# سیاسەت لە ئەفریقیادا

**نووسینی**

**ئەلکس تامسۆن**

**وەرگێڕانی لە فارسییەوە**

**هیوا مەجید خەلیل**



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **سیاسەت لە ئەفریقیادا**
- **نووسینی:** ئەلکس تامسۆن
- **وەرگێڕانی:** هیوا مەجید خەلیل
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** مۆگر سدیق
- **چاپ::** یەکەم ٢٠١٠
- **ژمارەی سپاردن:** ٢٢٤٥
- **نرخ:** ٤٠٠٠ دینار
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆک)

**زنجیرەی کتێب (٤٨٩)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

## ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بە:

## بانو



## ناوەڕۆك

## سەبارەت بەم پەرتووکە:

پەرتووکی (سیاسەت لە ئەفریقیادا) دەقێکی دەگمەنە بۆ ئەو توێژەرانەی دەیانەوێت توێژنەوەی لەسەر ئەم کیشوەرە سەرسوڕهێنەرە بکەن.

ئەم پەرتووکە سەرەکیترین بابەتەکانی سیاسەت لەم بەشەی جیهاندا دەخاتەڕوو و هەوڵ دەدات وەڵامی پرسیارگەلی وەك: بۆ هێشتاش ئەفریقیای هاوچەرخ بە کۆلۆنیالیزمی رادەبردوو کارتێکەرە؟ چۆن شوناسە نەژادییەکان بەسەر حکومەت لەم کیشوەرەدا کاریگەرییان هەیە؟ بۆچی میلیتاریزم کاریگەری زۆری بەسەر سیاسەتی (وڵاتانی) ئەفریقیادا هەبووە؟ بۆچی وڵاتانی ئەفریقیا لە بەڕێوەبردنی ئابووریدا جیاوازییان لەگەڵ یەکدی هەیە؟ ئاستی جیاوازی دیموکراسی لە ئەفریقیا بە بەراورد لەگەڵ دیموکراسی لە رۆژئاوادا چەنە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە کرۆکی سیاسەت لە ئەفریقیادا دەخاتەڕوو و ئەم هەلە بۆ خوێندکاران دەڕەخسێنێ کە ئەو نموونە (نموذج) سیاسییانەی لە دوای قۆناغی کۆلۆنیالدا پشتاوپشت لەم کیشوەرە دووبارە بوونەتەوە، لێی تێبگەن..

ئەم پەرتووکە ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

- ئەم پەرتووکە بەپێی بابەتگەلی تایبەتی و پۆلینکردنی وردی پرسگەلی وەك کۆلۆنیالیزم، نەژادپەرەستی، ناسیۆنالیزم، ئایین، چینی کۆمەڵایەتی، ئایدۆلۆژیای مەشروعیەت، دەسەڵات، فەرمانڕەوایی و دیمۆکراسی، لێکۆڵینەوەی هەریەك لەم بابەتانە دەکات.
- ئەم پەرتووکە بە زنجیرەیی پێوەندی رکابەریتی نێوان هەریەك لە دەوڵەتی ئەفریقیایی و کۆمەڵگای مەدەنی و بەرژەوەندی دەرەکی روون دەکاتەوە.
- ئەم پەرتووکە کۆمەڵێك بابەتی توێژینەوە لەسەر ئەنجامدرا و لە کۆتایی هەر بەشێکدا کۆ کردووتەوە و توێژینەوەی لەسەر هەریەك لە وڵاتانی کینیا، تانزانیا، نایجریا، بۆتسوانا، کەناری عاج، ئۆگاندا، سومالی، غانا، کۆماری دیموکراتی کۆنگۆ و ئەلجەزایر ئەنجامداوە. لە کۆتایی هەر بەشێك، پوختەی بەشەکە لە خشتەیەکدا خراوەتەڕوو و پرسیارگەلێك گەڵاڵە کراون و ئاماژەش بەو پەرتووك و وتارانە دراوە کە بۆ خوێندنی زیاتر سوودمەندن.
- لە کۆتایی ئەم پەرتووکەدا سەرچاوە ئەنتەرنێتییەکان (پەیوەست بەم بابەتی ئەم پەرتووکە) لەخۆ دەگرێ.

ئەم پەرتووکە، بە زمانێکی ساکارەوە لەلایەن مامۆستایەکی پسپۆر لە بواری ئەفریقیا، نووسراوەتەوە.



## سوپاس و پێزانین:

بەتەنیایی نووسینەوەی هەر پەرتووکی زانکویی ئەگەر نەڵێین کارێکی گەمژانەیە، بەڵام کارێکی زۆر سەختە. لەم روانگەیەوە هیچ کەس ناتوانێت تیۆرییەکان بە تەواوی فۆرمۆلیتە بکات یا خود نموونەگەلی عەینی بۆ روونکردنەوەی سیاسەت لە سەرتاسەری ئەو کیشوەرەدا بخاتەڕوو. بەم پێیەش سوپاسی گشت نووسەرانی ئەو پەرتووك و وتارانە دەکەم کە لە کۆتایی هەر بەشێکی ئەم پەرتووکەدا سوودم لەم پەرتووك و وتارانە وەرگرتووە. هیوادارم ئەم پەرتووکە رەنگدەرەوەی بۆچوونی نووسەرەکان بێت و، هزرەکانی منیش هەڵقولاوی توێژینەوەکانی ئەفریقیاناسان و پسپۆران (لە کاروباری ئەفریقیا)یە کە کارەکانیان شایانی رێزلێگرتنن و سوپاسیان دەکەم. پێوستە سوپاسی هەڵەچنی ئەم پەرتووکە بەڕێز مارك گاڤناك بکەم. لەسەرخۆیی چاودێری ئەو بەسەر ئەم پرۆژەیەدا دڵنیایکردم کە پەرتووکی (سیاسەت لە ئەفریقیادا) کارێکی بایەخدار دەبێت. هەروەها سوپاسی گشت هاورێ و ئەندامانی خێزانەکەم دەکەم کە یارمەتیدەر بوون بۆ نووسینەوەی ئەم پەرتووکە. سوپاس بۆ کێیس فاولکس بۆ پێشنیارەکانی سەبارەت بە چەمکە سیاسییەکان (ئەگەرچی سەبارەت بە چەمکی مەشروعیەت رای جیاوازمان هەبوو). سوپاسی نیك جێمز دەکەم کە لە خۆ تێهەڵقورتاندا لە بواری سیاسەت (لە وانیش رێبازە جوگرافییەکان لە ئەفریقیادا) هۆشداری ئاراستەی کردم. سوپاسی بەڕێز جاك هۆلی فیلدو پیت تامسون دەکەم بۆ رێنمایی کردنم لە هەڵە رێزمانییەکاندا. هیوادارم هەڵە سەرەکییەکانم راست کردبێت و ئەگەر هەڵەیەکیش هەبێت، بەرپرسیارێتییەکەی بۆ خۆم دەگەڕێتەوە.

ئەلێکس تامسۆن

مانچستەر ١٩٩٩

## پێشەکی نووسەر دەربارەی چاپی دووەم:

خۆشبەختانە بە هۆی بەرژەوەندییەکانەوە، بەڵام بەداخەوە بۆ نووسەری ئەم پەرتووکە، هەنوکەش جیهان لە بازنەی ناسیاسیدا دەخولێتەوە. ئەریقیش سەلماندی کە لەم ڕێسایە ڕێزپەڕ نییە. لە کاتی یەکەمین چاپی ئەم پەرتووکەوە لە سەرەتای هەزارەی نوێدا، چەندین وەرچەرخان و گۆڕانکاری گرنگ لەو کیشوەرەدا روودراوە. یەکێك لە بەئازارترین بەرەوپاشچوونەوەی ئەم کیشوەرە دانەمەزراندنی دەوڵەت لە سۆمال و (تا رادەیەك) کۆماری دیمۆکراتی کۆنگۆ و سیرالیون و لیبریایە. هەروەها لەم ساڵانی دواییدا شایەتی رووخانی دەوڵەت یاخۆد کەمبوونەوەی سیستەمی نوێنەرایەتی لە وڵاتانی کەناری عاج و زیمبابوی بووینە. بە هۆی ئەو رووداوانەوانەی وەها دێتە بەرچاو، دیموکراسی فرەپارتی لە ئەفریقیادا کە توانایی بەهێز و پۆزەتیڤی هەیە بۆ مەشروعیەتدان بە دەوڵەت، لەهەمبەر رووخانی دەوڵەت و دەوڵەتی شەڕسالار، کە لە ساڵانی نەوەدەکاندا لە ئەدەبیاتی سیاسی ئەفریقیادا بوونی هەبوو، گەرەنتیکەر نییە.

لەم ساڵانەی دواییدا پێشکەوتنگەلی گرنگ لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی ئەم کیشوەرە سەردەمی روویانداوە. جێگرتنەوەی ڕێکخراوی یەکبوونی ئەفریقیا لەبری ڕێکخراوێکی ئەفریقیا و پلانی بەشداریکردنی نوێ بۆ گەشەسەندنی ئەفریقیا (نپاد) بوو بەهۆی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی کە بەپێی داواکارییەکانی ئەفریقیا دامەزرا. بەریتانیاش تا ئەوکاتەی کە پرسی عێراق و ئەفغانستان گۆڕانی بەسەر ئەولەویەتەکانی ئەو وڵاتەدا نەهێنابوو، بە مەبەستی تێوەگلان لە پرسەکانی ئەفریقیادا، خوازیاری داڕشتنی سیاسەتێکی نوێ لەم کیشوەرەدا بوو. ئەم پێشکەوتنانەش وڵاتە رۆژئاواییەکانی بۆ بەخشینی رێژەیەك لە قەرزەکانی وڵاتە هەژارەکانی ئەم کیشوەرە رازیکرد. گشت ئەم داهێنانەش لایەنی سیاسی هەبوو و ئەنجامە راستەقینەکانی هەروەکو پێشبینی دەکرا، ئاشکرا نین.

هەروەها بە گەڵاڵەبوونی پرسگەلی وەکو ئایدز و HIV وڵاتانی رۆژئاوایی بەرەبەرە ئاگاداری کارەساتی ئەو کێشوەرە بوونەوە و، پرسێك کە بەرەبەرە ئەم کیشوەرەی بەرەو رووخان ئاراستە دەکرد. هەندێ ئامار لەم پەرتووکەدا خراونەتە روو، بەڵام من دڵنیام کە لە داهاتووشدا



هیچ کەس ئامادەی رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ئەم راستییانەی نییە. لەهەر شوێنێك کە پێویستی کردبێت بابەتەکانی ئەم پەرتووکە بەپێی کات گۆڕدراون. بابەتی ئایین و دەوڵەت، لە چاپی دووەمدا زیادکراوە و لە بەشی مێژوویش سوود لە تیوری جێفری هربست سەبارەت بە دەوڵەتی ناهەژمونیك وەرگیراوە. لە کۆتایی هەر بەشێکیش پوختەی بەشەکە لە خشتەیەکدا خراوەتەڕوو. لە کۆتاییشدا سەرچاوە ئەنتەرنێتییەکانیش کۆ کردنەوەیە زیاد کراوە. هیواخوازم بە ئەنجامدانی.

لە کۆتاییشدا سوپاسی رۆی مای و بروس بیکەر و جۆرج نیابیوگا لە زانکۆی کاونتری دەکەم کە بۆ باسکردن لە بابەتەکانی ئەم پەرتووکە یارمەتیاندام. سوپاسی جانیس ئەلێس دەکەم بۆ پێداچوونەوەی دەستنووسی ئەم پەرتووکە و راستکردنەوەی هەڵەکان.

ئەلێکس تامسۆن

مانچستەر-کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣

ئەفریقیا بابەتگەلی زۆر (بۆ لێکۆڵینەوە) پێشنیاری خوێندکارانی زانستە رامیارییەکان دەکات و لەم کیشوەرەدا رووبەڕووی بابەتگەلی جۆراوجۆر دەبینەوە. دیکتاتورەکان رکابەرێتی دیموکراتەکان دەکەن. حکومەتەکان پشتگیری لە وڵاتانی سۆسیالیزمی دراوسێی دەکەن کە بەپێی دەستووری لیبرالییەوە بەرێوەدەبردێن. هەندێ دەوڵەت نموونەی سەقامگیرین، لە کاتێکدا کە هەندێ دەوڵەتیتر لە لێواری رووخاندان.

سیستەمە فرە پارتییەکان لەگەڵ دەوڵەتە تاك پارتییەکاندا لەململانێدان و پولینکردنی کۆمەڵایەتی پشت بە (فاکتەرەکانی) نەتەوە، ئایین، چینی کۆمەڵایەتی، نەژاد دەبەستێت. گشت ئەم (فاکتەرانەش) سەرکردە سیاسییەکانی بۆ پاراستنی دیسپلێنی سیاسی رووبەڕووی تەحەدیاتی کردووەتەوە. گشت ئەم راستییانەش بوونەتە هۆی ئەوەی کە ئەفریقیا بابەتێکی سەرسۆڕهێنەر و بایەخدار بۆ تۆێژینەوە بێت.

## بۆچی خوێندنەوەی سیاسەتی ئەفریقیا دەکەین؟

هەنوکەش پێویستە ئەم پرسیارە بکرێت کە "بۆچی دەبێ رۆژئاواییەکان کاتە بایەخدارەکەیان بۆ تۆیژینەوە لەسەر سیاسەتی ئەفریقیا تەرخان بکەن؟" بۆچی ئەوان توێژینەوەی وڵاتانی نزیك خۆیان ناکەن؟ زیاد لەمەش ئەم کێشوەرە چ شتێکی هەیە پێشکەشی بکات؟ جگە لە سوودەکانی لێکۆڵینەوە سەبارەت بە لایەنە سەرنجڕاکێشەکانی ئەفریقیا بۆ خودی ئەفریقییەکان، ئەم کێشوەرە بە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ توێژینەوەی سیاسەتی پراکتیکی هەژمار دەکرێت. جۆراوجۆری بیرۆکە سیاسییەکان، پرۆسە و دامەزراوە سیاسییەکان، بابەتگەلی جۆراوجۆر بۆ شیکردنەوە بۆ خوێندکارانی زانستە رامیارییەکان دەخاتەڕوو. بە هەر حاڵ خوێندنەوەی دیاردە سیاسییەکانی دوور لە چوارچێوەی بۆچوونەباوەکانی رۆژئاوا، دەتوانێت رەهەندێکی تازە بە توێژینەوە سیاسییەکان بدات. هەروەك چۆن زۆرێك لە گەشتیاران فێربوونە بەدەستهێنانی ئەزموون سەبارەت بە کولتوورە بیانییەکان نەتەنیا بۆ پێشکەوتنی وڵاتی بینراو سوودمەندە، بەڵکو هانی ئەم گەشتیارانە دەدات بۆ بینینی وڵاتەکەیان لە لایەنە جۆراوجۆرەکانیەوە. ئەوەی باسکرا دەربڕی بابەتێکە کە سیاسەتی پراکتیکی لێکۆڵینەوە لەبارەیەوە ئەنجامدەدات.

ئەگەرچی بۆ سوودوەرگرتن لەو شتەی کە ئەفریقیا پیشکەشی دەکات پێویستە سەرەتا توێژەرە نوێیەکانی ئەم کیشوەرە پێش گریمانەکانیان وەلا بنێن. تێکڕایی بۆچوونەکانی رۆژئاوا



سەبارەت بە ئەفریقیا زۆرتر دەستبژێردراون و ورد نین. ئەو روانگە ئاسیاییانە کە رۆژئاوا سەبارەت بەم کیشوەرە، هەیەتی زۆربەیان لە رێگەی رۆژنامە و پەیامنێرەکانەوەیە، ئەگەر مرۆڤ تەنیا پشت بەم سەرچاوانە ببەستێ ئەفریقیا دەبێتە کیشوەری وشکەساڵی، کارەساتەکان و شەڕە ناوخوییەکان. هەندێ لەم بابەتانە لەم کیشوەرەدا بوونیان هەیە، بەڵام خویندنەوەی ئەم رووداوانە وەك پوختەیەك لە سیاسەتەکانی ئەفریقیا تووشی لەڕێ لادانمان دەکات. پێش گریمانەی رۆژنامەنووسەکان پشتبەستراو بە هەواڵە هەڵبژێردراوەکان و نموونەیەك لە تارزان (واتە درندە خوویی بوونی ئەفریقییەکان) و خانوو لە قوردروستکراو و خێڵەکانی گیرودەی شەڕن. پێویستە پێش خوێندنەوەی وردی ئەفریقیا گشت ئەم پیش گریمانانە وەلا بنرێن و پێویستە ئەو کەسانی بە تازەیی ئەم کیشوەرە دەناسن بە هزری کراوە توێژینەوەی ئەم بەشەی جیهان بکەن.

جۆرج ئالاجیا، پەیام نێری پێشووی (BBC) لە ئەفریقیا، گرفتە هەڵقوولاوەکانی ئەم پێشگریمانە بەرجەستە دەکات. بە رەچاوکردن ماوی خزمەتکردنی ئالاجیا لە ئەفریقیا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو بە باشی لە بارودۆخی رۆژنامەکان لەم بەشەی جیهاندا لە سەردەمی خزمەتکردنەکەی ئاگادار بووە. سەرەڕای هەوڵدانی ئالاجیا بۆ هوشیارکردنەوەی خەڵك، ئەو دانی بەوە نا کە دیمەنی تەلفزیونەکانی رۆژئاوا، ئەفریقیا وەك شوێنێکی دوور هەڵکەوتوو کە مروڤە باشەکان برسی و مروڤە خراپەکان فەرمانڕەوایی دەکەن نیشان دەدات و پشێوی لەم کیشوەرەدا وەك رێسایەك هەژمار دەکریت. ئەو پەرۆشی ئەوەیە کە چاودێران بە دەگمەن بە تەواوی ئاور لە ئەفریقیا دەدەنەوە.

ئالاجیا بە ئاماژەدان بەم خاڵە نموونەیەك لە قۆناغی کۆتایی خزمەتکردنی دەگێڕتەوە. ئەو لە کاتی ئامادە کردنی راپۆرتێك لەسەر وشکە ساڵی باشووری سودان لە ساڵی ١٩٩٨دا دوو راپۆرتە هەواڵی تومار کردووە. ئەم دوو راپۆرتەش لە هەوالەکانی بەریتانیا چەندین شەو بەدوای یەکدا بلاوبوونەوە. یەکەمین راپۆرت باس لە بارودۆخی بەرقەراری دەکرد و راپۆرتی دووەمیش هەوڵدانێکی بابەتیانە بۆ روونکردنەوی هۆکارەکانی روودانی وشکە ساڵی بوو. یەکەمین راپۆرت زۆر کارتیکەر بوو. نامەی بینران، رنگدانەوەی پەرۆشی راستەقینەی خەڵك بۆ ((خەڵکی هەژاری باشووری سودان)) بوو، بەڵام ژمارەیەکی کەم باسیان لە هۆکاری روودانی ئەم کارەساتە دەکرد. هەروەك ئالاجیا دەڵیت: ((تیگەیشتنی گەلی بەریتانیا لە ماڵەکانیانەوە لە (بارودۆخی) مرۆڤێکی لێقەوماو کە هەوڵی بەرەنگاربوونەوەی کارەساتی مرۆیی دەدات،

کارێکی سادەیە بەڵام تێگەیشتنی خەڵك لە قەیرانێك کە بەشێك لە رەوتی بارگرژاوی روشنگەری سیاسی پێك دێنێت کارێکی دژوارە)).

ئەمەش رێك هەمان گرفتە کە پێویستە خوێندکارە نوێیەکانی پرسەکانی ئەفریقیا بەسەریدا زاڵ بن. گرفت لێرەدایە کاتێك زۆربەی رۆژئاواییەکان رووبەڕووی پرسەکانی ئەفریقیا دەبنەوە هۆ و هۆکارەکان (علە و معلول) تێکەڵ بە یەکتری دەکەن. بۆچی لە لیبریادا شەڕی ناوخۆیی هەڵگیرسا؟ بۆچی لە رواندا ئاپارتاید روویداوە؟ بۆچی لە سۆمالی حکومەت رووخا؟

گشت ئەم پرسیارانە بە سادەیی لەلایەن مرۆڤەوە وەڵام دەدرێنەوە، وەڵامیش ئەوەیە کە ((ئەم وڵاتانە کەوتوونەتە ئەفریقیا))، ((ئەم جۆرە پرسانە لەم کیشوەرەدا شتێکی سروشتییە)) و ((ئەم ناوچەیە هەر لە بنەرەتدا ناسەقامگیرە)). بیرۆکەی سەرەکی ئەم پەرتووکە گۆڕینی ئەم بۆچوونە نادروستەیە.

لە جەوهەردا ئەفریقییەکان لە مرۆڤەکانی ئەم جیهانەدا گەندەڵتر، چاوچنوکتر و نەزانتر نین. ئەوان توانای خۆبەڕیوەبردنیان هەیە. بڕوا نەکردن بەم بابەتەش گەڕانەوە بۆ نەژادپەرەستییە کە جەخت لە خەسڵەتی کوێلایەتی و کۆلۆنیایزم دەکاتەوە. لەم رووداوە ستراکتۆرەکانی ئەفریقیا هەروەك سیستەمی حکومەتەکانیتری ئەم جیهانە عەقڵانی نین. ئەگەر کودەتای سەربازییەکانی ئەفریقیا زۆرتر لە (کودەتاکانی) ئەمریکا بووە، پێویستە بە دوای هۆیەکانیدا بگەڕێین روونکردنەوەیەکیش سەبارەت بەوەی کە بۆچی سیستەمە سیاسییەکانی ئەم کیشوەرە زۆرتر لە سیستەمە بەرقەرارەکانی بەریتانیا رووبەڕووی رووخان دەبنەوە بوونی هەیە. بە پشتبەستن بە هۆکارەکان دەتوانین خراپترین ناسەقامگیری لە سیاسەتەی فریقیادا دیکتاتۆرییەکان و شەڕە ناوخۆییەکان هەژمار بکەین.

هەروەها دەکرێت ئاماژە بە باوترین، دواکەوتووترین، خەسڵەتەکانی رۆژانەی چارەسەری کێشەکان لەم کیشوەرەدا بکەین. ئەم پەرتووکە رێڕەوی بنیاتنانەوەی سیاسەتی دوای کۆڵۆنیال (لەم کیشوەرەدا) دەخاتەڕوو و داوا لە خوێنەرانی دەکات کە هەرجۆرە بڕیاردانی پێشوەختە وەلا بنێن کە ئەفریقیا بە هەژار و نالۆژیك و هەڵچوو و قوربانی ژینگەی سیاسییەکەی دەزانن.



## سیستەمی سیاسی فرە لایەنەی ئەفریقیا:

دووەمین راسپاردەی ئەم پەرتووکە، ئەوەیە کە ئەفریقیا وێکچوو (یەك دەست) هەژمار نەکەن. ئەم کیشوەرە قەڵەمڕەوێکی بەرفراوانە کە نیشتمانی کولتوور و کومەڵگا جۆراوجۆرەکانە، شتیك بە ناوی هێمای (مۆشر) سیاسەتی ئەفریقیا بوونی نییە. لەم کیشوەرەدا پەنجا و سێ دەوڵەتی سەربەخۆ بوونی هەیە کە هەر یەك خاوەن سیستەمی سیاسی تایبەت بە خۆیەتی. گامبیا وڵاتێکی بچووکە کە رووبەری یازدەهەزار کیلومەتری چوارگوشەیە. لە کاتێکدا کە رووبەری سودان ٢٥٠ بەرابەر زۆرترە لە رووبەری گامبیا. نیجریا ١٢١ ملیۆن دانیشتووی هەیە. لە کاتێکدا کە لسوتۆ دوو میلیون کەس دانیشتوانی هەیە. بۆتسونا وڵاتێکی وشك و خاکی بەیارە، بەڵام کۆنگۆی کینشازا وڵاتێکی سەرسەوز و بە پیتە. لە رووی نەژادییەوە ئەسیۆپیا یەك دەستە. بەڵام وڵاتی ئەفریقیای باشوور نەژادی جۆراوجۆری لەخۆ گرتووە. باکووری ئەم وڵاتە موسڵمان و باشووریشی مەسیحینشینە. پێویستی وەبیرهێنانەوە نییە کە لە سەرتاسەری ئەم کیشوەرە تێکەڵەیەك لە ئایینە سووننەتییەکان بەرچاو دەکەوێت تا ئەو کاتەی کە داواکارییە خۆجێیەکان سیاسەتی بێ وێنە و خواستە یەکسانەکان داوا بکەن، هیچ سیستەمێکی سیاسی ناتوانێت گشت وڵات بەڕێوە ببات.

بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم (داواکارییە) جۆراوجۆرانە هیچ شێوەیەك بۆ خوێندنەوەی سیاسەتی ئەفریقیا بوونی نییە تەنیا خوێندنەوەی بەجیای هەریەك لە وڵاتانی ئەفریقیایی نەبێت. لەم پەرتووکەدا هەوڵ دراوە هەر وڵاتێك بە پێی خەسڵەتە تایبەتییەکانیەوە شی بکرێتەوە.

ئەفریقیاناسانی تازە پیگەیشتوو بۆ توێژینەوەی ئەم خەسڵەتانە پرسە ئاڵۆزەکان بە بێ خوێندنی چەند پەرتووکێکی سەرەتایی رووبەڕووی گرفت دەبنەوە. ئەم پەرتووکەش وەك پەرتووکێکی سەرەتایی (بۆ تویژینەوە) نووسراوەتەوە و بناغەیەك بۆ ئەدەبیاتی ئەم بوارە پێك دێنێت.

پەرتووکی (سیاسەت لە ئەفریقیادا) رێبازی بەراوردکاری دەگرێتەبەر. ئەم پەرتووکە ئاوەردانەوەیەکی خێرا بۆ گشت لایەنەکانی ئەم کیشوەرە لەخۆ دەگرێت و رەگەزە باوەکانی کۆمەڵگەکانی ئەم کیشوەرە دیار دەکات. گرنگ ئەوەیە کە رێز لە پرەنسیپەکان بگرین و یەکەمین پرەنسیپی سیاسەت لە ئەفریقیادا ئەوەیە کە دەکرێ وردەکارییەکان بەوردی نەخرێنەڕوو. ئەم بابەتەش رێگا بە تازەپێگەیشتووەکان خۆش دەکات لە بری ئەوەی کە خۆیان سەرقاڵی وردەکارییە ناگرنگەکانی وڵاتێکی تایبەت بکەن، توێژینەوە لەسەر سیاسەتەکانی ئەم کیشوەرە بکەن. بەم پێیەش ئەم پەرتووکە خاڵی دەستپێکی ئەو کەسانەیە کە هۆگری سیاسەتەکانی دوای کۆڵۆنیال لە ئەفریقیادان.

## ڕێبازی ئەم پەرتووکە:

بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە سیاسەتەکانی ئەفریقیا بۆ توژێنەوە (بابەتێکی)  لۆژیکی و گرنگە و ئەم کیشوەرەش یەکدەست نییە، عەقڵانییە کە بە پوختی باس لە ڕێبازی شیکردنەوەی ئەم پەرتووکە بکەین. هەروەك پێشتر ئاماژە پێکرا جیێبەجێکردنی سیاسەت لە ئەفریقیادا جیاوازی ئەوتوی لەگەڵ پرۆسە سیاسییەکانی بەرقەرار لە شوێنەکانیتری جیهاندا نییە، هەنوکەش پرسگەلی وەك دەسەڵات، بڕواکان، دابەشکردنی سەرچاوەکان، چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان، هەروەك ئەو حکومەتانەی کە چاودێری ئەم پرۆسانە دەکەن لە ئارادایە، لەم ڕووە ئەفریقیا گۆڕەپانێکی تاکانەیە کە تیایدا ئاڵوگۆڕی سیاسی ئەنجام دەدرێت بەڵام ڕەوتی ڕاستەقینەی ئەم (پرۆسەیە)  لە ئەفریقیادا هاوشێوەی گشت کیشوەرەکانیترە. بۆ نموونە ئەگەر بە وردی بڕوانینە ئەم بابەتە، بۆمان دەردەکەوێت کە چۆن سۆسیالیزم (بۆ نموونە لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات) پرسەکانی نەتەوە و چینی کۆمەڵایەتی (بەتایبەتی لە بەلجیکیا و بەریتانیا)، کودەتای سەربازی (پۆرتۆگال)، ڕووخانی دەوڵەت (یوگسلاڤیا)، دیموکراسییە تازە سەرهەڵداوەکان (ئیسپانیا)، دەوڵەتی تاك پارتی (ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات)، لە تایبەتمەندییەکانی سیاسەتی ئەورووپا لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالدان.

کەواتە پسپۆرە نوێیەکانی سیاسەتی ئەفریقیا نابی زۆر نائومید بن. زانیاریی خوێنەران سەبارەت بە ڕێڕەو و ناوڕۆکی سیاسی ڕۆژئاوا، دەکرێ لە کیشوەری ئەفریقیادا جێبەجێ بکرێت. هەڵبەت پێکهاتەی ئەم پەرتووکەش هەر بەم شێوەیە داڕێژراوە. لە هەر بەشێکدا چەمکی سیاسی دەخرێتەڕوو و، دواتر پەیوەندی نێوان ئەم چەمکە و ژینگەی ئەفریقیا شی دەکرێتەوە. بەشەکانی پەرتووك پرسگەلی ئایدیۆلۆژی، ناسیۆنالیزم، چینی کۆمەڵایەتی، مەشروعییەت، دەوڵەتی ستەمکاری، سەروەریی، دەسەڵات، دیموکراسی و کاریگەری هەریەك لەمانە بەسەر سیاسەتی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالدا لەخۆ دەگرێت. ئەم ڕێبازە نەتەنیا سروشتی سیاسەتی ئەفریقیا ڕوون دەکاتەوە بەڵکو سەبارەت بەو شتانەی کە لە دوای سەربەخۆییەوە لەم کیشوەرەدا ڕوویداوە زانیاریگەلێك بەدەستەوە دەدات. هەروەها یارمەتی خوێنکارانیش دەکات کە تێگەیشتنیان لەم چەمکە سیاسییە گرنگ و سەرەکییانە زۆر بێتەوە. زیاد لە مەش، ئامانجی سەرەکی لە خستنەڕووی ئەم چەمکانە لە هەر بەشێکدا، خۆ دوورخستنە لە گیرۆدەبوون بە پێش گریمانەکانی میتۆدیی و پوخت بێژیی سەبارەت  بەم کیشوەرەیە. بابەتێکی توێژینەوەی کورت لە کۆتایی هەر بەشێکدا هاتووە باس لە یەك وڵات دەکات. بۆ نموونە لە



بەشی تایبەت بە ئایدۆلۆژیا لە بابەتی توێژینەوەدا باس لە کارکردی سۆسیالیزمی کۆمەڵی لە تانزانیا لە قۆناغی سەرۆکایەتی جولیۆس نایرێرێ کراوە. یاخود لە بەشی تایبەت بە دیموکراسی باس لە ململانێیەکانی ئەلجەزایر و هەڵبژاردنی فرە پارتی لە ساڵانی نەوەددا کراوە. لە دە بابەتی توێژینەوەی ئەم پەرتووکە. ڕوونکرنەوەی پراکتیکییانە سەبارەت بە ئەوەی کە چۆن چەمکە سیاسییەکان دەتوانن یارمەتی واقیعییەتەکانی ئەفریقیا بدەن خراونەتەڕوو.

## دەوڵەت، کۆمەڵگای مەدەنی و بەرژەوەندیی دەرەکی:

لەم پەرتووکەدا گشت سیاسەتەکانی ئەفریقیا بەپێی بەشەکان ڕوونکراونەتەوە و ئەم سیاسەتەش لە بابەتی توێژینەوە و چەمکە جۆراوجۆرەکاندا باس کراوە. لەم میانەیەدا ئێمە پێویستیمان بە هەوێنێك بە ناوی میتۆدۆلۆژی  هەیە تا یارمەتی خوێنەر بدات و گشت ئەم چەمکە لێك جیاوازانە پێکەوە گرێ بدات. ئەم هەوێنەش لە پێکەوە گرێدانی سێ فاکتەری دەوڵەت، کۆمەڵگای مەدەنی و بەرژەوەندیی دەرەکی بە دەست دێت. هەر جۆرە لە ڕێ لادانێك لە گەشەسەندن و فراوان بوونی سیاسەتی ئەفریقیا لە سەردەمی سەربەخۆییەوە تا ڕۆشنگەری دەسەڵات لەنێوان ئەم سێ گرووپەدا دەجووڵێتەوە. هەروەها لە هەر بەشێکدا بابەتێك بۆ ڕوونکردنەوەی پەیوەندی نێوان ئەم سێ فاکتەرە تەرخان کراوە. هەروەك باسکرا دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی و بەرژەوەندیی دەرەکی پێکهاتی سەرەکی ئەم پەرتووکە پێك دێنن. لە درێژەی ئەم پێشەکییەدا ڕوونکردنەوەی گرنگ سەبارەت بەم چەمکانە پێشکەش کراون. دەوڵەت چەمکێکی ناسراوە، لە پێناسەیەکی کورتدا ئەم چەمکە بریتییە لە ((ئۆرگانێك لە دامەزراوە سیاسییەکان کە لە چوارچێوەی قەلەمڕەوێکی دیارکراودا فەرمانڕەوایی دەکات)). بەڵام دەوڵەتی مۆدێرن ناتوانێ تەنیا قەوارەیەك و ئەندامێك لە دامەزراوەکان بێت. دەوڵەت لە پێناسەیەکی ورددا پێویستە دەسەڵاتیش کە ئەم ستراکتوارنە پێك دێنێت لەخۆ بگرێت. زیاد لە مەش دامەزراوە و کاربەدەستە حکومییەکان کە هەوڵ بۆ سەرکردایەتی و حوکم  بە دەستەوە گرتن دەدەن، هەروەك ئەو دامەزراوە خاوەن سەروەرییانەن کە وڵاتانیتری جیهان لەڕێگەی ئەم دامەزراوانەوە کاروبارەکانیان بەڕێوە دەبەن. بەم پێیەش ئەم دامەزراوانە خاوەن هێزێکی زۆرن. ماکس ڤێبر لە پێناسەی دەوڵەتدا ئاماژە بەم حەقیقەتە دەدات کە جیاوازی نێوان هاوڵاتیان بەم هۆیەوە دروست دەبێت کە دەوڵەت لە وڵاتێکدا خاوەنی قۆرغکردنی توندوتیژی یاساییە.

بەپێی ئەم پێناسانەی سەرەوە دەوڵەت تاکە دامەزراوەی خاوەن دەسەڵاتە و بە هۆی دەسەڵاتە بێ ڕکابەرەکەی دەتوانێت یاساکانی کۆمەڵگا دابڕێژێت و بە وردی دەسەڵاتەکەی لە قەڵەمڕەوییەکی سیاسیدا جێبەجێ بکات.

پێویست بە ئاماژە پێدان ناکات کە گشت سیاسەتەکان بە ناوی ((سیاسەتی باڵا))وە لە دەوڵەتدا دەادەڕێژرێت. چاڕەسەری ناکۆکییەکان، لە ڕکابەرێتی نێوان پەرلەمان، دامەزراوەکانی سەرۆکایەتی کۆمار و بۆرۆکراسیدا سنووردار ناکرێتەوە. وەرچەرخانە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان، دەکرێ لە گشت کۆمەڵگاکاندا، لە پانتاییەکی قووڵتر لە پانتای دەولەت روو بدات و، ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کە کۆمەڵگای مەدەنی ڕۆڵی گرنگی لە ڕوونکردنەوەی سیاسەتی ئەفریقیادا هەیە. لەم پرتووکەدا کۆمەڵگای مەدەنی وەك "ڕێکخراوگەلیك کە خۆبەخشانە لە کۆمەڵگادا هەڵقوولاون و لەنێوان خێزان و دەوڵەتدا جێ دەگرنەوە" پێناسە کراوە. نموونەگەلی ئەم کۆمەڵگا پسپۆڕییانە بریتین لە یەکێتی کرێکاران، کۆمەڵگای بازرگانی، ڕێکخراوی ژنان، کەنیسە، بازرگانەکان، گرووپە خاوەن بەرژەوەندییە تایبەتەکان، کلوپە وەرزشی و کۆمەڵایەتییەکان لەم ڕووەوە، هەر گرووپێك لە دەرەوەی خێزاندا ڕێك بخرێت و بەشێك لە ئۆرگانی دەوڵەت نەبێت بە بەشێك لە کۆمەڵگای مەدەنی پێناسە دەکرێت.

چالاکییە سیاسییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی جۆراوجۆرن. گرووپە جۆراوجۆرەکان خاوەن بەرژەوەندی تایبەتن بەڵام لە داواکارییەکاندا لێك جیاوازن. لە کۆمەڵگای مەدەنیدا سیاسەت شێوازی ڕکابەرێتی هەیە و ئەمەش هەمان "سیاسەتی باڵای" دەوڵەتە. ئەم بەرژەوەندییە جیاوازانە کاریگەرییان بەسەر ڕێکخراوە مەدەنییەکانی سەر بە دەوڵەت هەیە. هەندێ گرووپ هاوکاری دەوڵەت دەکەن و هەندێ گرووپیتریش لە دژی دەوڵەت دەوەستنەوە. هەریەك لەم گرووپانە هەوڵ دەدات سەرەڕای جیاوازی لەنێوان بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، بەسەر بڕیارەکانی دەوڵەتدا کاریگەری دابنێن. ئەم پرسە لەو وڵاتانەی کە ڕەچاوی داواکارییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ناکات دەبێتە هۆی بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت لەلایەن کۆمەڵگای مەدەنییەوە.

سێیەمین بەشی پەیوەندییەکانی ڕکابەرێتی، بەرژەوەندییە دەرەکییەکانن. وڵاتانی ئەفریقیا بۆ پارچەکانیتری جیهان ناسراوەیە، چونکە چارەنووسیان بەتەنیا لە پانتای ناوخۆییەوە دیار ناکریت، پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیش بەسەر ئەم چارەنووسەدا کاریگەرە. فاکتەرە مێژوویی



و ئابوورییەکان دەسەلمێنن کە دەوڵەتانی ئەفریقیا زورتر لە وڵاتانیتر لەژێر کاریگەری هێزە دەرەکییەکاندان. زیاد لەمەش لە ڕوانگەی زۆرێك لە ئەفریقیاناسانەوە، ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالی نوێ، فاکتەری سەرەکی و هێزی شاراوەی کارکردە لاوازەکەی ئابووری و سیاسی ئەم کیشوەرەیە. ئەم بابەتەش لەم پەرتووکەدا ڕوونکراوەتەوە بەڵام ئایا ئەم هێزانە کاریگەری نگەتیڤیان هەیە یاخود کاریگەری پۆزەتیڤیان هەیە؟ بێگومان حکومەتە دەرەکییەکان، ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان ڕۆڵی فراوانیان لە پرۆسەی سیاسی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالدا هەبووە.

هەروەها پەرتووکی ((سیاسەت لە فریقیادا)) سەبارەت بە سیاسەتەکانی ئەم کیشوەرە لە زنجیرە چەمکێکی شیکاریی سوودی وەرگرتووە کە پەیوەندی بە ڕکابەرێتی نێوان سێ فاکتەرە ئاماژە پێ کراوەکان (دەوڵەت، کۆمەڵگای مەدەنی و بەرژەوەندیی دەرەکی) هەیە. بە گشتی خودی ئەمەش چیرۆکێکە کە چۆن دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە دووبارە بەرهەمهێنانەوەی یەکتر تووشی شکست بوونەتەوە. دەوڵەت بە هۆی کەمی سەرچاوەکانەوە ( بەهوی دەستڕۆیی دەرەکی) لە هەندێ کاتدا لە قوناغی دوای سەربەخۆیی بووە هۆی جیا بوونەوەی کۆمەڵگای مەدەنی لە پرۆسەی سیاسییەوە. ئەنجامی ئەم پرۆسەیەش بێ بەش بوونی هاوڵاتیانی ئەفریقیا لە حکومەتەکانیان بوو. سەرەڕای ئەمەش کاربەدەستە حکومییەکان جێگۆڕکێ لەنێوان ئەرك و بەرپرسیارێتییە گشتییەکان و بەرژەوەندیی تایبەتی دەکەن. بەمجۆرەش زۆربەی خزمەتگوزارییەکان بۆ هاوڵاتیانی ئاسایی کە بەپێی سیستەمی دەرەبەگایەتی کار دەکەن تەرخان دەکریت و، لەم سیستەمەشدا هیچ کاتێك کۆمەڵگای مەدەنی بەرەنگاری دەوڵەت نابێتەوە و بەپێی پێویست دەسەڵات، بەگوێرەی دەسەڵاتەکەی هاوڵاتیان پشتگوێ دەخات و هاوڵاتیانیش دەوڵەت پشتگوێ دەخەن. لە نموونەگەلی زۆردا، ئەم هەڵوێستە بۆ ستراتیژییەکی پێویست بۆ مانەوە لەهەمبەر دەوڵەتدا دەگۆڕدرێت و بەمجۆرەش دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بە درێژایی چەندین دەیە پاش سەربەخۆیی لێك دوور بوونەتەوە، ئەگەرچی بە تەواوی لە ناو نەچوونە. لە هەندێ وڵاتدا شەپۆلێك لە هەڵبژاردنی فرە پارتی دەبینرێت کە ئەم کیشوەرە لە کۆتایی هەشتاکانەوە وەك پرۆسەیەك سەرقاڵی بووە و لە ئەنجامیشدا دەوڵەت و کومەڵگای مەدەنی پەیوەندییەکی بەسوودتر لەگەڵ یەکتردا دادەمەزرێنن. بەکورتی، ئەمڕۆکە لە ئەفریقیا حکومەت زۆر لە مۆدیلی دەوڵەتی ڤێبر دوور کەوتووەتەوە. واتە (بەپێی مۆدیلی ڤێبر) سیاسەتمەدار و بۆرۆکراتەکان بە وردی بەرژەوەندیی گشتی و تایبەتییان لێك جیا کردووەتەوەوە

و "بەرژەوەندیی نەتەوەی" لە رێگەی دامەزراوەی بیّ لایەنی یاسایی-عەقلانی دەستەبەر دەکرێت. مومکینە ئەفریقییەکان مۆدیلێکی حکومەت کە بۆ کیشوەرەکەیان گونجاو بێت هەڵبژێرن. ئەگەرچی بێگومان ناهەماهەنگی و پشێوی دوای کۆڵۆنیال خەرجی زۆری لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا بە دیاری هینا. لە زورێك لە وڵاتاندا و بۆ ماوەیەکی درێژ گەشەی کۆمەڵایەتی و ئابووری لەم کیشوەرە لەسەرخۆ و تەنانەت لە هەندێ بواریشدا بەرەو دوا چوونی هەبووە بە سوودوەرگرتن لە چەمکە سیاسییەکان و بابەتەکانی توێژینەوە کە لە سەرەوە ئاماژە پێکران، ئەم پەرتووکە هەوڵ دەدات بە بەرجەستە کردنی رۆڵی دەوڵەت، کۆمەڵگای مەدەنی، هێزە دەرەکییەکان ئەو رووداوە سیاسی و پرۆسانەی کە بوونە هۆی دروستکردنی ئەم ناهەماهەنگییانە روون بکاتەوە. لە هەر بەشی ئەم پەرتووکەدا میکانیزمێکی ئالۆز کە سیاسەتەکانی ئەفریقیا وێنا دەکات روون دەکرێتەوە.

## زاراوە سەرەکییەکان:

**کۆمەڵگای مەدەنی:** رێکخراوگەلێك کە بە خۆبەخشانە لە کۆمەڵگادا دروست دەبن و لەنێوان خێزان و دەوڵەتدا جێگر دەبن

**بەرژەوەندیی دەرەکی:** حکومەتە دەرەکییەکان، رێکخراوەکانی نێودەوڵەتی، کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان کە هاوکاری دەوڵەتەکانی ئەفریقیا و رێکخراوە مەدەنییەکان دەکەن.

**حکومەت:** بەشێك لە دامەزراوە سیاسییەکان کە بەسەر پارچە هەرێمێکی دیاریکراودا فەرمانڕەوایی دەکات.

جیهان به یەك شێوە نامێنەتەوە و بەرەو کامڵبوون دەڕوات. هیچ شۆڕشێکی گشتگیر بوونی نییە کە پێش لە سەرهەڵدانی شۆڕش ئارامی بەخووە نەبینیبێت و سیاسەتی نوێش پێشینەیەکی باشی هەبوو. داب و نەریت دامەزراوەکان و پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەردەوام دەبن و لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکیتر دەگوازرێتەوە.

هەر بۆیەش خوێندنەوەی مێژوو بۆ زانایانی بواری سیاسی سوودمەندە. زانایەك کە هۆگری تێگەیشتنی زەمەنی ئێستایە پێویستە هەندێ شت لە رابردوو بزانێت. بۆ نموونە هەندێ دەڵێن کە سیاسەتمەدارە نوێیەکانی فەرەنسا مەیلیان بۆ رێ و رەسمی کۆمارەکەیان کە بۆ شۆڕشی ساڵی ١٧٨٩ دەگەڕێتەوە، هەیە. هەروەها ئەو کەسانەی کە هۆگری سیاسەتە ئەمرۆییەکانی ئەمریکان، پێویستە شارەزای بۆچوونی دۆزینەرەکانی ئەمریکا بن. ئەم بابەتە ئەفریقیاش لەخۆ دەگرێ. بەم پێیەش هەروەك بینرا زنجیرە بنەمایەکی بەردەوام هەن کە لە قۆناغی پێش کۆلۆنیال و سەردەمی کۆلۆنیال تا ئەم ساڵانەی دوایی بەردەوامییان هەبوو.

ئەم بەشە رێڕەوی مێژوویی ئەم کیشوەرە لەخۆ دەگرێت و هەوڵ دەدات وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە کە چ فاکتەرێك لە رابردووی ئەفریقیا تا هەنوکەش بەسەر سیاسەتەکانی ئەم کیشوەرەدا کاریگەرن؟ لەم بەشە سەرەتا ئەم فاکتەرانەی کە ریشەیان بۆ سەردەمی پێش کۆلۆنیال دەگەڕێتەوە روون دەکرێنەوە و دواتریش لێکۆڵینەوە لە میراتی کۆلۆنیال دەکەین.

## میراتی پێش کۆلۆنیال:

تا چەند ساڵ لەمەوبەر هۆگرانی (کاروباری) ئەفریقیا زۆرتر بەسەر میراتی کۆلۆنیال لەم کیشوەردا ورد دەبوونەوە. ئەوان رەچاوی کاریگەری ئەوروپا بۆسەر ئەم کیشوەرەیان دەکرد. لەم بارەوە توێژەرە ئیمپریالیزمەکان، بەرهەمی بەپێزەیان پێشکەش کردووە، بەڵام ئەنجامی گشتی ئەم توێژەرانە لە خستنەڕووی رێڕەوی مێژوویی ئەم کیشوەرە سەرکەوتوو نەبوو بە رەچاو کردنی ئەم بابەتە کە یاسا فەرمییەکانی ئەوروپا کە ٧٠ تا ٨٠ ساڵ مێژووی گشت ئەم کیشوەرە لەخۆ دەگرێت، ئەم کێشەی سەرەوە زەقتر دەکات. بەڵام بوونی مرۆڤ لە ئەفریقیادا بۆ دوو تا سێ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە. بەم پێیەش لۆژیکانەیە کە پێش دەستپێکردنی توێژینەوە لەسەر میراتی کۆلۆنیال لە ئەفریقیادا، سەرەتا باس لەوە بکەین کە دەوڵەتە هاوچەرخەکانی ئەفریقیا چ شتێکیان لە قۆناغی پێش کۆلۆنیال بۆ بەمیرات ماوەتەوە.



پێش کۆلۆنیال ئەفریقیا کیشوەرێکی فرە چەشن (متنوع) بووە. هەلومەرجی ژینگەیی لێکجیاواز، کۆمەڵگای جۆراوجۆر بە داب و نەریت و سیاسەتی لێکجیاوازی دروست کردبوو. ئەم کۆمەڵگایانە بە تێپەربوونی چەندین سەدە لە سەرهەڵدانیان، هەرەسیان هێنا یاخود گۆڕدراون. پێویستە دامەزراوە سیاسییەکان لە کۆمەڵگاکانی ئەفریقیادا بەسەر دوو گرووپی بەرفراوان، واتا کۆمەڵگاکانی خاوەن دەوڵەت و کۆمەڵگا بێ دەوڵەتەکان دابەش بکەین.

لە زۆرێك لە ناوچەکانی ئەفریقیای پێش کۆلۆنیال، چڕی کەمی دانیشتوان و بەرهەمهێنانی کەمی زیادە ئابوور لەهەمبەر دامەزراندنی دەوڵەت لەمپەر بوونە. ئەمەش لە ناوچەکانی ناوەڕاست و باشووری ئەم کیشوەرە زۆرتر زەق دەبێتەوە. بەڵام ئەم کۆمەڵگە بێ دەوڵەتانەش تا رادەیەك خاوەن دیسپلینی سیاسی بوون. روژئاواییەکان چونکە نەبوونی دامەزراوەی دەوڵەتیان بە هێمای دواکەوتوویی دەزانی دەستیان لە رسومی دەوڵەتی (ئەم کومەلگەیانە) وەرداوە. ئەگەرچی ئەم کارەش ئاسان نەبوو. ئەم سیستەمە سیاسییانە کە ئەم کۆمەڵگا بێ دەوڵەتانەی دروستکردبوو (لەلایەن خەڵکەوە) پەسەند کرابوون. بەڵگەی بەهێز لە شێوازگەلی پێشکەوتووی نوێنەرایەتی کردن، دادپەروەری و وەڵامدانەوەی (خەڵك) لەم کۆمەڵگایەدا دۆزراونەتەوە. لە چەندین بابەتدا کۆنفدراسیۆنە لادێیەکان سەرقاڵی بەدیهێنانی ئەمن و چالاکی هاوبەش بۆ هەزاران ئەفریقیایی بوونە.

ژمارەیەکی زۆری ئەم کۆمەڵگا بێ دەوڵەتانە دامەزراوە و پلەبەندییەکیان دروست کردووە کە هێدی هێدی کامڵبوونە و بە تێپەربوونی کات بۆ دەوڵەت گۆڕدران. (بڕوانە خشتەی ژمارە ٢). ئەم بابەتەش بە گشتی بەڵام نە بە قۆرغکراوی لە رۆژئاوای ئەفریقیادا روویداوە. مەیل بۆ دامەزراندنی دەوڵەت، هەڵقوولاو لە زیادە ئابوور بوو. ئەم سامانە، کۆمەڵگاکانی بۆ بەهێز کردنی سەرکردایەتیکردنی گرووپەکان و ستراکتۆرە کارگێڕییەکان بۆ پشتگیریکردن لەم سەرکردانە بە توانا دەکرێت. بۆ نموونە دەوڵەتی غانا و مالی لە رێگەی بەرژەوەندییەکانی بازرگانی بیاوانەوە دامەزراون. زیادە بەرهەمی کشتوکاڵی لە کێڵگە بەپیتەکانی رووباری نیل و دەریاچە گەورەگانی ناوڕاستی ئەفریقیا یارمەتیدەری دامەزراندنی میسری کۆن و پاشایەتی ئۆگاندا بوون. هەروەها ئیمپراتورییەکانی ئاشانتی و بنین لە رێگەی کانەکان و بەکارهێنانی کانزاکانەوە دامەزران و لە ناوچەکانیتریش دەوڵەتەکان بە پێی دەسەڵاتی پاشایەتی و وابەستەیی ئایینی دامەزران، بۆ نموونە گەلی زۆلۆ لە رێگەی هێزی سەربازییەوە دامەزراون.

هەندێ لەم شارەستانییەتە گەورانە لەڕووی تەکنۆلۆژیا و کۆمەڵایەتییەوە لە شارستانییەتە ئەورووپییەکانی هاوسەردەمیان پێشکەوتووتر بوونە. وردەکاری سەرسوڕهێنەر سەبارەت بەم دەوڵەتانە، لەم پەرتووکەدا هاتووە کە بۆ مێژووناسان سوودمەند دەبێت. لەم بەشەدا هەندێ لایەنی مێژوویی باسکراوە کە لە ڕوونکرنەوەی سیاسەتی ئەمڕۆیی ئەفریقیا یارمەتییان دەدات. فاکتەری بەردەوام بوون کە پێشتر ئاماژە پێکرا، گرنگی تایبەتی هەیە کە خانەدان و دەوڵەتە ناهەژمونیکەکان لەخۆ دەگرێت.

## دەوڵەتە ناهەژموونیکەکان:

تەنانەت ئەو کاتەی کە دەوڵەت لە ئەفریقیادا بنیاتدەنرا، ئەنجام لەگەڵ ئەو شتەی کە ئەمڕۆکە بە دەوڵەت پێناسەی دەکەین زۆر جیاوازە. ئەفریقیای پێش کۆلۆنیال بە بێ سنووری سەقامگیر و هەمیشەیی بوو و، دەسترۆیی دەسەلات لە (دەکرا) ناوەندێکی پاشایەتییە و بۆ زورتر لە گوندێك و بە ناهاوسەنگی تەشەنە بکات و بە پێی شانس حکومەتی ناوەندی ڕووبەڕووی هەوراز و نشێویی ببێتەوە. هەندێجار چونکە لەم کۆمەڵگایەدا، ڕێژەیەك لە خزمایەتی یاخود زۆرتر لە سەرکردایەتییەکی سیاسی بوونی هەبوو، کەواتە دەسەڵاتی هاوسەنگ بوونی هەبوو و ئەم پرسەش لەگەڵ دەوڵەتە ئەورووپییەکانی ئەوکات- کە حکومەتەکان هەوڵیان دەدا وەك تاکە سەرچاوەی دەسەڵاتی سیاسی لە چوارچێوەی هەرێمەکەیاندا فەرمانڕەوایی بکەن- زۆر جیاواز بوو. بەم جۆرەش ئەورووپییەکان زۆرتر هەوڵی فراوانکردنی سنوورەکان یا خود دابینکردنی ئەمنیەتیان دەدا، لە کاتێکدا کە ململانێیەکان لە ئەفریقیادا بە هۆی بەرفراوانی هەرێمەکان بوو نەك سنوورەکان و ئەم ململانێیەش زۆرتر سەبارەت بە بەدەستهێنانی دەستکەوتی (امکانات) زۆرتر وەك زێڕ و کوێلە و ئاژەڵ بوو.

هەروەها بەرفراوانی خاك بوو بە هۆی کەم کردنەوەی ململانێیەکان لە کۆمەڵگاکانی پێش کۆلۆنیالدا. ئەگەر بەشێك لە کۆمەڵگا هەوڵی ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی سیاسی دابا بە ئاسانی پارچەیەك لە هەرێمێکی (دوورتر لە ناوەندیان) داگیر دەکرد و ئەم شێوازەش بۆ ڕزگاربوونی (حکومەت) لە بەرهەڵستکارە سیاسییەکان ئاسانتر لە بەرەنگاربوونەوەیان بوو.

نەبوونی سنوورە فەرمییەکانی نێوان دەوڵەتان، هاتووچۆی ئازادانەی مرۆڤ و حەقیقەتی حکومەتەکانی پێش کۆلۆنیال لە ئەفریقیا بۆ بە هۆی فراوان بوونی دەسەڵات لە چوارچێوەیەکی سنووردارداو هەندێ لە پسپۆران زاراوەی (( دەوڵەتە ناهەژمونیکەکان))یان بۆ ئەم چەشنە



دەوڵەتانە بە کار هێناوە. بە کورتی، دەوڵەتانی ئەفریقیای پێش کۆلۆنیال چارەنووسێکی سیاسی بەهێزیان نەبوو. لە بەشی داهاتوودا بابەتی لە بیرۆکەی دەڵەتە ناهەژموونیکەکان دەکەین تا ببینین کە چۆن بووە بە هۆی بەهێز کردنی سروشتی حکومەتە کۆلۆنیالییەکان.

لە بەشی دەیەمیشدا، باس لەم بیرۆکەیە دەکرێت کە بۆچی وڵاتانی هاوچەرخی ئەفریقیا ناتوانن وەڵامدەرەوەی هەژموونێکی نوێ بن. یا خود چ فاکتەرگەلێك بوونە هۆی ڕووخان یاخود نزیك بوونەوەی لە ڕووخانی دەوڵەتانی ئەفریقیا لە دەیەی نۆیەمی سەدەی بیستەم و سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەم.

## خانەدان:

دووەمین ڕێڕەوی مێژوویی چەمکی خزمایەتییە. ئەم بیرۆکەیە هەڵقوولاوی بنەماڵە بەرفراوانەکانە. لە ڕووی مێژووییەوە، ڕیشەی گرووپە خزمایەتییەکان ڕابردووی (هاوبەشی) مێژوویی (ئەم گرووپانەیە) و ئەم جۆرە پەیوەندییانە کۆمەڵگاکان پێکەوە گرێ دەدەن و بەم جۆرەش پەرەستشی باو باپیران لە چەقی سوننەتە ڕۆحی و دەروونییەکانی ئەفریقیادایە.

لە ڕاستیدا پەیوەندیی وەچەیی زۆر جار بێ بایەخە، چونکە ئەم پەیوەندییانە لەنێوان ئەندامانی گرووپێکدا مەیلدار بوونی هەیە (واتە دەکرێ ئەم پەیوەندیە بگۆڕدرێت). دەکرێ کەسانی دەرەوەی گرووپ بێنە ناو خێڵەکاندا و دەکرێ هەندێ کەس لە گرووپێك لەگەڵ خێڵەکانیتریشدا هاوسەرگیری ئەنجام بدەن، بە گشتی بە تێپەر بوونی کات گرووپەکان لێك جیا دەبنەوە (زۆرتر بە هۆی شەڕ و کوچکردن). دامەزراوەکانی خانەدانەکان کە وەك ئامرازێك بە دەستیانەوە خاوەن پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەهێزن. پێویستە کە هەر کەسێك وەك ئەندامێکی گرووپ ملکەچی داب و نەریتی زۆردارەکی ژیان، هاوسەرگیری میراتی، دادپەروەری و خاوەن پشکی زەوی بێت.

گرووپەکانی خزمایەتی دەبنە هۆی هاوپەیوەندی (دابین کردنی) ئاسایش و خۆشگوزەرانی ئەندامەکان. کەواتە جۆرە پەیوەندییەکی دوو لایەنە لەنێوان ئەو سەرکردەکانی نەژادی کە بڕیارەکان دەردەکەن و ئەو کەسانەی کە ملکەچی ئەم بڕیارانەن دروست دەبێت. تەنانەت هەنوکەش ئەم پەیوەندییانە لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگاکانی ئەفریقیادا دەبینرێت. بە چەشنێك کە تاکەکان لەبری ئەوەی کە وەك ڕۆژئاوا خۆیان بە تەنیایی (تاکگەرا) بناسێنن، خۆیان سەربە

گرووپ و خانەدانێکی دیار دەزانن. لە بەشی سێیەمدا ڕێڕەوی مێژوویی نەریتی خانەدانەکانی پێش کۆلۆنیال روون دەکەینەوە.

لەم بەشە روون دەکرێتەوە کە چۆن چەمکی کۆمەڵگا لەسەر ئایدیۆلۆژیاکانی دوای کۆلۆنیال (بەتایبەت بەسەر سۆسیالیزمی ئەفریقیادا) کاریگەری هەبوو. لە بەشی چوارەمیشدا وەڵامی ئەم پرسیارە دەدرێتەوە کە چۆن پەیوەندییە بەهێزەکانی نەژادی لە پێکهاتنی ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی سەردەمی نوێ کاریگەری دەنوێنن.

## میراتی کۆلۆنیال:

ئەفریقیا پێش کۆلۆنیالی ئەوروپییەکان لە گوشەگیریەوە (انزوا) گەشەی نەکردووە. ئەم کیشوەرە وەك بەشەکانیتری جیهان، هەروەك مێژوو نیشانی دەدات ناچار بوو کە خۆی لەگەڵ یاساکانی پاشایەتیدا بگونجێنێت. هەروەك چۆن بەریتانیا قۆناغگەلێکی بوون بە ژێر دەستی رۆم و نۆرمەنەکانی بە خۆوە بینی، باکووری ئەفریقیاش، ئیمپراتوری ئێرانی، یۆنانی، رۆمی و عوسمانی بە خۆوە بینیوە. هەروەها ئەفریقیا لە ژێر کاریگەری ئایینی دابوو. لە سەرەتاکانی سەدەی هەشتەمدا، ئیسلام لە باکوورەوە تا زەریای ئەتلانتیك بەرەوپێشەوە چوو، لە کاتێکدا کە پێش ئەم مێژوویە مەسیحییەت لە سەدەی چوارەمەوە لە ئەسۆپیادا چەقی گرتبوو.

لە باشووردا، بیاوان ئاڵوگۆڕی کولتووری لەنێوان شوێنەکانیتری جیهان و ناوچەی ئۆستوای ئەفریقیای سنووردار دەکرد. بەڵام ئەفریقییەکانی خوارەوەی بیاوان تا سەدەی پازدەیەم وڵاتێکی بەهێزیان بنیاتنا و هێلی بازرگانی دەریایان لەگەڵ عەرەب و ئەوروپییەکان دامەزراند. لەم رووەوە گشت ئەم کیشوەرە پێش کۆلۆنیال چووە ناو ئابووری نێودەولەتیدا. لە ساڵی ١٤١٥پۆرتەگال لە کەنارکانی دەریای ناوەڕاستی ئەفریقیا لە سیۆتا، بنکەیەکی دامەزراند و دواتر چەندین بنکەی لە رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی کەنارکانی ئەم کیشوەرە دامەزراند. دواتر لە ساڵی ١٦٥٢دا، هولەندا کیپتاونی لە باشووری ئەم کیشوەرە دامەزراند. تا سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەم چەندین بنکەی بازەرگانی کردن لە کەنارکانی ئەفریقیا دامەزران، کە تیادا ئەوروپییەکان سەرقاڵی کڕینی زێڕ، شاخی فیل، کوێلە و کاڵاکان بوون و لەم سەروبەندەدا بانگهێشتکارانی مەسیحیش لەم کیشوەرەدا دەست بەکار بوون، بەڵام گشت ئەم بابەتانەش بە بێ کونتڕۆڵی راستەوخۆی سیاسی دامەزران ئەگەرچی ئەم بارودۆخە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا گۆڕانی بەسەردا هات.



باشترە وردەکاری پاڵنەرەکانی پەیوەست بە بابەتی ((هەوڵدان بۆ ئەفریقیا)) بە مێژووناسان بسپێرین، بەڵام ئەنجامەکانی ئەم رکابەرییە ئاشکرایە. لە کۆنفرانسی بەرلین لە ساڵی ١٨٨٤-٨٥ رێککەوتنگەلێك بە هۆی فاکتەرە ئابووری و ستراتیژیکی و کولتوورییەکانەوە گرێدرا و دواتر ئەفریقیا لەنێوان هێزە ئەوروپییەکاندا دابەشکرا. تەنیا ئیمپراتوری ئەسوپیا قەلەمڕەوی وڵاتی لیبریا (وڵاتی تازە دامەزراو بۆ کوێلە ئازاد کراوەکان) لەم دابەشکردنە رزگار بوو.

فەڕەنسا دەستی بەسەر باکووری رۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەفریقیادا گرت. بەریتانیا، داوای بەشێکی گەورەی رۆژئاوا، رۆژهەلات، ناوەڕاست و باشووری ئەفریقیای کرد. پۆرتەگال، قەلەمڕەوی ئەنگۆلا، موزامبیك، گینەی بیسائۆی داگیر کرد. کۆنگۆ بە لیو پۆلد پاشای بەلجیکیا بەخشرا. ئیتاڵیا لیبیا، ئەریترە و بەشێك لە سومالی خستە ژێر کونتڕۆڵی خۆیەوە. ئیسپانیاش ئەم کارەی لە باکووری مەراکش، بیاوان و گینەی ئیسپانیا ئەنجامدا. ئەڵمانیا ناوچەگەلێکی لە باشووری رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی ئەم کیشوەرە و کامیرون و تۆگلەندی بەدەست هێنا. شایانی ئاماژە پێکردنە کە ئەڵمانیا دەستکەوتەکانی بە هۆی شکست لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لەدەستدا. (کۆمەڵەی گەلان، وڵاتە داگیرکراوەکان لەلایەن ئەڵمانیاوە لەنێوان کۆلۆنیالکارەکانیتردا دابەش کرد).

سەرەڕای نەبوونی کۆلۆنیالی راستەقینە لە گشت پارچەکانی ئەفریقیا، دانیشتوانی سپی پێست تەنیا لە باشووری، رودزیایی باشوور (زیمبابوا)، کینیا، ئەفریقیای باشووری رۆژئاوا (نامیبیا) و ئەلجەزایردا نیشتەجێن و لە دەیەکانی سەدەی بیستەمدا یاساکانی ئیمپراتوری ئەرروپایی لەم شوێنانەدا جێبەجێ دەکران. ئەم قۆناغەی کۆلۆنیال (زۆرتر لە ساڵانی ١٨٨٠و١٨٩٠و ١٩٦٠) ئەگەرچی زۆری نەخایاند، بەڵام کاریگەریکانی بەسەر بەدواهاتەکانی ژینگەی سیاسی شایانی رەچاو کردن بوون.

دەکرێ دووبارە هێلە بەردەوامەکان لەنێوان رابردوو و ئێستادا وێنا بکەینەوە. حەفت فاکتۆری زۆرگرنگ لە میراتی کۆلۆنیادا بریتین لە: لکاندنی ئەفریقیا بە ستراکتۆری دەوڵەتی مۆدێڕنی نێودەوڵەتی، سەپاندنی سنوورە بە پێی رێککەوتنەکان، بەهێزکردنی دەوڵەتی ناهەرمونیك، پەیوەندی لاوازی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، بەهێزکردنی نوخبە حکومییەکانی ئەفریقیا، دامەزراندنی ستراکتۆری ئابووری پشتبەستراو بە هەناردەکردنی کاڵاگەلی تایبەت و نەبوونی دامەزراوەی سیاسی بەهێز کە هەر یەك لەم فاکتەرانە بە جیا خوێندنەوەیان بۆ دەکرێت.

## دەوڵەتە هاوچەرخەکان:

یەکێك لە ناودارترین میراتی کۆلۆنیال، دابەشکردنی ئەفریقیا بەسەر دەوڵەتانی هاوچەرخدا بوو. یاسای ئەوروپی لە ئەفریقیادا بوو بە هۆی کامڵبوونی ئەم پازەڵەی (جۆرە گەمەیەکی ئالۆزە) نێودەوڵەتی بە سەر هەرێمە سەربەخۆیەکاندا. ئەمەش بەو مانایەیە کە هەنوکە دەوڵەتانی جیهان (جیا لە جەمسەری باشوور) گشت وڵاتانی جیهانی پێکهێناوە. گشت ئەم دەوڵەتانە بە روونی سنوورەکانیان دیارکردووە یاخود بەلانیکەمەوە ئەم وڵاتانە لەهەمبەر دامەزراوەکانی دەوڵەتدا هەستی بەرپرسیارێتییان هەیە.

هەروەك باسکرا ئەفریقیای پێش کۆلۆنیال، کۆمەڵگاگەلی بێ دەوڵەتی جۆراجۆری لەخۆ گرت و تەنانەت لەو شوێنانەی کە دەوڵەت بوونی هەبووە، وێکچوونی کەمی لەگەڵ دەوڵەتانی هاوچەرخی هەبوو. سنوورەکانیش هەروەك دەستەڵات لە هەڵبەز و دابەزیندا بوون. هەڵبەت زۆرێك لە کۆمەڵگاکان ئەگەر دەسەڵاتێکی فراوانیان هەبوا، ئۆتۆنۆمییەکی بەرچوەیان پێ دەبەخشرا. لەم رووەوە ئەفریقییەکان پێشتریش حەقیقەتی دەوڵەتی ستەمکاریان بە خۆوە بینی بوو.

## سنوورە دەستکردەکان (رێککەوتنی):

سەپاندنی سنوورەکانی دەوڵەت لە قەلەمڕەوی ئەفریقیادا لەلایەن هێزە کۆلۆنیالکارەکانەوە بەدواهاتی گرنگی بۆ ئەو کیشوەرە هەبوو. گرفت لەم حەقیقەتەدایە کە کێشانی سنوورەکانی دەوڵەت لەگەڵ دابەشکردنەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی بەرقەراری قۆناغی پێش کۆلۆنیال هەماهەنگ نەبوون و سنوورەکان دەستکرد بوون. بەڵام دەستکرد نە بە مانای لە خۆڕاوە (صدفە) بەڵکو دەستکرد بەم هۆیەوە کە بەرژەوەندییە ئابووری و ستراتیژییەکانی زلهێزە کۆلۆنیالکارەکان بۆ ماوەیەکی کورت دابین بکات، نەك بۆ ئەوەی کە بەرژەوەندیی ئەفریقییەکانی نیشتەجێ لەم کۆمەڵگایانەدا دابین بکات.

چاو پێ خشانێکی خێرا بە نەخشەی هەنوکەی ئەفریقیا نیشان دەدات کە ئەم سنوورانە لەبری لۆژیکی ناوخۆیی بەپێی بەرژەوندیی دەرەکی داڕێژراون. زۆرێك لەم سنوورانە بە هێڵێکی راست و بە پێی پانی و درێژایی جوگرافیا کێشراونەتەوە. لە رووی مێژووییەوە لەم دابەشکردنانەدا بە دەگمەن داواکارییە کۆمەڵایەتییەکان رەچاوکراون. هەروەها لەم دابەشکردنانەدا (بابەتی) سەرسوڕهێنەرتر بوونی هەیە، بۆنموونە بۆچی لە باشووری رۆژئاوا

ئەفریقیا (سەر بە) ئەڵمانیا، نامبیا هەرێمێکی باریك لە هێلی کاپرڤیدا بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات کێشراوە؟ بۆچی ڕۆژئاوای ئەفریقیا وڵاتێکی بچووکی وەك نامبیای لەخۆ گرت؟ شێوەی نائاسایی نامبیا بە پێی خواستە ستراتیژییەکانی وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا، کونت ڤێن کاپرڤی کێشراوەتە و ئەو جەختی لەوە دەکردەوە کە ئەم ناوچەیە بۆ پرۆسەی سەربازی نۆچەکانی ئەڵمانیا پێویستی بە ڕووباری زامبزی هەیە. هۆی دامەزراندنی گامبیا بەرژەوەندیی بازرگانی بوو، بەریتانیا لە گەرووی ڕووباری گامبیا ناوچەیەکی بازرگانی دامەزراندبوو و، سەرەڕای داواکاریی فەڕەنسا حکومەتی بەریتانیا ئامادە نەبوو ئەم ناوچەیە بە فەڕەنسا بدات. لە ئەنجامدا گامبیا وەك وڵاتێکی بچووکی کەمتر لە ٥٠ کیلۆمەتری چوار گۆشە ڕووبەر لە ژێر گەماوی سێنگال، دامەزرا.

سەرەڕای بابەتە ئاماژە پێکراو پێویستە باس لە ناوچەی (کابیندا)ش بکەین. ئەم ناوچەیەی پڕ لە نەوت بەشێکە لە وڵاتی ئەنگۆلایە. خاکی کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ کابیندای لە ئەنگۆلای گەورە جیا کردەوە، چونکە لیۆ پۆلد پاشای بەلجیکیا پێداگری دەکرد کە پێویستە پاشایەتی ئەفریقیای بەلجیکیا بە زەریای ئەتلانتیك بگات. وەبیرهێنانەوەی ئەم خاڵە گرنگە کە ئەگەر سنووری دەوڵەتانی ئەفریقیا لەبری ئەوەی کە سنوورەکان دەستکرد و بە ڕێککەوتن بن بە پێی دابەشکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و بە سروشتی دیار کرابان، ئەم پشێوویە وەك حەقیقەتی ئەفریقیا، لە نەخشەی ئەفریقیادا نەدەکێشرانەوە. هەروەك چۆن سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتی بەریتانیا لورد سالزبۆری بە گاڵتەجارییەوە لە کۆنفرانسی ئەنگلۆ — فەڕەنسیدا لە ساڵی ١٨٩٠دا وتی" ئێمە لە کێشانی سنووری نەخشەکان لەو شوێنانەی کە دەستی هیچ سپی پێستێکی پێ نەگەیشتووە دەستتێوەردانمان هەبوو، ئێمە شاخ و ڕووبار و دەریاچەکان پێکەوە گرێماندا و تەنیا بە چەند خاڵێك ئاماژەمان پێ کردوون. تەنانەت خودی ئێمەش لە شوێنی ئەم شاخ و ڕووبار و دەریاچەیانە ئاگادار نەبووین". گاڵتەی سالزبۆری کە دوای خواردنی ئێوارە دەربڕی بوو، بوو بە حەقیقەت. لە ڕووی ئابوورییەوە زۆرێك لە سنوورەکان بێ مانا بوون. سنوورەکانی کۆڵۆنیال هەروەك لێکترازانی سنووری نێوان کۆمەڵگا و بازرگانی کردن، بۆ وڵاتانی ئەفریقیا گرفتی درێژخایەنی دروستکرد. لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەم بڕیارەکانی دەرچوو لە ناوەندی ئەوروپا بوو بەهۆی بێبەشکردنی ١٤ وڵاتی ئەفریقیا لە گەیشتن بە دەریای ئازاد. ئەم پرسەش، لەڕووی بازگانییەوە ئەم وڵاتانەی ڕووبەڕووی بارودۆخێکی سەخت کرد. ئەوان ناچار بوون بۆ هاوەردە و هەناردەکرن ملکەچی داواکارییەکانی وڵاتانی دراوسێ ببنەوە.



بۆ ئەو وڵاتانەی کە لە دەریا بێبەش ببوون هیچ شوێنێك لەم کیشوەرەدا، شوێنێکی ئەمن نەبوون.

سنوورە سەپێنراوەکانی کۆڵۆنیال چەندین وڵاتی لە سەرچاوە گرنگەکانی ئابووری بێبەش کرد. بەبێ بوونی کێڵگەی بەپیت، کان، کەرەستەی خاو و دانیشتوان، هیچ وڵاتیك ناتوانێ بەبێ ئەم بناغەی ئابوورییانە بەرگری و گەرەنتی داهاتووی بکات. بەبێ بوونی سەرچاوەکان پێویست نەدەکرا وڵاتانی ئەفریقیایی بەم چەشنە دابمەزرێن. بۆ نموونە نیجریا خاکی کەمی بۆ کشتوکاڵ هەیە و کێڵگەکانیشی لە ئەنجامی نوشستی کانەکانەوە دروست بوونە. بەم جۆرەش ئەم وڵاتە بۆ وچانەوەی ئابووری ڕووبەڕووی چەندین گرفت بووەتەوە. سەرەڕای لەمپەرە ئابوورییەکان سنوورە دەستکردەکانیش تێکەڵی کێشەی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوونەتەوە. سنوورەکانی کۆڵۆنیال لە یەکەی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا درێژ بوونەتەوە و دابەش بوونی کومەڵگا لەنێوان دەوڵەت و هێزی کۆڵۆنیالی لێ کەوتەوە. هەندێ لە هێماکانی سیاسی قۆناغی پێش کۆڵۆنیال هەر وەك خۆیان ماونەتەوە. سنوورەکانی ڕواندا، بۆرندی سوازیلەند پشت بەستراو بە حەقیقەتەکانی پێش کۆڵۆنیالن، بەڵام ئەم جۆرە سنوورانە دەگمەنن. بۆ نموونە پاشایەتی سومالی لەنێوان پێنج وڵاتی خاوەن ئۆتۆنۆمی دابەش کراوە و سومالی بەسەر وڵاتانی سومالی لاند، سومالی فەڕەنسا، ئەسیۆپا و کینیا دابەشکرا. هەروەها سنوورەکانی بۆرکینافاسۆ لەنێوان قەلەمڕەوی ٢١ گرووپی کولتووری و زمانی جیاواز دەرباز بووە. لەم ڕووەوە یاسای کۆڵۆنیال سنوورەکانی ئەفریقیا نامرۆیی کرد. شکیتی سنوورە سەپێنراوەکان لە دانپێنان بەم دابەشکردنە دوو گرفتی بۆ حکومەتەکانی دوای کۆڵۆنیال دروستکرد. یەکەم، ئەگەری وەرگرتنەوەی خاکی (وڵاتێك لەلایەن وڵاتێکیترەوە) لە ئارادا بوو. ئەم وەرگرتنەوەیەش واتە مەیلی یەکگرتنی (گەل) لەژێر ئاڵای ولاتێك کە بۆ چەند پارچە دابەشکراوە. یەکەیەکی سیاسی پێش کۆڵۆنیال کە بەسەر دوو وڵاتدا دابەشکرابوو، ئەم مەترسییەی لێ دەکەوتەوە کە لە دوای سەربەخۆیی لە پێناو دووبارە یەك گرتنەوە توندوتیژی بەکار بهێنرێت. بۆ نموونە لە هەفتاکاندا سومالی بۆ داگیرکردنی ئۆگادان کە خێڵە سوکالیەکان تیایدا نیشتەجێ بوون، لەگەڵ ئەسیۆپیا شەڕی هەڵگیرساند و جکومەتی مۆگادیشۆ دوای نیشتەجێ کردنی گشت گەلی سومالی لە سنوورەکانیدا بوو بە وڵاتێکی خاوەن سەروەریی.

دووەمین گرفت، ئەگەری هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی نەژادی بوو. سنوورەکانی کۆڵۆنیال نە تەنیا گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی لێك جیا کردبوو، بەڵکو ئەم گرووپانەی خستبوو ناو وڵاتانی

خاوەن نەتەوەی نویّ. بۆ نموونە زۆرتر لە ٢٠٠ گرووپی نەژادی لە تانزانیا نیشتەجێن. بۆیە دەوڵەتانی دوای کۆڵۆنیال ناچار بوون دامەزراوە و پرۆسەی سیاسی بنیات بنێن کە گەرەنتی چارەسەری ناکۆکییەکانی دانیشتووە دابەشکراوەکان بە ئاشتیخوازانە بکات. چۆنێتی سەرکەوتنی حکومەتەکان لە بەڕێوەبردنی خێڵەکان لە چوارچێوەی سنوورە دەستکردەکاندا، لە بەشی سێیەم و چوارەم کە سەبارەت بە ناسیۆنالیزم و نەژادگەرایی لە ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیالە، باس لەم بابەتە دەکرێت.

## بەهێزکردنی دەوڵەتی ناهەژموونیك:

هەروەك داڕێشتنی سنوورە دەستکردەکان، کۆڵۆنیالکارنی ئەورووپی سروشتی ناهەژمونیکی دەوڵەتی ئەفریقییان بەهێزکرد. تەنیا لە ئەفریقیای باشووردا رودزیای باشوور (زیمبابوە)، کینیا، ئەفریقیای باشووری رۆژئاوا (نامبیا) و ئەلجەزایر داواکاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی مۆدێرن بوون کە لە دەرونی هەر یەك لەم ناوچانەدا دانیشتوانێکی بەرچاو دەژیان. لە بەشەکانیتری کیشوەری ئەفریقیا هێزە کۆڵۆنیالکارەکان ئامانجگەلی سنووردارییان هەبوو و هیچ مەیلەك بۆ سەرمایەگوزاری لەسەر سەرچاوەکان لە پێناو گەرەنتیکردنی ئەوەی کە دەوڵەتی (کۆڵۆنیالکار) بتوانێت دەسەڵاتی بەسەر گشت کۆڵۆنە نوێیەکاندا بسەپێنیت بوونی نەبوو. زیاد لەمەش ئەوان زۆرتر جەختیان لەسەر گرنگی ئابووری و ستراتیژیکی ناوچەکە دەکردەوە. چونکە ستراکتۆرگەلی بەرتەسك لەم ولاّتانەدا دامەزراوە کە تەنیا لەلایەن گرووپێکی بچووکی سپی پێست و سەربازەکان پشتگیریی لیّ دەکرا. بەڵام حکومەتەکانی کۆڵۆنیالکار هەوڵیان نەدا بۆ پراکتێکی کردنی تیۆرییەکانی (بەمەدەنیکردن) و (یەکپارچەیی) لەم ولاّتانەدا و ئەم شێوازەی کۆڵۆنیالکاریش سادەترین شێواز بوو و هیچ پلانێکی درێژخایان بۆ گەشەی ئابووری و سیاسی کۆڵۆنەکان دانەرێژران. هەروەها سەرەڕای کاریگەری بەرفراوانی ئەم قۆناغی کۆڵۆنیالکاری ئەورووپییەکان بەسەر گەشەی سیاسی ئەفریقیادا، کاریگەرییە راستەقینەکان بەسەر دەوڵەتدا لاوازبوو. کەمی توانایی دەولەت هەروەك لە بەشی شەشەم و دەیەمدا روون دەکرێتەوە میراتێکە کە دەوڵەتانی دوای کۆڵۆنیال بەسەختی دەتوانن بەسەریدا زاڵ بن.



## پەیوەندی لاوازی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی:

یەکێك لە دەرئەنجامەکانی دەستڕۆیی دەوڵەت پەیوەندی لاوازی نێوان دەولەت و کۆمەڵگای مەدەنییە کە بۆ ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیال بەمیرات ماوەتەوە. دەسەڵاتی سیاسی کۆڵۆنیالکاران لەم کیشوەردا لە ئەنجامی هەوڵدان و سەپاندنی دامەزراوە سیاسییەکان بەدەست هاتووە. توندوتیژیش وەك جێگرەوەی مەشروعیەت بووە و لەم رەوشەی دەوڵەت هیچ کاتێك وەك هەوێنی کۆمەڵایەتی نێوان حکومەت و گەل کاری نەکردووە. هەروەها دامەزراوەکانی کۆڵۆنیال لەهەمبەر خەڵکی ئەفریقیادا کە فەرمانڕەوایی بەسەریاندا دەکرد، وەڵامدەرەوە نەبوو. زیاد لەمەش ئەوان پەیڕەوی لەو بڕیارانەیان دەکرد کە فەرمانڕواکانیان لە پایتەختە ئەورووپییەکانەوە دەریان دەکرد. لە ئەنجامدا ئەرکی حکومەتەکان پاراستنی دیسپلێن، هاوسەنگی بوودجە و چاودێری کردنی کەرەستەی خاو بۆ هەناردەکردن بوو و هیچ چاودێریەك بۆ تەرخانکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان بۆ هاولاّتیان لە ئارادا نەبوو. لە ئەنجامی ئەم تایبەتمەندییەش کراوفۆرد یونگ، دەولەتی کۆڵۆنیال بە (دەوڵەتی) "تەواو بێگانە" ناو دەبات . بەڵام لە دەوڵەتەکانی هاوچەرخی ئەورووپا، پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی تەواو گەشەی کردووە و بەهێزە. لێرەدا دەوڵەت گەشەی کردووە و لە رێگەی کۆمەڵگاوە دامەزراوە. بە درێژای سەدەکان ئەندامانێك لە کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ پاشایەتی و ئیمپراتۆرییەکاندا رکابەرێتی کردووە و بەم جۆرەش سەرەتا وەك چینی مامناوەندی سەریان هەڵدا و دواتر وەك چینی کرێکار دەسەڵاتیان گرتەدەست. دواجار هەر گرووپێك لە پێکهێنانی دامەزراوەکانی دەوڵەت کە لە داواکارییەکانیاندا بەرجەستە دەبووە، سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. ئەمڕۆکە رەگی بیرۆکەی دیموکراسی بۆ پەیوەندی نێوان دەولەت و کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵە دابەشکردنێکی خزمەتگوزارییە گشتییەکان دەگرێتەوە. ئەم پرسە لە ئەفریقیادا واتە شوێنێك کە دەوڵەتی مۆدێرن یەکسەر سەری هەڵداوە سروشتی لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنی خۆجێیی وێکچوونی کەمی هەبوو، تەواو جیاوازە. ئەفریقییەکان بە سادەیی نوێنەرایەتی پەیوەندی نێوان حکومەت و گەل پشتگوێ دەخەن. لەئەنجامدا هیچ جۆرە متمانە و بەها سیاسییەکانی هاوبەش لەنێوان فەرمانڕەوا و هاولاّتیاندا بوونی نابێت. دامەزراوەکانی دەوڵەتیش هیچ کاتێك بۆ بەدەست هێنانی متمانەی گەل هەوڵ نادەن. ئەم بارودۆخەش داهاتوویەکی باشی بۆ هەڵسوکەوتی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا لە ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیالدا نابێت لە بەشی شەشەمدا باس لە چۆنیەتی سنووردارکردنی پاشای چالاکی سیاسی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا دەکەین.

بەشی دەیەمیش خوێندنەوەی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە گۆشە نیگای جیاوازەوە لەخۆ دەگرێت. لەم بەشەدا روون دەکرێتەوە کە چۆن لە دەیەی هەشتەم و نۆیەمدا، کۆمەڵگای مەدەنی لە دەوڵەتە دەسەڵاتخواز و کۆڵۆنیالکارەکان تۆڵەی سەندەوە.

## سەرهەڵدانی نوخبەکانی دەوڵەت:

ئەگەرچی دەوڵەتانی کۆڵۆنیالکار مەیلیان بۆ خۆدوورخستنەوە لە پرسەکانی ئەفریقیا هەبوو، بەڵام (بوونی) پەیوەندییەکی کەم بە پێویست دەزانرا بەهەرحال "هێڵە لاوازە سپییەکانی" دامەزراوە کۆڵۆنیالییەکان نەیاندەتوانی بەتەنیایی گشت پرۆسە کارگێڕییەکانی دەوڵەت لەئەستۆ بگرن. بوونی ژمارەیەك ئەفریقیایی بۆ پاراستنی دامەزراوەکانی ئیمپریالیستی لەنێوان خەڵکدا بە پێویست دەزانرا و ئەمەش بوو بە هۆی سەرهەڵدانی نوخبە خۆجێییەکان لە کۆلۆنەکاندا. ئەم نوخبانەش کە لەم رێگەیەوە دەستیان بە بەرژەوەندییەکان دام و دزگاکان گەیشت، دەبوایا بەرەنگاری چالاکییە رزگاریخوازەکان ببنەوە و یەکەمین حکومەتی دوای کۆلۆنیال دابمەزرێنن.

وەك پێویست، فەرمانڕەواکانی کۆلۆنیال، سەرکردە سوننەتییەکان وەك ناوبژیوانی (نێوان خەڵك) و ئیمپریالیزم دەستنیشانکرد و ئەو سەرکردە و پاشایانەی کە لەنێوان خەڵکدا خاوەن دەسەلات بوون، بوون بە بەرپرسی زیادکردنی باج، بەکارخستنی هێزی کار و گەرەنتی کردنی یاسا و رێساکان کە دەبوایا رێزیان لێ بگیردرێت. لەبری ئەمەشدا ئەم ناوبژیوانانە خوازیار بوون کە دەسەڵاتی دەوڵەت بگرنە دەست و پشتگیری لە سەرکردایەتی و بەرژەوەندیی سەرکردەکانیان لە رێگەی باج وەرگرتنەوە بکەن. بۆنموونە، کارگێڕەکان لە سەرکردەکانیان داواکار بوون کە لە داهاتی باجە زیاد کراوەکان یاخود غەرامە سەپێنراوەکان، رێژەیەك بۆ ئەوان بێت. ئەم سەرکردە سوونەتییانەش ئەم توانایییەیان هەبوو کە تا رادەیەك یاساکان بە پێی بۆچوونی خۆیان بە مەرجێك کە زیانی بۆ بەرژەوەندیی کۆلۆنیالکارەکان نەبێت جێبەجێ بکەن و ئەم شێوازەی کۆلۆنیالکاریش کەم خەرجی بوو. شایانی ئاماژە پێدانە کە نوخبە حکومییەکان تەنیا لە سەرکردە سونەتیەکان لە خۆ نەدەگرت بەڵکو بە تێپەر بوونی کات، نوخبە گەنجەکانی ئەفریقیاش هاتنە ناو گۆڕپاندا. ئەم کەسانە پێگەیان لە ئەنجامی هام وشۆ کردنی دەسەڵاتی دەوڵەت بەدەستیان هێناوە بەڵام چاوگەی مۆبیلیزەکردنیان سیاسی یان دەسەڵاتی تەقلیدی نەبوو. چاوگەی سەرکی مۆبیلیزەکردنیان خوێندەواری بوو و خوێندەواریش (زۆرتر لە



قوتابخانەکانی میسیۆنێریدا) دەست گەیشتنی ئەم کەسانەی بەدەوڵەت ئاسان کرد. ئەم (نوخبە ـ سەرەتاییانە) لە پۆستەکانی ئاستی خوارووی حکومەت وەك پارێزەر و پزیشك کاریان دەکرد. بەم جۆرەش دەست گەیشتنێکی رێژەییان بە ماف و خزمەتگوزارییەکان پەیداکرد و لە کۆمەڵگا شارییەکان (بە رۆژئاوایی کراو) بەشدارییان دەکرد. هەرچەند نزیکی کۆتایی هاتنی حکومەتی کۆلۆنیال دەبینەوە حکومەتە کۆلۆنیالییەکان هەوڵیان دەدا خزمەتگوزارییەکانی شار بە ئەفریقییەکان بسپێرن. بەم جۆرەش ژمارەی ئەندامانی چینی بۆرۆکرات زۆری کرد و ژمارەی پسپۆڕەکانی گوماردراو لەلایەن حکومەتەوە زیادی کرد. لە راستیدا حکومەتی کۆلۆنیال، خودی خۆیان کاربەدەستانی کارگێڕییان دروست کرد. تا دەیەی پێنجەم، هێزگەلی نەتەوەگەرا بەرەنگاری دەوڵەتە کۆلۆنیالکارەکان بوونەوە و ئەم بزاڤانەش لەلایەن ئەو کەسانەوە کە لە ژێر (دەسەڵاتی) حکومەتی کۆلۆنیالدا، پێشکەوتوو بوون سەرکردایەتی دەکرا. سیاسەتەکانی ناسیۆنالیستی لەنێوان نوخبەکانی شاردا بەخێرایی پەرەی سەند. بۆ نموونە دەکرێ ئاماژە بە کۆنگرەی گەلی ئۆگاندا بکەین کە لەساڵی ١٩٥٢دا کۆمیتەی ناوەندی ئەم کۆنگرەیە لە ٥ دوکاندار، ٤ رۆژنامەنووس، ٣ سیاسەتمەدار، ٢ فەرمانبەر، ٢ پارێزەر، ٢ مامۆستا و خوێندکارێکی خەریکی خوێندن لە دەرەوە پێکهاتبوو.

ناسیۆنالیزم لەلایەن وەرزێرانی سەرتاسەری وڵات پشتگیریی دەکرا. بەڵام ناتوانین گشتاندنی ئەم بابەتە بۆ سەر گشت کۆمەڵگادا بکەین، کە وەکو کۆمەڵێك داوای سەربەخۆییان دەکرد. بەڵکو ئەمە خودی حکومەتی کۆلۆنیال بوو کە دەسەڵاتی بە خوێندەوارانی ئەفریقیا سپارد. ئەوان ئەندامانێك لە کۆمەڵگای ئەفریقیا بوون کە پەیوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ حکومەتی کۆلۆنیالی هەبوو، کە لەلایەن ئەم حکومەتەوە لە پۆستە پێشووەکەیان دەرکرابوون. فەرمانبەران، مامۆستایان و پارێزەران، دامەزراوەکانی حکومەتیان داگیرکرد. لە بەشی پێنجەمدا باس لە کاریگەری چینی کۆمەڵایەتی سیاسی ئەفریقیا و ئەنجامەکانی دەست گەیشتنی ئەم نوخبانە بە حکومەت دەکەین.

## میراتی ئابووری:

لەنێوان گشت رەگەزە بەجێماوەکانی میراتی کۆلۆنیالی ئەفریقیا، میراتی ئابووری لەنێوان ئەفریقییەکاندا زۆر مشتومڕی لەسەر دەکرێت. وێنەی تەواو ئاشکرای مێژووی هاوچەرخی ئەفریقیا، هەڵقوولاوی کارکردی لاوازی ئابووری ئەم کیشوەرە بووە. پشتگوێ خستنی پلانی

ئابووری و بە گشتی پشتگوێ خستنی گشت پلان و پێشبینییەکانی سەبارەت بەم کیشوەرە بوو بە هۆی شکست هێنانی ئەم کیشوەرە لە "پلانی بەرەو ژوورەوە چوون" (صعود) لە دوای سەربەخۆییدا. لە چەندین بابەتدا سەرەڕای گەشەسەندنی ئابووری کە ئامانجی سەرەکی دەوڵەت و لە ئەولەوییەتەکان هەژمار دەکرا، بارودۆخی دەوڵەتانی ئەفریقیا لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا خراپتر لە سەردەمی دژە کۆلۆنیالی لە دەیەی شەشەم بوو.

قوتابخانەیەکی هزری کە لە هەفتاکان و سەرەتای هەشتاکاندا لە سەرووی قوتابخانەکاندا وەستا، بە راستەوخۆ میراتی کۆلۆنیالی بە هۆکاری دواکەوتوویی ئەم کیشوەرە دەزانی. لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە لەو بڕوایەدا بوون کە ئەم کیشوەرە سیستەماتیکانە بە هۆی بەرژەوەندیی کۆلۆنیالی دواکەوتوو کراوە و دەوڵەتە تازە سەربەخۆکان لە بارودۆخی وابەستەیی (التبعیة)دان. هەر بۆیەش بەڕێوبەرانی کۆلۆنیالکار لە فەراهەمکردنی بناغە سەرەکییەکانی حکومەت کە هەنوکە بۆ گەشەی خێرای ئەم کیشوەرە پێویستە، شکستیان هێنا. توێژینەوەکانی قوتابخانەی گەشەنەسەدن بۆ لێکۆڵینەوە سوودمەندن. ئەم توێژینەوانە بە راشکاوی گرفتەکانی ستراکتۆری هەنوکەیی کە رەگی بۆ حکومەتی کۆلۆنیال دەگەڕێتەوە، دەخەنەڕوو. لە حالی حازردا لێکۆڵینەوەکانی ئاکادیمیك باس لە فاکتەرگەلی جۆراوجۆر بۆ ئەم شکستەی ئابووری دەکەن و فاکتەرگەلی فراوانیان وەك فاکتەری سەرەکی ئەم شکستە دەخەنەڕوو. ئەگەرچی ئەفریقییەکان لە رابردوودا چەوسێنراونەتەوە و لە کاتی سەربەخۆییدا رووبەڕووی ئابووری لاواز بوونەتەوە، بەڵام رزگار بوون لەم بارودۆخە نامومکین نییە. رێك بە هەمان ئەندازەی کۆلۆنیالکارە پێشوویەکان، سیاستمەدار و کاربەدەستانی حکومەتەکانی دوای سەربەخۆیی کیشوەری ئەفریقیا، لە شکستی ئابووری ئەم کیشوەرە پشکدارن.

خاڵی سەرەکی لە قوتابخانەی گەشەنەسەدندا ئەوەیە کە گشت دەوڵەتان لە سیستەمێکی جیهانیدان و وەك یەك هەڵسوکەوت دەکەن و ئەم پرۆسەیەش بەدرێژای چوار سەدەی رابردوو بە خێرایی پەرەی سەندووە و سەرمایەداری بەرەبەرە وەك شێوازی باڵادەست لە ئاڵوگۆرکردن و بەرهەمهێنانی بازرگانیدا زال بووە. ئەگەرچی گشت وڵاتەکان لەم سیستەمەدا یەکسان نین، وڵاتان لەم سیستەمەدا بۆ سەر دوو گرووپ دابەش دەبن. ئەو وڵاتانەی گەشەیان کردووە و لە ناوەنددان (وڵاتە ئەورووپییەکان)، وڵاتانی کەمتر گەشەسەندوو کە لە پەراوێزدان (وڵاتانی جیهانی سێیەم). جیاوازی نێوان سامانی ناوەند و پەراوێزدا، بۆ جیاوازی لە شێوازەکانی پەیڕەویکراوی رۆژئاوا و جیهانی سێیەم ناگەڕێتەوە. بەڵکو ئەم دووانە بەرهەمی یەك پرۆسەن



واتە گەشەسەندنی ناوەند لەسەر تێچوونی (کلفة) پەراوێز. ئەو پێشکەوتن و خۆشگوزەرانییەی کە هەنوکە رۆژئاوا بەخۆوە دەبینێ، هەڵقوولاوی کۆلۆنیالکردنی سەرچاوەکانی وڵاتانی پەراوێز کراوە. کەواتە گەشەسەندن و گەشەنەسەندن دوو رووی یەك دراون. چالاکی ئابووری (لە ئەفریقیادا) کە دەکرا یارمەتیدەری گەشەسەندنی ئابووری بێت بوو بە هۆی پێشکەوتنی رۆژئاوا. حکومەتە ئیمپریالیستییەکان شێوەی فەرمی دەسەڵاتی سیاسییە کە بووە بەهۆی چەوساندنەوەی هێزی کار. دەکرێ باس لە نموونەی فراوان لە گەشەنەسەدن بکەین کە هەڵقوولاوی ئەم پرۆسەیەن. بەرچاوترین ئەم نموونانە بریتین لە، چەوساندنەوەی هێزی کار، چوونی سەرمایە لە وڵاتانی پەراوێزە و بۆ وڵاتانی ناوەند، شکست هێنانی دەوڵەتە کۆلۆنیالکارەکان لە جۆراوجۆر کردنی ئابووری خۆجێیی. بە خوێندنەوەی بابەتی چەوساندنەوەی هێزی کار، هەر لە سەرەتاوە بۆمان دەردەکەوێت کە رۆژئاوا تەنانەت پێش دامەزراندنی حکومەتی کۆلۆنیالی بە رێژەیەکی بەرفراوان هێزی کاری ئەفریقیای دەچەوساندەوە. بازرگانی کردن بە کۆیلە کە لە زەریای ئەتلانتیکەوە دەستی پێکرد ١٥ ملیون کەسی لەخۆ گرت کە بۆ کارکردن لە کێڵگە گەورەکانی کارائیب و ئەمریکا گوازرانەوە و زۆربەشیان لە کاتی دەستگیر کردن و گواستنەوە گیانیان لەدەستدا. بازرگانە عەرەب و پۆرتۆگالییەکانیش سەرقاڵی بازرگانیکردن بە مرۆڤ لە کەنارکانی رۆژهەڵاتی ئەم کیشوەرە بوون. ئەنجامی ئەم پرۆسەیە چاوەڕوانکراو نەبوو. دانیشتوانی هەندێ ناوچەی ئەم کیشوەرە زۆر کەم بوونەوە، کەسانێك کە کارەکەیان دەبوو بە هۆی گەشەسەندنی ئابووری و کۆمەلایەتی، ناچار کران لە شوێنەکانیتردا بەشداری لە کەڵەکەکردنی سەرمایە بکەن. ئەورووپی و عەرەبەکان بە دزینی هێزی کاری ئەفریقیا بوونە هۆی گەشە نەسەدنی ئەم کیشوەرە.

چەوساندنەوەی هێزی کار لە سەردەمی کۆلۆنیالکاریشدا بەفەرمی بەردەوامی هەبوو. کاتێك کە بۆ فەرمانڕەوا کۆلۆنیالکارەکان دەرکەوت کە زۆربەی (ناوچەکانی) ئەفریقیا (جیا لە ئەفریقیای باشوور) هەروەك باشووری ئەمریکا بۆ ئیمپراتوری ئیسپانیا وڵاتی پڕ لە زێر نییە، بڕیاریاندا بۆ چەوساندنەوەی سەرچاوەی ناوچەکانیتری ئەم کیشوەرە.

ئامانجی سەرەکی هێزی کاری ئەفریقیا بوو. یاساکانی کۆلۆنیال و سیستەمی باجدان بە مەبەستی دەرکردنی جووتیاران لە کێڵگەکانی کشتوکاڵی و بەکارهێنانیان لە کان (معدن)، کێڵگە بازرگانییەکانی گەورە، چاندنی دانەوێلە بۆ هەناردەکردن بۆ رۆژئاوا، داڕێژران. هێزە چەوسێنەرەکان، بە کرێکارانی ئەفریقیای، حەقدەستی وەك کرێکارانی ئەورووپییان نەدەدا و

ئەمەش بوو بەهۆی دروستکردنی درزی گەورە لە ژیانی ئەم کرێکارانەدا، چونکە بە کرێکارێکی ئەفریقیایی حەقدەستێکی کەمتر لە پێداویستییە رۆژانەیی و سەرەکییەکانی ژیانی دەدرا. ئەم پرسەش کرێکارانی ناچار بە سوودوەرگرتن لە کاڵا و سەرچاوەکانیتر (وەك بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی جێگیرەوە) کرد. لە هەندێ ناوچەی ئەفریقیادا کە هێزی کرێکاری خۆبەخش بوونی نەبوو، هێزی کاری زۆرەکی (اجباری) پێکهێنرا. بۆ نموونە لە کۆنگۆ و موزامبیك، ئەفریقییەکان لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ ماوەی یەك ساڵ، کاریان پێ دەکرا یاخود دەکەوتنە ژێر لێپێچینەوەدا. دانی حەقدەست بە کرێکارانی ئەفریقیایی لە قۆناغی کۆلۆنیالدا مومکین بوو ببێتە هۆی کەلەکە بوونی (سەرمایەی) خۆجێیی بۆ حکومەتەکانی دوای کۆلۆنیال و بارودۆخی ئابووریش باشتر ببێتەوە.

هەروەها گەشەنەکردن لە ئەنجامی هەناردەکردنی زیادەی بەرهەمهێنان بوو. لەبری سوودمەند بوونی ئەفریقییەکان لە چالاکییە نوێیە ئابوورییەکانی ئەم کیشوەرە، کەرەستە خاوەکان بە رێژەیەکی زۆر دەردەهێنران (استخراج) و سوودیشی زۆر بوو. بەم جۆرەش هێزی کاری ئەفریقیا بە مەبەستی گەشە پێدان بە ئابووری رۆژئاوا، لە (وڵاتە) پەراوێز خراوەکان دوور بوونەوە. بۆ گەشەسەندی ئابوور لە هەر شوێنێکی جیهاندا نەتەنیا زیادبوونی سەرمایە پێویستە بەڵکو دەبێت ئەم سەرمایەیە بۆ بەرهەمهێنان بخرێتەگەر. دووبارە سەرمایە گوزاریکردنەوە لە سەرچاوەکاندا لە ئابووری ئەفریقیادا، دەتوانرا ببێتە هۆی گەشەسەندنی ناوخۆی ئەفریقیا. بەڵام رۆژئاوا ئەم زیادەیەی بۆ خۆی تەرخانکرد. کەواتە لەخۆرا نییە کە ئابوورەکانی رۆژئاوا بە پێوەرێکی بێ وێنە لە سەردەمی کۆلۆنیالدا بووژاوەنەوە. هەروەها گەشەنەسەدن، هەڵقوولاوی بەرهەمهێنانی کەرستەی خاوەی (کان و کشتوکاڵ ) ئەم کیشوەرە بوو. حکومەتە کۆلۆنیالییەکان دڵنیا بوون کە زۆربەی ئابوورە پەراوێزخراوەکان بۆ ئابووری هەناردەکار دەگۆڕدرێن (کان، قاوە، چا، کاکاو، رۆنی رووەك، باوی، پۆمە و...) بەم جۆرەش زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا لە سەردەمی سەربەخۆییدا رووبەڕووی گرفتی "ئابووری تاك بەرهەمی" بوونەوە. بۆ نموونە لە زامبیا ئابووری وڵات پشتبەستراو بە دەرهێنانی مس بوو. لە کاتێکدا کە غانا، پشتبەستراو بە کاکاو بوو. ئەگەر نرخی ئەم کاڵایانە لە بازاڕەکانی جیهاندا دادەبەزی هیچ کەرتێکیتر لە وڵاتدا بوونی نەبوو کە بتوانرێ پشتی پێ ببەسترێت، بەم جۆرەش زنجیرەیەك لە قەیرانی حەقدەست دروست بوو. ئەگەر فەرمانڕەواکانی کۆلۆنیالکار برەویان بە هەندێ کەرتی ئابوور وەك بەرهەمهێنانی خۆراك و کارگە پیشەسازییەکانی



بەرهەمهێنانی کاڵا بەکارهاتووەکان (مستعمل)دا، بەم هۆیەوە بوو کە دەبوایا ئابووری ئەفریقیا لە دوای کۆلۆنیال کەمتر پسپۆریتی تیایدا بێت و بەم جۆرەش کەمتر لەرزۆك بێت. دامەزراوە کارگێڕییەکانی کۆلۆنیالی زۆرتر بەسەر پێداویستییە پیشەسازییەکانی رۆژئاوا چەقیان گرتبوو. ئەوان هیچ بەرژەوەندییەکیان لە ئابووری یەکپارچە و بەهێزی وڵاتانی پەراوێزکراودا نەبوو. ئەولەوییەتە دەرەکییەکانی ئابووری ئەفریقیا، هۆگری ئەو سەرمایەگوزارییانە بوون کە فرمانڕەواکانی کۆلۆنیال لە ولاتەکانیاندا، ئەنجامیاندەدا. بۆ نموونە ژێر خانەکانی گواستنەوە و گەیاندن تەنیا لەو ناوچانەدا دروست دەکران کە کاڵاکان تیایدا بەرهەم دەهێنران و بە بەندەر گرێ دەدرا. تا لەم رێگەیەوە کاڵاکان بۆ رۆژئاوا هەناردە بکرێن. بەم جۆرەش هێڵی گواستنەوەی کەم بۆ پێکەوە گرێدان و بەهێزکردنی بازرگانانە ناوخۆ یاخود پێکەوە گرێدانی ناوچەکان دروستکراوە. بۆیە بازرگانەکانی ئەمرۆی ئەفریقیا پشتبەستراو بە رۆژئاوان. بۆ نموونە لە کەناری عاجدا بازرگانەکان لەبری ئەوەی کە لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ وەك غانا پەیوەندیان هەبێت، زۆرتر لەگەڵ فەرەنسا پەیوەندییان هەیە. سەرمایەگوزارییەکی کەمیش لەسەر هێزی مرۆیی ئەنجامدرا. هەروەك دیڤید لامب دەڵێت" دوای ٣٠ ساڵ حوکمڕانی پۆرتۆگال لە گینەی بیسائۆ، ئیمپریالیزم تەنیا ١٤ دەرچووی زانکۆی لە پاش خۆی بەجێ هێشت. رێژەی نەخوێندەواری لەم وڵاتەدا ٩٧٪ بوو و تەنیا ٢٦٥ مایل رێگا و بانی قیرتاو، یەك کارگە (کارگەی بەرهەمهێنانی مەشروبات بۆ سەربازانی پۆرتوگالی) لەم وڵاتەدا هەیە. پشکێکی گەورەی سوودەکان کە لە ئەفریقیا بەرهەم دەهێنران ئەگەر لەلایەن ئابووری ناوخۆوە سەرمایەگوزاری کرابا، ئابوورێکی ساغلەمتر بۆ حکومەتەکانی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال بە میرات دەماوە.

ئەگەرچی توێژینەوە نوێیەکانی زانکۆ رەخنەی جیدییان ئاراستەی تیۆرییەکانی گەشە نەسەندن کردووە، بەڵام زۆربەی زانایان لەم بڕوایەدان کە چەوساندنەوە و تاڵان لەمپەر بوونە بۆ گەشە نەکردنی ئەم وڵاتانە. بەڵام ئەزموونی ئابووری کۆلۆنیال بە تەواوەتی بۆ وڵاتانی جیهانی سێیەم نگەتیڤ نەبوو.

بۆ نموونە کیشوەری ئەفریقیا لە پێش کۆلۆنیال لە دەسپێکی ئابووری روو لە بووژانەوەدا نەبوو. چڕی دانیشتوان نەگۆڕ بوو و هیچ جۆرە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیایی نزیك مەودا لە ئارادا نەبوو. ئامرازەکانی کشتوکاڵی و جووتکردنی کێڵگە بەکار نەدەهێنران، کەمی زەوی، ئاو و کارەبا لەم کیشوەرەدا گرفتێکی سەرەکی بوو و لەم وڵاتەدا کشتوکاڵ بە شێوازی میکانیکی بە

پێویست نەدەزانرا. بیل وارن باس لەوە دەکات کە کۆڵۆنیال وەك پێشەنگی سەرمایەداریی ناچار بوو درزی نێوان جیهانی پێشکەوتوو و جیهانی سێیەم پڕ بکاتەوە. لەوانەیە حکومەتی کۆڵۆنیال لەمپەری زۆری بەسەر ئەم وڵاتانەدا سەپاندبێت، بەڵام تەکنیکی ئابووری پێشکەوتوو، خزمەتگوزاری تەندروستی باشتر و ئەزموونی پەروەردەی بۆ ئەم کیشوەرە بەدیهێنا. وارن باس دەکات کە دوای سەربەخۆیی هێماگەلێك لە کەمبوونی ڕێژەی مردنی منداڵان و ئومێد بە ژیان دەبینرێت. ئەم دوو بابەتە لە قۆناغی کۆڵۆنیالدا بە دراماتیکانە باشتر ببوون. میرکوتە، دیفتری، سل بە هۆی داودەرمانی ڕۆژئاوا کەم ببووە و باشتر بوونی ڕەوشی تەندروستی لە سەرتاسەری ئەم کیشوەرەدا هێزی کاری بەهێزتر کرد.

هەروەها دەکرێ باس لەوە بکەین کە ئەگەرچی دەسەڵاتی کۆڵۆنیال بەسەر گەشەپێدانی کەرتی کەرەستەی خاو لە کۆڵۆنەکاندا چەقی گرت، بەڵام بەلانیکەمەوە ئەمە قۆناغێکی ئابووری بوو کە هێزی پێویستی بۆ دروستکردنی چوارچێوە و پلانگەلی داهاتوو بۆ جۆراوجۆرکردنی ئابوور، بەدوادا هات. بۆ نموونە زیمبابوا بە هۆی بوونی کانی گەورەی بەردی خەڵوز زەمینەی بۆ گەشەسەندنی پیشەسازیی لە دوای کۆڵۆنیال فەراهەم کرد. ئەلجەزایریش خاوەن پیشەسازیی بچووکی پۆڵا بۆ گەشەسەندن بوو. کەواتە چۆن دەتوانین سەبارەت بە میراتی ئابووری ئەفریقیا ناوبژیوانی بکەین؟ ئایا چەوساندنەوە پتانسیێلی ئەفریقیای لە بەین بردووە یاخود سەرمایەگوزاری کەمی (زۆربەیان تایبەت) لەم ناوچانەدا هەبوو؟ یاخود نەبوونی ژێرخانی ئابووریی بوو بە هۆی هەرەسهێنانی ئابوور؟ بێ گومان هێزە کۆڵۆنیالکارەکان سامانی زۆریان لەم کۆڵۆنانەدا لە ڕێگەی چەوساندنەوەی کرێکاران، کەرەستەی خاو و سوودی بە دەست هاتوو لە هەناردەکان، بەدەستیان هێنا. دەکرێ سوودی ئەم سەرمایەیە لەبری ئەوەی کە بۆ ڕۆژئاوا بێت، بۆ خودی ئەفریقیا بێت و دەکراش ئەمڕۆکە ئەنجامی ئەم سەرمایەگوزارییە لە ئەفریقیادا ببینرێت و بوو بەهۆی بووژانەوەی زۆرتری ئەم کیشوەرە. سەردەمی کۆڵۆنیالی کیشوەری ئەفریقیای پشت بەستوو بە ستراکتۆری دامەزراو لەسەر کەرتی سەرەتایی و کەرەستەی خاو بەجێ هێشت. ئەگەرچی ئەم ئابوورانە جۆراوجۆر نەبوون بەڵام فاکتەری هەژاری کە هەندێ لە تیۆرەکانی گەشەسەندن ئاماژەی بۆ دەکەن هەتاهەتایی نییە.

سەربەخۆیی سیاسی لانیکەمی پتانسیێلی پێویست بۆ بووژانەوەی خێرای ئابوور فەراهەم کرد و ڕێڕەوی سوودی هەناردەکان بۆ ناوەند، هەڵقوولاوی ئانجگەلی سیاسی بوون، لە کاتێکدا کە دەکرا سوودی بەدەست هاتوو لەم هەناردانە لە ناوخودی وڵاتدا سەرمایەگوزاری بکرێت.



جۆراوجۆری ئابوور لە ڕۆژهەڵاتی دوور کە پێشتر کۆڵۆن بوون (پلنگەکانی ئاسیا) دەتوانێت بەهێزکەری ئەم ڕوانگەیە بێت. پرسی گەشەنەسەندن و بەرپرسیارێتی هەڵقوولاو لە چەوساندنەوەی بەردەوام لە سەردەمی پاش سەربەخۆیدا لە بەشی هەشتەمدا ڕوون دەکرێتەوە.

**دامەزراوە سیاسییە لاوازەکان:**

دوایین ڕەگەزی میراتی کۆڵۆنیالکردنی ئەفریقیا کە پێویستە باسی لێ بکرێت، دامەزراوە سیاسییە لاوازەکانن کە لەلایەن هێزە کۆڵۆنیالکارەکانەوە بە میرات مابووە. بە پێی ڕێبازی دژە کۆڵۆنیالکاری، بزاڤە ناسیۆنالیستییەکان بۆ بەدەستهێنان و چاودێریکردنی دەسەڵاتی گوازراوە بۆ حکومەتە خۆجێییەکان هێزەکانیان مۆبیلیزەکرد و دامەزراوە کۆڵۆنیالییەکانیان سەرپەرەشتی کرد. لە زۆربەی بابەتەکاندا سەلمێنراوە کە دانوسان کلیلی سەربەخۆییە. ئەنجامی ئەم دانوساندنانە بە ڕەزامەندی دەربڕین بوو لەسەر چاودێریکردنی دەسەڵاتدارانی کۆڵۆنیالی بەسەر هەڵبژاردنی فرە پارتی کە تیایدا سەرکەوتووی هەڵبژاردنەکان، وێرانکاری هێزی کۆڵۆنیال و دەستووری نوێ کە دوای سەربەخۆیی دادەڕێژرێ لەئەستۆ دەگرێت. لە گشت دەستوورەکاندا دیموکراسی فرە پارتی و حکومەتی یاسا گەرەنتی کرابوو. ئەمەش دوایین گاڵتەجاریی حکومەتی کۆڵۆنیال بوو. هێزە کۆڵۆنیالییەکان هەوڵیاندەدا کە میراتی لیبرال دیموکراسی جیگیرکراو، بۆ ئەم وڵاتانە بەجێ بێڵنەوە. ئەم میراتەش ئازادییەکان و نوێنەرایەتی کردنی سیاسی لەخۆ دەگرت کە کاربەدەستانی کۆڵۆنیال بە ئەنقەست ئەفریقییەکانی لەم مافانە بێ بەش دەکرد. ئامانج لەم کارەش پاراستنی ستراکتۆرەکان کۆڵۆنیالی بەمەبەستی کۆنترۆڵی سەرچاوەکان بە کەمترین تێچوون بوو. ئامانجی ئیمپریالیزم، دامەزراندنی دامەزراوەی یاسایی — عەقڵانی لەم وڵاتانەدا نەبوو، بەڵکو (بە پێچەوانەوە) حکومەتی کۆڵۆنیالی بۆرۆکراتیك و دەسەڵاتخواز بوو. ئەوان مەیلی کەمیان بۆ دامەزراندنی ئەم جۆرە دامەزراوانە هەبوو و هیچ کاتێك هەوڵی بەدەستهێنانی مەشروعییەتیان نەدەدا و دەستی لە کاباری کۆڵۆنەکان وەردەدا. ئەوان لە ڕێگەی ئامرازەکانی دەسەڵاتەوە حوکمیان دەکرد و لەڕێگەی زۆر لێکردن و سەرکوتکردنەوە پشتگیری دەکران. کولتووری سیاسی کە بەپێی ئەم ڕاستییانەوە بنیاتنرا، بە سەختی دەکرا ببێت بە ناوبژیوانێکی چاودێر بەسەر دامەزراندنی دەوڵەتانی لیبرال دیموکراسی. زیاد لەمەش سەرەڕای داهێنانی رووکەشانەی سیستەمی دیموکراتیك لە دواین چرکەساتەکاندا، زۆرێك لە ڕەگەزەکانی حکومەتی کۆڵۆنی، لە قۆناغی دوای کۆڵۆنیالدا دووبارە بنیاتنرانەوە.

دەسەڵاتخوازی و بۆرۆکراتیك میراتی جێگر بووەی واقیعییەتێك بوو کە لە کۆلۆنیالکارەکانی پێشوو بەجێ مابووە. لەم بارەوە لە بەشی شەشەم و دەیەم روونکردنەوەی زۆرتر هاتووە.

## دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی:

بە ناسینی ئەو رەگەز و فاکتەرە پێکەوە گرێدراو و کاریگەر بەسەر رابردووی ئەفریقیادا کە دەتوانن بەسەر سیاسەتەکانی دوای کۆلۆنیالدا کاریگەرییان هەبێت. ئەم بەشە دەتوانێت بە کورتی بە رەچاوکردنی میراتی مێژوویی، ئەم دەرەنجامە کە تەوەری سەرەکی ئەم پەرتووکەیە، واتە پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بخاتەروو.

بێگومان ئەگەر ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال هەوڵی دابێت کە بە گەشەسەندنی ئابووری و سیاسی بگات، پێویستە بەسەر لەمپەرە سەرەکییەکاندا زاڵ بێت. بۆ نموونە ئەم دەوڵەتانە لە هەلومەرج و پێگەی لەرزۆك و لاوازدان. ئەوان ناچارن کۆمەڵگەی چەند پارچەکراو بە هۆی سنوورە دەستکردەکانەوە بەڕێوە ببەن. بۆ نموونە میکانیزمە جێگربووەکان و ئایدیۆلۆژیاکانی هاوبەندی، ناچارن چارەسەری کەمکردنەوەی توندڕەوی نەژادی بدۆزنەوە و حکومەتە چاکەکانیش ناچارن بەرەنگاری مەترسییەکانی یەکپارچەگەرایی ببنەوە. هەروەها ئابوورە تازە سەربەخۆکانیش ناچارن پەرە بە سەرچاوەکان و جۆراوجۆرکردنی بەرهەمەکانیان بدەن. ئەمەش تاکە رێگای کەمکردنەوەی نائارامی هەڵقوولاو لە تاك بەرهەمی و دابین کردنی سەرمایە بۆ خزمەتگوزارییە گشتییە سەرەکییەکان وەك تەندروستی و پەروەردەیە کە لە کۆمەڵگادا زۆر لاوازن.

هەروەها کۆمەڵگای مەدەنی ناچارە بەسەر تەحەدییەکانی قۆناغی دوای کۆلۆنیالدا زاڵ بێت. مەترسی لەوەدایە کە کۆمەڵگا لەرزۆکەکان بە توندی لە ژێر کونترۆڵی دەوڵەتدان. ئەم بارودۆخەش دەتوانێ دەرفەتەکانی رکابەرێتی فرە لایەن لە بەین ببات و ببێتە هۆی کەمکردنەوەی دەستڕۆیی کۆمەڵگا بەسەر سیاسەتەکانی دەوڵەتدا. زیاد لەمەش دەوڵەت هاوچەرخەکانی ئەفریقیا هیچ پێشینەیەکیان بۆ نوێنەرایەتی کردن و وەڵامدانەوەی گەل نییە. دامەزراوە بۆرۆکراتییەکانی دەسەڵاتخواز یەکێك لە میرات و نموونەکانی کۆلۆنیالە. هەنوکە ئەم ئەگەرە لە ئارادیە کە نوخبە خوێندەوارەکان، ببن بە میراتگەری حکومەتەکانی پێشوو. لە ئەنجامدا ئەگەر دووبارە دەسەڵاتی حکومەت زاڵ ببێتەوە، ئەوە کۆمەڵگای مەدەنییە کە زیانمەند دەبێت. ئاشکرایە کە میراتی کۆلۆنیال و پێش کۆلۆنیال هۆکاری شکستی ئابووری و



سیاسی ئەم کیشوەرە بووە و بە براوی سەرکەوتن بەسەر میراتی کۆلۆنیالدا دەبێتە هۆی باشتر بوونی گۆڕەپانی سیاسی بۆ سیاسەتمەدارانی ئەفریقیا، سەرکەوتنی بزاڤەکان و بە دەسەڵات گەیشتنی ناسیۆنالیستەکان. حکومەتەکانیش متمانە و پشتگیریی کۆمەڵگای مەدەنی لە رێگەی سرکردەکانی بزاڤە رزگاریخوازەکان و رکابەرێتی لە هەڵبژاردنەکاندا، بە دەست دێنن. بەم جۆرەش رێژەیەك لە مەشروعییەت لەنێوان دەسەڵات و هاوڵاتیاندا دروست دەبێت. هەروەها ژێرخانی ئابووری پێویستیش بوونی دەبێت، ئەگەرچیش ئەم ژێرخانە لەرزۆکە و دیموکراسی لە رێگەی هەڵبژاردنەکان فرە پارتی کە لە میانەیدا دەکرا حکومەت لە کۆلۆنیالکارەکانەوە وەربگیردرێت، بنیات دەنرا.

سەرەڕای ئەمەش لە هەمان کاتدا، هیوایەکی گەورە لە ئەفریقیادا، هەروەك سەرتاسەری جیهان بوونی هەبوو کە ئەم کیشوەرە بۆ چوونە ناوەوەی قۆناغێکی نوێ و بووژانەوە ئامادەیە.

لەم بەشەدا رێڕەوی تۆێژینەوە مێژووییەکان خرانەڕوو. لە بەشەکانیتری ئەم پەرتووکەدا هەوڵ دەدرێت وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە کە بۆچی ئەفریقیا لە سەدەی بیست و یەکەمدا، هێشتا نەچووەتە سەردەمی بە توانا بووندا؟

**پوختەی بەشی دووەم: گرفتەکانی هەڵقووڵاو لە میراتی کۆلۆنیال**

| | |
|---|---|
| سنوورە دەستکردەکان | - یەکەی هەرێمیی نالۆژیکانە<br>- کۆمەڵگای چەند پارچە<br>- بزاڤە تۆتالیتارەکان<br>- رکابەرێتی نەژادی<br>- یەکەی ئابووری ناگونجاو (گەمارودراو لە وشکاییدا، خاوەن سەرچاوەی کەم). |
| دەوڵەتی ناهەژمونیك | - هیچ کولتوورێکی هاوبەش لەنێوان دەوڵەت کۆمەڵگای مەدەنیدا بوونی نییە<br>- مەشروعییەتی کەم<br>- حکومەتی نابەرپرس<br>- کۆمەڵگای مەدەنی لێك جیاواز.<br>- نەبوونی پەیوەندی لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگادا. |

| | |
|---|---|
| دروستکردنی نوخبەی دەوڵەتی | – پەیوەندی بەهێز لەنێوان کاربەدەستانی حکومەت و سامانی کەسیی.<br>– مۆبیلیزەکردنی سیاسی لە ڕێگەی دەستگەیشتن بە خزمەتگوزارییەکانی دەوڵەت.<br>– گەندەڵیی<br>– بۆرژوازی بۆرۆکراتیکی چەوسێنەر |
| میراتی ئابووری | – پێش نەکەوتن لە ئابووری نێودەوڵەتیدا<br>– گەشەنەسەندنی سەرچاوەی مرۆیی<br>– نەبوونی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان<br>– ئابووری پشت بەستو بە کەرەستە خاوەکان<br>– پشت بەستن بە هەناردەکان<br>– پشت بەستن بە بازاڕەکانی ئەوروپا لەبری بازاڕە ناوچەیی و ناوخۆییەکان. |
| دامەزراوە سیاسییەکانی لاواز | – دامەزراوەی لیبرال دیموکراتیکی لاواز بە بێ پشتگیریی مێژوویی.<br>– گەڕانەوە بەرەو دەسەڵاتی حکومی لەسەر شێوازی قۆناغی کۆلۆنیالی و دەوڵەتی بۆرۆکراتیك. |

## بابەتی توێژینەوە: میراتی مێژوویی کینیا:

وڵاتی کینیا لە کەناری ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیادا دامەزراوە و کەش و هەوای جۆراوجۆری هەیە. زۆربەی خاکی ئەم وڵاتە بەیار و نیمچە بەیارە و تەنیا ناوچەیەکی کەمی بەپیت بۆ کشتوکاڵی هەیە، وەك ناوچەکانی کەناری زەریای هیند. هەروەها کێڵگە بەرزەکانی لێواری دۆڵی بەرفراوانی (ریفت) و کەنارکانی دەریاچەی ڤیکتۆریا بۆ کشتوکاڵ خاکی بەپیتە. لەم ڕووەوە کینیا دەتوانێ شانازی بە شارەکانی وەك نایرۆبی، مۆمباسا و کیزۆمۆ بکات.

توێژینەوەکانی ئاسەوارناسی وەها بۆی دەچن کە کینیا یەکەمین پێشوازیکەری ژیانی مرۆڤ بووە. بەجێماوەکانی لاشەی مرۆڤ لە نزیك دەریاچەی تیۆرکانا بۆ دوو تا سێ ملیۆن ساڵ لەمەو پێشتر دەگەڕێتەوە.



لەم ناوەدا یەکێك لە گرنگترین بابەتەکان، کۆچکردنی نەتەوەی بانتۆیە. ڕەچەلەکی ئەم نەتەوەیە بۆ ڕۆژئاوای ئەفریقیا دەگەڕێتەوە. کە بە درێژایی چەندین سەدە لە گشت ناوچە ئەستواییەکانی ئەفریقیا نیشتەجێ بوونەتەوە و بەرەبەرە لەو ناوچەیەی کە ئەمڕۆکە بە ئەفریقیای باشوور ناودەبردرێت نیشتەجێ بوون و چونکە بەرەو باشوور و ڕۆژهەڵات کۆچیان کردووە چەندین کۆمەڵگەیان دامەزراندووە. نەتەوەکانی کی کیۆکا، ئەمبیۆ، کامبا، تاراکا، لیۆیا و گیسی لە ڕەچەلەك و نەژادی کۆچبەرەکانی بانتۆنەکانن کە باو باپیرانیان نزیکەی هەزار ساڵ لە دۆڵی ریفیتدا نیشتەجێ بوونە. کۆچبەرانیتر کە پاش بانتۆنەکان لە سەدەی پانزدەیەمدا بۆ ئەم ناوچەیە کۆچیان کرد، گرووپەکانی نیۆلتیك و کاسیتیك بوون کە لە باکوورەوە کۆچیان کرد و نەژادی جۆراوجۆریان دروستکرد و نەژادەکانی ئێستای وەك ماسایی، کالنجین، لیۆ و نەژادە سومالییەکانیان پێکهێنا. سەرەڕای گەلی ئەفریقیا بازرگانە عەرەبەکان کە لە سەدەی هەفتەمدا سەرەدانی ئەم وڵاتەیان کرد، لەم وڵاتەدا نیشتەجێ بوون ئەمەش لە کاتێکدایە کە ئەورووپییەکان دوای کۆتایی هاتنی سەدەی نۆزدەیەم لەم ناوچەیەدا جێگیر بوون. سەرەڕای ئەم دانیشتووە جۆراوجۆرانە ئاسیاییەکانیش (هەندێ ڕەچەلەکی هیندی) ژمارەیەکی بەرژاوی دانیشتوانی کینیا لە سەدەی بیستەمدا پێك هێنا.

دامەزراوەی سیاسی کینیا پێش قۆناغی کۆلۆنیال زۆرتر پشتبەستراو بە کۆمەڵگا بێ دەوڵەتەکان بوو. پێشکەوتووترین کۆمەڵگاکان لە بەرزایی و کەنارکانی دەریاچەی ڤیکتۆریا نیشتەجێ ببوون. ئەگەرچی هەریەك لەم گرووپانە خاوەن چەمکی کۆمەڵایەتی ئابووری و سنووری کولتووری نەبەزێنراوی تایبەت بە خۆیانن. بەڵام پێکەوە ژیان و شەڕکردن لەنێوان ئەم گرووپانەدا بوونی هەبووە. بۆ نموونە دانیشتوانی بەرزاییەکانی ریفت واتە ماساییەکان بازرگان و دەوڵەمەندانی ئەم ناوچەیە بوون. ئەم گرووپە ژیانی شوانکارییان هەبوو و ژیان لەگەڵ خێڵەکانیتردا واتە تێکەڵ بوون لەگەڵ جووتیاران و نەژادەکانیتر و سوودمەند بوون لەم تێکەڵ بە یەکتر بوونە. ئەمانە لە ڕێگەی فرۆشتنی ئاژەڵ بە دراوسێیەکانیان بژێوی ژیانیان دابین دەکرد. ئاژەڵ لەم کۆمەڵگایانەدا کاڵایەك بوو کە بۆ بەدەستهێنانی سوود و بازرگانی کردن و دانەوەی قەرزەکانی کۆمەڵایەتی وەك نەختی هاوسەرگیریی بەکار دەهێنرا. ئەم ناوچەیە لەگەڵ ناوچەکانیتری ئەفریقیا و جیهان پەیوەندی هەبوو. بازرگانەکانی کەناری دەریا هەر لە سەرەتاوە بوونی هەبووە لە کاتێکدا کە کاروانی بازرگانانی عەرەب لە سەدەی نوزدەیەم بۆ ئەم ناوچەیە هاتوونە. کاری ئەم کاروانانە بازرگانی کوێلە و شاخی فیل لە مۆمباسا (کەنارکانی

زەریای هیند) و دەریاچەی ڤیکتۆریا بوو. چالاکی بازرگانی ئەم کاروانانە لە زەنگبار (کە لەژێر دەسەڵاتی عەرەبەکانی عەماندا بوو) کونترۆڵ دەکرا. دەستڕۆیی بەریتانیا لەم ناوچەیەدا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە دەستی پێکرد. ئەم وڵاتە لە ساڵی ١٨٨٨دا، بڕگەی بەخشینی کینیا بە کۆمپانیای بازرگانی ئەفریقیای ڕۆژهەڵاتی دامەزراند. سەروەری ئەم وڵاتە لە ژێر چاودێری کۆمپانیادا کارەساتی خوڵقاند. بەریتانیا پێش ئیفلاس بوونی کۆمپانیاکە ناچار بوو خودی خۆی کونترۆڵی کینیا بکات. دەوڵەتی بەریتانیا لە ساڵی ١٨٩٥دا سەرپەرشتی (قیومت) ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیای بەدەست هێنا. دوای بیست و پێنج ساڵ کاتێك کە سپی پێستەکان لەم ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون، کینیا بوو بە یەکێك لە کۆڵۆنەکانی بەریتانیا. بە درێژایی ئەم ماوەیە کینیا لە ناوچەیەك کە تیایدا کۆمەڵگاکانی بێ دەوڵەت دەژیان بۆ دەوڵەتێکی کۆڵۆنیالی مۆدێرن و سەربەخۆ گۆڕدرا کە ئەم قەلەمڕەوە خاوەن ستراکتۆریی جێبەجێ کردنی ناوەندگەرایی بەهێز و کۆمەڵگا سپی پێستانی خاون دەستڕۆیی بوو.

بارودۆخی کینیا ڕەنگدانەوەی بەسەر ناوچەکانیتری ئەفریقیادا هەبوو کە بە سنوورە دەستکردەکانەوە لە قۆناغی کۆڵۆنیالدا دامەزرابوون. بۆ نموونە سنووری دەستکردی کینیا و تانزانیا لە ناکاوە بەرەو موشای گۆڕدرا. وەها دێتە بەرچاو کە هەڵەیەك رووی دابێت و قەلەمی سنوور دارێژەکان لە پانی هێلی جوگرافییەوە بەرەو زەریای هیند بەهەڵە چەمابێتەوە. مەلیکەی ڤیکتۆریا ئاواتەمەن بوو کە چیاکانی کلیمانجارۆ وەك دیاری بە نەوەی (کۆڕەکەی) قەیسەر ڤیایامی دووەم ببەخشێت. بەم جۆرەش سنووری نێوان ئەڵمانیا و بەریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا گۆڕدرا. بە هۆی ئەم کردارە و سروشتی ناعەقڵانی ئەفریقیا هەزاران ئەفریقیایی ناچار بوون کە هەر لە کاتی لە دایك بوونەوە ببن بە هاوڵاتی کینیا یان تانزانیا.

ئەگەرچی ئەم نموونەیە نموونەیەکی توندڕەوانە لە کێشانی سنوورەکانە، بەڵام ئاشکرایە کە وڵاتانی ئەفریقیا بەپێی پێداویستییەکانی ناوخۆیی دانەمەزراون، بەڵکو بەپێچەوانەوە بە ئاراستەی دابین کردنی خواستەکانی ئیمپریالیزم و بەرژەوەندی سەرکردەکان دامەزراون. هەروەها ئەم پرسە لە سنوورەکانی نێوان ڕۆژئاوای کینیا و ئۆگاندا ڕەنگی داوەتەوە. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم سنوورانە لە ساڵی ١٩٢٦دا گۆڕدران. بەڵام ناوچەیەکی خاوەن ١٠٠ گرووپی لێك جیاواز دەرباز دەبێت. سنوورەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی کینیا لە قۆناغی دوای کۆڵۆنیال زۆرترین گرفتی بۆ ئەم وڵاتە دروستکردووە. هەروەك باسکرا گەلی سومالی لە ئەنجامی سنوور داڕێشتنی کۆڵۆنیال بەسەر پێنج وڵاتدا دابەشکرا. بەم جۆرەش لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کینیا



ژمارەیەکی زۆری خەڵکی سومالی ڕەچەڵەك نیشتەجێ بوون. زۆربەی ئەم خەڵکە ئارەزوومەندن ببن بە بەشێك لە خاکی سومالی گەورە، کۆماری سومالیش هەوڵ دەدات تا ئەم بەشەی خاکی کینیا بە وڵاتەکەیەوە بلکێنێت. لە شەڕی جیهانی یەکەمدا، دەوڵەتی بەریتانیا بە نهێنی ڕێککەوتنێکی لەگەڵ ئیتاڵیادا واژوو کرد، کە بەپێی ئەم ڕێککەوتنە ٩٤٪٠٥ کیلۆمەتری چوارگۆشە لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی کەوتە ژێر دەسەڵاتی وڵاتی سومالی ئیتاڵیا. ئەم ڕێککەوتنەش بە هۆی هاوپەیمانی بوونی ئیتاڵیا و بەریتانیا لە شەڕی دژ بە ئەڵمانیا بوو. لە ساڵی ١٩٢٤ ئەم ناوچەیە پێشکەش بە ئیتاڵیا کرا. سەرەڕای ئەمەش زۆرێك لە نەتەوەکانی سومالی دوای گۆڕینی سنوورەکانیش لە خاکی کینیادا مانەوە.

ڕێك لە دوای سەربەخۆیی لە ساڵی ١٩٦٣دا، چاو پێ خشاندنەوەی ئەم پرسە کرا. بەریتانیا لەگەڵ سومالی دەستی بە دانوساندن کرد و سومالیش هەوڵیدا قەلەمڕەوەکی زۆرتر بە دەست بهێنێت. یەکێك لە داواکارییەکانی ئەم وڵاتە گشت خاکی پارێزگای باکووری کینیا بوو. بەڵام ئەم بڕە خاکە زۆر لەوە زۆرتر بوو کە بەریتانیا بە نیاز بوو بە سومالی ببەخشێت، بۆیە دانوساندنەکان بە بنبەست گەیشت. ململانێی سنووری لە جوای سەربەخۆیی کینیا بۆ ئەم وڵاتە بەمیرات مایەوە و شەڕی یەك پارچە خوازی لەم پارێزگایەدا هەڵگیرسا. بەڵام ئەم حەقیقەتە لە ئارادایە کە هەنوکەش ڕێژەیەك لە سومالییەکان لە کینیادا دەژین کە وەفاداری سیاسییان زۆرتر بۆ دەرەوەی سنوورەکانە تا بۆ حکومەتی کینیا بێت.

هەروەها میراتی ئابووری بەجێماو لە دەسەڵاتی کۆڵۆنیالی، گرفتساز بوو. بەڵگەی باوەڕپێکراو بۆ سەلماندنی ئەم پرسە لەبەردەستدان. خاکێکی زۆری ئەفریقییەکان لە ناوچە بەپیتەکان بە سپی پێستەکان بەخشراو و بۆ نیشتەجێ کردنی جووتیارە ئەوەروپییەکان تەرخانکرا و هێزی کاری ئەفریقیاش ناچار بە کارکردن لە کێڵگەکان و باخدان کران. لە ئەنجامدا گەشەی ئابووری ئەم وڵاتە پشت بەستراو بە بەرهەمی خاوی وەك قاوە و چا بوو کە ئەم پرسەش وەستانی جۆراوجۆر بوونی ئابووری کینیای لێ کەوتەوە. تەنانەت ئەمڕۆکەش دوای ٤٠ ساڵ لە سەربەخۆیی کینیا، کینیای تا ڕادەیەك پیشەسازیی ڕێژەیەکی بەرفراوانی کاڵا و پێداویستییەکانی لەبری ئەوەی کە لە دراوسێ و بازاڕە خۆجێییەکان بکڕێت، لە وڵاتی مێترۆپۆڵ واتە بەریتانیا هاوردە دەکات. بەدواهاتەکانی گەشەنەسەندن ئەوە بوو کە دامەزراوەکانی پاش کۆڵۆنیال ڕووبەڕووی گرفتی زەوی (کێڵگە) بوونەوە.

بە چ شێوازێك دەكرا خاوەندارێتی كێڵگەكانی ئەوروپییەكان بەو جووتیارانە كە ئەم كێڵگەیە لێ زەوتكرابوو بگەڕێنرێتەوە. هەروەها گرفتی پەرەپێدان بە ئابوورێكی پشتبەستراو بە هەناردەكردنی بەرهەمە كشتوكاڵییەكان لە ئارادا بوو. هەروەها دەبوایا ئابووری كینیا بەرەنگاری دابەزینی نرخی قاوە و چا ببێتەوە.

بەڵام پێویستە رەچاو بكرێت كە ئابووری ئەم وڵاتە تەواو گەشەسەندوو نەبوو. كینیا لە دەوڵەتانی كۆڵۆنیال ژێرخانی باشی بۆ بە میرات مابووە، وەك خزمەتگوزاری تەندروستی و سیستەمی پەروەردە. زیاد لەمەش بە بەراوردە نێوان كینیا و ناوچەكانیتری ئەفریقیا ئەم وڵاتە خاوەن كەرتی پیشەسازیی بەرچاوە. پیشەسازییە پێشكەوتووەكان لە ژێر دەستی سپی پێستەكاندایە و كارگەكان دوای قۆناغی كۆڵۆنیال بووژانەوە. كینیا لە رێگەی فرۆشتنی كاڵا بە وڵاتانیتری ئەفریقیا و تەنانەت دەرەوەی ئەفریقیاش، سوودی زیادی بە دەستهێنا. ئەگەرچی ئابووری كینیا پشتبەستراو بە بەرهەمی خاوی كشتوكاڵییە، بەڵام پیشەسازیی ئەم وڵاتە لە كەرتی پیشەسازیی كیمیاویدا وەك چیمەنتۆ و بەرهەمهێنانی كاڵای سەرەتایی بۆ كارگەكانیتر و پاڵاوتنی نەوت، زۆر سەركەوتوو بووە. پیشەی گەشتوگوزاری ساڵانە رێژەیەكی بەرچاوی دراوی دەرەكی بە خۆوە تەرخانكردبوو.

ئەگەرچی هێزی كار و سەرچاوەكانی كینیا لەلایەن كۆڵۆنیالكلرەكانەوە، چەوسێنراو بووە و ئەم وڵاتە ئابووری پشتبەستراو بە كاڵا سەرەتاییەكانی بۆ بەمیرات ماوەتەوە، بەڵام پێویستە رەچاو بكرێت كە ئاسوی ئابووری ئەم وڵاتە تا رادەیەك سەركەوتوو دێتە بەرچاو. ئەمڕۆكەش ئابووری ئەم وڵاتە تا رادەیەك لە پلانی جۆراوجۆر كردنی بەرهەمەكان سەركەوتنی بەدەست هێناوە، ئەگەرچی رووبەڕووی هەندێ لەمپەر بووەتەوە.

بەرهەڵسیكاری رێك خراو لە دژی حكومەتی كۆڵۆنیالی لە كینیادا، بەتایبەتی لەلایەن گرووپی كیكۆیا لە دژی بەریتانیا بۆ ساڵی ١٩٢٠ دەگەڕێتەوە كە بە شۆڕشەكانی مایۆمایۆ ناوی دەركردووە و لە كۆتاییدا بەریتانیای ناچار بە دانوساندن كرد و ئەم دانوساندنەش سەربەخۆیی كینیای لێ كەوتەوە. لەم پشێوییانەدا نزیكەی سێزدە هەزرای ئەفریقیایی و یازدە هەزار ئەوروپی لەسەر كێشەی كێڵگەكان گیانیان لەدەستدا. ئەم گرووپە خوازیاری لێسەندنەوەی كێڵگەكان بوون و هەڕەشەی ئەوەیان دەكرد كە كێڵگەكان وەردەگرنەوە. زۆرتر لە هەشتا هەزار ئەفریقیایی دەسگیر كران و لە گرتوخانەكانی" دووبارە پەروەردە كردن"دا بەند كران. كاتێك كە لە ساڵی ١٩٥٢ ئەم نارەزامەندییە پەرەی سەند لە وڵاتدا بارودۆخی نائاسایی



راگەیێنرا. سەركردە نەتەوەییەكان وەك جۆمۆ كینیاتا كە بوو بە سەرۆك كۆمار بەند كران و سەربازانی بەریتانیایی بۆ سەركوتكردنی شۆڕش رەوانەی ئەم وڵاتە كران. كاتێك كە ئەم سەربازانە بە ئامانج گەیشتن واتە شۆڕشیان سەركوتكرد، كاربەدەستانی كۆڵۆنیال هەوڵی بەهێز كردنی چینێكی سیاسییاندا كە بتوانن بەشداریی كارایان لەگەڵ حكومەتدا هەبێت. سەركردە نەتەوەییەكان كە كاربەدەستانی كۆڵۆنیال هەوڵی بەشداری پێكردنیان دەدا، بەدڵنیاییەوە نوێنەری كۆمەڵگای فرە چینی كینیا نەبوون. ئەوان نوخبەیەكی شارنشینی خوێندەوار بوون كە لەگەڵ حكومەت پەیوەندی پتەویان هەبوو (چ وەك فەرمانبەر یاخود هاوبەشی بازرگانی). بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٥٧دا كاتێك كە بۆ یەكەمین جار مۆڵەت بە ئەفریقییەكان درا كە لەگەڵ نوێنەرە ئەوروپییەكان لە پەرلەماندا بەشداری بكەن، سەنگ و پێگەی ئەم ئەفریقییانە دەركەوت. زۆربەی ئەم كەسانە ماموستا و ئەوانیتریش ڤیتەرنەر، رۆژنامەنووس، بازرگان، سەرۆكی یەكێتی خزمەتگوزارییەكانی شار، ئەفسەرێكی سوپا، كرێكارێك و مافناسێك بوون. زۆربەی ئەم نوێنەرانە خوێندەواریی ئامادەییان هەبوو و هەندێكیشیان دەرچوویی زانكۆ یاخود لە دەرەوەی وڵاتدا كاریان كردبوو. ئەوان پێگەیەكی بەرزی كۆمەڵایەتی و پەیوەندی كەمیان لەگەڵ وەرزێرەكانی مایۆمایۆ كە ئەركی شۆڕشیان لەئەستۆ گرتبوو هەیانبوو. ئەم نوخبەیە ئەركی بەمیرات وەرگرتنی دەوڵەتی كینیا لە هێزە ئیمپریالیستییەكانی لەئەستۆدا بوو. گشت ئەم بابەتە لە بەشەكانی داهاتوودا باسیان لێ دەكرێت و ئەم پرسەش كە چۆن ئەم نوخبەیە (بۆرژوازی بۆرۆكراتیكی) كۆڵۆنیالكاریان دامەزراند، باسی لێ دەكرێت.

كینیا لە ساڵی ١٩٦٣دا واتە پیش ئەو كاتەی كە بەریتانیا پێشبینی كردبوو سەربەخۆیی وەرگرت. ناسیۆنالیستەكان لەبری ئەوەی كە بەشدارییەكی كەمیان لە حكومەتی ئیمپریالیستیدا هەبێت، هەوڵی سەربەخۆ بوون و ئۆتۆنۆمییان دەدا. فۆرمولی بەشداری كردن لە حكومەتدا وەلاخرا و بەم كارەش حكومەتی كۆڵۆنیالی هەرەسی هێنا، بەڵام بەریتانیا پێش دەرچوون لە كینیا دەستوورێكی دیموكراتیكی بە پێی دانوساندنەكانی پێش سەربەخۆیی بۆ ئەم وڵاتەی بە جێ هێشت. بە ئاگادار بوون لە بەرژەوەندییەكانی بەریتانیا، ئاشكرایە كە دامەزراوە سیاسییەكانی دامەزراو بەپێی ئەم دەستوورە زۆر ناكارا و لاواز بن و بەپێی پێداویستییەكانی وڵات گەشە نەكەن و لە دەرەوەی كۆمەڵگا و بە نهێنی بەڕێوە ببردرێن. لە دەستووری نوێدا دان بە دیموكراسی فرە پارتی بۆ كینیا نرا. لە راستیدا ئەم جۆرە پێشتر لەم وڵاتەدا بوونی نەبوو و هیچ پارتێكی سیاسی تاپێش شەڕی جیهانی دووەم دانەمەزرا و دوای شەڕیش رێكخستنی ئەم

جۆرە دامەزراوانە قەدەغە کرا و هەروەها پەرلەمانیش لە قۆناغی حکومەتی کۆلۆنیالدا لە کینیا بوونی نەبوو. بە کورتی لە ئەفریقیادا لیبرال دیموکراسی هیچ بناغەیەکی نەبوو و میراتی بەجێماوی کۆلۆنیال بوو و وەها چاوەڕوان دەکرا کە کینیا لە ڕێگەی ئەم میراتەوە کولتوورێکی سیاسی بنیات بنێت تا بتوانێت پشتگیریی لەم سیستەمە بکات. مۆدیلی ڕۆژئاوایی دەستووری کینیا هەر لە دوای سەربەخۆییەوە شکستی هێنا. لە یەکەمین ساڵی سەربەخۆیی پارتی بچووکتری یەکێتی ئەفریقیایی دیموکراتیکی کینیا، کانۆ، لەنێوان دوو پارتی ڕکابەر لە هەڵبژاردنەکانی دوای سەربەخۆیی ڕکابەرێتی یەکتریان دەکرد، سەرکەوتنی بە دەست هێنا. پارتی کانۆ بە بێ بوونی پارتێکی بەرهەڵستکار لە ساڵی ١٩٦٤ەوە تا کاتی هەڵبژاردنی پێش وەختە لە ساڵی ١٩٩٠دا، حوکمی ئەم وڵاتەی دەکرد. گەورەترین تەحەدی سەرەکی بۆ پارتی دەسەڵاتدار لە ساڵی ١٩٦٦دا، کاتێك کە یەکێتی گەلی کینیا دامەزرا، سەریهەڵدا. سەرۆك کۆماری کینیا چالاکی ئەم پارتەی قەدەغە کرد. هەروەها کردەوەیتریش بۆ چەق گرتنی دەسەڵاتی حکومەت لە ڕێگەی پارتی کانۆوە ئەنجامدرا. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٦٤ نووسینگەی سەرۆك وەزیران هەڵوەشێنرایەوە و نووسینگەی سەرۆك کۆمار بە دەسەڵاتی زۆرتر جێ گرتەوە. زیاد لەمەش لە ساڵی ١٩٦٦دا، پەرلەمانی دووەم هەڵوەشێنرایەوە و سیستەمی پەرلەمانی تاك ئەنجوومەنی لە ژێر کونترۆڵی حکومەتدا دامەزرا. هەروەها لە هەمان ساڵدا دووەمین یاسا "گورزی پێشگیریی" داڕێژرا. بە پەسەندکردنی پەیماننامەی مافی مرۆڤ کە بەپێی ئەم پەیماننامەیە ڕێگەی لە دامەزراندنی دادگا بە بیانوی نەتەوەیی گیرا، سیستەماتیکانە دەسەڵات لە پەرلەمان وەرگیرایەوە و نووسینگەی سەرۆك کۆمار -کێنیتا و هاوپەیمانانی لە حکومەت و سوپادا- گوازرایەوە. ئەم چالاکییانەش نیشاندەری ئەوە بوون کە کینیا لە دۆخی گەڕانەوە بۆ حکومەتی بۆرۆکراتیکی هاوشێوەی سەردەمی کۆلۆنیالییە.

دوای بە دەسەڵات گەیشتنی ئاراپ مویی لە ساڵی ١٩٨٢دا، واتە دوای مردنی کنیاتا پلانی ئازادسازیی سیاسی داڕێشت و زیندانییە سیاسییەکانی ئازاد کرد و دژی گەندەڵیی وەستایەوە، بەڵام ئەم پرۆسەیە زۆری نەخایاند. ئەو هەوڵیدا، دوای کودەتای سەرەنەکەوتووی ساڵی ١٩٨٢ بناغەکانی دەسەڵات قایم بکات و کینیا بوو بە خاوەن پارتێکی فەرمی و دوایین هێماکانی لیبرال دیموکراسی لەناو چوون و دەستووری سەردەمی کۆلۆنیال کە تیایدا مۆلەت بە ڕکابەرێتی فرە پارتی دەدا (ئەگەرچی لەسەر بناغەی سست و لەرزۆکی حکومەتی بۆرۆکراتیکی ستەمکاری بنیاتنرابوو) بە مێژوو سپێردرا.



لە ساڵی ١٩٩٠دا ئاراپ مویی بۆ چاکسازیی حکومەت کەوتە ژێر گوشارەوە و سیاسەتی فرە پارتی لەم دەیەیەدا بۆ وڵات گەڕێنرایەوە. سەرۆك کۆمار بە شارەزاییەوە هەوڵیدا لە دوو خولی هەڵبژاردنی گشتی سەرکەوتن بە دەست بهێنێت. ئەو لە ساڵی ٢٠٠٢دا خانەنشین کرا و پارتەکەشی لە هەڵبژاردنی فرە پارتی ساڵی ٢٠٠٢ دەسەڵاتی بە هاوپەیمانی بەرهەڵستکار سپارد. لەوانەیە ئەم پرسە نیشاندەری ئەم بابەتە بێت کە ڕژێم گۆڕانی بەسەردا هات و سەرەنجام دیموکراسی فرە پارتی بوو بە شێوازی سیاسەتی زاڵ بەسەر ئەفریقیادا. بەڵام ئەم ڕاستییە لە ئارادایە کە ئەم وڵاتە پاش ٤٠ ساڵ توانی چاکسازی تەنیا لە یەکێك لە ڕەگەزەکانی میراتی کۆلۆنیالدا ئەنجام بدات.

**کینیا:**

| | |
|---|---|
| ڕووبەر | ٥٨٠٪٣٦٧ کیلۆمەتری چوار گۆشە |
| دانیشتوان | ٣٠٪٤ ملیۆن کەس |
| هێزی کۆلۆنیالکار | بەریتانیا |
| ساڵی سەربەخۆیی | ١٩٦٣ |
| گرنگترین شارەکان | نایرۆبی (پایتەخت)، مۆمباسا، کی زۆمۆ |
| گرنگترین نەژادەکان | کیلیۆیا، لیۆیا، لیۆ، کامبا، کالنجین، ماسایی |
| دانیشتوانی شار | ٪٣٣/١ |
| زمان | ئەنگلیزی، سواحیلی |
| ناوەندی ژیان | ٤٩ ساڵ |
| ڕێژەی خوێندەواری | ٧٩٪٣ |
| گرنگترین هەناردەکان | قاوە، چا، میوە و سەوزەوات |
| دراو | شلینگی کینیا |
| ڕێژەی مردن | ٦٤مردن لە هەر ١٠٠٠ لە دایك بوو |
| ئایین | سونەتی، مەسیحی،هیندو |
| بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی(gdp) | ٣٤٥ دولاڕ |

## زاراوە سەرەکییەکان :

**سنوورە دەستکردەکان:** سنوورەکانی دەوڵەت کە رەنگدانەوەی بەرژەوەندیی هێزە کۆلۆنیالکارەکانە، لەبری ئەوەی کە رەنگدانەوەی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی خۆجێیی یاخود واقیعییەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتە بێت.

**ستەمکاری بۆرۆکراتیك:** سیستەمێك کە پشتبەستراو بە سەرکوتکردنە نەك مەشروعییەت و هەوڵ دەدات تا قەڵەمڕەوەکەی لە رێگەی خۆ دوورخستنەوە لە سیستەمی نوێنەرایەتی کردن و وەڵامدانەوە بەڕێوە ببات.

**بەرهەمە خاوەکان:** بەرهەمی کشتوکاڵی کە بۆ هەناردەکردن (قاوە، چا، کاکاو و...) بەرهەم دێنێت، نەك لە پێناو بەکارهێنانی ناوخۆیی و تایبەت (وەك خۆراك).

**دەوڵەتی ناوەند - پەراوێز:** بیرۆکەیەك کە لەو بڕوایەدایە سیستەمی نێودەوڵەتی پێکهاتوو لە وڵاتانی دەوڵەمەند (رۆژئاوا)، ئابوورەکەیان بە هۆی کۆلۆنیال کردنی وڵاتانی لە دۆخی گەشەسەندن و ناوچە پەراوێزکراوەکانی سیستەمی نێودەوڵەتی واتە"جیهانی سێیەم" بەهێز بووە.

**بەهای زیادەی هەناردەکان:** سوودەکانی بەدەست هاتوو لە هەناردەکردن، کە لە وڵاتانی کۆلۆندا (ئەو وڵاتانەی کە کاڵا و بەرهەمە خاوەکان لێی هەناردە دەکرێن) سەرمایەگوزاری ناکرێتەوە.

**حکومەتی ناڕاستەوخۆ:** سیستەمی حکومی پشتگیری کراو لەلایەن کۆلۆنیالکارەوە، کە تا رادەیەك دەسەڵات بە ناوبژیوانەکان دەسپێرێت، لەبری ئەوەی گشت سیستەمی حکومەتی ناوەندی پێیان بسپێرێت.

**یەکپارچەخوازیی:** ویستێك بۆ بنیاتنانی یەکێتی گەل لە هەرێمێکدا کە پێشتر دابەشکراوە.

پەیوەندیی خزمایەتی و خوێنی: بەربەستە کۆمەڵایەتییەکانی پشتبەستراو بە خێزان، خێڵ و خزم.

**ئابووری تاك بەرهەمی:** ئابووری نەتەوەیی کە زۆرتر پشتبەستراو بە بەرهەمهێنانی یەك یان دوو بەرهەمە.

**کەرتی سەرەتایی ئابووری پشتبەستراو بە هەناردەکردنی بەرهەمی خاو:** چالاکی ئابووری کە پشتبەستراو بە کان و کشتوکاڵە تا پیشەسازیی و خزمەتگوزارییە گشتییەکان.



**هەوڵدان لە پێناو ئەفریقیا:** رکابەرێتی لەنێوان هێزە ئیمپریالیزمەکانی ئەورووپا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە پێناو دابەشکردنی ئەفریقیا لەنێوان خۆیاندا.

**نوخبەی حکومەتی:** چینی شارنشینی خوێندەوار کە گشت پێشکەوتنەکانی بە هۆی دەست گەیشتن بە دامەزراوە حکوومییەکانەوە نەبوو.

**کۆمەڵگا بێ دەوڵەتەکان:** کۆمەڵگایەك کە لە رووی سیاسییەوە پشتبەستراو بە قەڵەمڕەوێکی دیارکرا و دامەزراوە سیاسییە ناوەندییەکان نەبێت.

**سیستەمی گەشە نەسەندوو:** سیستەمێك کە لەپێناو خزمەتکردن بە بەرژەوەندیی هێزە ئیمپریالیستییەکان، لە رووی پتانسیێلی ئابوورییەوە بە دواکەوتوویی بمێنێتەوە.

### پرسیارەکان:

١. ئەو رەگەزانەی کۆمەڵگای ئەفریقیا چین کە لەم هەنوکەش بەسەر سیاسەتی ئەفریقیادا کاریگەری هەیە؟
٢. کاریگەری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی سنووردانای ئەفریقیا لەلایەن ئیمپریالیستەکانەوە چین؟
٣. تا چ ئاستێك دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە ئەفریقیادا بەرەنگاری کۆلۆنیال بوونەتەوە؟
٤. رۆڵی نوخبەکانی ئەفریقیا لە حکومەتی کۆلۆنیال و بزاڤە رزگاریخوازە نەتەوەییەکاندا چی بووە؟
٥. ئایا بەڵگە لەسەر پشتگیری کردنی ئەفریقیا لە تیۆرەکانی گەشە نەسەندن بوونی هەیە؟
٦. ئاستی کارلێکەری دامەزراوە سیاسییەکان لە سەربەخۆیی ئەفریقیادا تا چ ئاستێك بووە.

### بۆ خوێندنی زۆرتر:

بۆ دەستپێکردن لەسەر بارودۆخی ئەفریقیا پەرتووکی باسیل دێڤید سۆن، پەرتووکێکی سوودمەندە. توێژینەوەی مێژوویی جان.ی. لیفە سەردەمێکی زۆرتری لەخۆ گرتووە. سەبارەت بە دەوڵەتیش پەرتووکی گرافۆرد یونگ، لەبارەی کۆلۆنیالکردنی ئەفریقیا، بەرهەمێکی زۆر بەنرخ نییە، بەڵام پەرتووکی سادیا تیوال سەبارەت بە سنوورەکانی ئەفریقیا پەرتووکێکی سوودمەندە. بۆ بابەتی گەشە نەسەندن پەرتووکی گۆندر فرانك "سەرمایەداریی و گەشەنەسەندن" بە سوودە.

رابرت پۆتمان بەم جۆرە پێناسەی ئایدیۆلۆژیا دەکات:" سیستەمێکی ڕێنماییکەری بڕوا، بەها و ئامانجە کاریگەرەکان بەسەر شێواز و کارکردی سیاسیدا". لەم ڕوانگەیەوە مرۆڤ ئایدیۆلۆژیا بۆ تێگەیشتن و ڕوونکردنەوەی جیهان بەکار دێنێت و ئایدیۆلۆژیاش ڕێگە بۆ مرۆڤ بە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕێژەیەکی فراوانی زانیاریی سەبارەت بە ژینگە بە شێوازێکی لۆژیکانەتر و مانادارتر فەراهەم دەکات و ((بینینێکی جیهانی)) بە مرۆڤ دەبەخشێت. بۆ نموونە ئایینەکانی کاسۆلیك، ئیسلام، سۆسیالیزم، لیبرالیزم و ئانارشیزم گشتیان پەیڕەوەکانیان ڕێنمایی دەکەن و سەرەڕای دروستکردنی هەماهەنگی لەو بەهایانەی کە ئەم پەیڕەوانە بڕوایان پێ هەیە، لێکدانەوەی مێژوویی و ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکانی ڕۆژانەش ئەنجام دەدەن.

خوێندنی سیاسەت لە ڕێگەی شیکردنەوەی خەسڵەتە سەرەکییەکانی ئایدیۆلۆژیا و توێژینەوە بەسەر کاریگەرییەکانی بەسەر پرۆسەی حکومەتدا، پەرە دەسێنێت. لەم ڕوانگەیەوە، ئایدیۆلۆژیا وەك هێزی دروستکەری کۆمەڵگا کار دەکات. مرۆڤ بە ڕوانگەیەکی جیهانی وێکچوو، لە پێناو بەرژەوەندی دوو لایەنەدا هاوکاری یەکتر دەکەن و لەهەمبەر ڕکابەرەکانیاندا لەم شێوازەی ژیان دەکەن. بۆ نموونە لیبرال دیموکراسی کە لە ئەورووپای ڕۆژئاوا و ئەمریکادا بەرقەرارە، برەو بە مافی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگادا دەدات. لیبرالیزم ئایدیۆلۆژیاییێکە کە دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی پێکەوە گرێ دەدات و دەبێتە هۆی یەکگرتنی (انسجام) حکومەت و هێنانەدی مەشروعییەت.

ئەگەر خوێندنەوەی ئایدیۆلۆژیا یارمەتیدەری زانایانی زانستە سیاسییەکانە بۆ تێگەیشتن لە سیاسەتی ڕۆژئاوا، کەواتە دەبێت ئەم بابەتە بۆ ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالیش ڕاست بێت. هەر پەرتووکێك کە هەوڵی ڕوونکردنەوەی ڕووداوە سیاسییەکانی ئەم کیشوەرە بدات، پێویستی بە ناسین و توێژینەوەی ئایدیۆلۆژیا زاڵەکانی سەر ئەم ژینگەیەدا هەیە و ئەمەش خودی بابەتی گەلاڵە کراوی ئەم پەرتووکوییە و ئایدیۆلۆژیا خوێندراوەکان و بنیاتە دیارەکانی سیستەمی سیاسی ئەفریقیا ئاشکرا دەکات.

هەروەك لە پەرەگرافی خوارەوەدا ڕوون دەکرێتەوە، ناسیۆنالیزم بەسەر سیاسەتی هاوچەرخی ئەفریقیادا زاڵ بووە. دەکرێ ڕۆڵی ناسیۆنالیزم لە میانەی خستنەڕووی ململانێ دژی ئیمپریالیزم و تێکۆشان بۆ دامەزراندنی دەوڵەت- نەتەوەکانی یەکگرتوو لە دوای سەربەخۆییدا، ڕوون بکرێتەوە. ئەگەرچی وڵاتانی ئەفریقیا خاوەن ئایدیۆلۆژیای هاوشێوەن، بەڵام شێوازگەلی

جۆراوجۆر لە ناسیۆنالیزم سەری هەڵداوە، کە بە پێی هێماکان (مۆشرات) دەکرێت ئەم ئایدیۆلۆژیانە بەسەر چوار گرووپدا دابەش بکرێن:

١. سۆسیالیزمی ئەفریقیایی
٢. سۆسیالیزمی زانستی
٣. کۆمەڵگەرایی (پۆپۆلیزم)
٤. سەرمایەداری حکومی (دەوڵەتی)

هەریەك لەم ئایدیۆلۆژیانە بە پێی ریزبەند روون دەکرێنەوە و بەدوای ئەمەشدا دوایین بیرۆکەکانی رۆڵی ناسیۆنالیزم لە پێکهاتەی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە قۆناغی دوای کۆڵۆنیالدا باس دەکرێت.

## نەهێشتنی کۆڵۆنیال لە ئەفریقیا:

ناسیۆنالیزم هێزی مۆبیلیزەکارە کە ئەفریقییەکان بۆ رزگار بوون لە حکومەتی کۆڵۆنیال بەکاریانهێنا. لیبیا (١٩٥١)، مەراکیش (١٩٥٦)، سودان (١٩٥٦)، تونس (١٩٥٦)، غانا (١٩٥٧)، گینە (١٩٥٨) یەکەمین وڵات بوون کە لە پەنجاکاندا حکومەتی کۆڵۆنیالیان لە وڵاتەکەیاندا وەدەر خست. هەرچەندەش زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا لە شەستەکاندا سەربەخۆییان وەرگرت (بڕوانە خشتەی ١-٣).

زۆربەی کۆڵۆنەکانی فەڕەنسا لە ئەفریقیای ژێر بیاوان لە شەستەکاندا سەربەخۆیی و سەروەرییان بەدەست هێنا. ئەلجەزایر لە ساڵی ١٩٦٢دا سەربەخۆیی بەدەست هێنا، وڵاتی کۆمۆر لە زەریای هیند لە ساڵی ١٩٧٥دا بە سەربەخۆیی گەیشت. جیبوتی کە وڵاتێکی بچووکی دامەزراوە لە کەناری دەریای سوورە لە ساڵی ١٩٧٧دا سەربەخۆیی وەرگرت. ئەلجەزایر کێشەدارترین نموونەی دەرچوونی فەڕەنسا لەم کیشوەرەدا بوو، کە لە ڕێگەی شەڕێکی خوێناوییەوە لە پێناو سەربەخۆیی و شکستی کۆماری چوارەمی فەڕەنسا توانی بە سەربەخۆیی بگات. بەپێچەوانەوە بەریتانیا پلانی لەسەرە خۆی بۆ نەهێشتنی کۆڵۆنیال گرتەبەر. گوشارەکانی ناو ئەفریقیا، هێمای ئەوە بوون کە رێوڕەسمی رێسامەندانەی هێنانە خوارەوەی ئاڵای بەریتانیا و شکست هێنانی لە ساڵی ١٩٦٠دا مومکین بێت. کۆڵۆنەکان جیا لە سیشل کە لە ساڵی ١٩٧٦دا و زیمبابوا (رودزیای باشوور) لە کۆتایی شەستەکاندا سەربەخۆییان بەدەست هێنا. بەریتانیا لە ساڵی ١٩٨٠دا، بە فەرمی دەسەڵاتی زیمبابوای بەم وڵاتە سپارد.



ئەم هەڵپساردنەش (واتە بە دەستەوەدانی دەسەڵات بۆ زیمبابوا) بە هۆی شۆڕشی یان سمیت حکومەتی دەسەڵاتداری کەمینەی سپی پێست سەری هەڵدا کە بە یەك لایەنە لە ساڵی ١٩٦٥دا سەربەخۆیی لە بەریتانیا راگەیاند و پاش شەڕێکی درێژخایەن سمیت رەزامەندی لەسەر دانوساندن و (دامەزراندنی) حکومەتی زۆرینەی دەربڕی.

پۆرتۆگال لەهەمبەر رێڕەوی گۆڕانکارییەکانی ئەفریقیا بەرگرییەکی زۆرتری نیشاندا. لیسبۆن تا هەفتاکان کۆڵۆنەکانی ئەنگۆلا، موزامبیك و گینەی بیسائۆی کونترۆڵ کردبوو. بە هۆی کودەتای سەربازی لە پۆرتۆگال و تەنگژەکانی نێوان کۆڵۆنەکاندا، زەمینە بۆ سەربەخۆیی ئەم وڵاتانە هەموار کرا و حکومەتی میلیتاری لیبسۆن ناچارکرا هێزەکانی لە ئەفریقیا بکێشێنێتەوە و ئەمەش بوو بە هۆی سەربەخۆ بوونی سێ کۆڵۆن لە ساڵی ١٩٧٥دا.

لە کاتی سەربەخۆیی زیمبابوا لە ساڵی ١٩٨٠دا، دوو وڵاتیتر مابوونەوە تا ئیمپریالیزم بە تەواوی ئەم کیشوەرە بەجێبهێڵێت. نامبیا لە ساڵی ١٩٩٠دا سەربەخۆیی لە ئەفریقیای باشوور وەرگرت و زۆرینەی سپی پێست لە ساڵی ١٩٩٤دا دەسەڵاتیان لە ئەفریقیای باشوور گرتە دەست. دوو قەڵەمڕەو دەمێننەوە کە لە ژێر کونترۆڵی دەرەکیدا بوون (واتەسیۆتا و مێلیلا). سەرەڕای ئەمەش، تا ئێستاش هیچ دورگەیەك لە زەریای هیند و ئاتلانتیکدا لە ژێر دەسەڵاتی ئەورووپییەکانە.

چەندین فاکتەر پێکەوە بوونە هۆی دروستکردنی شەپۆلی دژی کۆڵۆنیالکاری. لە چەندین ناوچەدا هێزە کۆڵۆنیالکارەکان ناچار کران کە مافی ئۆتۆنۆمی و دیموکراسی بەو گەلانەی کە بە درێژایی شەڕی جیهانی لە پیناو بە دەست هێنانی ئەم مافانە تێدەکۆشان، ببەخشن. باسگەلی وەك تەنیا مرۆڤە پێشکەوتووەکان (واتە رۆژئاواییەکان) دەتوانن بە ئازادی و دەسەڵات بگەن، بەرەو نەمان بوون. ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەوڵی پەرەپێدان بە لیبرالیزم و کاپیتالیزم لە سەرتاسەری جیهانی دەدا. پرسی بەهاش لە ئارادا بوو. ئەو ئیمپراتورییەتەی کە خوازیاری لە ئەستۆ گرتنی بەرپرسیارێتی (ئەم وڵاتانە) بە بێ کۆڵۆنیال کردنیان بوو، هەنوکە بە لەمپەرێکی گەورە لەهەمبەر سامانی هێزی خێڵەکان هەژمار دەکرێت. لەم رووەوە، پاڵنەری دارایی و رەوشتی لە پاشەکێشەکردنی سیاسی لە ئارادا بوو. هەروەها لە دەرونی خودی کۆمەڵگاکانیش گۆشارگەلێك دروست بوو کە گەرەنتی سەربەخۆیی دەکرد. هەنوکە بۆ ئەفریقییەکان، ئەفریقیا ببوو بە داوایەکی (خواست) گشتی. ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا کامڵ ببوو و دەبوایا لە چەقی پرۆژەی نەتەوەسازی لە قۆناغی دوای کۆڵۆنیالدا بمێنێتەوە.

## ناسیۆنالیزم:

بەپێی پێناسە، ناسیۆنالیزم (چەمکێکی) سادەیە. ناسیۆنالیست خواستێکە کە بەپێی ئەم خواستە پێویستە نەتەوە لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی خۆیدا بەڕێوە ببردرێت. گرفتی ئەم پێناسەیە لێرەدایە کە پێویستە لێکۆڵەر سەرەتا بزانیت نەتەوە چییە؟

نەتەوە شوناسێکە فیزیکی (بۆ نموونە) وەك هەستێك نییە، بەڵکو کۆمەڵە خەڵکێکی لیك کۆ بووەی خاوەن بەها و نەریتی هاوبەشە کە لە زمان و مێژوو و خاك هاوبەشن. ئەندامانی ئەم گرووپە بە هاوڵاتی هەژمار دەکرێن و لەهەمبەر بیانییەکان، خۆیان سەر بەم نەتەوەیە دەزانن.

نەهێشتنی کۆلۆنیال لە ئەفریقیادا (خشتەی ژمارە ١-٣)

| ناوی وڵات | هێزی کۆلۆنیالکار | ساڵی سەربەخۆیی |
|---|---|---|
| ئەلجەزایر | فەرەنسا | ١٩٦٢ |
| ئەنگۆلا | پۆرتۆگال | ١٩٧٥ |
| بنین (داهومی) | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| بۆتسوانا (بیچوانالاند) | بەریتانیا | ١٩٦٦ |
| برۆندی (ئۆرۆندی) | ئەڵمانیا، بەلجیکا لە ١٩١٦ | ١٩٦٢ |
| کامیرۆن | ئەڵمانیا، بەلجیکا، فەرەنسا لە ١٩١٨ەوە | ١٩٦٠ |
| کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست (ئۆبانگی چاری) | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| گەروی سەوز (کیپ تاون) | پۆرتۆگال | ١٩٧٥ |
| چاد | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| کۆمۆر | فەرەنسا | ١٩٧٥( جیا لە دورگەی مایوتی ) |
| کۆماری کۆنگۆ (کۆنگۆی فەرەنسا، کۆنگۆی برازاویل) | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ (کۆنگۆی بەلجیکا، کۆنگۆی | بەلجیکا | ١٩٦٠ |



| | | |
|---|---|---|
| کینشازا، زەئیر) | | |
| کەناری عاج (کوت دیوار) | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| جیبوتی (سومالی لاندی فەرەنسا، ئافارس، ئایساس) | فەرەنسا | ١٩٧٧ |
| میسر | بەریتانیا | ١٩٢٢ |
| گینەی ئەستوا ( فرناندۆپۆ، ریۆ میونی) | ئیسپانیا | ١٩٦٨ |
| ئەسیۆپیا | - | - |
| ئەریتریا | ئیتاڵیا | (فدراسیۆنێك لە ئەسیۆپیا ١٩٥٢) سەربەخۆیی٩٣ ١٩ |
| گابۆن | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| گامبیا | بەریتانیا | ١٩٥٧ |
| غانا (کەناری ئاڵتون) | بەریتانیا | ١٩٥٧ |
| گینە | فەرەنسا | ١٩٥٨ |
| گینەی بیسائۆ | پۆرتۆگال | ١٩٧٤ |
| کینیا | بەریتانیا | ١٩٦٣ |
| لسۆتۆ (باسۆ تولاند) | بەریتانیا | ١٩٦٦ |
| لیبریا | - | ١٨٤٧ |
| لیبیا | ئیتاڵیا | ١٩٥١ |
| ماداگاسکار | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| مالاوی (نیا سالاند) | بەریتانیا | ١٩٦٤ |
| مالی (سوی دان) | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| موریتانی | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| موریس | بەریتانیا | ١٩٦٨ |
| مەغریب | ئیسپانیا و فەرەنسا | ١٩٥٦ |
| موزامبیك | پۆرتۆگال | ١٩٧٥ |

| | | |
|---|---|---|
| نامیبیا (ئەفریقیای باشووری ڕۆژئاوا) | ئەڵمانیا و دواتر لە ژێر سەرپەرشتی ئەفریقیای باشوور لە ساڵی ١٩٢٠ەوە | ١٩٩٠ |
| نیجر | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| نیجریا | بەریتانیا | ١٩٦٠ |
| ڕواندا | ئەڵمانیا و دواتر بەلجیکا لە ساڵی ١٩١٦ەوە | ١٩٦٢ |
| کۆماری عەرەبی بیاوان (بیاوانی ڕۆژئاوا) | ئیسپانیا | پاش کشانەوەی ئیسپانیا لەلایەن مەغریبەوە داگیرکرا ١٩٧٦ |
| سائۆتۆمە و پرەنسیپ | پۆرتۆگال | ١٩٧٥ |
| سنگال | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| سیشل | بەریتانیا | ١٩٦١ |
| سیرالیۆن | بەریتانیا | ١٩٦١ |
| سومالی | بەریتانیا و ئیتاڵیا | ١٩٦٠ |
| ئەفریقیای باشوور | یەکێتی کۆلۆنەکانی بەریتانیا و کۆماری بۆیر | ١٩١٠- حکومەتی زۆرینە ١٩٩٤ |
| سودان | بەریتانیا (کۆمەڵەی میسری- بەریتانی) | ١٩٥٦ |
| تانزانیا | ١. ئەڵمانیا و دواتر بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٩ەوە ٢. بەریتانیا | تانگانیکا١٩٦١ زەنگبار ١٩٦٣ تانزانیای یەکگرتوو لە ١٩٦٤ |
| تۆگۆ | ئەڵمانیا، دواتر بەریتانیا و فەرەنسا لە ١٩١٩ەوە | ١٩٦٠( تۆگۆ لاندی بەریتانیا بە غانا سپێردرا) |
| تونس | فەرەنسا | ١٩٥٦ |
| ئۆگاندا | بەریتانیا | ١٩٦٢ |



| | | |
|---|---|---|
| زامبیا (ڕودزیای باکوور) | بەریتانیا | ١٩٦٤ |
| زیمبابوا (ڕودزیای باشوور) | بەریتانیا | ١٩٨٠ یەکێتی دیموکراتیکی سەربەخۆ لە ١٩٦٥ەوە |
| بۆرکینافاسۆ (ڤۆلتای سەروو) | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| سوازی لاند | بەریتانیا | ١٩٦٨ |

بنديك ئاندرسۆن نەتەوەکان بە " کۆمەڵگا خەیاڵییەکان" ناو دەبات، ئەم ناونانەوەیەش بەو هۆیەوە بوو کە ئەندامانی کۆمەڵگا بچووکەکان هیچ کات نە زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵگایان بینیوە و نە لەبارەیاندا شتێکیان بیستووە و تەنانەت لە هزری ئەم کەسانەدا وێنایەکی تایبەت بە کۆمەڵگاکەیان بوونی نییە.

بە سوود وەرگرتن لە ئاماژە و لێکدانەوەکانی پێشووتر و سیمبولەکانی وەك ئاڵا، دروشم و بۆنەکان ئەندامانی ئەم نەتەوەیە، هاوبەندی کۆمەڵایەتییان بەپێی بەها نەتەوەییەکان و شێوازی ژیانی هاوبەشیان بە بوون هێناوە. لەم ڕووەوە تاکەکان پشتگیری ماددی و فیزیکی هەڵقوڵاو لە ئەندام بوون لەو نەتەوە و دەوڵەتدا بەدەست دێنن و زیاد لەمەش، ئەم جۆرە ئەمنیەتە لە کاتی یەکگرتنی دەسەڵاتی سیاسی پەرەدەسێنێت و بەم جۆرەش ناسیۆنالیزم سەر هەڵدەدات.

ناسیۆنالیزم کاتێك سەرهەڵدەدات کە ئەندامانی نەتەوەیەکی هۆگری یەکگرتنەوە، هەوڵی بوون بە یەکەیەکی سیاسی بدەن. ئەم پرسەش ڕێکخستن و دەسەڵاتی سیاسی بە نەتەوە دەبەخشێت. لێرەدا نەتەوە دەتوانێت سوود لە ئۆتۆنۆمییەکەی وەرگرێت و لە ڕێگەی دامەزراوە بەتواناکانی حکومەتەوە بەرژەوەندییەکانی دەستەبەر و چارەنووسیشی کونترۆڵ بکات. دەسەڵاتی دەوڵەت دەتوانێت سەرەڕای پارێزگاری کردن لە بەها نیشتمانییەکان، وڵات لەهەمبەر گوشاری نەتەوەکانیتر بپارێزێت.

نموونەیەکی کلاسیکی ناسیۆنالیزم کە بوو بە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێ، دەتوانین ئاماژە بە ئیتاڵیا بکەین. پێش ساڵی ١٨٦١ گەلی ئیتاڵیا بەسەر چەند ناوچەدا دابەش ببوون، بەڵام چالاکی دیپلۆماتیك و شەڕە پارتیزانییەکان بوو بە هۆی یەکگرتنەوەی گەل و دامەزراندنی دەوڵەتی یەکگرتووی ئیتاڵیا. دەوڵەتی ئیتاڵیا پارێزگاری لە سەروەرییەکەی کرد و لەبری ئەمەشدا، ئۆتۆنۆمی و دامەزراوە سیاسییەکانی بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی نەتەوە بە دیاری هێنا. ئەڵمانیاش پاش ١٠ ساڵ لە ساڵی ١٨٧١دا پەیڕەوی لە پرۆسەیەکی هاوشێوەی

(ئیتالّیای) کرد. له هەردوو نموونەدا، نەتەوە خوازیاری (دامەزراندنی) دەوڵەت بوو، دواتریش ئەرکی دەوڵەتی نویێ، پاراستن و گەشەدان بە نەتەوەیەك بوو کە ئەم دەوڵەتەی دامەزراندبوو.

## ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا:

سروشتی ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا تا رادەیەك جیاوازە لە سروشتی هاوتا ئەوروپییەکەی. بۆ نموونە وڵاتە مۆدێرنەکانی ئەفریقیا هەر لە سەرەتای دروست بوونەوە، دەرهاوێشتەی داخوازییەکانی ناسیۆنالیستی ناوخۆ نەبوون. بە پێچەوانەوە هەروەك لە بەشی پێشووتردا باسکرا، وڵاتانی ئەفریقیا لە ژێر گوشاری دەرەکیدا بوون. هێزە ئیمپریالیستییەکان، سنوورە سیاسییەکانیان دادەڕێشت کە بە بەراورد لەگەڵ سنووری کولتووری و شوناسی ئەفریقیا یەکتریان نەدەگرتەوە. ئەمەش بەو مانایەوە دێت کە گرووپە جۆراوجۆرە کولتوورییەکان بە شوناسی دژ بەیەك لە دەوری یەکتر کۆ ببوونەوە. نەبوونی یەککگرتوویی و کولتووری هاوبەش بەو مانایە بوو کە ئەم کۆمەڵگایانە بە نەتەوە هەژمار نەدەکران. لەبری ئەمەشدا ئەفریقییەکان دەستیان کرد بە پاراستن و برەودان بە بۆچوونی کۆمەڵایەتی لە ئاستی خۆجێیی و خوار دەوڵەتەوە (sub-state) وەك گرووپی خزمەکان، خێڵ و هۆز. حکومەتە ئیمپریالیستییەکانیش بە کردەوەکانیان کاریگەرییان لەسەر نەبوونی شوناسی نەتەوەیی دەکرد کە ئەم بێ شوناسیەش لەلایەن خودی ئەم دەوڵەتە کۆلۆنیالکارانەوە دروست ببوو. بە کورتی دەوڵەتە هاوچەرخەکانی ئەفریقیا پێش سەرهەڵدانی شوناس بۆ دامەزراندنی دەوڵەت، دامەزران و ئەم پرسەش تا ناوڕاستەکانی سەدەی بیستەم کە چالاکییە سیاسییەکانی سەرکەوتوو، هەستی ناسیۆنالیستی لە گشت ئەم کیشوەرەدا وروژاند درێژەی کێشا.

لە پەنجاکاندا، ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا بە جیددی بەرەنگاری حکومەتی ئیمپریالیستی بووە. ئەم بەرەنگارییەش وەك بەرپەرچدانەوەی کۆلۆنیال بوو و ئامانجیشی رزگارکردنی ئەفریقیا لە ژێر دەستی حکومەتە بیانییەکان بوو. لەم رووەوە، ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا رەنگدانەوە کۆنەکەی داواکاری ئەفریقییەکان بۆ ئۆتۆنۆمی بوو. ئەگەرچی سەرکردەکانی بزاڤە رزگاریخوازەکان تەنیا یاساکانی ئیمپریالیزمیان لەناو برد. ئەم سەرکردانە بە پێچەوانەی ناسیۆنالیستەکانی ئەوروپا هەوڵی دامەزراندنی وڵاتێکی نویێ بۆ جێگیرکردنی نەتەوەکەیان نەبوو، بەڵکو ئامانجیان دەستگرتن بەسەر دەوڵەتە کۆلۆنیالکارە دامەزراوەکان بوو تا لەم رێگەیەوە خودی ئەفریقییەکان دەسەڵات بگرنە دەست. بەمجۆرەش پارێزگای کردن لە دەوڵەتی یەککگرتوو پەرەی سەند و لە هەمان کاتیشدا هەندێ سنووردارێتی دروست کرد. ئامانج،



سەرهەڵدانی نەتەوەی نوێی ئەفریقیایی لە دەرونی ستراکتۆریی لە پێشتر دامەزراوی دەوڵەتی کۆلۆنیال بوو. بەمجۆرەش ئەفریقییەکان چوونە ناوی قۆناغی نوێی دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدێرندا.

یەکێتی نەتەوەیی لە چەقی ناسیۆنالیزمی ئەفریقیادابوو. ئامانج، ئاراستەکردن و گۆڕینی فرە نەتەوەیی، فرە کولتووریی، فرە ئایینی و فرە نەژادیی بەرەو نەتەویەکی یەکانە (یەککگرتوو) بوو. دەبوایا نەتەوەیەکی نوێ سەری هەڵدابا تا توانرابا پانتای سیاسی دروستکراو لە رێگەی سنوورەکانی دەوڵەتی کۆلۆنیالەوە کامڵ بکرێت. هەر بۆیەش پۆلۆرالیزمی کولتووری لەلایەن سەرکردە ناسیۆنالیستەکانەوە شتێکی پەسەند دراو نەبوو.

لەو ناوچانەی کە لەبری خاك شوناسی ئەفریقییەکان بۆ باو و باپیر و نەژاد دەگەڕێتەوە، هەنوکە ئەوان خوازیاریی یەکبوونی دەوڵەت- نەتەوەن.

هەروەك هاستینگ باندا، سەرۆك کۆماری مالاوی رایگەیاند:" ئەوەندەی کە من دەزانم هیچ (نەژادێکی) یایۆ، لۆموو، سینا، ئەنگۆنا، نیا کیوسا، تۆنگۆ، بوونی نییە. تەنیا مالاوییەکان لەم وڵاتەدا نیشتەجێن، ئەمەش هەموو شتێکە". سامۆرا ماچل، سەرۆك کۆماری موزامبیکیش بە کورتی رایگەیاند کە" بۆ (بەردەوام بوونی) ژیانی نەتەوە، پێویستە خێڵ لە ناو ببردرێت.

لە خەباتی بنیاتنانەوەی نەتەوەگەلی وەك مالاوی و موزامبیك، ناسیۆنالیستەکان، سیاسەتمەداران و زانایان پەیوەندی نەژادییان بە لەمپەر هەژمار دەکرد. لە روانگەی ئەمانەوە، خێڵەکان ئەنتیتیێزی و رێگری پێشکەوتن بوون. بەم پێیەش خێڵگەرایی بە تاوانێك لەهەبەر دەوڵەتی دوای کۆلۆنیال وێنا دەکرا ئازادیش بە براوە گۆڕەپانی رکابەرێتی هەژمار دەکرا. هەنوکە نەتەوە ئەولەوییەتی هەیە و دەبوایا پەیوەندی کۆنی خێڵەکی لە ناو ببردرێت و گشت هێزی دەوڵەت بۆ پرۆسەی بنیاتنانەوەی دەوڵەت تەرخان بکرێت. بەپێی ئەم بەڵگانەش ناسیۆنالیزم هیچ یەك لە تایبەتمەندییەکانی خۆی لە دوای قۆناغی سەربەخۆیی لە دەست نەدا، بەڵکو بە پێچەوانەوە بوو بە ئایدیۆلۆژیای زاڵی گشت دەوڵەتە تازە دامەزراوەکانی سەربازگەرا.

گەشەی ئابووری بە ئامانجی یەکێتی نەتەوە لکێنرا. وتەکانی سەرۆك کۆمار جولیۆس نایرێرێ کە لە دوای سەربەخۆیی تانگانیکا لە ساڵی ١٩٦١دا نووسراوەتەوە، بوو بە رەهەندی بیرۆکەی ناسیۆنالیستی ئەو کات. جۆلیۆس کارکردن لە پێناو وڵاتدا بە خەباتێکی نیشتمانپەروەرانە هەژمار دەکرد کە دەبێتە هۆی لەناوبردنی جیاوازییەکان و گشت رەگەزەکانی وڵات پێکەوە گرێ دەدات. هەر کە وڵاتە ئازادەکان دامەزران یەکەمین ئەرکی ئەم وڵاتە بریتییە لە بنیاتنانەوەی ئابوور. ئەم کارەش لە سەرتاسەری وڵاتدا ئەنجام دەدرێت و بە ئامانجێکی

سەرکەوتوو وێنا دەکرا و گرنگییەکەی کەمتر لە خەبات دژی کۆلۆنیال نییە. ئەم روانگەیە هیچ جۆرە جیاوازییەك (لەنێوان گەلدا) پەسەند ناکات.

دوای سەربەخۆیی چالاکی سیاسی زۆرتر لە رێگەی سیستەمی تاکپارتییەوە کە لەلایەن دەوڵەتەوە دانی پێنرابوو و چالاکی بەرهەڵستکارانیش قەدەغە کرایە، ئەنجام دەدرا. ئەو رێکخراوانەی کە پێشتر لە کۆمەڵگای مەدەنیدا چالاك بوون وەك یەکێتی بازرگانی، بزاڤی گەنجان، یەکێتی ژنان، کە حکومەت مۆڵەتی چالاکی گێرانیان پێ دابوو، دەسەڵاتی حکومەتیان سنووردار کرد. هاوکاری نەژادیی سنووردار و قەدەغەکراو بوو. تەنانەت ئەگەر زاراوەی جۆراوجۆریش لە وڵاتە ئەفریقییەکاندا بوونی هەبوایا، تەنیا یەك زمان بە فەرمی دەناسرا. بە کورتی، رکابەرێتی فرەلایەنی لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالدا بوو بە قوربانی ئامانجی یەکێتی نەتەوەیی و گەشەی ئابووریی. چونکە ناسیۆنالیزم لەلایەن دەوڵەتەوە بەهێز دەکرا و بوو بە ئایدیۆلۆژیای زاڵ بەسەر دەوڵەتدا.

## چیرۆکی ئایدیۆلۆژیا لێك جیاوازەکانی ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا:

گشت وڵاتە تازە سەربەخۆیەکانی ئەفریقیا ببوون بە وڵاتی دژی ئیمپریالیزمی و نەتەوەگەرا، بەڵام ئەمەش نەبوو بە هۆی خۆ گونجانی ئەم وڵاتانە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیا دیارەکاندا. هەر وڵاتێك جۆرە ئایدیۆلۆژیایەکی بێ هاوتای لە پێناو پاراستنی یەکێتی نەتەوەیی و گەشەی ئابووری گرتەبەر. هەڵبەت زۆربەی سەرکردە نەتەوییەکان فەلسەفەی سیاسی تایبەت بەخۆیان هەبوو کە لە سەنتەری گشت چالاکییەکانی وڵاتدا چەقی گرتبوو. بۆ نموونە سینگۆر، رێبازی نیگرۆمە، کایندا رێبازی مرۆڤدۆستی، نایرێرێ رێبازی کۆمەڵی و مۆبۆتۆ رێبازی مۆبۆتیزمی گرتەبەر. سەرەڕای ئەم جۆراوجۆرییەش دەکرێ ئایدیۆلۆژیا نەتەوییەکان بەسەر چوار گرووپدا دابەش بکەین: سۆسیالیزمی ئەفریقیا، سۆسیالیزمی زانستی، کۆمەڵەگەرایی (پۆپۆلیزم) و سەرمایەداریی. (پوختەی ئەم بەشە لە خشتەی ٢-٣دا هاتووە.)

بە توێژینەوەی هەر یەك لەم ئایدیۆلۆژیا سەرەکییانە دەتوانین سیستەمی سیاسی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال باشتر شی بکەینەوە.

### سۆسیالیزمی ئەفریقیا:

بێگومان زۆربەی دەوڵەتانی ئەفریقیا روانگەی سۆسیالیستییان هەیە. بە رزگار بوونی ئەم وڵاتانە ئەرکی حکومەت کەمکردنەوەی پشت بەستن بە رۆژئاوا و بنیاتنانەوەی ئابوور بوو تا



لەم رێگەیەوە ئەولەوییەتی پێداویستییەکانی گەشەی خۆجێیی دابین بکات. ئەمە تەنیا رێگەی کەمکردنەوەی هەژاری بوو و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتیش بۆ گەل فەراهەم دەکرا. ژمارەیەکی کەمی سەرکردەکانی ئەفریقیا، کاپیتالیزم و لیبرالیزمیان وەك شێوەیەکی گونجاو بۆ دەستگەیشتن بە ئامانجەکانیان، پەیرەوی کرد.

سۆسیالیزم هێمای" کاڵای خۆڕایی" و تلسمێکی سیاسی بوو کە زۆرێك وەها هزریان دەکردەوە کە بە پێشکەوتن و دەست گەیشتن بە کەرەستەی سەرەتایی لەم کیشوەرەدا، دەتوانن قەرەبووی هەڕەشەکانی کۆلۆنیالی نوێ بکەنەوە. ئاریستید زۆلبرگ لەو بڕوایەدا بوو کە بۆ مرڤێکی ئەفریقیایی کە ئەرکی قورسە حکومەتی لە ئەستۆیە (دەسەڵاتدارە) سۆسیالیزم لە شێوازێکی زانستی باشترە و وەك عیرفان و نهێنی میتافیزیکییە کە بۆ لایەنگرانی، نهێنییەکانی گەشەی ئابووری ئاشکرا دەکات.

وەها نییە کە سەرکردەکانی ئەفریقیا، سۆسیالیزمیان بەو شێوەیەی کە سۆڤیەت بڵاوی دەکردەوە جێبەجێیان کرد. ئەگەرچی پەیوەندی دوولایەنە لەگەڵ ئەم وڵاتەدا پەرەی سەند، بەڵام دەوڵەتانی ئەفریقیا وریا بوون کە مەودای خۆیان لەگەڵ سۆڤیەت بپارێزن. هەروەك ئەحمەد سیکۆتۆری سەرۆك کۆماری کینیا هۆشداریدا:" هەوڵدان بۆ رۆژئاوایی بوون، ئەفریقیا بەرەو نکۆڵی کردن لە شوناسی ئەفریقیایی بوونی ئاراستە دەکات". لەبری ئەمەشدا، سیاسەتمەدارانی ئەفریقیا بەپێی رەگ و ریشەی ناسیۆنالیست، پەرەیان بە سۆسیالیزمی تایبەت بە خۆیان واتە سۆسیالیزمی ئەفریقیادا.

لیۆپۆلد سینگۆر، سەرۆك کۆماری سینگال ئاماژە بە گرفتەکانی هەڵقولاو لە سۆسیالیزمی توندڕەوی ئەوروپای کرد و رایگەیاند:"ئاشکرایە کە سۆسیالیزمی ئەفریقیا ناتوانێت وەك سۆسیالیزمی مارکس یاخود ئەنگلز کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا بەپێی میتۆدی زانستی واقیعی بوون، کاربکات". بۆ نموونە تیورییە کلاسیکییەکانی سۆسیالیزم پرۆلتاریای بە چینێکی شۆڕشگێڕ دەزانی کە پێویست بوو بۆرژوازی لە ناو ببات. لە ئەفریقیادا، بە هۆی نەبوونی بناغەی پیشەسازیی، هیچ چینێکی راستەقینە کە بتوانرێ باسی لێ بکرێت و هیچ کۆمەڵگایەکی لە رادەبەدەر لێکجیاوازیش بوونی نەبوو. دەبوایا دەوڵەتانی ئەفریقیا ئەزموون و ئایدیۆلۆژیا پێکەوە گرێ بدەن. هەر بۆیەش سۆسیالیزمی ئەفریقیا جەختی لەسەر بەها سوونەتیەکان دەکردەوە. سەرکردەکانی ئەفریقیا پێش حکومەتی کۆلۆنیالی، کۆمەڵگاکەیان بە کۆمەڵگای بێ چین، کۆمەڵگای کۆمۆنی (سۆسیالیزم) و یەکسانیخواز وەسف دەکرد و لەو

بڕوایەدابوون کە هیچ جۆرە خاوەندارێتییەك لەم کیشوەرەدا بوونی نییە. هەروەها لە لێکدانەوەکانیاندا رایاندەگەیاند کە بەرژەوەندییەکانی ئەم کۆمەڵگایە لە سەرووی بەرژەوەندیی تاکەکانە. لەم روانگەیەوە سینگور لەم بڕوایەدابوو کە " پێش هاتنی ئەوروپییەکان (بۆ ئەفریقیا) ئەفریقییەکان زانیارییان سەبارەت بە سۆسیالیزم هەبوو".

بەم جۆرەش سۆسیالیزمی ئەفریقیایی هەوڵی سەرلەنوێ زیندووکردنەوەی بەها سونەتییەکان و گرێدانی بە تەکنۆلۆژیا و دەوڵەت-نەتەوەی دەدات. هەروەها سەبارەت بە تێکهەڵکێشانی یەکسانی، هاوکاریی و مرۆڤایەتی کۆمەڵگا لادێییەکان بە سامان و هێزی شاراوەکەی کە دەبوایا بەپێی شێوازەکانی بەرهەمهێنانی مۆدێڕن و کۆمەکی دامەزراو دەوڵەتییەکانەوە دابمەزرێت، (سۆسیالیزمی ئەفریقیا) بۆچوونگەلێکی پێشکەش کرد. لەم شێوازەدا سۆسیالیزمی ئەفریقیا هەوڵیدا تا لە قۆناغی سەرمایەداری گەشەسەندن و شیکردنەوەی مارکسیستە کلاسیکییەکان سەرووتر بڕوات و نەبێت بە جێگرەوەی سۆڤیەت و دیکتاتۆری چینی پرۆلتاریا. سەرکردەکانی ئەفریقیا لەو بڕوایەدا بوون کە شێوازی ناسەرمایەداری پشت بە خۆ بەستراوەی بەدیهێنەری سۆسیالیزم، پێویستە سیستەمێکی نوێ بەدی بهێنێت کە هەژاری کەم بکاتەوە و خۆشگوزەرانی و رێزگرتن لە مرۆڤ پەرە بسێنێت.

سۆسیالیزمی ئەفریقیا، دەوڵەت لە چەقی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیدا جیگیر دەکات. بەم جۆرەش دەوڵەت ماشینی گەشە پێدانە. سەرمایەی گشتی ببوو بە رەگەزی زاڵی ئابووری پلان بۆ دارێژراو و کەرتە تایبەتییەکان بە نیشتمانی کران (وەك سەرمایەی دەرەکی) و خودی دەوڵەت پرۆژەکانی گەشەپێدانی ژێرخان و پیشەسازیی گەورەی لە ئەستۆ گرت. بەرهەمەکان لە رێگەی گرووپەکانی دەستنیشانکراوی دەوڵەت، کڕدران و کاڵا بەرخۆرەکانیش بە رێژەیەکی یەکجار زۆر لە سۆپەرمارکێتە دەوڵەتییەکاندا فرۆشران. دامەزراوەکانی دەوڵەت کونترۆڵی نرخی کاڵایان دەکرد و بەکورتی دەسەڵات لە رێگەی کونترۆڵ کردنی بەرهەمهێنان و دابەشکردن (توزیع) لەلایەن دەوڵەتەوە، سنووردار کرا.

هەروەها دەوڵەت گۆڕەپانی سیاسیشی کونترۆڵ کرد. لە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیادا، دەوڵەت، بوو بە تاك پارتی و لە ناوەندەوە سەرکردایەتی دەکران و ئازادییەکی کەم بۆ چالاکی گێڕانی گرووپە بەرهەڵستکار و سیاسەتمەدارە خۆجێییەکان درا. بە بیانووی یەکێتی نەتەوەیی و پێویستی دەوڵەت بە جێبەجێ کردنی ستراتیژی گەشەی بەردەوام، پۆلۆرالیزم سنووردار کرا.



سەرەڕای سروشتی ئابووری و سیاسی و تایبەتمەندییە پراکتیکییانەی سۆسیالیزمی ئەفریقیا، حکومەت ئەم جۆرە چالاکییانەی گرێدراو بە ئامانجەکانی ناسیۆنالیزم هەژمار دەکرد کە لە ژێر ناوی دژی ئیمپریالیستی، یەکێتی نەتەوەیی، پشت بە خۆ بەستن و بەهێزکردنی گەشەی ئابووری ئەم چالاکییانە ئەنجام دەدران. سەرکردەکانی ئەفریقیا وەها بۆی دەچوون کە رێگەیەکی ناسەرمایەدارییان بۆ بەختەوەری داهاتوو بنیات ناوە. گشت دەوڵەتانی ئەفریقیا هەوڵی گەیشتن بە ئامانجە نەتەوییەکانی دەدا و وەك ئایدیۆلۆژیاکانیتر، سۆسیالیزمی ئەفریقیا هیچ جۆرە رێزپەڕییەکی پەسەند نەدەکرد. سۆسیالیزم بە هۆی هەندێ واقیعییەتەوە گرفتساز بوو، وەك سروشتی ئابووری نێودەوڵەتی (روونکردنەوەی زۆرتر لە بەشی نۆیەمدا هاتووە) و ناتوانایی لە مۆبیلیزە کردنی چینی وەرزێران لە پرۆژەی ئابووری نێودەوڵەتی (بڕوانە بابەتی تۆێژینەوەی کۆتایی ئەم بەشە)، دابەش بوونی کۆمەڵایەتی ناوخۆ (بڕوانە بەشی چوارەم) مەیلداری نوخبە حکومیەکان بۆ خزمەت بەخۆ کردن لەبری خزمەتکردن بە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگا (بڕوانە بەشی پێنجەم و دەیەم). کە ژمارەیەك لەم ئەزموونانە لە سەردەمی سەرهەڵدانی کودەتا سەربازییەکان لە ناوڕاستی شەستەکان بۆ سەرەوە، لە ناو چوو.

سۆسیالیزمی ئەفریقیاش لە رەخنەی رۆشنبیران بە دوور نەمایەوە. زۆرێك لەم رۆشنبیرانە، ئەم جۆرە سۆسیالیزمەیان بە ئامرازێکی لێهاتوو بۆ سەرکوتکردنی روانگە جێگرەوەکانی (ئەلتەرناتیڤ) و هەڵپساردنی ئامرازە مەدەنییەکان دەزانی. هەندێ دەوڵەتیتر بۆ پەیڕەوی نەکردن لە رێبازی مارکس و ئەنگلز رەخنەیان ئاراستەی مارکسیزمی کلاسیکی ئەوروپا گرت. ئەوان رایانگەیاند کە وتارە رادیکالەکانی سەرکردە نەتەوەییەکانی ئەفریقیا لەگەڵ سیاسەتە گشتییەکان هەماهەنگ نییە. یەکێتی سۆڤیەتیش ژمارەیەك لەم وڵاتانەی بە وڵاتی چاکسازیخواز وەسفکرد. چونکە ئەم وڵاتانە بەپێی سروشتی سەربەخۆیانەی سۆسیالیزمی ئەفریقیا، سەرەڕای نەریت و مرۆڤدۆستی بەهێز، بەلارێدا رویشتن کە ئەمەش زۆرتر هاوتەریبی بەهاکانی سۆسیالیزمی زانستی بوو.

## سۆسیالیزمی زانستی:

" ناکرێ سۆسیالیزمی ئێمە بە سۆسیالیزمی سومالی، سۆسیالیزمی ئەفریقیایی و سۆسیالیزمی ئیسلامی ناو بنرێت، سۆسیالیزمی ئێمە سۆسیالیزمی زانستییە کە بە مارکس و ئەنگلزەوە بنیاتنرا". ئەم وتەیەی زیاد بارێ نیشانەی گۆڕینی رێبازی ئایدیۆلۆژیکێك بوو کە

له ساڵی ١٩٦٩یەوە لە سومالی و چەندین وڵاتی ئەفریقیا جێبەجێ کرا. رژێمی میلیتاریی مارین نگوابی لە کۆنگۆی برازاویل، یەکەمین حکومەت بوو کە وەفادارێتی بە سۆسیالیزمی زانستی راگەیاند. دوای ساڵێك سومالی ئەم رێبازەی گرتەبەر و لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا شەپۆلێکی بەرفراوانی گۆڕینی ئایدیۆلۆژیك لە ئەفریقیادا سەری هەڵدا. کودەتای پۆرتۆگال لە ساڵی ١٩٧٤ زەمینەی بۆ بزاڤە پارتیزانییەکانی مارکسیستی- لێنینیستی هەموار کرد و لە موزامبیك و ئەنگولادا دەسەڵاتیان گرتە دەست. لە سپتەمبەری هەمان ساڵدا هایلە سیلاسی، ئیمپراتوری ئەسیۆقبا لە دەسەڵات دوور خرایەوە و دەرفەت بۆ لایەنگرانی سۆسیالیزمی زانستی رەخسا. پاش دوو مانگ ماتیۆ کریکو، ئەفسەری سوپا شۆڕشی لە بنین هەڵگیرساند. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە لە جوەنی ساڵی ١٩٧٥دا دەوڵەتی میلیتاریستی ماداگاسکار بۆ مارکسیزم-لێنینیزم گۆڕدرا و بزاڤە رزگاریخوازەکانی زیمبابوا، نامبیا و ئەفریقیای باشوور وەفادار بوونیان بەم ئایدیۆلۆژیایە دەربڕی. رووداوەکانی (ئەفریقیا) تا کۆتایی هەشتاکان پێگەیەکی بەهێزیان بۆ سۆسیالیزمی زانستی فەراهەم کرد.

دوای یەکەم رەخنەگرتن لە یەکەمین شەپۆلی سۆسیالیزمی ئەفریقیا، مارکسیزم- لنێنیزم سەریهەڵدا. سۆسیالیزمی ئەفریقیا لە نەهێشتنی لەمپەرەکانی وابەستەیی ئابووری شکستی هێنا و زۆرێك لە حکومەتەکان کودەتای سەربازییان ئەنجامدا و دیکتاتۆری گەندەڵ و لەرزۆکیان دامەزراند. مارکسیزم — لێنینیزم ئەم ئەنجامەیان بە حەتمی دەزانی. بە بڕوای ئەوان سۆسیالیزمی ئەفریقیایی، بۆ ئەم کیشوەرە ناگونجێت. بە بۆچوونی ئەمانە هزرە رۆمانتیکە گشتگیرگەراکانی ئەفریقیا، حەقیقەتی شاردراوە لەململانێی چینایەتی سەرپۆش کرد. هەڵبەت لە زۆر بابەتدا بۆرژوازی حکومەتی چەوساندنەوەی جەماوەری لە ژێر ناوی سۆسیالیستیدا، ئەنجامی دەدا. بەمجۆرەش مارکسیزم — لێنینیستەکان رایانگەیاند کە تەنیا یەك سۆسیالیزم بوونی هەیە و پشتبەستراو بە زانستی شیکردنەوەی چینایەتییە. ئەمەش بەو مانایە بوو کە دەبوایا نوخبەکانی حکومەت لە چینی کۆمەڵایەتی وردە بۆرژوازی دەست هەڵگرن و لەبری ئەمانەشدا چینی کرێکار بنیات بنرێت. بەمجۆرەش دوو گرووپی وەرزێرەکان فەرمانڕەوایی دەکەن. تەنیا بە ئەنجامدانی ئەم جۆرە گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانەوە کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی راستەقینە دادەمەزرێت.

ئەسیۆپیا بایەتێکی توێژینەوەی بێ هاوتایە بۆ توێژینەوە لەسەر بەدواهاتەکانی بە دەسەڵات گەیشتنی رژێمی مارکسیست-لێنینیست بەسەر وڵاتانی ئەفریقیادا.



له ساڵی ١٩٧٥دا حکومەتی نوێی کۆلۆنێل ماریام منگۆستۆ گشت پیشەسازییە ناوخۆییە گرنگەکان و سەرمایەگوزارییە دارایی و بازرگانییەکان بە بێ قەرەبوو کردنەوە بە نیشتمانی کرد، رۆڵی سەرمایەی تایبەت بە دەرکردنی بڕیارێك لەلایەن دەوڵەت و راگەیاندنی کونترۆڵ کردنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان زۆر دابەزی. ئیتر دەوڵەت ئابووری کونترۆڵ دەکرد. هەروەها بەشێکی کەمی سەرمایەداریی دەرەکی لە ئەسیۆپیادا (بە قەرەبوو کردنەوە) بە نیشتمانی کرا و خاوەندارێتی زەوییەکانیش راستەوخۆ کەوتە ژێر کونترۆڵی دەوڵەتەوە. لە کاتێکدا کە پێشتر کۆمەڵگای ئەسیۆپیا بۆ رێزگرتن لە چینی خاوەنداری ئەسیۆپیا بێ هاوتا بوو. لە بورای گەشەی ئابووردا دەوڵەت گشت هەوڵەکانی بەسەر بەپیشەسازیی کردن و پەرەپێدان بە کارگە حکومییەکان و بە کۆمەڵایەتی کردنی کشتوکاڵ لە رێگەی دامەزراندنی کێڵگەی دەوڵەتییەوە، چڕ کردەوە. بە هەر حاڵ چینی کرێکار و وەرزێرەکان سەرکردەکانی شۆڕش بوون. لە کۆتادا رژێمی پارتی کرێکارانی ئەسیۆپیا بە مەبەستی بەدیهێنانی بەڵێنەکانی وەك پێشەنگی شۆڕش، دامەزراند.

له بورای سیاسەتی گشتیدا، لێك جیاکردنەوەی دەوڵەتە مارکسیستی — لێنینیستییەکان و دەوڵەتە سۆسیالیستییەکانی ئەفریقیا سەختە. دەوڵەتانی خاوەن (سیستەمی) سۆسیالیزمی زانستی لەوانەیە سەبارەت بە سۆسیالیستی بوونیان زۆر سیستەماتیکانە (کار) بکەن و تەنانەت دەکرێ لە دەربڕینی ئەم ئایدیۆلۆژیایەش خۆیان دوور بخەنەوە. ئەگەرچی ناتوانین بڵێین کە رژێمە سۆسیالیستییە زانستییەکان بە بەراورد لەگەڵ پێش سۆسیالیستییەکان کەمتر نەتەوەگەران. بۆ نموونە لەکاتی پەیوەندی کردنی دەوڵەتانی ئەفریقیا بە بلوکی ئایدیۆلۆژیکی جیهان بە سەرکردایەتی سۆڤیەت، پرۆلتاریای نێودەوڵەتی هیچ کۆدەنگیان نەبوو. هەروەك سامۆرا ماچل سەرۆك کۆماری موزامبیك رایگەیاند" ئێمە نامانهەوێت ببین بە بۆلگلریایەکیتر". مۆسکۆ بە هەژمارکردنی ئەم رژێمانە بە مارکسیزم-ئەفریقیایی، بەرپەرچی بۆچوونەکانی سۆسیالیزم بووە. هەڵبەت رژێمە ئەفریقیایی- مارکسیزمییەکان بۆچوونی پلان دارێژراویان لەهەمبەر مارکسیزم — لێنینیزم گرتەبەر. هێمای بەرچاوی وەك نەبوونی جیاکاری لەهەمبەر ئایینە دیسیپلێن کراوەکان و هاوکاری کردنی حکومەت لەگەڵ کۆمپانیا نێودەوڵەتییەکان روون و بەرچاو بوون و رژێمە مارکسیست — لێنینیستییەکان زۆرتر لەگەڵ رۆژئاوادا بازرگانییان دەکرد تا لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت یاخود ئەورووپای رۆژهەڵات. ئەم لێکدانەوەیەی سەربەخۆ بۆ سۆسیالیزمی زانستی (کێنس جویس)ی بەم ئەنجامە گەیاند کە" ناوەرۆکی سەرسوڕهێنەری رژێمە مارکسیست-

ئەفریقییەکان، نەبوونی کۆمەڵگای ئایدیۆلۆژیکی، ستراتیژییەکانی پێشکەوتن و گەشەی بەردەوامی دامەزراوەکان، هاوجووت لەگەڵ شوناسەکەیانە. داخوازی نەتەوەگەرەکان بۆ یەکێتی (نەتەوەیی) و گەشەسەندن، لەبری ئەوەی کە هەر (لە بنەرەتدا) بوونیان نەبێت لە رادەبەدەر بوون و ئەولەوییەتی داواکارییەکانیش بەپێی ململانێی چینایەتی دیار دەکران.

سەرەڕای ئەم باسانە، ئەم راستییەش بوونی هەبوو کە ئاسەوارێك لە هەڵومەرجی ماددی کە بەپێی پێشبینی مارکس هەڵگری پەیامی روودانی شۆڕشی سۆسیالیستی بوو، لە ئەفریقیادا بوونی نەبوو. بە وتەی (بەری مۆنسلاو) هیچ چینێکی کرێکاری هۆشیار بۆ دامەزراندنی حکومەتی شۆڕشگێڕی و سۆسیالیزم بەپێی بنەما بەهێزەکانی تەکنۆلۆژیا بوونی نەبوو. سۆسیالیزم بەهۆی توانایی بەرهەمهێنان و کارامەیی هێزی سەرمایەداریی نێودەوڵەتی لە چۆك پێدادانی سەرمایەداریی بێ توانا بوو. تەنانەت یەکێتی سۆڤیەتیش بە ستراکتۆریی بەهێزی پێشەسازیی، داهێنانی نوێ، تەکنۆلۆژیای سەربازیی و فراوانی سەرچاوە سروشتییەکان لەم کارەدا شکستی هێنا. دەوڵەتانی ئەفریقیا کە هێزی ئەمنیان لە کونترۆڵکردنی ململانێی ناوخۆیدا رووبەڕووی گرفتگەلی جۆراوجۆرن و ئەو وڵاتانەی کە بە ئابوورەکەیان بە ئابووری نێودەوڵەتی پشت بەستراو مابووە، هیچ بزاڤێکیان بۆ ئاراستە بوون بەرەو سۆسیالیزمی زانستی ئەنجام نەدا. سەرەڕای بەڵێنەکانی سەرکردەکانی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال بە مارکسیزم — لینینیزم، ئەوان خوازیاری بەدیهێنانی یۆتۆپیای پێکهاتوو لە هێزی کرێکار و وەرزێرەکان نەبوون. رژێمە سۆسیالیستییەکان بۆ رووبەڕوو بوونەوەی راستییە ناڵەبارەکانی ئابووری ساڵانی هەشتا، هاوکات لەگەڵ وڵاتانیتری ئەفریقیا کەرتی گشتییان ئازاد کرد. حکومەتەکان چانسی کەمیان هەبوو و ناچار بە پەسەندکردنی پلانەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی سەپێنراو لەلایەن دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی (بانکی جیهانی و سەندوقی نێودەوڵەتی دراو) کران. (بڕوانە بەشی شەشەم). ئەزموونە سۆسیالیزمییەکانی ئەم کیشوەرە بەرەو کۆتا دەهات و سەرسوڕهێنەر ئەوە بوو کە ئەوە دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی بوون کە لە دەروونی ئابووری سەرمایەداریی نێودەوڵەتیدا لە هەڵگەڕاندنەوەی دەوڵەتە سۆسیالیستییەکانی ئەفریقیا و دەوڵەتە مارکسیستی — لینینیستییەکان سەرکەوتوو بوون.

## کۆمەڵگەرایی (پۆپۆلیزم):

سێیەمین گرووپی دەوڵەتان کە جیاوازی کەمیان لەگەڵ ناسیۆنالیزم هەیە، دەکرێ بە دەوڵەتی کۆمەڵەیی ناو بنێین. ئەگەرچی کۆمەڵگەرایی بە ئایدیۆلۆژیایەکی راستەقینە هەژمار



ناکرێت و هۆکەشی ئەوەیە کە ئەم ئایدیۆلۆژیایە بە ئاراستەی ئامانجگەلی سیاسی بنیات دەنرێت (هەر وەك ناسیۆنالیزم). سیتەمی بۆچوونی ئەم حکومەتانە هاوشێوەی یەکترن کە بەسەر بڕیارەکاندا کاریگەری هەیە.

کۆمەڵگەرایی (پۆپۆلیزم) هاوڵاتی ئاسایی کۆمەڵگا لە سەروو دادەنێت و وەهای بۆ دەچێت کە پێویستە تاکەکان لە پرۆسەی سیاسیدا بەشداربن و دامەزراوە حکومییەکانیش دەبێ زۆرتر وەڵامدەرەوەی نیازمەندەکان بن. بزاڤە پۆپۆلیستییەکان زۆرتر لەو شوێنانە سەر هەڵدەدەن کە حکومەت ڕەچاوی بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی بکات و ئامانجی ئەم بزاڤانەش گەڕاندنەوەی دەسەڵات بۆ گەلە.

لە کیشوەری ئەفریقیادا، پۆپۆلیزم لەگەڵ حکومەتە میلیتارییەکان پەیوەندی هەیە و ئەفسەرەکان بۆ لەسەر کار لادانی رژێمە دیکتاتۆرییەکانی پێشوو و رژێمە گەندەڵەکان کودەتای سەربازی ئەنجام دەدەن. حکومەتە میلیتارییەکان هەوڵ دەدەن لە رێگەی بنیاتنانەوە یاخود دامەزراندنی، دامەزراوەی نوێ کە بۆشایی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی پڕ دەکاتەوە، مەشروعییەت بە دەست بێنن. بۆرەکە ڕەوشتییەکان و راستگۆیی و وەڵامدانەوەی گەل ڕەچاو دەکرێت و هانی ئاستێکی نوێی دیموکراسی و بەشداریکردن لە پرۆسەی سیاسیدا دەدرێت.

حکومەتی کاپیتان تۆماس سانکارا و سەرهەنگ جێری راولینگز لە بۆرکینافاسۆ و غانادا، دوو نموونەی بەرجەستەی رژێمە پۆپۆلیزمەکانی ئەفریقیایە. سەرۆکایەتی سانکارا لە ساڵی ١٩٨٣دا درێژەی خایاند، لە کاتێکدا کە راولینگز لە شەوی کریسمەسی ١٩٨١ فەرمانڕەوایی غانای گرتە دەست. هەروەها ژەنەراڵ مەعمەر قەزافی لە لیبیا لە ساڵی ١٩٦٩، تاڕادەیەك حکومەتی یووری مۆسوینی لە ئۆگاندا کە لە ساڵی ١٩٨٩ یەوە هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتی بێ پارتی دەدا، دەکرێ وەك ئەو کەسانەی کە لە زنجیرەی پۆپۆلیزمدا جێ دەگرنەوە، ناو ببرێن.

زۆرێك لە رژێمەکانی ئەفریقیا بە کۆمەڵگەرا هەژمار دەکران. سەرەڕای ئەمەش پرسی خۆشگوزەرانی لە سیاسەتی گشتیدا زەق و بەرجەستە بوون. ئەگەرچی دامەزراوە بنیاتنراوەکان لەلایەن دەوڵەتەوە (هەروەك ئاماژە پێکرا) وەك زنجیرەیەکی پۆپۆلیزمی لێك جیا هەژمار دەکرێن. بۆ نموونە لە غانا رژێمی راولینگز، پاش شۆڕش "کۆمیتەی بەرگری کردنی گەل"ی دامەزراند. ئەم کۆمیتەیە بەمەبەستی پەیوەندیی راستەوخۆی کۆمەڵەکان بە پرۆسەی (بنیاتنانەوەی) دەوڵەت دامەزرابوو. ئەم کۆمیتەیە چاودێری کردەوەکانی کاربەدەستە حکومییەکانی دەکرد. ئەندامانی کۆمیتەی گەل لە تیوریدا، لە ئاست خۆجێیدا دەسەڵاتی دامەزراندن و لە کار لادانی

کاربەدەستانی، هەبوو. ئەم کۆمیتەیە هەروەك کاربەدەستە پلەبەرزەکان، دەسەڵاتی بڕیار دەرکردنیان هەبوو. لە راستیدا رۆژنامەی Bane Workers نووسی: هیچ کات دەسەڵات لە ترۆپکدا چەق ناگرێت. لە قۆناغی حکومەتی سانکارا لە بۆرکینافاسۆ، کۆمیتەی شۆڕشگێڕی لە لادێیەکان، شار و ناوچە کرێکارییەکانی سەرتاسەری وڵاتدا، بەمەبەستی چاودێری کردنی چالاکییەکانی دژە گەندەڵیی و کونترۆڵی مووچەی حکومەت، دامەزران. لە لیبیا سەرهەنگ قەزافی بە خەسڵەتی کۆمەڵەگەرایییەوە، هەوڵیدا ئیسلام بە بیرۆکەی دیموکراسی راستەوخۆی یۆنان گرێ بدات و بە گۆڕینی ناوی ئەم وڵاتە بۆ کۆماری گەلی عەرەبی سۆسیالیستی لیبیا (وڵاتی کۆمەڵەکان) بوو بە هۆی بالادەستی کرێکارەکان لە کاروباری بازرگانیدا. خوێندکاران جێی دیپلۆماتکارانیان گرتەوە و کەسە ناپسپۆڕەکان هەوڵی لە کار لادانی کاربەدەستانی حکومەتیان دەدا. گشت وڵاتانی پۆپۆلیستی رووبەڕووی گرفتی شوناس بوونەوە. کاربەدەستە کارگێڕییەکانی حکومەتی ناوەندی لە راسپاردنی لە رادەبەدەری دەسەڵات بۆ کۆمیتەکانی ناوەندی نارازی بوون. ئەوان لە بەدواهاتەکانی لە دەستدانی کونترۆڵ دەترسان. داواکاری ناسیۆنالیستەکان بۆ دامەزراندنی حکومەتی ناوەندی بەهێز لە پێناو پاراستنی یەکێتی نەتەوە و گەشەی هەماهەنگی ئابوور، دەبووە هۆی ئەوەی کە بە پێی داواکاری کۆمەڵەکان خۆیان بەسەر خۆیاندا حوکم بکەن. تا رادەیەك سپاردنی دەسەڵات جێبەجێ کرا، دەکرێ هۆی ئەم کارەش لە وتەی پیر رابینسۆن بدۆزینەوە کە دەڵێت" هەوڵی حکومەتی بۆرکینافاسۆ کونترۆڵی وردی سیاسەت و دامەزراوە نیمچە دیموکراتکەکانە". ئەو بەم ئەنجامە دەگات کە" بەشداریی کۆمەڵەی گەل وێران کردنی جەوهەری حکومەتەکانە". لەم چەشنە حکومەتانەدا، سەرۆك کۆمار و ئەندامانی حکومەتی ناوەندی هەروەك سیستەمە سیاسییەکانیتری ئەفریقیا، دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە و لە ترۆپکی دەسەڵاتدا دەمێننەوە. لە راستیدا ئەزموونی پۆپۆلیستی ئەفریقیا، سەلماندی کە دەکرێ لەبری ئەوەی کۆمەڵگای مەدەنی لە دەوڵەت تێبگات وەك میتۆدێك بۆ دەوڵەت لە پێناو تێگەیشتن لە کۆمەڵگای مەدەنی سوودمەند بێت.

## کاپیتالیزمی دەوڵەتی:

دوایین زنجیرەی ئایدیۆلۆژیکی کە ئەم بەشە هەوڵی بەرجەستە کردنی دەدات، سەرمایەدارییی دەوڵەتییە. ئەگەرچی زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا دوای سەربەخۆیی رێگەکانی سۆسیالیستانەی گەشەی ئابووری و سیاسییان بڕی، بەڵام هەندێ وڵاتیش رێبازی لیبرالیان گرتەبەر. وڵاتانی وەك



کەناری عاج، کینیا، مالاوی، نیجریا، کامیرۆن، مەغریب و گابون لە پێناو بەدیهێنانی چالاکییەکانی بازاڕی ئازاد ئابوورەکەیان، ئازادکرد و لەبری پشت بەستن بە ئابوورێکی رێسامەند- واتە کاتێك دەوڵەت بە راستەوخۆ کونترۆڵی بەرهەمهێنان، دابەشکردن و ئاڵوگۆڕی بەرهەمە ئابوورییەکان دەکات- ئەم رژێمانە هانی سەرمایەگوزاری لە کەرتی تایبەتیاندا و چالاکییەکەشیان زۆرتر لە کەرتە ئابوورییەکانی وەك کەیاندن و گواستنەوە، بازرگانی و کشتوکاڵ چەقی گرت و بە دوای ئەمەشدا جووتیاران، بازرگانە سەربەخۆکان، سەرمایەگوزاران و هەناردە و هاوردەکاران توانییان چالاکی ئابووری ئەنجام بدەن. لەلایەن دەوڵەتیشەوە داهێنانگەلێك سەبارەت بە سەرمایەگوزاری بیانی ئەنجام دران. تا رادەیەك بیرۆکەکانی پشت بە خۆ بەستن لە بەین بردران، بە هەمان رادەش دامەزراوە کاتییە چەق گرتووەکان، توانای چەوسێنەرانەیان نەما. سەرەڕای بوونی هەستی نەتەوایەتی بەڵام ئێستاش سەرمایەگوزاری هاوبەش ( تێکەڵێك لە سەرمایەگەزاری بیانی و ناوخۆیی) گرنگترین شێوازی سەرمایەگوزارییە و لە سەرمایەگوزاری بیانیش باشترە.

تەنانەت لیبرالترین سیستەمە سەرمایەدارییەکانیش ناتوانن وەك ئاسۆی سەرمایەداری ئازاد وێنا بکرێن. دەوڵەت زۆرتر لە کۆمەڵگای مەدەنی لە هەر جۆرە چالاکییەکی ئابووری و سیاسیدا بەشدار بووە. گرافۆرد یونگ ئەم رژێمانە بە رژێمی ناسیۆنالیستی سەرمایەداری ناو دەبات. هەنوکەش ئامانجی یەکێتی (گەل) و گەشەپێدانی ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا گرنگی تایبەتی هەیە و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە هزری سەرکردەکان بەرەو سوودە هەڵقوڵاوەکانی دەستی شاراوەی بازاڕی ئازاد ئاراستە بکرێت کە دەستتێوەردانی دەوڵەت لە ئابووردا لێی کەوتەوە. سەرمایەگوزاری دەوڵەتی، کەرتی تایبەت، نرخ، کونترۆڵی هەناردە و هاوردەکرنی کرد. دەوڵەت نرخی بازاڕی بەرهەمە خاوەکانی کونترۆڵ کرد. تێچوونەکانی پلانی کەرتی گشتی لە رادەبەدەر بوون. دەکرا ئەم دەستتێوەردانەش لە هەست و بزاڤگەلی ئایدیۆلۆژیکی زانستیانەتر بێت. دەوڵەت لەبری ئەوەی کە درێژە بە سۆسیالیزم و پۆپۆلیزم بدات، خۆی بە فاکتەری گەشەپێدانی بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی ئابوور پێناسە کرد.

لیبرالیزمی بەرقەرار لە ئابووردا، بە دەگمەن لە سیستەمی ئابووری وڵاتدا پەرەی سەند. وڵاتانی خاوەن (سیستەمی) سەرمایەداری دەوڵەتی لە ئاستی وڵاتانی دراوسێی دیموکراتیك نەبوون و تەنانەت کەمتر لەم وڵاتانە خاوەن بالا دەستی نوخبە سیاسییەکان بوون. سەبارەت بە چاکسازیی لە کارکردی ئابووردا، سەرەڕای بەدەست هێنانی سەرکەوتن لە یەکەم دەیەی

سەربەخۆییدا، ئەم وڵاتانە لە هەشتاکاندا وەك وڵاتانیتر ڕووبەڕووی گرفتگەلێك بوونەوە. لە ئەنجامدا ئەم وڵاتانە هەروەك دراوسێییەکانیان ناچار بوون ملکەچی خواست و داواکاریی دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی ببنەوە. بۆ نموونە پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی ئەم ڕژێمانەی ناچار بە سپاردنی بەشێك لە خاوەندارێتی کەرتی گشتی بۆ کەرتی تایبەتی کرد.

**خشتەی ٢-٣ ئایدیۆلۆژیا نەتەوەییەکانی ئەفریقیا**

| جۆری ئایدیۆلۆژیا | تایبەتمەندییەکان |
|---|---|
| **ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا** | - دژی ئیمپریالیزم، ئامانجی نەهێشتنی کۆڵۆنیال بوو.<br>- ئۆتۆنۆمی، گۆڕینی ئابوور و سیاسەتی پشت بەستراو بە ڕۆژئاوا.<br>- یەکێتی، خوازیاری یەکێتی گەل لە چوارچێوەی سنوورە بەجێماوەکانی کۆڵۆنیال.<br>- گەشەسەندنی ئابووری، بنیاتنانەوەی ئابوور لە پێناو خزمەت گەیاندن بە ئەفریقییەکان نەك ڕۆژئاوا.<br>- ناوەندگەرایی، بنیاتنانی نەتەوە لەلایەن دەوڵەتەوە.<br>- دژی خێڵگەرایی، دەوڵەت شوناسی ناوچەیی و مۆبیلیزەکردنی نەژادیی لە ناو دەبات.<br>- حکومەتی جێبەجێ کاری بەهێز، چالاکی کۆمەڵگای مەدەنی کونترۆڵ دەکرێت.<br>نموونە: گشت وڵاتانی ئەفریقیا |
| **سۆسیالیزمی ئەفریقیا**<br>نموونە: سینگۆر لە سینگال، نایرێرێ لە تانزانیا، کایندا لە زامبیا و پۆپۆلیزمی گینە<br>نموونەکان:<br>سینگال لە سەردەمی سینگۆر، تانزانیا لە | - سەربەخۆ، کۆمەڵگای بان ستراکتۆریی نەك دووبارە بەرهەمهێنەرەوەی دۆگماتیزم.<br>- گرنگی نەریت، جەخت کردنە سەر نەریتەکانی کۆمەڵگای ئەفریقیا و بێ چین و بێ بەشداریکردن.<br>- مۆدێڕن، تێکەڵکردنی نەریت بە تەکنۆلۆژیا و شێوازەکانی بەرهەمهێنانی مۆدێڕن.<br>- بازدان لە قۆناغی سەرمایەداری گەشەسەندن، شێوازی |



| | |
|---|---|
| سەردەمی نایرێرێ، زامبیا لە سەردەمی کایندا، گینە لە سەردەمی تورە | ناسەرمایەداری بەرەو سۆسیالیزم.<br>- نیشتمانی کردن، سەرمایەی تایبەت کەوتە ژێر کونترۆڵی حکومەتەوە.<br>- باڵادەستی بازاڕە حکومییەکان، جووتیاران ناچار بوون بەرهەمەکانیان بە حکومەت بفرۆشن.<br>-دابەشکردنی (توزیع) حکومی، کاڵاکان لە سوپرمارکێتە حکومییەکاندا دەفرۆشران و دەوڵەت نرخەکان دیار دەکات.<br>- کونترۆڵی هەناردە و هاوردەکان لەلایەن حکومەتەوە.<br>- کونترۆڵی بانك و کاروباری دارایی لەلایەن حکومەتەوە.<br>- سنووردار کردنی پلۆرالیزمی سیاسی، بەپێی یاسا تەنیا یەك پارت دەتوانێت چالاکی سیاسی ئەنجام بدات. |
| **سۆسیالیزمی زانستی**<br>نموونە: لە سەردەمی ماچل لە موزامبیك، نیتۆ لە ئەنگۆلا، مەنگیستۆ لە ئەسیۆپیا | - مارکسیزم-لێنینیزم، پەیڕەوی کردن لە شیکردنەوەی چینایەتی مارکسیزمی توندڕەو.<br>- پەرەسەندنی چینی کرێکار (یەکێتی وەرزێران).<br>- بە لوتکە گەیشتن لە ساڵانی حەفتا و هەشتاکاندا.<br>- پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت، بەڵام سەربەخۆ لە بلوکی ڕۆژهەڵات.<br>- شێوازی سۆسیالیزمی ئەفریقیا: لێبوردەی ئایینی و ئاسانکاری لە ئابوور، دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ ڕۆژئاوا.<br>- نیشتمانی کردن: سەرمایەی کەرتی تایبەت کەوتە ژێر کونترۆڵی دەوڵەتەوە.<br>- کونترۆڵ کردنی بازاڕەکانی دەوڵەتی: جووتیاران ناچار بوون بەرهەمەکانیان بە حکومەت بفرۆشن.<br>- دابەشکردنی (توزیع) حکومی، کاڵاکان لە سوپر مارکێتە حکومییەکاندا دەفرۆشران و دەوڵەت نرخەکان دیار دەکات.<br>- کونترۆڵی هەناردە و هاوردەکان لەلایەن حکومەتەوە.<br>- کونترۆڵی بانك و کاروباری دارایی لەلایەن حکومەتەوە. |

| | |
|---|---|
| | - سنووردار کردنی پلۆرالیزمی سیاسی، بەپێی یاسا تەنیا یەك پارت دەتوانێت چالاکی سیاسی ئەنجام بدات. |
| **پۆپۆلیزم**<br>نموونە: حکومەتی سانکارا لە بۆرکینافاسۆ، ساڵە سەرەتاییەکانی حکومەتی روالینگ لە غانا، حکومەتی قەزافی لە لیبیا | - پشتگیریی لە نوێنەرایەتی گەل.<br>- بەشداریکردن، پێکهێنانی ئەنجوومەنە جەماوەرییەکان.<br>- چالاکی دژی گەندەڵیی.<br>- دامەزرانی (حکومەت) زۆرتر لە رێگەی کودەتای سەربازییەوە و رژێم هەوڵی بەدەست هێنانی مەشروعییەت دەدات. |
| **سەرمایەداریی دەوڵەتی**<br>نموونە: هۆیفیت بۆینگی لە کەناری عاج، کەنیتا لە کینیا، حکومەتی نیجریا | - ئاسانکاری لەهەمبەر سەرمایەداری تایبەت (چ ناوخۆ و چ بیانی).<br>- لایەنگری سەرمایەداریی بچووك، سەرمایەگوزاریی لە کەرتی کشتوکاڵ، گەیاندن و گواستنەوە، هەناردە و هاوەردەکردن.<br>- دەستتێوەردانی لە رادەبەدەری حکومەت، قۆرغکردنی بازاڕ، دیارکردنی نرخەکان.<br>- حکومەت گەورەترین بەرهەمهێنەر و دابەشکەری ئابوورە.<br>- سنووردار کردنی پلۆرالیزمی سیاسی، بەپێی یاسا تەنیا یەك پارت دەتوانێت چالاکی سیاسی ئەنجام بدات. |

## دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی:

بابەتی کۆتایی ئەم بەشە، باس لە کاریگەری ئایدیۆلۆژیا بەسەر پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال دەکات. ئایدیۆلۆژیا، لەگەڵ هەستە باڵا دەستەکانی ناسیۆنالیزم هەماهەنگ و لە هەندێ ناوچەی ئەم کیشوەرەدا هێزێکی پۆزەتیڤانەی هەبوو. ئایدیۆلۆژیاکان لە پاراستن و داڕێشتنی سیستەمی دەوڵەت — نەتەوە رۆڵی کارایان هەبوو. بە بێ رەچاوکردنی دوولایەنەی سنوورەکانی نێودەوڵەتی، دەکرا ناسەقامگیری سیاسی لە ئەفریقیادا زۆر گرژاویتر لەو شتە بێت کە ئەمڕۆکە دەبینرێت.



ئەگەرچی ئەم سەقامگیرییە گرنگی پێدرا بەڵام ئەم ئایدیۆلۆژیانە لەبری میلدار بوون بۆ بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی زۆرتر بەرژەوەندییەکانی نوخبەی حکومەت و پێشگیری کردن لەو گوشاری ئابووری و سیاسی بەسەر ئەم نوخبانەدا، رەچاو دەکرد. مومکین بوو ناسیۆنالیزم بە گشت رەهەندەکانیەوە سەقامگیری بە کۆمەڵگای مەدەنی ببەخشێت. بەڵام مومکینیش بوو لە درێژخایەندا ببێتە هۆی روودانی شەڕی خاچ پەرەستی لە یەکێتی گەڵدا و یاخود ململانێی ناوخۆیی لێ بکەوێتەوە. سەرەڕای گرفتگەلی دەوڵەتە نائۆرگانیکەکان و سنوور بۆ داڕێژراوەکان، کاتێك کە نەخشەی ئەفریقیا لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالدا داڕێژرا، تەنیا دوو سنوور گۆڕانی بەسەردا هات. یەکەم، تانگانیکا و زەنگبار یەکتریان گرتەوە و دووەم: هەر لە دوای سەربەخۆیی، جیا بوونەوەی ئەریتریا لە ئەسیۆپیا لە ساڵی ١٩٩٣دا، بە فەرمی ناسێنرا.

سەبارەت بە سنوورەکانیتر، سنوورە (داڕێژراوەکانی) کۆلۆنیال بە فەرمی ناسێنرا. ئەمەش بەرجەستە بوونی سەرکەوتنی بەرفراوانی ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا و تاوناییەکەی بۆ پشتگیری کردن لە چەمکی دەوڵەت — نەتەوەی بە میرات بۆ مایەوە (لەلایەن کۆلۆنیالەوە) بوو. کاتێك کە رێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا لە ساڵی ١٩٦٣ دامەزرا، ئەندامانی ئەم رێکخراوە جەختیان لەسەر نەگۆڕینی سنوورەکانی کۆلۆنیال کردەوە. ئەگەرچی ئەفریقییەکان ئاگادر بوون کە ئەم سنوورانە کێشە دروست دەکەن، بەڵام رێککەوتنێکی گشتگیر لە ئارادا بوو کە چارەسەرییەکیتر لەهەمبەر بەرەی کۆلۆنیالی دەتوانێ ململانێی گەورەتر دروست بکات. تەنیا مەغریب و سومالی لەم پرەنسیپە کە وڵاتان لەسەری رێککەوتبوون سەرپێچییان کرد. ئەنجامەکەشی ئەوە بوو کە دوکتورێنی رێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا، ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال لە سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەت، لە ململانێی نێودەوڵەتی رزگار کرد.

بۆ نموونە، رێگەیەکی سێیەم بۆ فراوانکردنی سنوورەکان بوونی نەبوو، هەروەها وڵاتێکی وەك لوبنان- وڵاتێکە کە سەروەرییەکەی لەلایەن دەوڵەتانی دراوسێوە پێشلکراوە- بوونی نەبوو. هەڵبەت تەنیا نموونەی ململانێی نێودەوڵەتی قوول، لە ساڵی ١٩٧٩دا روویدا واتە کاتێك کە تانزانیا، ئۆگاندای داگیر کرد. بێ گومان ململانێی نێودەوڵەتی لەم کیشوەرەدا، هەر لە سەرەتاوە بوونی نەبووە. وڵاتی ئەفریقیای باشوور لە هەشتاکاندا، بە مەبەستی پشتگیری کردن لە ئاپارتاید پشێوی بۆ دراوسێیەکانی دروستکرد. مەغریب درێژەی بە داگیرکردنی بیاوانی رۆژئاوایدا و بەشێك لە خاکی ئەلجەزایر و موریتانیای وەك بەشێکی سەر بە مەغریبی

گەورە داگیر کرد. لەنێوان لیبیا و چادیش لە هیلە سنوورییەکاندا بارگرژی دروست بوو. رژێمی لکێنەری سومالی و بزاڤە رزگاریخوازەکان لە کاتانگا، بیافرا و ئەریتریا، سەلماندیان کە گەورەترین هەڕەشەن لەسەر سنوورەکانی دەوڵەت — نەتەوەی ئەزفریقیا. باسکردنی پوختی ئەم ململانێیە گرنگی تایبەتی هەیە. هەروەك سەلمێنرا، ئەم نموونانە هەندێ رێزپەرن لە حکومەتەکانی (ئەفریقیادا) و نیشان دەدات کە لەهەمبەر ئەو رووداوانەی کە ئەگەری هەیە لە ئەفریقیادا روو بدات، پشتگیریی سیاسی لە سنوورە بەجێماوەکانی کۆلۆنیال بوونی نامێنێت.

لکێنەرگەرایی (الحاق) بریتییە لە خواستێك بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگای کولتووریی لە ژێر ئالایەکدا کە وەك زنجیرە لە چەندین وڵاتدا بنیات دەنرێت. دۆنالد هۆرویتز ئەم خواستە وەك بزاڤێکی گرووپێکە نەژادیی و لە ناو دەوڵەتدا، لەپێناو هێنانەدی یەکێتی گەل و خاك لە چوارچێوەی سنووردا، هەژمار دەکات. لە وڵاتانی ئەفریقیادا تەنیا سومالی بۆ فراوانکردنی سنوورەکانی ئەم رێگەیەی گرتەبەر. گەلی سومالی لە سەردەمی کۆلۆنیالدا بۆ سەر پێنج وڵات دابەشکران:١- سومالی لاندی فەرەنسا (جیبوتی). ٢- سومالی لاندی بەریتانیا. ٣- سومالی لاندی ئیتالیا. ٤- ئەسیۆپیا. ٥- کینیا.

لە سەردەمی سەربەخۆیی لە ساڵی ١٩٦٠ تەنیا سومالی لاندی بەریتانیا و ئیتالیا یەکتریان گرتەوە و بەمەش نەژادی سومالی لە سنووری نێودەوڵەتی سێ وڵاتدا نیشتەجێ بوونەوە. سومالی بە خۆ دوور خستنەوە لە سنوورە نێودەوڵەتییەکانی بە فەرمی ناسرا و پشتگیری لە بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەت —نەتەوە بۆ گشت گەلی سومالی کرد. دوای سەربەخۆیی، حکومەتی مۆگادیشۆ پشتگیری لە شۆڕشگێڕانی باکووری رۆژهەڵاتی کینیا کرد کە بۆ یەکپارچەیی خاك خەباتیان دەکرد. ئەم پشتگیرییە گرووپەکانی ناوچەی ئۆگانی ئەسیۆپیاشی لە خۆ گرت. ئەم کردەیەش پەرەی بە ململانێیەکاندا و لە کۆتادا سوپای سومالی لە ساڵی ١٩٧١دا هێرشی کردە سەر ناوچەی ئۆگان. لە ئەنجامدا دەستتێوەردانی دەرەکی (یەکێتی سۆڤیەت) بوو بە هۆی سەرنەکەوتنی هێرشی چەکداری بۆ سەر ئەم ناوچەیە. (بڕوانە بابەتی توێژینەوەی بەشی هەشتەم).

هەروەها ناسیۆنالیزم لە بەرگریکردن لە نەتەوە نوێیەکانی ئەفریقیا لەهەمبەر هەڕەشە جیاخوازەکاندا سەرکەوتوو نەبوو. تەنیا بزاڤی رزگاریخوازی ئەریتریا توانی داواکارییەکانی بە ئاکام بگەیێنێت. پاڵنەری جیاخوازی بە هۆی ئازار بینینی کۆمەڵگالە کۆلۆنیالی ناوخۆوە



سەرهەڵدەدات. حکومەتی ناوەندی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگا دابین ناکات و لە ئەنجامدا وەك پەرچەکردارێك، کۆمەڵگاکانی ژێر گوشار هەوڵ دەدەن لەبری دروستکردنی هاوسەنگی لەنێوان دەسەڵاتەکانی دامەزراوە سەرەکییەکان، هەوڵی سەربەخۆیی دەدەن.

لە کۆنگۆی کینشازادا (زەئیری پێشوو- دواتر بوو بە کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ) ناوچەی کاتانگا هەوڵی بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی دەدا و کاتێك کە لە ساڵی ١٩٦٠دا ئیمپراتوری بەلجیکیا لەم وڵاتە کشایەوە، جیاخوازەکان لەو بڕوایەدا بوون کە سەرچاوەکانی کانی (معدن) ئەم وڵاتە کە لە رێگەی مامەڵەکردن لەگەڵ دامەزراوە نێودەولەتییەکانەوە بەدەست دێت، سوودمەند بن. بەڵام ئەوان لە بەدەستهێنانی پشتگیری بۆ بەگژدا چوونی حکومەتی ناوەندی شکستیان هێنا. نیجریاش لە ساڵی ١٩٦٠دا رووبەڕووی ئەم قەیرانە بوویەوە کە لەبەشی چوارەمدا باسی لێ دەکرێت.هیچ یەك لەم ململانێیانە نەبوونە هۆی داڕێشتنی سنوورە دانپێنراوەکانی نێودەوڵەتی و سیستەمی دەوڵەت — نەتەوە هەر وەك خۆی مایەوە.

هۆی سەرکەوتنی جیاخوازانی ئەریتریا و سەرنەکەوتنی کاتانگایی و بیافراییەکان، بە رێژەی چەق گرتنی دەسەلات لە ناوەندی حکومەت و باکگراوەندی مێژوویی دەسەلات لە ئەریتریادا دەگەڕێتەوە. ئەریتریا و ئەسیۆپیا وەك کۆلۆنی (جیاواز لە کۆلۆنەکانیتری) ئیتالیا لە ساڵی ١٩٥٢دا کەوتە ژێر دەسەلاتی حکومەتی فیدراڵیدا. پاش تێپەڕ بوونی بیست ساڵ بەسەر شەڕی چەکدارییەوە ئەم وڵاتە لە ساڵی ١٩٩٣دا سەربەخۆیی وەرگرت و هۆکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دەوڵەتی ئەسیۆپیا لە ناوەوە درزی تێکەوت و هاوپەیمانییەك لە بزاڤە بەرهەڵستکارانی سەرتاسەری ئەسیۆپیا پێکهێنرا و تا ئادیس ئابابا رێپێوانیان ئەنجامدا و بە هۆی رووخانی حکومەتی هایلە مارمام مەنگیستۆ، بۆشایی سیاسی لە پایتەختدا دروست بوو. هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی سیاسی بۆ کونترۆڵی ئەم وڵاتە بوونی نەما و دواجار لە ئەنجامی گفتوگۆی نێوان بزاڤە بەرهەڵستکارەکاندا کە رووخانی رژێمی هایلە ماریامی لێکەوتەوە، نوێنەرانی ئەریتریا توانییان بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی ناوچەکەیان (لەگەڵ حکومەتی ناوەندی) دانوسان ئەنجام بدەن. سەرەڕای بوونی بارگرژی لەنێوان ئەریتریا و ئەسیۆپیا لە ساڵانی ١٩٩٨-٢٠٠٠ ئەریتریا وەك دەوڵەتێکی تازە دامەزراوی ئەفریقیا لە ساڵی ١٩٩٣دا سەربەخۆیی راگەیاند.

ئەگەرچی ئەریتریاش لە ژێر گوشاردا بوو بەڵام ئەمە بابەتێکی رێزپەڕ بوو. لە سەرتاسەری ئەم کیشوەرەدا، سنوورەکانی کۆلۆنیال وەك خۆی مایەوە و ئەمەش بەومانایە دێت کە بەڵگەی

کەم بۆ پشتگیری کردنی ئەم بیرۆکەیە هەیە کە سنوورە دەستکردەکان بوو بە هۆی نەهێشتنی بارگرژی نێودەوڵەتی لەم کیشوەرەدا. ئەمەش بەو هۆیە دەگەڕێتەوە کە سنوورەکان وەها دەستکردن کە هیچ دەوڵەتێك لە توانایدا نییە خۆی بە خاوەن سەروەریی وڵاتێکیتر بزانێت. ململانێی دەوڵەت بۆ لکاندنی خاکی وڵاتێکیتر بە هۆی بانکهێشت بۆ یەکپارچەیی خام زۆر لاوازە. بۆ نموونە ئەگەر زامبیا هەوڵ بدات بە درێژایی سنوورەکانی کۆماری کۆنگۆ خاکی وڵاتەکەی بەرفراوان بکات، ئەم وڵاتە تەنیا دەتوانێت لەگەڵ مالاویدا هاوکاری هەبێت، چونکە تەنیا مالاوی هەمان خواستی ( لکاندنی خاکی وڵاتنیتر) هەیە. لەبری ئەمەشدا زۆربەی سەرکردەکانی ئەفریقیا مەیلیان بۆ نەهێشتنی ئەم بیرۆکەیان هەیە و پشتگیری لە ڕێککەوتنی ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا سەبارەت بە سنوورەکان دەکەن. بەم شێوازەش تەنگەژە نێودەوڵەتیەکان کەم دەبنەوە و وڵاتانیش سەقامگیر دەبن و لەلایەن وڵاتانیتریشەوە بەتایبەت سیستەمی نێودەوڵەتی مەشروعییەتی ئەم وڵاتانە بە فەرمی دەناسرێن.

ئەگەرچی لەوانەیە سەربەخۆیی ئەریتریا لە ساڵی **١٩٩٣**دا دەستپێکی قۆناغێکی نوێ بێت و پیرۆزێتی سنوورە بەمیرات ماوەکان (لە کۆلۆنیالەوە) کەم ببێتەوە. لە نەوەدەکاندا پرۆژەی بەشداریکردن لە دەسەڵاتدا بوو بە هۆی زیادبوونی تەنگژە لەنێوان ئەم وڵاتانەدا. بۆ نموونە ناوژەی دەریا گەورەکان لە ناوەڕاستی ئەفریقیادا، بوو بە هۆی بەرپا بوونی یەکەم شەڕی ناوچەیی. ڕووداوەکان بە کۆکوژی لە ڕواندا دەستی پێکرد و سەرەتا شۆڕشگێڕەکانی ئۆگاندا بۆ ڕووخاندنی حکومەت لە کیگالیدا و دواتر هێزەکانی ڕواندا و ئۆگاندا گیرۆدەی شەڕی ناوخۆی کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ (زەئیری پێشوو) بووە و لە ئەنجامدا ئەم شەڕە، بوو بە هۆی دروستکردنی پشتگیری سەربازی لەلایەن هەندێ هێزە هەرێمییەکانەوە. زیمبابوا، ئەنگولا، سودان و چاد هەروەك ڕواندا و ئۆگاندا گیرۆدەی ئەم شەڕە بوونەوە و گشت ئەم وڵاتانە سەربازیان بۆ ئەم شەڕە ڕەوانە کرد کە تا ساڵی **١٩٩٩** خایاندی. بە هۆی ئەم شەڕە و توندوتیژییە نێودەوڵەتییەکانەوە وەك پێکدادانی سنووری لەنێوان ئەسیۆپا و ئەریتریا، لە کۆتای نەوەدەکاندا ئەگەری پێشل کردنی ڕێککەوتننامەی ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا لە ئارادا بوو. یاخود بە لانیکەمەوە ڕێزگرتن لە سەروەری فەرمی ڕووبەڕووی مەترسی بوویەوە. بەڵام ئەو شتەی کە لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالدا ڕوویدا دیارکردنی سنوورە بەمیرات ماوەکان (بەتایبەتیش ڕێزگرتن لە ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی) و بەدیهێنانی ئاشتی ڕێژەیی بوو کە لە سەرەتادا هەندێ لە وڵاتە تازە سەربەخۆکان پێشبینی ئەم ڕووداوانەیان نەدەکرد.



ئەگەرچی سەقامگیری نێودەوڵەتی ئەم کیشوەرە گرنگە، بەڵام پرەنسیپی ڕێزگرتنی دوو لایەنە لەنێوان وڵاتاندا بەدی هاتووە، پرەنسیپێکیش لە ژێر ناوی یەکێتی نەتەوەیی بۆ سەرکوتکردنی ڕکابەرێتی سیاسی ناوخۆیی بوونی هەیە و دامەزراندنی دەوڵەت — نەتەوە لەلایەن هەندێ وڵاتەوە کە هەوڵی پیادەکردنی (ئەم پرەنسیپە بەسەر وڵاتانیتردا) دەدا، جێبەجێکراو لەلایەن کۆمەڵگای مەدەنییەوە پشتگیری لێکرا. بڕیار و بانگهێشتە دەسەڵاتخوازییەکان ئەو شتە بوو کە خەڵك لە ژێر ناوی یەکێتی گەل ناچار بە ئەنجامدانی بوون و دەبوایا جیاوازی خوازی لە بیرۆکەی ناسیۆنالیستیدا دوور بخرابایەوە. سیستەمە پۆلۆرالیزمە سیاسییەکان بۆ چارەسەر کردنی ململانێ و ڕزگاربوون لەم ململانێیە گرفتیان هەبوو، چونکە لەم ژینگەیەدا دەرفەتی کەم بۆ بڵاو بوونەوەی بۆچوونی بەرهەڵستکاری لە ئارادایە.

ئەگەر پلانی ناسیۆنالیستی دەوڵەت بە هۆی مۆبیلیزەکردنی نەژادیی ڕووبەڕووی تەحەدی ببێتەوە، پێویستە ئەم تەحەدییە لە ژێر ناوی خێڵگەرایی لەناو دەبردرا یاخود ئەگەر بەرهەڵستکاران لە ناوچەیەکی دیاری وڵاتدا چالاکییان هەبوایا ئەم ناوچەیە دەخرایە ژێر ناوی جیاخوازەکاندا. ئەگەر حکومەت تەنیا لە کەمینەیەکی دیار پێك هاتبێت، جیاخوازان ناچارن کە پشت لەم حکومەتە بکەن و ببن بە لایەنگری لایەنێکیتر. لەم ڕوانگەیەوە ئەندامانی نوخبەی سیاسی گشت ئامرازێك بە کار دێنن تا بتوانی کونترۆڵی دەوڵەت بکەن و دەوڵەت وەك کونترۆڵکەری خواستە کەسییەکانی یەکێتی نەتەوە هەژمار دەکەن. لەم ڕوانگەیەوە ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا وەك دیاردەیەکی دەوڵەتگەرا و خەسڵەتی دەوڵەتی دەمێنێتەوە و کۆمەڵگای مەدەنیش لەبری ئەوەی کە بتوانێت ڕۆڵی چالاك لە پرۆسەی بنیاتنانی دەوڵەت — نەتەوە بگێڕێت، تەنیا وەرگری (بڕیارەکان) دەبێت.

زیاد بوونی ڕەهەندی کۆمەڵایەتی لە پاڵ ڕەهەندی ناسیۆنالیستی دەبێتە هۆی زیاد بوونی (ئەگەری) شکست هێنانی کۆمەڵگای مەدەنی. زیاد لەمەش لە وڵاتانی ئەفریقیا شۆڕش لە سەرەوە دەستی پێکرد. بوونی ئایدیۆلۆژیایەك کە ناوەندگەرایی دەسەڵات ڕێك بخات و چالاکی ئابووری کەرتی تایبەت سەرکوت بکات کە ئەم چالاکییە لەلایەن نوخبەی سیاسییەوە بە جیددی کۆنترۆڵ دەکرێت. زیاد لەمەش سەرەڕای سۆسیالیزم و پۆپۆلیزم سەرمایەداری دەوڵەتیش بەهێز بوو. گشت ئەم ئایدیۆلۆژییانە ئەنجامی هاوشێوەیان هەبووە، واتە نەهێشتنی ناوەندگەرایی دەسەڵات کە لە دەست ژمارەیەك بۆرۆکراتیك و نوخبەی سیاسیدا چەقی گرتبوو. ئەگەرچی هەندێ لە سەرکردەکانی ئەفریقیا ئێستاش پابەندی ئەو ئایدیۆلۆژیایەن کە

هەڵیانبژاردووە، بەڵام نایەکسانی کە لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا روو لە زیاد بوونە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەم سەرکردانە بەرەو پابەند بوونێك هان بدات کە ناچار بن هەوڵی شاردنەوەی رفتارە چەوسێنەرانەیان بدەن. ئەمەش لە رێگەی دروستکردنی هۆشیاریی درۆیین لەنێوان کۆمەڵە (جەماوەر)کاندا.

ئەمیلکار کابرال، سەرۆکی بزاڤی رزگاریخوازی گینەی بیسائۆ هۆشداری دایە هێزە شۆڕشگێڕەکان کە خەڵك نە لەپێناو بڕواکانیان و نە لەپێناو ئەو شتەی کە لە هزریاندایە (شەڕ دەکەن)، بەڵکو خەڵك لەپێناو ئەوەی کە خواستەکانیان بە هۆی شەڕەوە قوربانی پێشکەوتنی ماددییەوە نەبێتەوە و ژیانی باشتر و ئاشتیخوازانەیان هەبێت و پێشکەوتن و داهاتووی باشتر بۆ منداڵەکانیان دابین بکەن، شەڕ دەکەن.

ئەگەر دەوڵەوت و ئایدیۆلۆژیای هەڵقولاو لە دەوڵەت بە ئاراستەی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی نەبێت کۆمەڵەکان (جەماوەر) مەیلی رزگار بوون لە دەوڵەتیان هەیە. هەروەك لە بەشی دەیەمدا روون دەکرێتەوە، ئەمە هەر ئەو شتەیە کە لە ژمارەیەك لە وڵاتانی ئەم کیشوەرەدا بە درێژایی ساڵانی نەوەد روویدا و ئەنجامیشی بەرەو پوکانەوە چوونی دەوڵەت بوو.

ئەگەر راکێشی (**جاذبة**) ئایدیۆلۆژیایەك لەپێناو بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی تەرخان نەکرێت، لە ماوەیەکی کورتدا ئەم ئایدیۆلوژیایە بەهای نامێنێت. ئایدیۆلۆژیا پێویستی بە پەسەندکردنی جەماوەری هەیە، نەك لەلایەن چینی سەرەوە بسەپێنرێت. لەم رووەوە دەکرێ ناسیۆنالیزم چەندین ساڵ دوای کۆلۆنیال لەم کیشوەرەدا یارمەتی سەقامگیریی سیاسی دابێت. بەڵام ئەم رێگەیانە کە لە سیاسەتی ناوخۆدا بەکار دەهێنرێت، دەرەنجامەکەی ململانێی ناوخۆیی لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنییە. ناهاوسەنگی و ناهەماهەنگی سیاسی بۆ پرۆژەی بنیاتنانەوەی دەوڵەت = نەتەوە مەترسیدار بوو.

**بابەتی توێژینەوە: سۆسیالیزم و (سیستەمی) دەستەجەمعی لە تانزانیادا:**

تانزانیا لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا و خوارووی هێلی ئەستوادا هەڵکەوتووە. ئەم دەوڵەتە لە ساڵی ١٩٦٤ دامەزرا، واتە کاتێك کە بەرزاییەکانی تانگانیا و دورگەکانی زەنگبار لە زەریای هیند پێکەوە گرێدران تا کۆماری یەکگرتووی تانزانیا پێك بهێنن. ئەم وڵاتە لە خاکی جۆراوجۆر پێکهاتووە. زۆربەی بەرزاییەکانی ناوەڕاستی وڵات لە بانی وشك پێکهاتووە، بەڵام



کەناری دەریا شیدار و پڕ لە شینایەتییە (ناوچەی سرنجیتی) و تەنانەت ناوچەی نیمچە بیاوانیشی لەخۆ گرتووە. دۆڵی گەورلاەی ریست و چالاکی بوارەکانی کۆن لە سنوورەکانی تانگانیا دیمەنی سەرنج راکێشی دروستکردووە. هەروەها کویستانی هەمیشە بەفراوی کلیمانجارۆ و دەریاچەی ڤیکتۆریا، تانگانیا و مالاوی لەم وڵاتەدایە. ئەمەش لە کاتێکدایە کە خودی دورگەی زەنگبار( پێکهاتوو لە بیست دورگە) پەنجا کیلۆمەتر دوورتر لە هەرێمی سەرەکی ئەم وڵاتە هەڵکەوتووە و ئاو و هەوای گەرم و شیداری ئەستوایی هەیە.

ناسیۆنالیزمی دامەزراو لەلایەن حکومەتی تانزانیاوە خاوەن ئامانجی یەکسانە و وێکچوونی زۆری لەگەڵ لقەکانیتری ناسیۆنالیزمی سەرتاسەری ئەم کیشوەرەی هەیە. ئامانجی سەرەکی ئەم ئایدیۆلۆژیانە بەدیهێنانی یەکێتی نەتەوەیی و گەشەی ئابووری بوو. بۆ سەقامگیری تانزانیا یەکێتی نەتەوەیی پێویست بوو. لەم وڵاتەدا ١٢٠ نەژاد دەژین. هەروەها، دابەشکردنی (کۆمەڵایەتیش) لەم وڵاتەدا بوونی هەیە. جیا لە ئەفریقییەکان لە تانزانیادا ئاسیایی، عەرەب و گرووپێکی بچووکی سپیی پێستەکانیش نیشتەجێن کە سەربە ئیسلام و مەسیحیەت و ئایینەکانیتر. سەرەڕای گرووپە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان جیاوازیگەلی بەهێز لەنێوان دانیشتوانی تانزانیادا بوونی هەیە. ئەم دابەش بوونەش هێمای ئەوەیە کە ئەرکی سەرەکی دەوڵەت بنیاتنانی نەتەوەیەکی یەکگرتوو لە چوارچێوەی سنوورە بەمیرات ماوەکانی کۆلۆنیالە. ئامانج لە بەهێزکردنی یەکێتی بەرقەرار، رکابەرێتی لەپێناو سەربەخۆیی بوو و جولیۆس نایرێرێ یەکەمین سەرۆك کۆماری تانزانیا رایگەیاند کە پێش هەر شتێك گەلی تانزانیا، تانزانیایین و دواتر نەتەوەی چاقا، عەرەب، ئاسیایی و شیرازی لەخۆ دەگرێت. ئەم یەکێتییەش چیرۆکی سەرکەوتنی تانزانیای دوای کۆلۆنیال بوو. لەم وڵاتەدا ململانێی نەژادیی لە ئاستێکی نزمەوە لە ساڵانی دوای کۆلۆنیال سەریهەڵدا و تانزانیا نموونەی سەقامگیری سیاسی و کۆمەڵایەتی لە کیشوەری ئەفریقیادا بوو.

ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا لە گەیشتن بە دووەمین ئامانجی واتە گەشەی ئابووری سەرکەوتنی کەمی بەدەست هێنا. تانزانیا (گرفتی) کەمی سەرچاوەی سروشتی هەیە و بۆ بەدەستهێنانی سامان پشت بەستراو بە بەرهەمە کشتوکاڵییەکانە. لە قۆناغی سەربەخۆییدا ئەم وڵاتە لە بەرهەمهێنانی کەل و پەلی خۆراکی پشت بەخۆ بەستراو بوو، بەڵام ئەم کەل و پەلەش لە کێڵگە بچووکەکانی وەرزێرەکاندا بەرهەم دەهێنرا. سەرمایەگوزارییەکی کەمی بازرگانی لە کەرتی ئابووردا ئەنجام دەدرا. لە قۆناغی دوای سەربەخۆییدا، ئەرکی سەرەکی ئەم سەرمایەگوزارییە

زیادکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی بوو. بەمجۆرەش سەرمایەی بەدەست هاتوو لەم سەرمایەگوزارییەدا، دەبوایا دووبارە گەشەی ئابووری زۆرتری بەدی هێنابا.

نایرێرێ سەرمایەگوزاریی بە شێوازێکی ناگونجاو بۆ بەرهەمهێنان و گەشەی ئابووری هەژمار دەکرد و رایگەیاند کە سۆسیالیزم ئایدیۆلۆژیایەکی دروستە کە پێویستە پەیڕەوی بکرێت و دەتوانێ بووژانەوە و گەشەی ساغلەم بۆ گەلی تانزانیا بە دیاری بێنێت. خودی نایرێرێ سۆسیالیزمی ئەفریقیای بنیاتنا و ئەم زاراوەیەی بە (سیستەمی) دەستەجەمعی (ئابووری خێزان) ناو برد. ئەم ئایدیۆلۆژیایە پەیوەندی زۆری بە خودی سەرۆك کۆمارەوە هەبوو و هەر وەك جۆرەکانیتری سۆسیالیزم، رەخنەگر لە تاکگەرایی و سەرمایەگوزاری بوو.

نایرێرێ خاوەندارێتی گشتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی بۆ کرێکار و وەرزێرەکان راگەیاند تا لەم رێگەیەوە یەکسانی کۆمەڵایەتی لەنێوان گشت توێژەکانی کۆمەڵگادا دابمەزرێنێت. هەر بۆیەش ئەو بەتوندی پەیڕەوی لە سۆسیالیزمی کلاسیك لە ژێر دروشمی" هەر کەس بەپێی توانا و هەر کەس بەپێی پێداویستییەکانی" کرد.

هەروەها نایرێرێ رایگەیاند: "لەڕاستیدا سۆسیالیزم وەك سیستەمێك، دامەزراوەی نایەکسانی نێوان مرۆڤ و بەکار گرتنیان لە پێناو (بەدیهێنانی) یەکسانی لەنێوان مرۆڤدایە". ئامانجی نایرێرێ ئەوە بوو کە ئەو کەسانەی تۆوی دووبەرکییان چاندووە لە مەترسییەکانی ئەو شتەی کە چاندوویانە هاوبەش بن.

نایرێرێ لەو بڕوایەدا نەبوو تانزانیا بتوانێ لەسەر شێوازی سۆڤیەت پەیڕەوی لە سۆسیالیزمی دۆگماتیزم بکات. ئەو رایگەیاند کە بارودۆخی ئەفریقیا لەگەڵ ئەوروپا کە مارکس و لێنین هەندێ بابەتی لەسەر نووسیوە و هەندێ کاریان ئەنجامداوە، زۆر جیاوازە. باسکردن لەسەر ئەم دوو زانایە کە وەڵامی گشت پرسیارەکانیان فەراهەم کردووە، یاخود مارکس کە سۆسیالیزمی داڕێشت وەك رەتکردنەوەی مرۆڤایەتی ئەفریقیا و جیهانی بوونی بابەتی سۆسیالیزمە. مارکس کە زاراوەی مارکسیزمی داهێنا ئەگەر زیندوو بوایا بە پێی تایبەتمەندییەکانی ئەفریقیا نکۆڵی لە گەردوونی بوونی سۆسیالیزمی دەکرد. ئەگەرچی مارکس بەشدارییەکی بێ وێنەی لە هزرە سۆسیالیزمدا هەبوو بەڵام سۆسیالیزم بە مارکسەوە دەستی پێ نەکرد یاخود نەیتوانی کۆتایی بە لێکدانەوە جیاوازەکانی نووسینەکانی بێنێت. لە درێژەی ئەم باسەدا، نایرێرێ ئاماژەی بەوە کرد کە ئەگەر مارکس لە سۆکیۆم لاند، ماسی لاند، و ریڤیۆما ژیابا، پەرتووکی "سەرمایە"ی بە شێوازێکی زۆر جیاوازتر دەنووسی، کە بە هەمان



ئەندازە زانستی و سۆسیالیستی دەبوو. بە کورتی کۆدەنگی لەسەر ئایدیۆلۆژیای هاوردەکراو بوونی نەبوو، بەڵکو پلانێکی کۆمەڵایەتی بوو کە بە شێوازێکی تایبەت بە مەبەستی رەچاوکردنی هەڵ و مەرجی ئەفریقیا و پێداویستییەکانی ئەفریقیا داڕێژرا بوو.

نایرێرێ لەو بڕوایەدا بوو کە کە تانزانیا پێویستی بە سۆسیالیزم نییە، چونکە گەلی ئەم وڵاتە فێری دیموکراسییە و ئەم دوو بیرۆکەیەش لە رابردوو و نەریتی کۆمەڵگەکەمان — کە ئەمەش لە بەرهەمی ئەم دوو بیرۆکەیەن- رەگی داکوتاوە و پێویستە سۆسیالیزم هەر وەك ئەوروپا وەکو پرۆسەیەکی لە دەرەوەی ململانێی چینایەتی هەژمار بکەین. هەندێ سەرکردەکانی ئەفریقیا لە بیریان مابوو کە باوکان و سەرکردەکانی پێشوو، پێش حکومەتی کۆلۆنیالی سۆسیالیزمیان تاقی کردووەتەوە و سۆسیالیزمی ئەفریقیا لەنێوان خێزانی گوندنشین و شێوازی هاوکاریی دوو لایەنە پەرەی سەندووە. ژمارەیەك لەم کۆمەڵگا بێ ژینانە" هیچ جۆرە ناکۆکییان لەنێوان بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان و کۆمەڵگاکەیان نەدەبینی، چونکە لەو بڕوایەدابوون کە ئێمە چاودێری بەسەر کۆمەڵگادا دەکەین و کۆمەڵگاش چاودێری بەسەر ئێمەدا دەکات".

نایرێرێ ئەرکی سۆسیالیزم لە دوای کۆلۆنیال کەمڕەنگ کردنەوەی شوێنپێی کاپیتالیزم دەزانی کە کۆلۆنیال بۆ ئەم کیشوەرەی هاوردە کردووە، لە کاتێکدا کە سۆسیالیزم زیندوو کردنەوەی بیرۆکە کلاسیکییەکانی سۆسیالیستی کۆمەڵگای ئەفریقیا و هاوجووت بوونی لەگەڵ سەردەمی هاوچەرخە. لەم رووەوە تانزانیا هەوڵی گەشەکردن بە شێوازی ناسەرمایەداریی دەدا. نایرێرێ دەپرسێت کە بۆچی سەرمایەداریی بە گشت خەسڵەتەکانیەوە، لەلایەن خەڵکەوە پێشوازی لێ دەکرێت و خەسڵەتی مرۆڤایەتی لەخۆ دەگرێت؟ ئەو لەو بڕوایەدا بوو کە سەرمایەداری بۆ رێکخستنی دەوڵەتی هاوچەرخ سوود لە بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای نوێ و شێوازی بەرهەمهێنانی سەرکوت کردنی کۆمەڵایەتی وەردەگرد و سوکایەتی بە مرۆڤ دەکات.

بۆیە پێویستە کۆمەڵگا قۆناغێکی هەماهەنگ لەپێناو گەیشتن بە سۆسیالیزم بەدی بهێنێت. پابەندی سۆسیالیزم بە بەیاننامەی ئارۆشا لە ساڵی ١٩٦٧دا راگەیێنرا واتە کاتێك کە زۆرێك لە رژێمە سۆسیالیستییەکان ئەم رەوتەیان بەجێ هێشت و چەندین وڵاتیتریش کودەتای سەربازی تیایدا ئەنجامدرا. نایرێرێ بناغەی ئایدیۆلۆژیای تانزانیای مکوم کرد. بەیاننامەی ئارۆشا بە ئامانجی بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی پشت بەستراو بە هاوکاریی و رێزگرتنی دوو لایەنە کە تیایدا مرۆڤ خاوەن ماف و هەلی یەکسانە و چەوساندنەوە بوونی نییە و گەل لە

خۆشگوزەرانی ماددی ڕێژەیی سوودمەندە، ڕاگەیێنرا. لەم بەیاننامەیەدا بە جەخت کردنە سەر سۆسیالیزم، چوار گرفت ڕاگەیێنرا کە پێویست بوو حکومەت بەرەنگاری ببێتەوە:

١. نایەکسانی بەرچاو لەنێوان فەرمانبەرانی حکومەت و کەرتی تایبەت (کۆمەڵگای مەدەنی).
٢. پێویستە ئامانج لە گەشەی سەرمایە، گەشەکردنی مرۆڤ بێت.( مرۆڤ لە چەقی گەشەی سەرمایەداری بێت).
٣. سەرمایەی تایبەت کە سوود بە سەرمایەدارەکان دەگەیێنێت، پێویستە ئەم سوودە بۆ هەمووان یەکسان بێت.( بەسەر هەمووان دابەش بکرێت).
٤. ناهاوسەنگی لە گەشەی شار و گوندەکاندا کە لە سوودی شارەکان بووە.

پەرلەمان یاساکانی تایبەت بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم چوار گرفتەی پەسەن کرد. فەرمانبەرە گشتییەکان و نوخبەی سیاسی بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی کۆلۆنیالدا ڕێکخراوتر بوون. ئەم بەیاننامەیە بوو بە ڕێگر لە بەردەم سەرکردەکانی ئەفریقیا بۆ هەوڵدان لە پێناو بەدەستهێنانی پۆستی زۆرتر و هاوبەش بوون لە خاوەندارێتیدا. مووچەکانیش سنووردار و بە پێی یاسا ڕێك خران و بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانیتر ئەم یاسایە بوو بە ڕێگر لە هەبرە سەرهەڵدانی چینی بۆرژەازی بۆرۆکراتیك لە تانزانیادا. خودی نایرێرێش بۆ ماوەیەك لە گوندێکدا نیشتەجێ بوو تا جەخت لەسەر ئەم بابەتە بکاتەوە کە گشت تانزانیاکان بۆ گەیشتن بە ئەمن و گەشەی ئابوور پێویستە کار بکەن. هەروەها دەوڵەتیش بە پابەند بوون بە بەیاننامەی ئاروشا بەڵێنیدا کە دەبێ مرۆڤ لە ئەولەوییەتی گەشەسەندندا بێت. بۆ ئەم مەبەستەش پەروەردەی گشتگیر لە خولە ئامادەکارییەکاندا دەست پێکرد. هەڵمەتی نەهێشتنی نەخوێندەواری ئەنجامدرا و لە گوندەکاندا بنکەی تەندروستی دامەزران. لەهەمبەر پرسی بنیاتنانی نەتەوە، زۆربەی سەرمایە تاکییەکان لە تانزانیادا (چ سەرمایەی ناوخۆیی و چ سەرمایەی دەرەکی) بۆ خاوەندارێتی گشتی گۆڕدران. ئامانج لە بەتایبەتی کردن ئەوە بوو کە لەبری ئەوەی لە ڕێگەی کەرتی تایبەتەوە دووبارە پێداویستییەکانی کەرتی تایبەت فەراهەم بکرێت، لەم ڕێگەیەوە وەڵامی پێداویستییەکانی گەل بدەنەوە. چوارەمین قۆناغی بەیاننامەی ئارۆشا، واتە گەشەپێدانی گوندەکان کە سۆسیالیزم زۆرتر لەگەڵ ئەم ناوچانە پەیوەندی هەبوو، ڕەچاو کرا.



لە جیهاندا تانزانیا کەمترین ڕێژەی شارنشینی لەخۆ دەگرێ. بەمجۆرەش (سیستەمی دەستەجەمعی (پشتبەستراو بە خێزان) ناچارە بە هۆی گەشەی ناوچەکانی دەوروبەری شار، ڕێگەیەك بۆ زیادکردنی بەرهەمهێنانی نەتەوەیی بدۆزێتەوە.

ئەگەر ژی نایرێرێ مەیلی ئەنجامدانی ئەم کارەی هەبوو، بەڵام ڕووبەڕووی هەمان ڕاستییەکان بووە کە پێشتر بەریتانیا و ئەڵمانیا لە قۆناغی کۆلۆنیال لەم وڵاتەدا ڕووبەڕووی ببوونەوە. لە تانزانیا خاوەندارێتی لە دەست وەرزێرە پەرت بووەکان و وێك نەچوودا بوو کە بەرهەمهێنانیان لە پێناو دابین کردنی بژێوی ڕۆژانەی ژیانیان بوو لە هیچ ڕۆڵێ لە پەرەپێدان و گەشەی ئابووری نەتەوەدا نەبوو و ناکرێ وەرزێرەکان وەك هێزی جوتیاری مۆدێرن کە شێوازی مۆدێرن بە کار دەهێنن هەژمار بکەین. نایرێرێ ئەم گرفتەی بە یەکپارچەیی گوندەکان لە مۆدیلێکدا کە بتوانێت وەك یەکەی کۆکەرەوەی بەرهەم، ڕۆڵێ هەبێت، چارەسەر کرد. بیرۆکەی سەرەکی پلانی لادێیی کردن تێکەڵێك لە ژیانی هاوکاریی یەکتر کردنی گوندنشینەکان لەگەڵ شێوازی بەرهەمهێنانی مۆدێرن و زیاد کردنی بەرهەمی کشتوکاڵییەکان لە ڕێگەی تەکنۆلۆژیاوە بوو. هەروەها دەبوایا ئەم پلانە لە پێناو زیادکردنی بەرهەمهێنان لە بواری هاوبەش و لەکەرتی تایبەت و بچووکدا ئەنجام بدرێت.

دەبوایا گوندنشینەکانی تانزانیا لە پێناو کۆمەڵگادا هاوکاریی یەکتریان کردبا تا هەم پێداویستییەکانیان دابین بکەن و هەمیش زیادە بەرهەمیان هەبێت، تا بەم شێوەیە بتوانن گەشە بە گوندەکان بدەن. دەبوایا گوندەکان وەك خاڵی پێکەوە گرێدان (نقطة تعامل) لەگەڵ کاربەدەستانی حکومەت هاوکاریی کردبا و لەم ڕێگەیەشەوە وەرزێرەکان فێری بنەما و تەکنیکەکانی مۆدێرنی کشتوکاڵی و شێوازی سوودوەرگرتن لە تەکنۆلۆژیا (ئامراز و شێوازەکانی ئاوەدان کردنەوە) دەبوون. بۆ دەوڵەتیش هەلی سەرمایەگوزاری کردن بەسەر هێزی کاردا دەرخسا. بۆ نموونە ژمارەیەکی زۆری قوتابخانە و بنکەی تەندروستی تازە دامەزراو لە پلانی(سیستەمی) دەستەجەمعیدا جێگرەوەدا، پەسەند کران و گوندەکانیش وەك ناوەندەکانی دیموکراسی خۆجێیی وەك دامەزراوەکانی دەوڵەت لە دەرکردنی بڕیارەکاندا یارمەتی کاربەدەستە سیاسییەکانی دەدا. پاول کیسر وەبیر دێنێتەوە کە پرۆسەی بنیاتنانەوەی گوندەکان بەو مەبەستە گەڵاڵە کرا تا لۆژیکی پشت بە خۆ بەستنی ئابووری بە ئامانەکانی یەکسانی کۆمەڵایەتی گرێ بدرێت.

پلانی (سیستەمی) دەستەجەمعی تا ساڵی ١٩٧٧، ١٣ ملیون گوندنشینی گرتەوە. ئەمەش بەو مانایە دێت کە زۆرینەی دانیشتوانی ئەم وڵاتە گوندنشینن. ژمارەیەك لەم گوندنشینانە بە ئامانجی نەتەوەیی و سۆسیالیستی بەشدارییان لەم پلانەدا کرد و ژمارەیەکیتریش پرۆپاگەندای حکومەت وەك نەهێشتنی باج، ئاسانکاری لە پەروەردە و بەدەستهێنانی پەینی کیمیاویی و خزمەتگوزارییەکانیتریان فریودران. لە ساڵانی دواتریشدا حکومەت پێویستی بە سەرکوتکردنی دەنگی کۆمەڵگا نارازییەکان بوو. بەڵام سەرەڕای ئەم رووداوە خێرایانە لە ئەندازیاری کۆمەڵایەتیدا، بە تاقیکردنەوەی (سیستەمی) دەستەجەمعی بۆ بەدیهێنانی گەشەی گوندەکان بە ئامانجی پەرەپێدانی ئابووری تانزانیا و وەپێشکەوتنی گەشەی ئابوور لە گەشەی دانیشتوان شکستی هێنا.

گۆران هایدن لەو بڕوایەدایە کە سیاسەتی کۆمەڵگای جێگرەوە بۆ بەرهەمهێنانی ئابوور شکستی هێنا، چونکە حکومەت و ئایدیۆلۆژیاکەی توانای کونترۆڵکردنی کۆمەڵگای وەرزێرانی تانزانیای نەبوو. گوندنشینەکان هەندێ لە ئامانجەکانی ئەم سیستەمەی دەستەجەمعی ( وەك ژیانی هاوبەش (اشتراکی) و دەست گەیشتن بە تەکنۆلۆژیای دەوڵەت و خۆشگوزەرانی)یان دەستەبەر کرد. بەڵام هیچ کاتێك بەپێی پلانی شێوازەکانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی مۆدێرن کاریان نەکرد، چونکە لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا، ئەفریقییەکان شێوازی کشتوکاڵی دەستەجەمعییان بە کار دێنا. ئەوان وەك (ئەندامانی) کۆمەڵگایەك لە پاراستنی کێڵگەکان و دورینەوەی بەرهەمەکان هاوکاری یەکتریان دەکرد. بەڵام هیچ کاتێك لە چاندنی بەرهەمدا ئەم هاوکارییە بوونی نەبوو، یاخود پشکدار بوون لە کار و بەرهەمەکاندا بوونی نەبوو. شێوازی وەرزێرانەی بەرهەمهێنان لە گوندەکاندا ( سەر بە پلانی دەستەجەمعی) بەردەوامی هەبوو. ئەویش بە جۆرێك کە کێڵگە هاوبەشەکان، بە هاوبەشی دەچێنران. بەڵام ئەمەش لە هەندێ کێڵگە و تەنیا بۆ یەکەمجار ئەنجامدرا. بە واتایەکیتر بەرهەمی بە دەست هاتوو لە کێڵگە بچووکە کەسییەکاندا، زۆرترین پشکیان لە بەرهەمهێناندا هەبوو. کاری دەستەجەمعی تەنیا لە پێناو بەدەستهێنانی داهاتی زۆرتر ئەنجام دەدرا. هایدن بەم ئەنجامە دەگات کە بۆ وەرزێرەکان، کارکردن لە کێڵگەی هاوبەش، هیچ کات بە ئامانج هەژمار ناکرێت و ئەوان هیچ مافێکیان لە پلانەدا بۆ خۆیان وێنا نەدەکرد. بۆ ئەوان ئەم پلانە وەك چالاکییەکی زیاد و بێهۆدە بوو کە لە ئابووری خێزاندا کورت دەکرایەوە. گوندنشینەکان بەپێی شێوازی بەرهەمهێنانی وەرزێری بەڕێوە دەبردران و (ئامرازەکانی) شێوازی بەرهەمهێنانی مۆدێرن



بۆیان دابین نەکرابوو. بەپێی توانا و ئەولەوییەتەکان، خستنەڕووی هۆی سەرنەکەوتنی (سیستەمی) دەستەجەمعی لە لادێیەکاندا سەخت نییە، چونکە وەرزێرەکان خاوەن پێشینەی سەرمایەداری نەبوون و بەم پێیەش زیادە بەرهەمهێنان بۆ ئەوان بە ئامانج هەژمار نەدەکرا.

بە رەچاو کردنی رەزامەندی وەرزێرەکان لە بەرهەمهێنانی رۆژانەیان، پەرەپێدان بە ئابووری نەتەوەیی، هەر لە دەستپێکەوە خنکێنرا.، گەشەی ئابووری بەڵێن پێدراویش جێبەجێ نەکرا و تەنانەت لە هەندێ ناوچەدا گۆژمەی پێویست بۆ دابینکردنی تێچوونی دامەزراندنی ئەم جۆرە گوندانە بە شێوازی دەستەجەمعی بوونی نەبوو. نایرێرێ لە پێداچوونەوەکانیدا بۆ پلانی پێشکەوتنی تانزانیا بەرەو سۆسیالیزم کە پاش دە ساڵ لە بەیاننامەی ئارۆشا نووسراوەتەوە دانی بەم راستییەنا کە " ئەنجامە بەدەوست هاتووەکان لە (پلانی) چاکسازیی کشتوکاڵیدا بە شێوازی گونجاو دانەرێژرابوو".

ناتوانین سەرنەکەوتنی بەرهەمهێنانی گوندەکان بەپێی پلانی دەستەجەمعی، هەڵقوڵاوی کۆمەڵگای وەرزێری پێ نەگەیشتوو بزانین. بەڵکو پێویستە خودی دەوڵەتیش هەندێ کێماسی لەئەستۆ بگرێت. دامەزراوە جێبەجێ کارەکانیش هەندێ هەڵەیان ئەنجامداوە. هەندێ جار خەڵك لە ناوچە بەیارەکاندا نیشتەجێ کران کە بەرهەم و دانەوێڵەی خراپ تیایدا بەرهەم دەهات. زیاد لەمەش، ئەوان ئیمکاناتی ژێرخانی بۆ گواستنەوە و ئامرازی پێویست بۆ دروێنەوە بوونی نەبوو. هەڵەی لەم جۆرە لە پلانی گەشەکردندا نکۆڵی لێ نەکراون، بەڵام لە هەڵسوکەوتی نێوان وەرزێران و دامەزراوە خۆجێییەکان، حکومەت بە شکست هێنانی ئایدیۆلۆژیای دەستەجەمعی یارمەتی زۆریدا. ناچار کردنی وەرزێرە نارازییەکان بۆ کارکردنی دەستەجەمعی لە کێڵگەکاندا و هەروەها دەسەڵاتی بۆرۆکراتەکان لە هۆکارەکانی شکست هێنانی ئەم پلانە بوون. هاوکاریتر لە خێراتر کردنی شکست هێنانی ئەم پلانە ئەوە بوو کە حکومەت بۆ پاراستنی مەشروعییەت، سیستەمی دەرەبەگایەتی لە گوندەکاندا دامەزراند. بەم پێیەش سەرمایەکانی (تەرخانکراو بۆ) گەشەپێدان لەبری ئەوەی کە لەپێناو پەرەپێدان بە بەرهەمەکان سەرمایەگوزرای بکرێت، لە بینا و دامەزراوە بۆرۆکراتییەکاندا خەرج کرا. بە بوونی ئەم جۆرە دامەزراوە بۆرۆکراتیکانە و وەرزێرە ناپێگەیشتووەکانی ژێر سەرپەرشتی ئەم دامەزراوانە، جێی سەرسوڕمان نییە کە ئەم پلانە بە شێوازی جۆراوجۆرەوە شکست بهێنێت.

گەشەی ئابووری تانزانیا بە بەراورد لەگەڵ گەشەی دانیشتوانی خێرایی کەمتری هەبوو و ئەم بابەتەش لە سەردەمی سەربەخۆییدا پێشبینی کرابوو و پلانی دەستەجەمعیش لەپێناو

چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە دارێژرابوو. تانزانیا یەکێك لە دوایین وڵاتان بوو کە سیاسەتە گشتییەکانی پشت بەستراو بە بیرۆکەی سۆسیالیزمی ئەفریقیا و پشت بە خۆبەستنی پەیڕەوی کرد. شێوازی ناسەرمایەداری گەشەکردن تەنانەت لە ساڵانی هەشتاکاندا، واتە کاتێك کە وڵاتانی دراوسێ بەرەو ڕێکخراوە ئابوورییەکانی نێودەوڵەتی گەڕانەوە تا بتوانن پارێزگاری لە ئابووری لە دۆخی هەرەس هێناندا بکەن، لە تانزانیا پشتگیری لەم جۆرە گەشەیە کرا. بەڵام دواجار تانزانیا ناچار بە پەسەندکردنی شێوازی سەپێنراو لەلایەن ڕێکخراوە ئابوورییەکانی نێودەوڵەتی بوویەوە. گوشاری قەرزە دەرەکییەکان، حکومەتی لە ساڵی ١٩٨٦دا ناچار بە ڕێککەوتن لەگەڵ دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی کرد و بۆ جێبەجێ کردنی پلانی هەمەوارکردنی ستراکتۆریی حکومەت ناچار بوو کە بۆ ئازاد کردنی ئابووریی هەوڵ بدات.

ئەگەرچی پێش ناوبژیوانی کردن سەبارەت بە شکست هێنانی پلانی (سیستەمی دەستەجەمعی، دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان دەبوایا درکیان کردبا کە تانزانیا وڵاتێکی سەقامگیرە. تانزانیا وڵاتێك بوو کە دوای سەربەخۆیی چالاکی پەروەردە و چاودێری تەندروستی و... بە بەرفراوانی ئەنجامدرا. ئێستا پێویستە ببینین کە ئەگەر پلانی هەمەوارکردنی ستراکتۆریی لە درێژخایەندا جێبەجێ بکرێت، ئاستێك لە بووژانەوەی ئابوور بەرهەم دێت کە بتوانێ کەم و کۆڕی سەرمایەگوزاری هێزی مرۆیی قەرەبوو بکاتەوە؟

**تانزانیا:**

| | |
|---|---|
| ڕووبەر | ٩٣٩/٧٦٠ |
| دانیشتوان | ٣٢ ملیۆن کەس |
| هێزی کۆلۆنیالکار | بەریتانیا و ئەڵمانیا |
| ساڵی سەربەخۆیی | ١٩٦٤ |
| گرنگترین شارەکان | دارولسەلام، موانزا، تابۆرا |
| گرنگترین نەژادەکان | ئۆی، کاباری، ماسایی، گرووپەکانیتر |
| ڕێگەی گەشەی دانیشتوان | ٤١ لە دایك بوون لە هەر ١٠٠٠ کەس دانیشتوو |
| زامن | ئەنگلیزی، سواحیلی |
| ناوەندی ژیان | ٥٢ ساڵ |
| ڕێژەی خوێندەواری | ٦٧/٨ |



| | |
|---|---|
| گرنگترین هەناردەکان | قاوە، کەتان، دانەوێڵەوی کاشیۆ (میوەیەك بۆ دەرمان)، توتن |
| دراو | شلینگی تانزانیا |
| ڕێژەی مردن | ٨٠ مردن لە هەر ١٠٠٠ لە دایك بوو |
| ئایین | سونەتی، مەسیحی، هیندو |
| بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی(gdp) | ٢٣٤ دولار |

## زاراوە سەرەکییەکان:

**سۆسیالیزمی ئەفریقیا:** زنجیرە سۆسیالیزمێك لەبری ئەوەی کە پشت بەستراو بە ململانێی چینایەتی مارکسیست – لینینیست بێت، پشت بەستراو بە بەها نەریتییەکانی ئەفریقیا (بەپێی هاوبەشییەکان و هاوکاری یەکتر کردنی گوندنشینەکان)ە.

**ئایدیۆلۆژیا:** سیستەمی ڕێنمایکەری ژیان، کە پشت بەستراو بە بڕوا، بەها و ئامانجەکانە کە کاریگەری لەسەر کردەی سیاسی دادەنێت.

**لکاندن (الحاق):** بزاڤێکی پشیتگیری کراو لەلایەن نەژادێك لەپێناو دووبارە بەدەست هێنانەوەی گەل و خاك لە دەوروبەری سنوورەکاندا.

**نەتەوە:** کۆمەڵە خەڵکێکی هاوبەش لە زمان و مێژوو و... هاوبەش کە لە ڕێگەی بەها و نەریتەکانەوە لێك کۆ بوونەتەوە.

**ناسیۆنالیزم:** بیرۆکەی پشت بەستراو بەوەی کە پێویستە نەتەوە لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی تایبەت بە خۆی بێت.

**بنیاتنانی دەوڵەت:** هەوڵدانەکانی دوای سەربەخۆیی بە ئامانجی بەدیهێنانی یەکێتی نەتەوە و گەشەی ئابوور.

**سنوورە پیرۆز و نەگۆڕەکان لە ڕێکخراوی یەکێتی ئەوفریقیا:** ڕێککەوتنی زۆربەی ئەندامانی ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقیا لە ساڵی ١٩٦٣ بۆ نەگۆڕینی سنوورەکانی بەجێماو لە کۆلۆنیال.

**بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان:** بزاڤی سیاسی پشت بەستراو بە داواکاریی هاوڵاتی ئاسایی.

**سۆسیالیزمی زانستی:** ڕەتێکی سۆسیالیزمی پشت بەستراو بە شیکردنەوەکانی مارکس کە لەلایەن لینینەوە پەرەی پێدرا.

**جیاخوازیی:** رەتێك لە ناوچەیەكی دیاركراوی وڵاتێك كـە هـەڵ بـۆ دامەزرانـدنی دەوڵـەتی سەربەخۆ دەدات یاخود بە وڵاتێكیتر بلكێنرێت.

**سەرمایەداریی دەوڵەتی:** سیاسەتی جەختكردنەوە سەر بازاڕی ئازاد (نـاوخۆیی و دەرەكـی) بەڵام دەوڵەت هەر دەست لە كاروباری ئابوور وەردەدات.

**هەمواركردنی ستراكتۆریی:** وەرگرتنی قەرز لـە دامـەزراوە داراییـەكانی نێودەوڵـەتی، كـە مەرجی ئەم قەرز پێدانەش ئازادكردنی سیاسەتە ئابووری و سیاسەتە گشتییەكانە.

**پرسیارەكان:**

١. چۆن ئایدیۆلۆژیا لە سیاسەتدا بەكار دەهێنرێت؟

٢. جیاوازی ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا و ناسیۆنالیزمی شوێنەكانیتری جیهان چییە؟

٣. تا چ ئاستێك ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا لە بەرگری كرن لە ستراكتۆریی بەرقەرار (بـەجێماوی سەردەمی كۆلۆنیال) سەركەوتوو بووە؟

٤. سۆسـیالیزمی ئـەفریقیا و رژێمـە ماركـسیزمییەكانی ئـەفریقیا تـا چ رادەیـەك لـە ژێـر كاریگەری بنەما پێشكەوتووەكانی سۆسیالیزمە ئەوروپادا بوون؟

٥. ئایا دامـەزراوە جەماوەرییـەكان (كۆمـەڵی) و سـەرمایەداری دەوڵـەتی لـە بـەڕێوەبردنی دەوڵەتانی ئەفریقیا لە هاوشێوە سۆسیالیستییەكانیان سەركەوتووتر بوون؟

٦. ناكۆكییـەكانی نێـوان ئایـدیۆلوژیای دەوڵـەت و كۆمـەڵگای مـەدەنی لـە قۆنـاغی دوای كۆلۆنیالدا چی بوون؟

**بۆ خویندنی زۆرتر:**

بۆ خوێندنی زۆرتر پەرتووكی ئەرنست گلنر سـەبارەت بـە ناسـیۆنالیزم دەسـتپێكی باشـە. دەتوانرێت سوود لە پەرتووكی باسیل دیڤیدسن و وتاری كرافۆرد یونگ سـەبارەت بـە چـونێتی بـەكارهێنای چـەمكی ناسـیۆنالیزم وربگیرێـت. كریـستوفر كلافهـام سـەبارەت بـە شۆڕشـی ماركسیستی – لێنینیستی لە ئەسیۆپیادا پەرتووكێكی بەپێزی هەیە.



# بەشی چوارەم

# نەژادگەرایی و ئایین: خێڵ، خواوەندەكان و شوناسی سیاسی

دەکرێ مـۆبیلیزەکردنی سیاسـی لـە چـەقی رکابەرێتییـە سیاسـییەکاندا ببینرێـت. هـیچ دەوڵەتێك لە کاریگەرییەکانی ئەم دیاردەیە بە دوور نییە. بۆ نموونە هزرگەلی نەژادپەرەسـتی و ناسیۆنالیستی بە درێژایی جەنگی جیهانی دووەم و ناوەڕاستەکانی سەدەی بیستەمدا، ئەوروپای بەسەر دوو کۆمەڵدا دابەشکرد. لە نەوەدەکاندا ئەم هەستە وێکچوانە، پـشێوی و ئـاژاوەگێڕانی لە ناوچەی بالکاندا خولقاند. تەنانەت لە یەکێتی ئەوروپاشدا مشومڕی نەژادیی بـوونی هەیـە. بۆ نموونە دانیشتوانی ئێرلەندای باکوور و باسکی ئیسپانیا ئاگاداریی تەواویان لەسەر تراژدیـای گەشـەی رکابـەرێتی خێڵەکیانـەی هەیـە. هـەروەها سەرسـوڕهێنەر نییـە کـە لـە ویلایەتـە یەکگرتووەکاندا توندوتیژی گشتگیر بوونی هەیە. نموونەگەلی بەربڵاو لـەو شۆڕشـانەی کـە لـە دەیە دواییەکانی (سەدەی بیستەمدا) روویدا ئاشکرا دەکات کـە کەمینـەکان لـە نایەکـسانی کۆمەڵگای ئەمریکا نارازین.

شایانی ئاماژە پێدانە کە بوونی نەژادگەرایی هەمیشە هۆکای نواندنەوەی توندوتیژی نییە. هەندێ جار داواکاری و خواستەکانیان هەروەك ناکۆکییەکانیتری بەرقەرار لـە کۆمـەڵگادا، بـە ئاشتی خوازانە و لە رێگەی دامەزراوە سیاسییەکانەوە بە بەرپرسەکان دەسپێردرێت. بـۆ نموونـە لە ساڵی ١٩٩٧دا سکۆتلەندا، دەنگی بۆ دامەزراندنی پەرلەمانی سەربەخۆدا. هەروەها نـەژادە جۆراوجۆرەکانی ولایەتە یـەکگرتووەکان شـارەزاییەکی زۆریـان لـە (چـۆنێتی) بەدواداچـوونی داواکاریی و بەرژەوەندییەکانیان بەپێی یاسا هەیە. بە هۆی چاکسازیی ئایینزاییـەوە ئـەڵمانیا سـەرەڕای تێکـەڵ بـە یـەکتربوونلای کاسـۆلیك و پرۆتـستانتەکان، نموونەیـەکی سـەرکەوتووی کونترۆڵی کۆمەڵایەتییە.

هەروەك رۆژئاوا، لە کیشوەری ئـەفریقیا هەڵـسوکەوتی (تعامـل) سیاسـی کـارتێکراو بـە نەژادگەراییە. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم دەوڵەتانە تازە دامەزراون، بـەڵام هەسـتی نەژادگـەرایی هەروەك بیرۆکەی نەتەوەگەرایی بەهێزە. بەجۆرەش سەرکردە سیاسییەکانی ئـەفریقیا لـە کـاتی بڕیاردان و سیاسەت داڕێشتن پێویستە نەتەنیا هزر لە بەرژەوەندیی نەتەوەیی بکەنـەوە، بـەڵکو ناچارن بەرپەرچـدانەوەی نـەژادەکانی کۆمەڵگاکانیـشیان رەچـاو بکـەن. گـرنگترین پـرس بـۆ سەرکردە سیاسییەکانی ئەفریقیا ئەوەیە کە پشتگیری لـە رکابـەرێتی ئاشـتیانە بکـەن و ئـەم رکابەرێتییەش بەپێی یاسا ئەنجام بدرێت.

لەم بەشەدا باس لە دەسترۆیی و کاریگەریی مۆبیلیزەکردنی سیاسی بەسـەر سیاسـەتەکانی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال دەکرێت. بۆ ئەم مەبەستەش، لەم بەشەدا سەرەتا پێناسەکانی کۆمەڵ

ناسان لە نەژادگەرایی دەخرێتەڕوو، دواتر باس لە شوناسی نەتەوەیی لە کۆمەڵگاکانی ئەفریقیادا دەکەین. لەم بەشەدا چەقی باسکردنەکانمان ئەوە دەبێت کە نەژادگەرایی لەمپەرێکی بەهێز و هەتاهەتایی نییە لەبەردەم حکومەتدا. ئەم دوو شوناسە کۆمەڵایەتییە (ئایین و نەژادگەرایی) وەکو (ئامرازی) هاوسەنگی دەسەڵاتی دەوڵەت کار دەکەن و بۆ مۆبیلیزەکردنی سیاسی و کۆمەڵگای مەدەنی بەسوودن.

### پێناسەکانی نەژادگەرایی:

لە پێناسەیەکی سەرەکیدا نەژادگەرایی واتە" کۆمەڵە خەڵکێك کە لە شوناس و چارەنووسی پشت بەستراو بە بابەتە ریشەییەکانی وەك پەیوەندی خێزانی، نەریتەکان، کولتووری قۆرغکراو، لە مێژوو و زماندا، هاوبەشن". بەپێی ئەم پێناسەیەش نەژاد لەبری ئەوەی کە پشت بەستراو بە هەڵکەوتەی جوگرافیایی بێت، پشت بەستراو بە "کۆمەڵگای خەیاڵی" و هەستی رادیکالی و نەریتەکانە.

بیرۆکەی نەژادیی بۆ لێك جیاکردنەوەی گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگا سەریهەڵدا. ئەم نەژادگەراییە" کێشەدارە" سەرنجی زانایانی زانستە سیاسییەکانی راکێش کرد. ئەم زانایانە دەتوانن ئەزموونێکی گەورە لە خوێندنەوەی چۆنێتی پەیوەندی نێوان گرووپەکان و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ رێکخراوە کۆمەڵایەتییە بەرفراوانەکانی وەك دەوڵەت و نەتەوە بە دەست بهێنن، بەتایبەتیش ئەو کاتەی کە وڵات زیادتر لە نەژادێکی لەخۆ گرتبێت پرسی نەژاد زەقتر دەبێتەوە.

بۆچوونی گشتی ئەوەیە کە گرووپی نەژادی کۆمەڵگایەکی بچووکە کە لە دەروونی کۆمەڵگایەکی گەورەتردا بنیاتنراوە. بۆ نموونە زۆربەی کۆمەڵە کۆچ بەرەکان بۆ بەریتانیا بە" کەمینەی نەژادی هەژمار دەکرێن". یاخود کەمینە لە ولایەتە یەکگرتووەکاندا بە کەمینەی سەرەکی (یەکەم دانیشتوان) هەژمار دەکرین، وەك ئەمریکی ئیرلەندا، ئەمریکی ئەفریقیا و.... بەڵام ئەم جۆرە پێناسە و هەڵسەنگاندنەی نەژادگەرایی لە رێگە لادەرن. گشت کەس و کەسایەتییەکان چ سەر بە کەمینە بن یاخود زۆرینە، پشتگیریی لە نەژادگەرایی دەکەن. بۆ ئەوەی کە ببیت بە بەریتانی یاخود سکۆتلەندی هەر ئەوەندە بەسە کە سەر بە گرووپێکی نەژادیی بیت. هەروەها دەکرێ لە هەمان کاتدا ئەندامی کۆمەڵگایەکی بچووکی ئەفریقیایی، کارائیب، یاخود ئاسیایی بیت. بەم پێیەش نەژادگەرایی هەستێکی دەربڕاوە چ لەلایەن کەمینە



بێت یاخود زۆرینە، زانایانی بواری سیاسیش ناچارن ئەم دەربڕینە بخەنەڕوو. ئەم جۆرەی پۆلۆرالیزمی کۆمەڵایەتی لەنێوان بەرژەوەندییەکاندا ناکۆکی دروست دەکات و زۆرترین نیگەرانیش بۆ سیاسەتمەداران دێنێتەکایەوە.

### دروستکردنی خێڵ:

نەژادگەرایی و خێڵگەرایی، دەتوانن رووداوە سیاسییەکانی ئەفریقیا روون بکەنەوە. میدیاکان باس لەوە دەکەن کە توندوتیژی و پێکدادان بە هۆی هێرشی خێڵی A بۆ سەر خێڵی B روویداوە، بەڵام هیچ روونکردنەوەیەکیتر سەبارەت بەم توندوتیژییە ناخرێتەڕوو. چونکە لە روانگەی ئەوانەوە ئەفریقییەکان هەر لە بنەڕەتدا خێڵگەران و بە خێڵەکی هەڵسوکەوت دەکەن. سروشتییە وەها گریمانە بکرێت کە رەکابەرێتی کۆنی نەژادی هەندێ جار بەرەو شەڕ کۆتا دێت.

نووسینە کۆنەکان خێڵەکانی ئەفریقیا بە میراتی پێش کۆلۆنیال هەژمار دەکەن. بەپێی ئەم نووسینانە وەفاداری مێژوویی وەك مۆدیلێك واتە مۆدیلی درندەیی (دۆخی) سەرەتایی تا هەنوکە هەر درێژەی هەیە و ئەم (دۆخەش) تا ئەو کاتەی کە هێزەکانی مۆدێرنیزم چالاکی خێڵەکی لە ناو نەبەن، بەردەوامی دەبێت. ئەم دۆخەش کاتێك لە ناو دەچێت کە ئەفریقییەکان پەرە بە هۆشیاریی نەتەوەیی بدەن، هاوکاریی یەکتر بکەن و سوود لە بەرهەمەکانی شارستانییەتی هاوچەرخ وەربگرن. (هەروەك رۆژئاواییەکان کە ئەم کارەیان لە دەوڵەت-نەتەوەکانیاندا ئەنجامدا). بەپێی بارودۆخی بەرقەرار سروشتییە کە خێلەکان شەڕی یەکتر بکەن و توندوتیژی بەکار بهێنن.

لێکدانەوەی خێڵگەرایانەی سیاسەتەکانی ئەفریقیا بێ بایەخن. پێویستە شارەزایانی سیاسی لەم میتۆدە ساکارانە دەرباز بن و ئاراستەی پۆلۆرالیزمی کۆمەڵایەتی بگرنەبەر. پێویستە ئەوان بزانن کە بۆچی خێڵی A لەگەڵ خێڵی B بە شەڕ هاتووە؟ ئەگەر هۆی ئەم شەڕ و پێکدادانە دیاردەیەکی خۆڕسکانە نەبێت، کە واتە فاکتەری سەرەکی ئەم پێکدادانە چییە؟ بۆچی ئەم پێکدادانە لە رێگەی مشومڕی ئاشتیخوازانەی سیاسی بە شێوازێکی تەواو جیاواز لە( توندوتیژی) کونترۆڵ نەکرا؟ پێویستە وەڵامی ئەم پرسیارانە بدرێتەوە. لێکدانەوەی خێڵگەرایانە وەڵامی هیچ یەك لەم پرسیارانە ناداتەوە. مومکینە لە ئەفریقیادا نەژادگەرایی فاکتەری مۆبیلیزەکردنی سیاسی بێت، بەڵام بە دەگمەن یەکەم فاکتەری شەڕ و ململانێش بێت.

جرالد پرۆنیر لە تویژینەوکەیدا لەسەر تێگەیشتن لە کۆمەڵکوژی  ساڵی ١٩٩٤ لە رواندا، ئەم پرسیارانەی خستەڕوو. لە سەرتاسەری جیهاندا بینەرانی تەلەفزیۆن نەیاندەتوانی ئەم حەقیقەتە قەبووڵ بکەن کە لە ماوەی سێ مانگدا ٨٠٠٠٠٠ کەس کوژراون. بۆ بینەران دژوار بوو هزر لەوە بکەن کە چ کەسێك ئەم کارەی ئەنجام داوە. چ بگاتە ئەوەی کە بۆچی ئەم کۆمەڵکوژییە روویداوە. سادەترین وەڵام ئەوە بوو کە وردەکارییەکانی (ئەم رووداوە) پشتگوێ بخەین و ئەم رووداوە لە خێڵگەراییدا کورت بکەینەوە.

هەنوکەش برۆنیز لەم بڕوایەدایە کە (( ئەو شتەی ئێمە لە رواندا بینیمان، بەرهەمێکی مێژوویی بوو نەك کوشتارێکی بیۆلۆژی یاخود کوشتارێکی درندانەی لە خۆ هەڵقولاّو)). خێڵەکانی توتسی و هۆتۆ لەلایەن خواوەندی سەگ و پشیلە خەڵق نەکراون کە ناچار بە کوشتنی یەکتر بۆ هەتاهەتایی بن. دەبێ بزوێنەرێك بۆ ئەم کۆکوژییە بوونی هەبێت. کۆکوژی گەلی رواندا لە ریشەکێش کردنی جووەکان بە ئەڵمانیای نازی و لەناوبردنی دانیشوانی رەسەنی ئەمریکای باکوور لەلایەن سوپای ئەمریکاوە، نەژادپەرەستانەتر نەبوو. گشت ئەم رووداوانە پێشینەیەکی مێژوویی تایبەت و بڕیار دەرکردنی خێرای سیاسی هەیە.

پێویستە بۆ روونکردنەوەی ململانێ لە ئەفریقیادا گشت هۆیەکانیتری ململانێ لە سەرتاسەری جیهاندا روون بکرێتەوە و ناکرێ تەنیا پشت بە ( هۆکاری)  خێڵگەرایی ببەستین. هەروەك چۆن پرۆنیز لەم بڕوایەدایە کە ((یارمەتیدان بۆ تێگەیشتنی هەڵە لە کوشتاری رواندا لە رێگەی کلێشەی ساکارەوە، خاڵی کۆتایی و ( یارمەتیدەری)  بکوژەکانی بۆ کامڵ کردنی (خەسڵەتی)  دژە مرۆڤایەتی بوونی کوژراوەکان. نکۆلی کردن لە مانا کۆمەڵایەتییەکەی مردنی مرۆڤ لە راستیدا بە مانای دووبارە کوشتنی ئەم کەسە دێت. جاری یەکەم کوشتنی جەستە و جاری دووەمیش کوشتنی رۆح)).

باسی هەتاهەتایی بوونی نەتەوایەتی باسێکی تەواو هەڵەیە، چونکە نەژادەکانی ئەفریقیا کابوسێك لە رابردوو یاخود بەرماوەی مێژوویی نین، بەڵکو ئەمڕۆکە گرووپە نەژادییەکان بەشێك لە دامەزراوەی کۆمەڵایەتین کە وەڵامی خواستە سیاسی و ئابوورییەکان دەدەنەوە. لە راستیدا، خێڵەکانی ئەفریقیا خاوەن ستراکتۆریی کۆمەڵایەتی مۆدێرنن. خێڵەکانی ئەفریقیا تا کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم پێك نەهاتبوون، ئەم خێڵانە لە ١٥٠ ساڵی رابردوودا گرنگییان بەدەست هێنا.



هەندێ کۆمەڵگا (لە رووی ژمارەوە کەم)  لە ئەفریقیای پێش کۆڵۆنیالدا بە خێڵ هەژمار دەکرێن. لە رووی نەریتەوە، ئەنجوومەنە نەژادییەکان بە بەراورد لەگەڵ جۆرە مۆدێنەکانیاندا، بکێشمانی زۆرتریان هەبووە. ئایدان سۆسال، باس لە شوناسە تێکچڕژا و پێکەوە گرێداوەکانی ئەفریقیا دەکات. بێ گومان، گرووپی خزمایەتی و خێڵ لە ئەفریقیای پێش کۆڵۆنیالدا بوونی هەبووە، بەڵام بەم جۆرەی هەنوکەیی واتە بە یەکگرتوویی، بوونی نەبووەوە و وەفادارێتی بە تێپەڕ بوونی کات گۆڕانی بەسەردا هاتووە (لە رێگەی هاوسەرگیری، کوێلاتی، کۆچکردن، سەرباز بوون). بۆ نموونە دانیشتوانی رەسەنی غانا کە ئەمڕۆکە خۆیان بە ئاکان دەناسێنن، پێشتر بە پێی گرووپە جۆراوجۆرەکانی وەك ئاسانتی، فانتی، برونگ، ئاکیم و ئەنزیما پۆلین دەکران و ئەمەش دەکرێ وەها لێك بدرێتەوە کە خێڵی ئاکان زۆر بچووکتر لە نەتەوەی سەرەتایی پێش سەدەی بیستەم بووە.

هەر بۆیەش ئەفریقییەکان زاراوەی خێڵ بەکار نایێنن و کەسانێکی زۆر هەن کە ئەم زاراوەیان خستووەتە کەوانەدا و بە پرسێکی پەراویز خراوی هەژمار دەکەن.

باشترە کە سەبارەت بە نەژاد کلێشە سەرەتاییەکان، نەك کلێشە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا وەلا بنێین. بۆ نموونە بۆچی دەبێ ئەفریقییەکان بە زاراوەی خێڵ پێناسە بکەین، بەڵام خێڵ و دانیشتوانی وێلز یاخود تگزانس بە خێڵ هەژمار نەکرێن؟ ئەو وێنایەی کە لەم نموونەیەدا بەدەست دێت لەبری ئەوەی کە رۆشنگەر بێت زۆرتر فریودەرە، واتە ( بەکار هێنانی) چەمکی گەردوونی نەژادگەرایی سوودمەندترە.

بەڵام بۆچی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، خێڵ سەریهەڵدا؟ بۆچی زۆربەی نەژادە کۆچ بەرەکان لەم ناوچانەدا نیشتەجێ بوون؟ کەواتە لە خۆڕا نییە کە پرۆسەی خێڵگەرایی هاوکات لەگەڵ سەردەمی کۆڵۆنیال کردنی ئەفریقیا سەری هەڵدابێت. دانیشتوانی ئەم کیشوەرە بە دوو هۆ لە کۆمەڵگاکانی خێڵەکیدا گرد بوونەتەوە یەکەم، پابەند بوون بەو شتانەی کە دەبوایا حکومەتی ئیمپریالیزم جێبەجێی کردبا. دووەم: خودی ئەفریقییەکان بە مەبەستی پێشکەوتن لە ژینگەی سیاسی نوێی کۆڵۆنیالکراودا، شوناسی نوێی نەژادییان دروستکردووە.

کاتێك کە ئەوروپییەکان لەم کیشوەرەدا دەسەڵاتیان گرتە دەست، ناچار بوون بەو کۆمەڵگایانەی کە فەرمانڕەواییان دەکرد، مانا ببەخشن. ئیمپریالیزم بە شێوەیەکی ستەمکارانەوە بە دەگمەن لەگەڵ سروشتی کۆمەڵگای خزمایەتی ئەفریقیا خۆی گونجاند. لەبری

ئەمەشدا دەسەڵاتدارانی کۆلۆنیال هەوڵیاندا تا واقیعییەتەکان بەپێی پێداویستی کارەکانیان بخەنەڕوو. لەم بارەوە کرافۆرد یونگ لەو بڕوایەدا بوو کە: "دەوڵەتی کۆلۆنیالکار بەتایبەتیش بەریتانیا و بەلجیکا لە بنیاتنانەوەی هەژموونی، ناچار بە دروستکردنی چین بوون و دامەزراوەی کارگێڕییان دامەزراند کە ریشەی بۆ بۆچوونە خێڵگەرایی ئەفریقیا دەگەڕایەوە. بەمجۆرەش ئەرکی فەرمانڕەوا داڕێشتنەوەی نەتەوە بەپێی شوناسی عەقڵانی و کارامەیی بوو".

بەمجۆرەش خێڵەکان لە بلوکی ناوچەییدا بەمەبەستی ئاسانکردنی کۆنترۆڵی سیاسی و ئابووریی ئەم خێڵانە گرد بوونەوە. لەو شوێنانەی کە خێڵ بوونی نەبوو حکومەتی کۆلۆنیالی گشت هەوڵەکانی بۆ دروستکردنی خێڵ چڕ کردەوە و وەك مرۆڤناسی ئاماتۆر ئەم هەوڵانە پشت بەستراو بە توێژینەوەکانی نەژادیی و گۆماناوییەکان بوون. پاش ئەم قۆناغە، پۆستی سەرۆك وەك ناوبژیوانی نێوان نەژادەکان و دەوڵەتی کۆلۆنیالکار دەستنیشانکرا. هەندێ جار ئەم کەسانە لەنێوان سەرکردەکانی ئەفریقیا هەڵبژێردراون یاخود پاڵێوراوێکی میانڕەو هەڵبژێردراوە. بۆ نموونە فۆبی لە باکووری کامیرون لەلایەن کاربەدەستانی کۆلۆنیالەوە وەك خێڵ بە فەرمی ناسێنرا و ئەم پرسەش، ئەندامانی ئەم خێڵە خستەناو میکانیزمەکانی کارگێڕی دەوڵەتی کۆلۆنیالدا. توێژینەوەیەکی وردتر لەسەر ئەم خێڵانە جیاوازییە ناوخۆییەکانیان دەخاتەڕوو. لە ناو ئەم گرووپە (خێڵ)دا نەتەوەی کیردی هەیە، سەد ساڵ لەمەوبەر فۆلبی ئەم نەتەوەیەی خستبوو ژێر دەسەڵاتی خۆیدا. شوناسی لێك جیاوازی ئەم دوو نەتەوەیە تا هەنوکەش هەر بەردەوامی هەیە. بۆ نموونە فۆلبی بەرەو ئیسلام مەیلدار بوو لە کاتێکدا کە نەتەوەی کیردی گرووپگەلی جۆراوجۆری وەك مۆندانگ، تیۆ پیۆری، گیۆ سیلگا، ماسا، ئیمبۆم دۆرۆ لەخۆ گرتووە. ئەگەرچی گشت ئەم گرووپانە بۆ (بەدیهێنانی) ئامانجەکانی کاربەدەستانی کۆلۆنیال وەك ئەندامانی پارتی فۆلبی هەژمار دەکرێن. بکێشمانی شوناسەکانی پێش کۆلۆنیال بوونی نەماوە، لە ئەنجامدا سنوورە نەژادییەکان بەهۆی پێشکەوتنەکانی سەدەی بیستەمەوە کەمتر تووشی درز تێکەوتنەوە بووەتەوە. کێشە تەنیا لە سەپاندنی خێڵ بەسەر ئەفریقیادا کورت نەدەبووە. ژمارەیەك لە وڵاتانی ئەفریقیا بە خرۆشەوە شوناسگەلی نوێیان بە مەبەستی پەرەپێدان بە بەرژەوەندییەکانیان، لە سەرووی کۆمەڵگاکان داڕێشت و ئەمەش جیاوازی زۆری لەگەڵ ئەو بیرۆکانە هەبوو کە هەوڵیان دەدا لەنێوان دەوڵەت و خێڵەکاندا ناوبژیوانی بکەن. (واتە دەوڵەت و خێڵەکان پێکەوە گرێ بدەن) . ئەم کەسانە لەپێناو ئەوەی کە ببن بە سەرکردەی کۆمەڵگایەکی گەورەتر و بەرژەوەندییەکانی هەڵقولاو لەم پۆستە و دەست گەیشتن بە دامەزراوەکانی حکومەت، ڕەزامەندییان لەسەر ئەم شوناسە هەبوو. لە ژێر ئەم چەشنە بارودۆخەدا جێی سەرسوڕمان نییە کە ئەم ناوبژیوانانە سوودی لە رادەبەدەر لە دروستکردنی ئەسورەی خێڵ دەستەبەر بکەن.

زۆرێك لەو کەسانەی کە ئەم خێڵانەیان دامەزراندبوو، ئەم ئەسورەیان پەسەند کرد. سەرەڕای ئەمەش، ئەم شادەمارە (واتە خێڵ) کلیلێك بوو کە خزمەتگوزارییەکانی حکومەت لە ڕێگەیەوە دابەش دەکران. بە پێچەوانەوە ئەو کەسانەی کە سەربە خێڵ نەبوون ئۆتۆماتیکانە لە رکابەرێتی کردن لەسەر بەدەستهێنانی خزمەتگوزارییەکانی حکومەت بێ بەشکران. حکومەت هەوڵ بۆ بەشداریی پێکردنی خێڵەکانی دەدا، بەمجۆرەش ئەفریقییەکان لە ڕێگەی دامەزراندنی گرووپگەلی گەورەتری نەژادیی و ناوچەیی بەرپەرچدانەوەیان نیشاندا. سەرکردە و لایەنگرانی هەوڵی دروست کردنی نەریت و سیمبولگەلێکیان دەدا تا لەم ڕێگەیەوە بتوانن کۆمەڵگا خویاڵیەکان لە ناو بەرن. لەم شێوازەدا مێژوو وەك رابردوویەکی دور و درێژ و پرشەنگدار دەستکاری کرا. ئەمەش لە کاتێدا بوو کە کاربەدەستانی کۆلۆنیال زۆربەی کاتەکەیان بۆ دابەشکردنی ئەفریقییەکان بەسەر خێڵەکاندا تەرخان کرد بوو و ئەفریقییەکانیش سەرقاڵی دروست کردنی خێڵگەلێك بوون تا سەر بەم خێڵە بن. بەڵگەکانی سەرەوە نیشان دەدەن کە پێویستە خێڵەکانی ئەفریقیا وەك ئامرازی بنیاتنانەوەی کۆمەڵایەتی نە وەك دیاردەیەکی سروشتی و هەتاهەتایی هەژمار بکرێن. ئەفریقییەکان، خۆیان بە کەسانێك کە سەر بە گرووپێکی نەژادین پێناسە دەکەن. چونکە بەرژەوەندییەکانیان وەها دەخوازێت. هاوبەشی کولتووری، شێوازێکە بۆ پاراستنی دەسەڵاتی سیاسی و پێشکەوتنی ئابووریی. رابرت باتس، گرووپە نەژادییەکان بە لانیکەمی هاوپەیمانی بردراوە پێناسە دەکات و ئەم هاوپەیمانییەش ئەوەندە گەورەیە کە بتوانێت لەهەمبەر بەرژەوەندی سیاسی پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی بکات، بەڵام لەلایەکیترەوە زۆر بچووك و لاوازە کە ناتوانێت ئەوپەڕی بەرژەوەندییەکانی لەنێوان گشت بەرژەوەندییە سیاسییەکاندا دەستەبەر بکات.

گرووپە نەژادییەکان سەرەڕای ستراکتۆریی کولتورییەکەیان، جیاوازی کەمیان لەگەڵ گرووپە بەرژەوەندیخوازەکاندا هەیە و دەکرێ ئەم گرووپانە لە سیستەمە سیاسییەکانیتریشدا ببینرێت. نوێنەری ئەم گرووپە وەك لابی هەوڵی بەرفراوان کردنی بەرژەوەندییەکانی گرووپ دەدات. ئەم کاربەدەستانە خۆیان سەر بەم گرووپە دەزانن. چونکە لەم ڕێگەیەوە دەتوانن پارێزگاری لە بیرە نەوتییەکان، بنکەی تەندروستی، قوتابخانە، ڕێگاوبان و کارگەی نوێ کە بۆ کۆمەڵ و خێڵ پێویستە، بکەن.

له راستیدا ئەفریقییەکان شەڕی نەژادیی بە شەڕی بێ وێنە کولتوورەکان نازانن، بەڵکو ئەم شەڕەی وەك پرسێکی سەرەتایی و تێکۆشانێکی بەردەوام لە پێناو سەرچاوە دەگمەنەکان دەزانن. بۆیە ئەم شەڕە ململانێیەکی ناعەقڵانی هەتاهەتایی نییە، بەڵکو رکابەرێتییەکی سادەی سیاسییە. لە ئەفریقیادا خێڵگەرایی بۆ سەرکردە و کەسایەتییەکان، رێگەیەکی کاریگەر بوو تابتوانن لەم رێگەیەوە بۆ دامەزراندنی ستراکتۆری دەوڵەتی هاوچەرخ و دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکانیان، مۆبیلیزەکردنی سیاسی ئەنجام بدەن. هەر بۆیەش لە ئەفریقیادا مۆبیلیزە کردنی سیاسی، نوێنەرایەتی سیاسەتی، پشکدار بوونی کەسەکان و ئاڵۆزییەکانی (سیاسی) تایبەت بە ئەفریقیا دەکات.

## نەژادگەرایی وەك شێوازی مۆبیلیزەکردنی سیاسی مۆدێرن:

نەژادگەرایی لە قۆناغی دوای کۆڵۆنیالدا بە لەمپەرێك لەهەمبەر گەشەی سیاسی و ئابووری ئەفریقیا هەژمار کراوە. ئەم روانگەیە لایەنگری زۆری هەیە و لە باسەکانی تایبەت بە نەژادگەراییشەوە پشتگیرییان لێ دەکرێت. ناتوانرێ گەرەنتی ئەم چەشنە تاوانبار کردنەی نەژادیی بکەین. لەلایەن ئەندامانی ژینگەی سیاسی باڵی راستڕەوە، دەکرێ نەژادگەرایی، وەك هەر هێزێکیتری کۆمەڵایەتی بە هێزی بەرەو پێشەوەبەر هەژمار بکرێت. لە راستیدا لە پانتای حکومەتی ستەمکاریی تاك پارتی ئەفریقیادا، نەژادگەرایی ئاستێکی نزم لە پۆلۆرالیزم و نوێنەرایەتی کردنی سیاسی فەراهەم دەکات. هیچ وڵاتێك لە رووی کۆمەڵایەتییەوە یەك دەست نییە. لێکترازانی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ململانێ لە ناوچە جیاجیاکاندا. لە هەر وڵاتێکدا پرسگەلی جۆراوجۆر دەبنە خاڵی دەستپێکی مۆبیلیزە کردن. ناسیۆنالیزم، چین، ئایدیۆرلۆژیا و ئایین دەنگە پەرت و بڵاوەکان کۆ دەکەنەوە و ئەو تواناییەیان پێ دەبەخشێت کە داواکارییە سیاسییەکان بخەنە بەردەم دەوڵەتەوە. هەروەها نەژادگەرایی دەتوانێت وەك ئامرازێکی هاوبەش، توانایی رێکخستی داواکارییەکان بە گرووپ ببەخشێت. بەڵام بۆچی کۆمەڵگاکانی ئەزفریقیا بەپێی بناغەکانی نەژادگەرایی مۆبیلیزە ناکرێن؟ بە هەر حاڵ، نەژادگەرایی بەڵگە نەویستترین فاکتەری دابەش بوونی کۆمەڵایەتی لە ئەفریقیادایە.

نەژادگەرایی لە زۆرێك لە وڵاتانی ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیال رۆڵی پۆزەتیڤی هەبووە و ئەم وڵاتانەی ئامادە کردووە کە هەم خزمەتی دەوڵەت و هەمیش خزمەتی کۆمەڵگای مەدەنی بکەن. تەنانەت لە زۆربەی کۆمەڵگا سەرکوتکەرەکانی ئەفریقیادا، نوخبەکانی حکومەت ناچار



بوونە دان بە هێزی نەژادیی- ناوچەیی دابنێن. ئەگەرچی ئەم سەرکردانە تا ئاستێکی کەم بەرژەوەندییەکانی گرووپی رەکابەر لە کاروباری سیاسیدا، بە فەرمی دەناسێنن. سپاردنی جیاوك (امتیازات) تلویحی هیچ کاتێك نابێتە هۆی دروستکردنی گرووپی خوارووی دەوڵەت (sub-state). بۆ نموونە ئەندامانی کابینە وەك هێزی هاوسەنگ بە باشی ئەرکەکانیان جێبەجێ دەکەن. زۆربەی نەژادەکان، لە دامەزراوەکانی دەوڵەتدا خاوەن دەلال بوون. شکست لە هێنانە ناوەوەی ئەندامانی سەرکردایەتی هەر یەك لەم نەژادانە بۆ ناو دەستەی کارگێڕیدا، لەو بەشانەی کە گرووپی نەژادی تیایدا ئەندام نین مەترسی بۆ دەوڵەت دروست دەکات.

هەروەها پشکی نەژادی لە پۆستەکانی بۆرۆکراسیدا (کاروباری سەربازی، خزمەتگوزاری گشتی، پۆلیس و دامەزراوە گشتییەکان) و لە تەرخان کردنی بودجەی ناوچەکان و تەرخان کردنی سەرچاوەکانی دەوڵەت، رەچاو کراون. بێ گومان (ئامرازێکی) ئۆتۆماتیکی بۆ دابەشکردنی سەرچاوەکان بە یەکسانی بوونی نەبوو. بەڵام نوخبەکانی حکومەت دەزانن تا ئەو کاتەی گرووپی وەرگری (ئەم سەرچاوانە) ناچار بە دەرچوون لەم دەستەیەدا نەبن، دەبێ تێچوونە سیاسییەکان بگرنە ئەستۆ. دەوڵەت ناچارە دان بە داواکاری نەژادەکان دابنێت و ببێتە ناوبژیوانی نێوان ئەم نەژادانە، ئەگەرچی لەوانەیە دەوڵەت بە گوشار خستنەسەری ئەم داواکارییانە پەسەند بکات. بەمجۆرەش داواکارییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بۆ وەڵامدانەوە و نوێنەرایەتیکردنی (گەل) سنووردار دەبێتەوە.

دۆنالد رۆش چیلد، پەیوەندی نێوان دەوڵەت و نەژادەکان بە زاراوەی "ئاڵوگۆڕی هەژمونیکی" وەسف دەکات. ئەمەش لە کاتێکدایە کە دەوڵەتانی ئەفریقیا ئەو هێزەیان نییە کە بتوانن گوشار بخەنە سەر کۆمەڵگای مەدەنی و ناتوانێت بە تاك لایەنەوە خواستەکانی بەسەر گرووپە بەهێزەکانی نەژادیی- ناوچەیی بسەپێنێت. لە ئەنجامدا دەوڵەت ناچارە رادەیەك لە مەشروعییەتەکەی لە رێگەی گرووپە نەژادیی = ناوچەییەکانەوە بە دەست بهێنێت. تا بەمجۆرەش بتوانێت رێگە لە بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتەکەی (لەلایەن ئەم گرووپانەوە) بگرێت. ئەم مەشروعییەتەش لە رێگەی دابەشکردنی سەرچاوەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەت بەدەست دێت. هەروەها راس چیلد لەو بڕوایەدایە کە:" ئاڵوگۆڕی هەژمونیکی جۆرێك لە هاوکاریی لەلایەن دەوڵەتەوەیە کە تیایدا تارِادەیەك سەرچاوەکانی حکومەتی ناوەندی سەربەخۆ و ژمارەیەك لە کاربەدەستانی پلە نزمی گرووپە نەژادیی — ناوچەییەکان لە پرۆسەی هەڵسوکەوتی (تعامل) دوو لایەنەی پشت بەستراو بە نۆرمی بڕواکان، ئایین و تێگەیشتنی دوو

لایەنە، هاوبەشن". بە واتایەکیتر چونکە دەوڵەتی ناوەندی ناتوانێت هەژمون و دەسەڵاتەکەی بەسەر گرووپە نەژادییە بەهێزەکاندا بسەپێنێت، دانوسان لەگەڵیان ئەنجام دەدات. گرووپە نەژادییەکان هەر جۆرە بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەت رەت دەکەنەوە و تا ئەو کاتەی هەست بکەن سەرچاوەی پێویست بۆ ناوچەکانیان دابین کراوە، ئەم رەوتە بەردەوامی دەبێت. لە روانگەی رۆژئاواییەکانەوە ئەم رەوتە لە بیرۆکەی لیبرال دیموکراسییەوە هەڵقوڵاوە، بەڵام تارادەیەك سەقامگیری بۆ کۆمەڵگا پەرت و بڵاوەکان (نا یەك دەست) فەراهەم دەکات. لە ریگەی ئەم کەنالگەلی سیاسییەوە تا رادەیەك هەم بۆ دەوڵەت و هەمیش بۆ کۆمەڵگای مەدەنی مەشروعییەت دەستەبەر دەبێت.

زۆریك لە کۆمەڵگاکانی ئەفریقیا بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بە هۆی ئاڵوگۆڕی هەژمونیکەوە خۆیان لە پێکدادانی توندوتیژاوی خۆیان دوور خستەوە. لە حەقیقەتدا سەرۆك کۆمار جۆمۆ کنیاتا لە کینیا و فیلیکس هۆیفیت یونگی لە کەناری عاجدا بە شێوازی جۆراوجۆرەوە پلانی هاوسەنگی نەژادییان بەکار هێنا. لە ئەنجامدا ئەم پلانە بۆ دەیان ساڵ سەقامگیری سیاسی بەرفراوانی بۆ ئەم وڵاتە بە دیاری هێنا.

لەو وڵاتانەی کە ئاڵ و گۆڕی هەژمونیك بەسەریاندا زاڵە سێ گرفتی سەرەکی لە ئارادایە. یەکەمین گرفت ناشارەزایی لە هێنانەدی هاوسەنگی لەنێوان گشت گرووپە نەژادییەکانی دەوڵەت- نەتەوەدا سەرهەڵدەدات. گرفتی دووەم پەیوەستە بە ناکارامەیی بەرفراوانی یاساکان کە حکومەت لە میانەی ئاڵوگۆڕی هەژموونیکەوە دادەرێژێت. گرفتی سێیەمیش ئەوەیە کە حکومەتی ناوەندی دەتوانێت تەنیا رێژەیەك لە داواکارییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی فەراهەم بکات.

گرفتی یەکەم کاتێك سەرهەڵدەدات کە گرووپێکی نەژادیی هەست بکات لەلایەن حکومەتەوە پشتگوێ خراوە و ئەندامانی هەست بەوە بکەن کە وەك کەسلنیاری (کۆمەڵگا) خاوەن ماف و سەرچاوەی یەکسان نین و لێی بێ بەشکراون. پاراستنی یاسای هاوسەنگی بەپێی لێکدانەوە (حسابات) نەژادییەکان و بەپێی مۆدیلی ئاڵوگۆڕی هەژمونیك بۆ ماوەیەکی درێژخایەن کارێکی سەختە و ئەمەش لێکدانەوەیەکی هەڵەیە و دەکرێ توندوتیژی لێ بکەوێتەوە. نموونەگەلی زۆر لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالدا بوونی هەیە کە نوخبەکانی دەوڵەت بە ئەنقەست هاوەنگی نەژادیی نایەکسانیان دروست کرد. لەو ناوچانەی کە ئەم کارە روو دەدات دەوڵەت بە گرووپێکی نەتەوەیی تایبەت هەژمار دەکرێت. بەمجۆرەش لەبری گرتنەبەری



سیاسەتێکی گشتگیری کۆمەڵایەتی، نوخبەکان رێژەیەکی بەرچاوی سەرچاوەکانی دەوڵەتی بۆ ناوچەگەلی تایبەت تەرخانکرد. لە ژێر ئەم چەشنە بارودۆخەدا پێویستە حکومەت هەر جۆرە دژایەتییەك لەلایەن گرووپەکانی دەرەوەی حکومەت بە هاوسەنگی رابگرێت.

هەروەها ئاڵوگۆڕی هەژمونیك بۆ جێبەجێ کردنی لۆژیکانەی سیاسەتی گشتی لەمپەرە. چونکە دابەشکردنی سەرچاوەکان بەپێی ویست نەك بەپێی نیاز کارێکی هەڵەیە. ئەگەر نەژادێك رێژەیەکی زۆر لە سەرچاوەکانی حکومەت بۆ خۆی تەرخان بکات، ئامانجەکەی بێبەش بوونی ناوچەکانیتر لە پشکەکەیانە. بۆ نموونە دەکرێ ناوچەی A بە هۆی هەبوونی کەرەستەی خاو ( لەم ناوچەیەدا) و ئاسانی گواستنەوە و گەیاندن بۆ دامەزراندنی کارگەیەکی حکومی ناوچەیەکی شیاو بێت، بەڵام لەوانەیە ناوچەی B بە هۆی هاوسەنگی نەژادیی بەهێز (واتە بە هۆی دەسەڵاتی زۆرتری ئەم نەژادە) لەبری ناوژەی A هەڵبژێردرێت. بەمجۆرەش سەقامگیری سیاسی بە تێچوونی ناکارامەیی سیاسی دەستەبەر دەکرێت. ئەنجامی ئاڵوگۆڕی هەژمونیك نەبوونی پلانی ستراتیژیکە. داواکارییە کورت ماوەکان و رۆژانەیی جێگرەوەی پلانە ستراتیژییەکان دەبنەوە. سەرۆك کۆمار میلتۆن ئۆبۆتێ لە ساڵانی شەستەکاندا لە سیاسەتمەدارانی ئۆگاندا گلەمەند بوو کە ئەوان وەك ئەندام پەرلەمان کار ناکەن، بەڵکە وەك ئەندامانی" ئەنجوومەنی دانوسانکارانی کۆنفرانسی ئاشتی" کار دەکەن و مشتومڕە (ئەنجوومەنی دانوسانکاراندا) پەیڕەوی لە گەمەیەکی نادیار بۆ پەرەپێدانی تاك جەمسەری خێڵایەتی دەکات. بەرژەوەندی بەرتەسکی نەژادیی لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالدا، بەرەبەرە بۆ لەمپەرێك لەهەمبەر (جێبەجێ کردنی) سیاسەتە گشتییەکاندا، کە بەپێی ئەم سیاسەتە بەرژەوەندیی نەتەوەیی بە رادەیەکی زۆرتر بە بەراورد لەگەڵ بەرژەوەندیی بەرتەسکی ناوچەیی بە دیاری دێنا.

زیاد لەمەش، نەبوونی دەرفەت بۆ بەشداریکردنی جەماوەر، رەخنەیەکیترە کە ئاراستەی ئاڵوگۆڕی هەژمەنیك کراوە. سیاسەتمەدارانی ئەم وڵاتە، فەرمانبەران و دەڵاڵانی نەژادیی بەهێزن و سەر بە کاربەدەستانی حکومین و بەدەگمەن جەماوەر لەم پرۆسەیەدا بەشدار دەبێت. کەواتە بەرژەوەندیی نەژادیی کورت ماوە، پلانە گشتگیر و سەقامگیری سیاسی و سوودەکانی بەشداریی سیاسیی جەماوەر، دەخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە و بەرە بەرە لە درێژ ماوەدا مەشروعییەت رووبەڕووی گرفت دەبێتەوە.

لەڕاستیدا، لە ساڵانی هەفتا و هەشتاکان سەرچاوەی زۆر بەفیڕۆ دران و فەرمانبەرانی نەژادیی لە دابین کردنی خزمەتگوزاری بۆ کۆمەڵگاکانیان شکستیان هێنا. لە ئەنجامدا لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنی لەلایەك و ناوبژیوانانی نەژادیی (ئەندامانی ئەنجوومەنە خۆجێییەکان و سەرکردە سونەتییەکان) و کاربەدەستانی حکومەت (سیاسەتمەدار و بۆرۆکراتەکان) لەلایەکیترەوە، بۆشایی دروست دەبێت. بابەتی گرنگ ئەوەیە کە ستراکتۆریی دەوڵەتی تاك پارتی هیچ گرنگییەك بە کۆمەڵگای مەدەنی بۆ دەربڕینی سکاڵا و داواکارییەکان نادات و ئەنجامی ئەم کارەش ( سەرهەڵدانی) قەیرانی فرە رەهەندی مەشروعییەتی دەوڵەتانی ئەفریقیا بوو. ئەم حەقیقەتەش لە ئەرزی واقیعدا دەبینرێت و لە بەشی دەیەم و یازدەیەمدا بە وردی باسی لێ دەکرێت. پێویستە وەبیر بێنینەوە کە ئەفریقییەکان بە درێژایی ساڵانی نەوەد بە سەرکەوتوانە داواکاری زۆریان بۆ نوێنەرایەتی کردن و گەڕانەوە بۆ سیاسەتی فرە پارتی پێشکەشیان کرد.

بێگومان گەڕانەوە بۆ رکابەرێتی فرە پارتی کەم و کوڕییەکانی مۆدیلی هەژمونیك بەرجەستە دەکات. ئەم کارەش هیچ گرفتێکی بۆ مۆبیلیزە کردنی ئەفریقییەکان بەپێی هێڵە نەژادییەکان دروست ناکات.

سەقامگیری درێژخایەن و گەشەی سیاسی دەستەبەر دەکرێت ئەگەربێتو مۆبیلیزەکردنی سیاسی لە سیستەمێکدا بتوانێ وەڵامدەرەوەی داواکارییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بێت. هەنوکە هەلی زۆر بۆ رکابەرێتی فرە نەژادیی هەڵقولاو لە ( بەشداریی کردن لە) بڕیارەکانی دامەزراوە پۆلۆرالیزمییەکان رەخساوە.

## ئایین و سیاسەتی ئەفریقیا:

هەروەك نەژادگەرایی، ئایین بە درێژایی چەندین ساڵ وەك (هۆکاری) لێکترازانی کۆمەڵایەتی بۆ دروستکردنی رکابەرێتی سیاسی لە کۆمەڵگاکاندا سەری هەڵداوە. هەر لە سەردەمی لە دایك بوونی مرۆڤ و دەستپێکردنی ژیان، مرۆڤ لە رووی سیاسییەوە، لە رێگەی بڕواگەلی رۆحییەوە مۆبیلیزە کراون. بۆ نموونە سەربازانی ئەوروپا لە کۆتاییەکانی سەدەی یازدەیەم بۆ ماوەی ٢٠٠ ساڵ، بۆ پاراستنی شوێنە پیرۆزەکان، لە دژی موسڵمانەکان شەڕی خاچ پەرستییان هەڵگیرساند.



لە رووی مێژووییەوە، ئەم پرسە (واتە ئایین) لە ئەوروپادا زیادتر باو بوو. لەگەڵ ئەمەشدا لە ناو خودی مەسیحییەت، شەڕ و پێداویستییەکانی لە سەرووی بڕوا لەنێوان گرووپ و کەمینە مەسیحییەکاندا بوونی هەبووە. گشت وڵاتان هەر لە ناکاوەوە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەرەو خراپتر بوون هەنگاویان نا. لە کاتێکدا کە ململانێی سیاسی و سەربازی لەسەر بڕواکان، ئەنجامدانی بۆنە ئایینییەکان و... کەم بووە و تارادەیەکیش چارەسەر کرا. زیاد لەمەش، هەڵەیە ئەگەر زانای سیاسی ئەم ململانێیە هەڵقولاوی نەبوونی لێبوردەیی و بە هۆی ئایینەوە بزانێت. هەر یەك لەم کردەوە سیاسییانە دەرهاوێشتەی هەڵ و مەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی تایبەتن و بەرژەوەندیی سیاسیش لە رێگەی مۆبیلیزەکردنی سیاسییەوە دەستەبەر دەکرێت و ئامانجەکان بەپێی لێکدانەوەکانی پەرتووکی پیرۆز رێك خراون.

ململانێی ئایینی بەتایبەت لە ئەوروپادا، بوو بەهۆی پێکدادانی توندوتیژاوی و ئەم پێکدادانەش دوو سەدەی خایاند و بوو بەهۆی ئەوەی کە ئەم وڵاتانە تارادەیەك لە لێك جیاکردنەوەی ئایین و دەوڵەت سەرکەوتوو بن. دەوڵەتە هاوچەرخەکان زۆر بەکەمی دەست لە کاروباری ئایینی وەردەدەن و بەمجۆرەش زۆرێك لە کاروبارەکان لە پانتای تایبەتدا (شخصی) ئەنجام دەدرێن حکومەتەکانیش لێبوردەیی بەهێز دەکەن بە بێ رەچاو کردنی (جۆری) ئایین پشتگیری لە مافە ئایینییەکان دەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا، دەوڵەت بۆ ماوەیەك دوکتۆرێن و چاودێری ئایینەکانی کرد. بێگومان پرسی بڕوا و بۆچوونی ئایینی هەنوکەش بەشێك لە پرۆسەی سیاسی پێك دێنێت. بەڵام بە شێوازی جۆراوجۆرەوە وەك شەڕی خاچ پەرستی و شەڕی سی ساڵە لەم کێشەیە رزگار بوو. ئەمڕۆکە ئایین رۆڵی کەمی لە پرۆسە و داڕێشتنی سیاسەتی گشتی حکومەتدا هەیە. دەوڵەت قەڵەمڕەوی گشتی رێنمایی دەکات و ئایینیش لە پانتای تایبەتدا کار دەکات.

## ئایینەکانی ئەفریقیا کۆمەڵگای مەدەنی بەهێز دەکەن:

ئایینە کلاسیکییەکانی ئەفریقیا هەروەك ئایینە (کلاسیکییەکانی) سەرتاسەری جیهان بەپێی بڕواگەلی ئانیمیستی کامڵ بوونە. بەپێی ئەم بڕوایە جیهانی فیزیکی لە رێگەی زەوی، ئاسمان، رووبار، خۆر، رۆح، ئاژەڵ و... کونترۆڵ دەکرێت. ئایینەکانی ئەفریقیا هەمیشە بە پەرستش و پەیوەندی کردن بە باو و باپیران و رۆحی مردووەکان کە بە پلەی خواوەندی گەیشتوونە، هۆگر بوونە. زۆربەی ئەم پێشینانە پاڵەوانی واقیعی و خەیاڵی بوونە کە لە

چوارچێوەی نەژادەکاندا سەریانهەڵداوە. ئـەم جـۆرە بڕواگەلـە دەرفـەت و پێگەیـەکی بـەهێزی سیاسی بە تاك و سەرۆك خێڵەکان وەك پێگەی خواوەندی، پێغەمبەرایەتی و پلـە ئایینییـەکان دەبەخشێت و، ئەم کەسانە وەك ناوبژیوانی نێوان (خەڵك) و ڕۆحەکان کـار دەکـەن. هەنوکـەش جادو لە ئەفریقیادا بوونی هەیە و خەڵکانێك بە بڕواگەلی ئانیمیستی تەقلیدی واتە ڕێزگرتن لە جیهانی مردووەکان و پێشینیان پابەندن.

زۆربەی ئەم بڕوایانە لە تێکەڵێك لە ئایینـە هاوچـەرخەکانی وەك ئیـسلام و مەسـیحییەت دروست بوونە. بەم هۆیەشەوەیە کە هەروەك گـشت شـوێنەکانیتری جیهـان، ئـەفریقیا ناوچـەی پەرەسەندنی دوکتۆرێنی ئایینە جێگرەوەکان لە سەردەمە جۆراوجۆرەکـانی مێـژوودا بـووە. بـۆ نموونە ئایینی جولەکە لە کەناری دەریای ناوڕاست لە مەغریب سـەریهەڵدا، بـەڵام بـە تـەواوی لەلایـەن مەسـیحییەتەوە لـە سـەرەتاکانی سـەدەی یەکـەمی زایینـی کەوتـە ژێـر گوشـار و سەرکوتکرا. هەنوکەش هەندێ لە مەسیحییەکانی سەرەتای (سـەرهەڵدانی) مەسـیحییەت لـە هەندێ ناوچەی میسر و سودان نیشتەجێن. بـەڵام تـەنیا وڵاتـی ئەسـۆپیایە کـە ١٦٠٠ سـاڵە مەسیحییەت تیایدا بوونی هەیە. لە سەدەی هەشتەمی زایینییەوە، شەپۆلێکی نـوێی ئـایینی ئیسلام لە باکووری ئەفریقیا و لە وڵاتی بیاواندا لە ڕێگەی بازرگانییەوە پەرەی سەند. ئەمڕۆکە ئەم ئایینە بووە بە ئایینی سەرەکی لە نیوەی باکووری کیشوەری ئـەفریقیا. دووەمـین قۆنـاغی پەرەسەندنی ئیسلام لە ئەفریقیادا لە کەناری ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئەفریقیا لەلایەن بازرگـان و فەرمانڕەوا عەرەبەکانەوە لە سەدەی دوازدەی زایینییـەوە دەسـتی پێکـرد. هـەروەها دووەمـین شەپۆل لە پەرەسەندنی مەسیحییەت لەلایەن میسیۆنێرەکانی ئەوروپییەوە لە سەدەی نوزدەیـەم و بیستەمدا دەستی پێکرد و زۆرترین چالاکییەکانی لە نیوەی باشووری ئەم کیشوەرەدایە. ئـەم بەشەی ئەفریقیا، میوانداری کەنیسە ڕازاوەکـانی پرۆتـستانت و کاسـۆلیکە. بـە پەرەسـەندنی ئیسلام لە باکوور و ڕۆژهەڵات، مەسیحییەت لە باشـوور و ناوەڕاسـتی ئـەم کیـشوەرە پـەرەی سەند و بڕواگەلی ئانیمیستی لە سەتاسەری ئەم کیـشوەرەدا، لـە دوای کۆلۆنیـال وەك ئـایینی سەرەکی لەم بەشەی جیهاندا چەقی گرت.

بە پەیوەندی کردن لەگەڵ دەوڵەتی دوای کۆلۆنیال لە ئەفریقیادا، گرووپە ئایینییەکان خاوەن بەرژەوەندیگەلێك بوون. هەروەك لە سەرەوە باسکرا، سـەرکردە سیاسـییەکان ناچـار بـوون کـە وریاییەوە لەگەڵ دامەزراوە ئایینییەکان هەڵسوکەوت بکەن. ئەم پانتایەی کۆمەڵگای مـەدەنی (واتە ئایین) کەمترین لایـەنی هاوکـاری کـردن، گوشـار خـستنەسەر و سـەرکوتکردن لەلایـەن



دەوڵەتەوە بوو. سیاسەتمەداران هەوڵیان دەدا ئایـدیۆلۆژیا و سیـستەمە بڕواییـەکانی جیگـرەوە وەك ناسـیۆنالیزم، یۆسـیالیزم، کاپیتـالیزم و پۆپـۆلیزم بـەهێز بکـەن. بـەڵام لـە ڕای گـشتی ئـەفریقیادا هـیچ یـەك لـەم بڕوایانـە نەیانـدەتوانی ببنـە جێگـرەوەی بیرۆکـەی ئیـسلام و مەسیحییەت. لە ئەنجامدا لەو کاتانەی کە دەوڵەت بەرەبـەرە لەمپـەری لەبـەردەم کۆمـەڵگای مەدەنیدا دروسـتکرد (بـۆ نموونـە پارتـە سیاسـییە بەرهەڵـستکارەکان، کرێکارەکـان) یـاخود چالاکییەکانی سنووردار کرد، کەنیسە و مزگەوتەکان هەمیشە پانتـای چـالاکی گێـڕان بـوون. نوخبەکانی دەوڵەت لە کاتە جۆراوجۆرەکاندا کـە خـەرجیان بـۆ لاوازکردنـی هاوکـاری یـاخود سەرکوتکردنی دامـەزراوە ئایینییەکان تەرخان کردووە، ئەم دامەزراوانە بوونە بە بنکەیـەك بـۆ یەکگرتوویی و سەرکردایەتی کردنی کۆمـەڵگای مەدەنی و دەربڕینی نارەزایی و داواکارییەکانی دژ بە دەوڵەت.

بۆ نموونە لە وڵاتی ئەفریقیای باشوور لە سـەردەمی ئاپارتایـددا، کاتێـك کـە حکومـەتی کەمینەی سـپی پێـست چـالاکی (چ توندوتیـژی بێـت یـاخود ئاشـتیخوازانە) گـشت گرووپـە بەرهەڵستکارەکانی ڕەش پێست، لە ساڵانی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکاندا قەدەغـە کـرد و گشت بزاڤە ڕزگاریخوازەکانیشی سەرکوت کرد، کەنیسەکان بوون کە هاتنە ناو پانتـای بۆشـایی تێکەوتووی سیاسیدا. دەوڵەتی ئەفریقیای باشـوور دوو جـار هـەوڵی داخـستنی کەنیـسەکان و زیندانی کردنی بڕوادارەکانیدا.

نموونەیەکیتر لە چالاکی سەرکردە ئایینییەکان، مالاوی ساڵانی نەوەدە. لەم وڵاتـەدا وەزیـرە مەسیحییەکان بۆ کۆتایی هێنان بە حکومەتی ستەمکاری هاسینگ بانـدا، داوای پارمـەتییان لە پیاوانی ئایینی کرد. ئەم بابەتەش کاریگەری زۆری بەسەر سەرکەوتنی کۆمەڵگای مـەدەنی و دامەزراندنی دیموکراسی فرە پارتی لە مالاویدا هەبووە.

### سیاسەتی ئیسلامگەراکان لە ئەفریقیادا:

نموونەگەلێك لە چالاکی کەنیسە و مزگەوتـە لیبراڵـەکان کـە بـە تـەواوی گـیرۆدەی چـاکی سیاسی بووبن، زۆر دەگمەنە. ئەولەویەت و ڕەچاوکردنی سەرەتاییانەی سـەرکردەکانی ئـایینی، زۆرتر لە هەر شتێك هەوڵی چاودێری و پاراستنی پێداویستییە ڕۆحییەکانی پـەیڕەوانیان دەدەن نەك بەرژەوەندیی سیاسییەکانیان. تەنیا ئەو کاتانـەی کـە سـنووردار مردنـی مـرۆڤ و کـەمی سەرچاوە جیگرەوەکان سەریهەڵدەدا، کەنیسە و مزگەوتەکان دەبوون بە بنکەی بەرپەرچـدانەوەی

سیاسی. هۆکەشی ئەوە بوو کە ئەم دامەزراوانە مەیلدار بوون بۆ بەدوادا چوون لە ڕەوتی لێك جیا کردنەوەی ئایین و دەوڵەت و سونەتە تازە سەرهەڵداوەکان. دەکرێ عیبادەت بە کۆمەڵی یان بە تەنیاییەوە ئەنجام بدرێت، بەڵام ئەمە بەشێکی ژیانە کە پێویستە بە دوور لە کاروباری گشتی و رکابەرێتی سیاسی ئەنجام بدرێت.

هەندێ لە موسلمانەکان کە بە ئیسلامگەرا ناو دەبردرێن دژی لێك جیا کردنەوەی ئایین و دەوڵەتن. بە بڕوای ئەوان ئایینی بێ دەسەڵات هیچ بەهایەکی نییە. بە بڕوای ئەوان لە ڕۆژئاوادا، واتە جێگەیەك کە ئایین و دەوڵەت لێك جیا کراونەتەوە، کۆمەڵگا بەرەو نەمان و لە ڕێ دەرچوون، زیادەخوازی، پڕ لە تاوان و لایەنگری ماددەگەرایی و بە بێ کۆمەڵگا و یەکگرتووین. بە جیابوونەوەی کەنیسە لە دەوڵەت، بابەتە ئایینییەکان بوونیان نەماوە و بەمجۆرەش کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوا پەیڕەوی لە میتۆدی بەد ڕەوشتی دەکەن.

ئیسلام خۆی بە بەشێکی جیا نەکراوەی ئایین و سیاسەت هەژمار دەکات، چونکە لەو بڕوایەدایە کە جیهان هەم بەپێی کاروباری ماددی و هەمیش کاروباری مەعنەوی بەڕێوە دەبردرێت. شرۆڤەکارانی قورئان نەتەنیا بڕوایان بە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوا هەیە، بەڵکو لە بواری ماددیشەوە ڕێنمایی کۆمەڵگا دەکەن. بە بڕوای ئەوان پێویستە ئیسلام لە گشت کایەکانی ژیانی مرۆڤدا بوونی هەبێت. بەپێی پەروەردەی ئیسلامی و لێکدانەوەکان، ئەوان لەو بڕوایەدان کە پێویستە مرۆڤ نەتەنیا عیبادەت بکات، بەڵکو پێەویستە کاروباری ئایینی، هاوسەرگیری، پەروەردەکردنی منداڵ، کۆمەڵگا و.... ئەنجام بدات. ئەمە ئەرکی گشت موسڵمانانە کە یەکگرتوو بن و پشتگیری لە هەر دوو کایەی کۆمەڵایەتی و ئایینی بکەن و پەرەی پێ بدەین. ئەم ئەرکەش بە جیهاد ناو دەبردرێت.

لە زاراوە سیاسییەکاندا، ئیسلامگەراکان پشتگیریی لە شەریعەت وەك بنەمای ڕێنمایی کردنی حکومەتەکەیان دەکەن. یاسای شەریعەت چەقی سەرەکی ڕێنمایی کردنی موسڵمانانە و ئەم یاسایانەش لە سەرووی سیستەمە یاساییەکانیتر، پەیوەندی مرۆڤ بە خۆیەوە و دراوسێ و دەوڵەت ڕێك دەخات. هەروەها شەریعەت جەخت لە پەیوەندی تایبەت لەگەڵ خوا دەکات. بەمجۆرەش شەریعەت چۆنێتی عیبادەتکردن (نوێژی واجب، سەدەقە، ڕۆژوو و حەج) لە خۆ دەگرێ و جەخت لەسەر سزادانی تاوانەسەرەکییەکانی (وەك بڕینی دەستی دز، بەردباران کردنی گەورەکان) و سیستەمی یاسایی بۆ بەرگری کردن لە داواکارییەکان دەکاتەوە. شەریعەت چۆنێتی جل پۆشینی موسڵمانان دیار دەکات و، دیار دەکات کە پێویستە چ شتێك بخۆن. بە



گشتی شەریعەت بابەتگەلی جۆراوجۆر ڕێك دەخات و بە موسڵمانەکان ڕادەگەیێنێت کە بەپێی یاسای شەریعەت هەڵسوکەوت بکەن و موسڵمانەکانیش لەم بڕوایەدان کە یاساکانی ئیسلام دەبێتە هۆی بەرقەرار کردنی ئەرك و مافەکان، دیسپلێن و شەفافییەت لە کۆمەڵگادا. ئەگەرچی لە قورئاندا باس لە هیچ هێمایەکی گشتگیر (جامع) وەك یاسای بنەڕەتی حکومەت نەکراوە بەڵام زیادتر لە هەشتا ئایەتی قورئان بە ڕاستەوخۆ باسی ئەم بابەتەی کردووە و ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ ئەو لێکدانەوەانەی کە باس لە چۆنێتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ شەریعەتدا دەکات و چۆن دەبێ شەریعەت جێبەجێ بکرێت؟ هەندێ لە شارەزایان بە وردی قورئانیان شرۆڤە کردووە. خومەینی کە لە دوای ڕووخانی شا لە ئێران لە ساڵی ١٩٧٨-٧٩ دەسەڵاتە گرتە دەست، ٣٠٠٠٠ یاسای بۆ ڕێنمایی کردنی ژیانی ڕۆژانە لە (توضیح المسایل)دا ڕوون کردووەتەوە. ئەم یاسایانە باس لەوە دەکەن کە پێویستە ئێرانییەکان چۆن بەپێی یاسای میراتگری هەڵسوکەوت بکەن، فێری بابەتەکانی تەندروستی کەسی و شێوازی دروستی قوربانی کردنی ئاژەڵ بن.

ڕژێمی تاڵیبان لە ساڵی ١٩٩٦-٢٠٠٠ لە ئەفغانستان، جەختی لەسەر لێکدانەوەی پارێزگارانەتری شەریعەتی ئیسلامی دەکرد. ئەوان خۆیان لە زانستی هاوچەرخ دوور دەخستەوە و هەڵیان بۆ گەڕانەوە بۆ ژیانێکی سوننەتی دەدا. حکومەتەکانی مەغریب و ئەندونزیا لەهەمبەر چۆنێتی جێبەجێ کردنی بنەماکانی ئیسلام و کاریگەرییان بەسەر حکومەتەوە بۆچوونی لیبرالیان هەیە. ئەم دوو دەوڵەتە وەك دەوڵەتی ئیسلامی هیچ گرفتێکیان لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا نەبووە.

لێرەدا ئەم پرسیارە گەڵاڵە دەبێت کە پێویستە چ کەسێك لێکدانەوەی شەریعەت بکات؟ ئیسلام وەك گشت ئایین و سیستەمی بڕواداریێتی ڕۆڵی کاریگەر و گرنگی بەسەر ئایدیۆلۆژیاگەلێکدا هەبووە و پێداگریان دەکرد کە لێکدانەوەکانیان بۆ قورئان ڕاست و دروستن و بەپێی بڕیارەکانی قورئان (کار دەکەن). هەندێ شارەزایتر پشتگیری لە ئیسلامی دیموکراسە دەکەن و بڕوایان بە یەکسانی مافی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا هەیە. هەروەها گرووپێك لە شرۆڤەکاران پشتگیری لە بزاڤە ئیسلامییەکان دەکەن و لەو بڕوایەدان کە جیهاد و شێوازەکانی توندوتیژی ڕێگەیەکی ڕاست و دروستە. بەڵام هەندێ گرووپیتر پشتگیری لەم شێوازە ناکەن. سەرەڕای ئەم بارودۆخە جیاوازە سەبارەت بە مەرجە ڕاست و دروستەکانی شێوەی حکومەتی ئیسلامی و چۆنێتی حکومەتداری ئەو شتەی کە بڕوایە ئەوەیە کە گشت ئیسلامگەراکان

پشتگیری له بیرۆکەی لێك جیاکردنەوەی  ئایین و سیاسەت ناکەن و لەبری ئەمەشدا هەوڵی دامەزراندن یاخود پاراستنی کۆماری ئیسلامی دەدەن کە تیایدا سیاسەتی گشتی و بارودۆخی کۆمەڵایەتی بەپێی شەریعەت دیار دەکرێن.

ئیسلامگەراکان کاریگەری زۆریان بەسەر دەوڵەتانی ئەفریقیادا هەبووە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتدارێتی ئیسلام لە نیوەی باکووری ئەم کیشوەرەدا کە تا هەنوکەش نیوەی ئەم وڵاتانە سکیۆلارن و تیایدا ئایین و سیاسەت لێك جیا کراونەتەوە ئەمەش سروشتی بەجێماوی سیستەمی کۆلۆنیالی لەم وڵاتانەدا بوو (کە دژی دەسەڵات ئایینی بوو) . ئیسلامگەراکان هەوڵی چالاکی گێڕان دەدەن و تەنیا هەندێ وڵات لە باکووری ئەفریقیادا هەن کە بزاڤە ئیسلامگەراکان تیایدا زۆر بەهێزن و چالاکی توندوتیژانەی ئەم گرووپانەش پەرەی سەندووە. بۆ نموونە لە میسردا، گرووپی جیهادگێڕ تاوانبارە بە تیرۆرکردنی ئەنوەر سادات لە ساڵی ١٩٨١دا و شەست گەشتیار لە لۆکسیر لە ساڵی ١٩٩٧دا. بەپێی ڕاگەیاندنی هێزەکانی ئاسایشی دەوڵەت، گرووپێکی نیمچە چەکدار لەم وڵاتەدا هەوڵی دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی میسر دەدات. هەروەها وڵاتانی ئەفریقیا هەوڵیان داوە تا توندوتیژی جیهانی جیهادگێڕی کە لەلایەن تاقمگەلی وەك ئەلقاعیدە ئەنجام دەدرێن، کونترۆڵ بکەن. ئەمەش لە کاتێکدایە کە وڵاتی بێ حکومەتی سومالی پەناگایەکی ئەمن بۆ هەندێ تاقمی تیرۆریستییە. ئیسلامگەراگان هەڕەشەیەکی بەهێزن لە گواستنەوەی دەسەڵات بۆ دەوڵەتی سکۆلار لە ئەفریقیادا. ئەگەرچی پێویستە وەبیر بهێنرێتەوە کە لە حاڵی حازردا تەنیا ئەلجەزایر خاوەنی ئەم پتانسیێلەیە.

ئەلجەزایر وەك بابەتی توێژینەوەی بەشی یازدەیەم بۆ (گەیشتن) دیموکراسی، باسی لێ دەکرێت. خوێنەران دەتوانن لە ڕێگەی خوێندنەوەی بابەتی توێژینەوە، زانیاری سەبارەت بە کۆمەڵێکی ئاڵۆزی شەڕەکان دەستەبەر دەکەن. هەر ئەوەندەش بەس بوو کە بووترابا ئەلجەزایر لەمەودواوە خاوەن دیموکراسییە کە تیادا ئیسلامگەراکان هەڵبژێردراون. بەڵام لەهەمان کاتدا سوپا کودەتایەکی ڕێکخست و هەڵبژاردنەکانی هەڵوەشاندەوە و دەسەڵاتیان گرتە دەست. لەم کاتەوە گشت هەوڵی ئیسلامگەراکان بۆ دامەزراندنی سیستەمی کۆماری ئیسلامی بە شێوازی سیاسی و توندوتیژاوی سەرکوتکرا و زۆرتر لە ١٠٠٠٠٠ کەس لە ماوەی دە ساڵدا بە هۆی هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردنەکان گیانیان لەدەستدا.



## ئامرازە ئایینییەکانی مۆبیلیزە کردنی سیاسی:

لێرەدا دەتوانین بەم دەرەنجامە بگەین کە ئایین لە سیاسەتی ئەفریقیادا پشت بەستراو بە نەژادگەراییە. نەژاد نەتەنیا وەك بەڵگەیەکی ڕەوشتی و ڕۆحی، بەڵکو وەك ئامرازی جێبەجێ کردنیش دیتە ناو (گۆڕەپانی) سیاسەتدا. هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی بەسەر بڕیاری هەرکەسێك کە خوازیاری بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەت لە ڕێگەی ڕێسامەند کردنی بڕواکانەوە بێت، کاریگەری هەیە. بێگومان هەر کەسێك دەتوانێت چەکدارێکی ئیسلامگەرای ئەلجەزایری، بە کەسێکی خاوەن بڕوای ئایینی وێنا بکات کە ئامادەیە خۆی قوربانی بکات تا دەوڵەت لە کوفر و ئیلحاد ڕزگار بکات. بەمجۆرەش بە ڕەچاو کردنی کۆمەڵکوژی ڕواندا، کە پێشتر ئاماژە پێکرا، کەمبوونەوەی ململانێی ئەلجەزایر فاکتەرێکی لە ڕێگە لادەرە و زانایانی زانستە سیاسییەکان ناچارن بە قوولی بچنە ناو بابەتەکەوە. پێویستە مرۆڤ ئەم ڕاستییە بزانێت کە ئیسلامگەرایی هاوکات لەگەڵ کێشە ئابوورییەکان و قۆناغی بنیاتنانەوەی دەوڵەت (سکۆلار) پەرەدەسێنێت. بەمجۆرش چالاکڤانێکی (ئیسلامی)  لە ئەلجەزایردا نەتەنیا بە بڕوای دەروونییەوە بە فەرموودەکانی (پێغەمبەر) محەممەد بەڵکو بە ئاگادار بوون لە نایەکسانی کۆمەڵایەتی لە وڵاتەکەیدا بووە بە کەسێکی ئیسلامگەرا. ئیسلامگەراکان لەم بڕوایەدان کە چالاکڤانانی سیاسی و بە تایبەتیش سوپا لەم نادادپەروەرییەدا بەشدارن. بەم پێیەش ئەوان بە ناچاری کۆماری ئیسلامی وەك ئەلتەرناتیڤ و جێگرەوەی مۆدیای مۆدێرنیتەی شکست خواردوو لە ئەلجەزایر، دەزانن. لە ڕوانگەی ئەم ئیسلامگەرایانەوە، ئەم دامەزراوەیە (ئایین)  دامەزراوەیەکی چاو بەستراو نییە، بەڵکۆ ئەوان ئەم بڕوایە (چ بە ئاشتیخوازانە و چ بە توندوتیژی) بۆ دەربڕینی نارازیی بوونیان لە کاربەدەستانی حکومەت و بەکارهێنانی ئامرازی(ئایین)، بەکاردێنن.

## دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی:

بێگومان نەژادگەرایی تەنیا هۆکاری پەیوەندی سیاسی لە ئەفریقیادا نییە. ئەم هەستە و بابەتە کۆمەڵایەتییەکانیتری وەك چین، ئایین، نەژاد، ئایدیۆلۆژیا، ڕەگەز و تەمەن بۆ دەربڕینی بیر و ڕاکان، تێکەڵ بە یەکتر بوونەتەوە. بەڵام نەژادگەرایی زۆرتر بە ستراکتۆریی سیستەمی سیاسی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال پەیوەستە. هەروەها نەژادگەرایی چەمکێکە کە بابەتی ئەم پەرتووکە، واتە ڕکابەرێتی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە ئەفریقیادا، دەخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە.

ئاشكرایە كە ناسیۆنالیزم ئایدیۆلۆژیای ئایدیالی نوخبەكانی حكومەتە و ئامرازێكە كە بۆ پاراستنی دەسەڵاتیان بەسەر دامەزراوە سیاسییەكان و كۆمەڵگادا، یارمەتی نوخبە دەدات. چەقی بڕوای نوخبەكان بە حكومەت لێرەدا بوو كە حكومەت كلیلی داهاتووە. ئەوان باسیان لە دەرفەتەكانی هەڵقوڵاو لە بنیاتنانی دەوڵەت و لە بەین بردنی وەفادارێتی خێڵایەتی دەكرد. لە دەوڵەت- نەتەوەی ویستراوی ئەم نوخبانەدا، هەر جۆرە بەرەنگاربوونەوەیەكی خوارووی نەتەوە بووندا (خێڵ، نەژاد،....) لەپێناو پاراستنی گەشەی ئابووری و سیاسی سەركوت دەكرێت.

سەرەڕای بەرهەڵستكاری سەركردەكانی ئەفریقیا، ئەم بابەتە هەڵەیە كە وەفادارێتی نەژادیی و بەرهەڵستكاری سیستەمە سیاسییە سەقامگیرەكان پشتبەستراو بە بناغەكانی دەوڵەت- نەتەوە بێت. لە راستیدا زۆر جار پۆلۆرالیزم، مۆبیلیزە كردنی سیاسی سوودمەندی بۆ سیستەمی سیاسی بە دیاری هێنا. نەژادگەرایی كەناڵێكی دانوساندن و مشتومڕی لەنێوان دەوڵەتی ناسیۆنالیستی و كۆمەڵگای مەدەنیدا كردەوە. لە راستیدا، لە ژینگەیەكی سیاسی خاوەن دەوڵەتی تاك پارتی و حكومەتی ستەمكاریی، زۆربەی ئەفریقییەكان رێژەیەكی زۆری داواكارییەكانیان لە رێگەی ئەم كەناڵەوە (لە رێگەی ئەندام بوون لە گرووپێكی نەژادیدا) فەراهەم كردووە. بە پێچەوانەی مەیلی پارتە سیاسییەكان، تەنیا لە هەندێ كاتدا نوخبەی دەوڵەت لە رێگەی ئەم كەناڵە جێگرەوە، دەسەڵاتی سیاسییان لاواز دەكرد یاخود بە تەواوەتی ئەم دەسەڵاتەیان لە ناو دەبرد.

ئەفریقییەكان خۆیان بە هاوڵاتی نەتەوەیی هەژمار دەكەن، بۆ نموونە هاوڵاتی زامبیایی یاخود گامبیایی. بەڵام بە جیددییانە شوناسی دامەزراوەكانی خواری دەوڵەت (sub-state) یان پاراست و ئەمەش بەو هۆیەوەیە كە شوناسە جیاوازەكان باشتر بەرژەوەندییەكانیان فەراهەم دەكەن. چونكە ئەوان وەك ئەندامانی كۆمەڵگای مەدەنی ناتوانن گشت وەفادارێتی سیاسییان لە چوارچێوەی دامەزراوەكانی دەوڵەت- نەتەوەدا بخەنەڕوو. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سنووردار كردنەی كە ئەم رێكخراوانە دروستی دەكەن. لە راستیدا هاوبەندیی و هاوكاریی نەژادیی لە قۆناغی دوای كۆلۆنیالدا پاداشتی سیاسی بەدی هێنا. بەم پێیەش ئەگەر ناسیۆنالیستی ئامرازی ئایدیۆلۆژیكی دەوڵەت بێت، نەژادگەراییش ئامرازی كۆمەڵگای مەدەنییە.



**پوختەی بەشی چوارەم: نەژادگەرایی و ئایین لە سیاسەتی ئەفریقیادا**

| | |
|---|---|
| **نەژادگەرایی** | - هاوبەندی پشتبەستراو بە بیرۆكەی هاوبەشی لە باو باپیران، كولتوور، نەریت.<br>- گرووپە نەژادییەكان بە جوڵە و مۆدێرنن بەڵام هەتاهەتایی نین. |
| **دامەزراندنی خێڵ** | - خێڵ لە بەرهەمی كۆلۆنیال و بەرپەرچدانەوەی ئەفریقییەكانە لەهەمبەر دەوڵەتی مۆدێرنە. |
| **مۆبیلیزەكردنی سیاسی و نەژادیی** | - وەفاداری بە نەژاد كە ئەمەش دەبێتە هۆی بارگرانی بۆ دەوڵەت.<br>- دەوڵەت هەوڵ دەدات لە رێگەی تەرخانكردنی سەرچاوەكان و بەخشینی پۆستی سیاسی، سەرچاوە نەژادییەكان كونترۆڵ بكات.<br>- تا رادەیەك سەقامگیر بەڵام ناكارامە و ناهەڵبژێردراو، دەوڵەت لە رێگەی ئاڵوگۆڕی هەژمونیكەوە دادەمەزرێت. |
| **نەژاد** | - بڕوا تەقلیدییەكانی ئەفریقیا پشت بەستراو بە ئانیمیستی و پەرەستشی بڕواگەلی پێشینیانە كە رێزی لێ دەگیرێت و تێكەڵ بە ئیسلام و مەسیحییەت بووەتەوە.<br>- گرووپێك لە مەسیحییەكانی سەرەتای سەرهەڵدانی مەسیحییەت هەنوكەش لە ئەسیوپیادا نیشتەجێن.<br>- بڵاو بوونەوەی ئیسلام لە سەدەی حەفتەمەوە لە باكوور و دواتر لە باشوور و كەناری رۆژهەڵاتی ئەم كیشوەرە.<br>- پەیوەندییەكانی ئەوروپا لە سەدەی نۆزدەیەمەوە، مەسیحییەتی بۆ ناوەڕاست و باشووری ئەم كیشوەرەی هێنا. |
| **دامەزراوە ئایینییەكان وەك كەناڵی نارەزایی دەربڕینی كۆمەڵگای مەدەنی** | - سەركوتكردنی رێكخراوە ئایینییەكان بۆ دەوڵەت زۆر سەختە، چونكە خاوەن پشتگیری گشتی و دەلالەتی رەوشتی هەیە. |

| | |
|---|---|
| | - کەنیسەکان و مزگەوتەکان کەناڵەکانی کۆمەڵگای مەدەنین، تا لەم کەناڵەوە بەتایبەت لە کاتی داخستنی کەناڵەکانیتر بتوانێت نارەزایی لە دژی دەوڵەت دەرببڕی. |
| **سیاسەتی ئیسلامگەراکان لە ئەوفریقیادا** | - ئیسلامگەراکان هەوڵ دەدەن کۆماری ئیسلامی دابمەزرێنن، کۆمارێك کە تیایدا ئایین و سیاسەت لێك جیا نەکرابنەوە.<br>- حکومەت لە کۆماری ئیسلامیدا ئەرکی جێبەجێ کردنی شەریعەتە.<br>- زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا سکولارن.<br>- لە زۆربەی وڵاتانی باکووری ئەفریقیا بەتایبەتیش ئەلجەزایر بزاڤە ئیسلامییەکان لە گەشەسەندان. |

### بابەتی توێژینەوە: نەژادگەرایی و دەوڵەت – نەتەوە لە نایجیریا:

نیجریا لە کەناری رۆژئاوای ئەفریقیادا جێگیر بووە و زۆرترین دانیشتوانی ئەفریقیا لەخۆ دەگرێ. لە رووی جیۆلۆجییەوە (زەوی ناسی) ئەم وڵاتە لە مێرگەکانی دیلتای رووباری نیجریا پێکهاتووە کە رێرەوی چەند لایەنە (رووباری) بۆ دارستانەکانی گەرمیانی و شێنایەتی ئەستوایی ئەم وڵاتەی دروست کردووە. باکووری ئەم وڵاتە لە خاکی وشك (بەیار) پێك دێت کە درێژکراوەی بیاوانی ئەفریقیایە.

نیجریا یەکێك لە وڵاتە گەشەسەندووەکانی ئەفریقیایە کە خاوەن داهاتی فرۆشتنی نەوتە. ئەگەرچی ململانێی بەردەوامی نێوان گرووپە کۆمەڵایەتییەکان بوو بە هۆی دواکەوتنی گەشەی ئابووری و سیاسی ئەم وڵاتە، بەڵام ئەم ململانێیە بوو بە هۆی مۆبیلیزەکردنی سیاسی بەپێی دابەش بوونە نەژادییەکان.

ئەم وڵاتە لە ٢٥٠ گرووپی نەژادیی پێك هاتووە کە سێ گرووپ لەم گرووپانە لە ساڵی ١٩٦٠ەوە لە گۆڕەپانی سیاسی ئەم وڵاتەدا بە جیددییانە ئامادەبوونیان هەبووە. هەر یەك لەم گرووپانە لە ناوچەی نیشتەجێ بوونیان، هێزەکانیان مۆبیلیزە کردووە. لە باکووردا نەژادی هۆسا- فەلانی ٣٠٪ی دانیشتوان، لە رۆژئاوا نەژادی یۆرۆبا ٢٠٪، نەژادی ئیبۆ لە رۆژهەڵات ١٧٪ی دانیشتوان پێك دێنن. لە هەر یەك لەم ناوچانەشدا گرووپی بچووکتری نەژادی هەن.



پێویستە ئاماژە بکرێت کە هەر یەك لەم سێ گرووپە نەژادییانە بەسەر چەند ژێر کۆمەڵەدا دابەش دەکرێن. بۆ نموونە ٢٩ گرووپی نەژادی ژێر کۆمەڵەی ( هۆسا – فولانی)، ١٢ گرووپی نەژادی ژێر کۆمەڵەی یۆرۆبا و ٣٢ گرووپی نەژادیی ژێر کۆمەڵەی ئیبۆ پێك دێنێت. لە راستیدا شوناسە زەق و بەرچاوەکان، ژێر کۆمەڵەی نەژادی و مێژووی هۆسا – فولانی، یۆرۆبا و ئیبۆ بە دوورودرێژی روون دەکاتەوە. هێما و بەڵگەنامەکان نیشان دەدەن کە ئەم کۆمەڵەیانە، کۆمەڵگای نوێن. ئەوان گرووپی نەژادین کە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە لە قۆناغی تاڕادەیەك هاوچەرخ سەریانهەڵداوە. هەڵبەت دروست کردنی ئەم خێڵانە پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ سەردەمی دەسەڵاتدارێتی کۆلۆنیالی بەریتانیادا هەیە.

بۆ نموونە هەر لە خۆڕاوە نییە کە سێ ناوچەی سەربەخۆی نیجریا خاوەن دامەزراوە و سنوورەکانی هاوشێوەی ساڵانی کۆلۆنیال کردنن. لە ناوچەی باکووردا، دامەزراوە کارگێڕییەکانی لایەنگری حکومەتی فیدرالی، لە رێگەی میرەکانی فولانییەوە رۆڵی ناوبژیوانیان هەیە. (دانیشتوانی) ناوچەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا لایەنگری باشوور بوونە کە لە ساڵی ١٩٠٦ەوە، وەك دوو ناوچەی ئیداریی سەربەخۆ ببوون و، بە یەکگرتنەوەی باکوور و باشوور لە ساڵی ١٩١٤دا لە ژێر ناوی نیجریای یەکگرتوو یەکتریان گرتەوە.

بە بەرچاو گرتنی نموونەی (نموذج) ئیداری ناوچەکە، کە دەبوایا خێڵەکان لە چوارچێوەی ئەم ناوچە (ئیدارییانەدا) پەرە بسێنن و شوناسیان لەم ناوچەیەدا دروست بکرێت، هەر دوو ناوچە ئۆتۆنۆمییەکی رێژەییان لە حکومەتی کۆلۆنیالی وەرگرت. ئەمەش رێگەیەکی عەقڵانی بوو کە بە هۆیەوە کاربەدەستانی کۆلۆنیالی، بۆ بەدەست هێنانی سەرچاوەکان، ببن بە لابی. بە واتایەکیتر، مۆبیلیزە کردنی خەڵك بەپێی نەژادەکان سەلماندوویەتی کە باشترین شێوازی کارتێکەری دامەزراندنی" هاوپەیمانی براوە"ی رۆبرت باتزە. بەمجۆرەش ئەو گرووپانەی کە پێشتر هەوڵی ئەندام بوون لە گرووپە نەژادییەکانیان دەدا، هەنوکە خۆیان بوونەتە بە خێڵ. ئەم جۆرە هاوبەندییە ئامرازگەرایانەی خێڵ و هۆزەکان بەمەبەستی پێکهێنانی گرووپی گەورەتر و لەپێناو ئامانجە ئیدارییەکان لەلایەن کاربەدەستانی کۆلۆنیالییەوە دامەزرا.

خوێندنەوەیەکی کورتی دامەزراندنی خێڵی یۆرۆبا لە رۆژئاوای نیجریا، ئەم پرۆسەیە بە باشی دەخاتەڕوو. بەڵگە مێژووییەکان نیشان دەدەن کە چۆن ئەم گرووپە بە بێ پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی لە ماوەیەکی کورتدا بە فەرامۆشی سپێردران. لە راستیدا، ئەم پرسەش هەڵقولاوی سیاسەتی مۆدێرن و ستراکتۆریی کۆمەڵایەتی بوو. پێش حکومەتی

کۆلۆنیالی هیچ شتێك بە ناوی شوناس و یەکەی سیاسی یۆرۆبا بوونی نەبوو، سەرەڕای ئەمەش زاراوەی یۆرۆبا هیچ جۆرە وێکچونێکیان لەگەڵ دانیشتوانی باشوور و رۆژئاوای نیجریا، تا سەدەی نۆزدەیەمەوە نەیانبوو. لەبری ئەمەشدا کاربەدەستانی نیجریا ئەم ناوچەیەیان وەك ئۆیۆ، کیتۆ، ئەگبا، ئیجیبۆ، ئیجیسا، ئیکیتی، ئۆندۆ، ... هەژمار کرد. بێگومان هەر یەك لەم گرووپانە زانیارییان لەسەر چۆنێتی دامەزراندنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی، ئابووری و شەڕ، لەلایەن دراوسێیەکانیانەوە هەیە. بەڵام هیچ یەك لەم کۆمەڵگایانە لە شوناسی یۆرۆبادا هاوبەش نەبوونە و ئەگەرچیش لەوانەیە هەندێ گرووپ بوونیان هەبووبێت کە لە رووی زمانەوانییەوە لە هەندێ زاراوە زانستییەکان هاوبەشیان هەبێت، بەڵام زاراوە جیاوازەکان بەو مانایەوە دێت کەئەم زمانانە، بۆ هەر دوو لایەن تێگەیشتنی سەختە.

لە سەردەمی کۆلۆنیالدا پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەنێوان خێڵەکانی یۆرۆبادا بە تەواوی گۆڕدرا. حکومەتە ئیمپریالیزمەکان بۆ کەمکردنەوەی خەرجییەکان و گرفتە ئیدارییەکان پێویستیان بە کۆمەڵگایەکی گەورەتر هەبوو. میسیۆنێرەکانیش خوازیاری کۆمەڵگایەکی گەورەتر و خەڵکانێك بوون کە بە یەك زمان قسە بکەن و ئەمەش بوو بە هۆی گۆڕینی ئایینی مەسیحییەت و بەمجۆرەش زمانێکی دایکانەی ستاندەر لەنێوان میسیۆنێرەکانەوە داهێنرا. (بە پێی eyoی گەورەترین) و ئەنجیلێك بە زمانی یۆرۆبا چاپکرا. لەمەو بە دواوە بەسوودی خێڵ بوو کە لەگەڵ زمانی ستاندەری یۆرۆبا بگونجێت. واتە زمانێك کە بوو بە چەقی پەروەردەی رۆژئاوایی. دەبوایا بەپێی ئەم زمانە کاربەدەستان سنوورێکی شوناسی دروست بکەن و لەلایەن حکومەتی کۆلۆنیالەوە بەفەرمی بناسرێت و لە رێگەیەشەوە سوودگەلێك دەستەبەر بکات. شکستی خێڵەکان وەك هێزی یەکگرتوو لەگەڵ کاربەدەستانی کۆلۆنیالدا بوو بە هۆی ئەوەی کە گشت خێڵەکان گرووپە هاوپەیمانەکەیان لە دەست بدەن، ئەم رەوتەش لە سەرتاسەری نیجریادا دەبینرا. بە کورتی، هاوپەیمانی نەژادیی دووبارە دامەزرانەوە و پەرەیان سەند تا بتوانن داواکاری و هەلەکانی دەوڵەتی هاوچەرخ دەستەبەر بکەن. هاوکات لەگەڵ دامەزراندنی یۆرۆبا، فولانی —هۆسا و ئیبۆش هەر لەسەر ئەم شێوازە دروستکران.

جێی سەرسوڕمان نییە کە لە کاتی سەربەخۆ، یەکەمین کۆماری نیجریا بەپێی پۆلین کردنی گرووپە نەژادیی-ناوچەییەکانی باڵا دەست بەڕێوە دەبردرا. هەڵبەت دەستووری سەردەمی سەربەخۆیی پشت بەستراو بە راستەقینە سیاسییەکانی دان پێنراو و دیارکردنی پێداویستی، هاوسەنگی و ئارەزووی ئەم گرووپە نەژادییانە بوو و لە هەر ناوچەیەکیشدا دەوڵەتێکی



ئۆتۆنۆمی بەهێز بوونی هەبوو و دەوڵەتی ناوەندیش بەسەر پرسە نەتەوەییەکانی وەك بەرگری کردن، سیاسەتی دەرەوە و بازرگانی نێودەوڵەتی چڕی گرتبوو. گەلی نیجریا چەندین جار دەنگی بە دەستووردا و بە هەڵبژاردنی "دەلالانی کولتووری"، پالێوراوی هەڵبژێراوەکەیان لە داگیرکردنی سەرچاوەکانی فیدراڵی و گەڕاندنەوەیان بۆ کۆمەڵگای ناوچەیی، هاوبەش کردووە. بەمجۆرەش هیچ پارتێکی سیاسی بەهێز و گشتگیر لەم وڵاتەدا دانەمەزرا و پرسە ناوچەییەکانیش بەسەر بەرژەوەندیی نەتەوەییدا زاڵ بووە و پرسە نەژادییەکان بوون بە پرسگەلی سیاسی و هەر ناوچەیەك لە رێگەی پارتێکی سیاسییەوە کە سەربە نەژادێکی دیارکراو بوو، بەڕێوە دەبردرا، هۆسا لە باکوور، یۆرۆبا لە رۆژئاوا، ئیبۆ لە رۆژهەڵات.

ئەگەرچی لە یەکەم کۆماردا، هەرسێ بناغەی یاسایی لە بەدامەزراوەیی کردنی هاوسەنگی نەژادیی سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام لە چوارچێوەی سیستەمێکی سیاسی سەقامگیردا هەڵسوکەوتی کرد. گۆمانی دانیشتوانی ئەم ناوچانە ئەوە بوو کە باشووری مەسیحی لە باکووری موسڵمان دەترسێت و ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە باکوور دواکەوتووتر لە باشووری خاوەن ئاستێکی پەروەردەیی باش، دەترا. هەروەها رۆژئاوا و باکوور لە ئامادەبوونی زۆربەی ئەندامانی رۆژهەڵات لە حکومەتدا دەترسان و بەمجۆرەش هەر ناوچەیەك خۆی لە بارودۆخێکی مەترسیداردا دەدیتەوە. لەمانەش گرنگتر، دەستووری سێ بناغەیی دەرفەتی چالاکی گێڕانی بۆ کەمینە نەژادییەکانی رەخساند تا بتوانن لەهەمبەر نەژادەکانی ئیبۆ، یۆرۆبا، هوسا-فولانی دەنگیان هەبێت.

لەوانەیە گەورەترین مەترسی جیددی و ستراکتۆرییانە ئەوە بێت کە مومکینە دوو ناوچە لە دژی ناوچەی سێیەم یەکتر بگرنەوە. زیاد لەمەش، هەر لە دوای سەربەخۆییەوە، پارتەکانی باکوور هاوپەیمانییان لەگەڵ پارتی رۆژهەڵاتدا دامەزراند و پاش ماوەیەك هەوڵیاندا بە هۆی درز تێکەوتنی ناوخۆیی لە پارتی یۆرۆبای رۆژئاوایی، ئەم ناوچەیە بچەوسێننەوە و لە رێگەی زۆرینەی ئەندامەکانیان لە پەرلەماندا ناوچەیەکی چوارەمی فیدراڵیان بەمەبەستی کەم کردنەوەی دەسەڵاتی یۆرۆبا دامەزراند. ئەم پرسەش بوو بە هۆی ناسەقامگیری و ناکارامەیی بەڕێوەبردنی ئابووری و گەندەڵکاریی و رێ بۆ دوو کودەتا لە ساڵی ١٩٦٦دا خۆش کرد و سوپا لە دوای کودەتا رایگەیاند کە هەوڵ دەدات دیسپلێن سەرلەنوێ بەرقەرار بکات.

ئەم دەستتێوەردانە سەربازییە، بوو بە هۆی زۆرتر بوونی شۆڕشە سیاسییەکان، سیاسەتمەداران و گرووپی نەژادی ئیبۆ لە باڵادەستی پارتی باکوور ( هوسا-فولانی) بەسەر

حكومەتی میلیتاریدا نیگەران بوون و ئەمەش بوو بە هۆی خۆ دوورخستنەوەی ناوچەی رۆژئاوا لە حكومەت. حكومەتی خاوەن ئۆتۆنۆمی بیافرا لە ساڵی ٩٦٧دا سەربەخۆیی راگەیاند. ئەم پرسەش هەڵوێست و مەیلی كەمی گەلی نیجریایی بۆ یەكێتی نەتەوەیی و مەیلی زۆر بۆ مۆبیلیزەكردنی سیاسی بەپێی نەژادگەرایی نیشان دەدات و ئەم وڵاتە دواجار پاش سێ ساڵ شەڕی ناوخۆیی یەكتری گرتەوە، بەڵام دوای ئەوەی ە دوو ملیون كەس بافرایی لە ئەنجامی ئۆتۆنۆمی حكومەتی فیدراڵی رۆژئاوا گیانیان لەدەستدا.

یەكەمین قۆناغی حكومەتی سەربازیی لە نیجریا لە ساڵی ١٩٦٦ تاساڵی ١٩٧٧ خایاندی. ژنرەالەكان هەوڵیاندا لە رێگی ستراكتۆریی سیاسی سەربازییەوە مۆبیلیزەكردنی سیاسییانەی نەژادگەرایی لە ناو ببەن. حكومەت ببوو بە ناوەندگەرا و ئامانجیشی بەدیهێنانی یەكێتی نەتەوەیی و گەشەی ئابووری بۆ گشت وڵات بوو. ژمارەی ناوچەكانی فدراسیۆن لە چوار ناوچە بۆ دوانزە ناوچە لە ساڵی ١٩٦٨دا بەرز بووە و لە ساڵی ١٩٨٦دا گەیشتە نۆزدە ناوچە. ئەمەش هەوڵدانێك بوو بۆ نەهێشتنی دەسەڵاتی ئەم سێ گرووپە نەژادییە و بۆ نەژادە بچووكترەكانی ئەم وڵاتەش دەرفەت رەخسا (تا بەشداری لە حكومەتدا بكەن) . حكومەتی سەربازی بە شێوازی جۆراوجۆرەوە یارمەتی یەكگرتنەوەی دەسەڵات لە دامەزراوە نەتەوەییەكانیدا. ئەگەرچی هاوسەنگی نەژادیی تەنیا لایەنێكی دامەزراوەكانی حكومەت و ركابەرێتی سیاسی بوو، بەڵام بەرەبەرە لەلایەن دامەزراوەكانی فیدراڵییەوە لە دەسەڵات و باڵادەستی نەژادەكان گۆڕانكاری ئەنجامدرا. هەروەها حكومەتی سەربازی لە دامەزراندنی یەكێتی نەتەوەیی سەركەوتوو بوو. هیچ هەوڵدانێك بۆ جیاخوازی لە دوای شەڕی ناوخۆیی لە ساڵانی ١٩٦٧-٧٠ ئەنجام نەدرا. بەڵام پێویستە بزانین لە قۆناغی یەكەمی حكەمەتی سەربازی، وڵات لە سەقامگیرییەكی تەواو سیاسیدا نەبوو. (سەقامگیرییەكی رێژەیی هەبوو).

بەرەنگار نەبوونەوی ئەفسەران لە دژی گەندەڵی لە دەروونی (سیستەمی) بۆرۆكراسی و خراپ بەڕێوەبردنی ئابووری لاواز، بوو بە هۆی رووخانی حكومەت لە ساڵی ١٩٧٥دا و حكومەتێكیتری سەربازیی پێكهێنرا. رژێمی سەرهەنگ ئۆلیسیگان ئۆباسانجۆلە ساڵی ١٩٧٩دا نیجریای بۆ سیستەمی حكومەتی مەدەنی گەڕاندەوە.

كۆماری دووەم لە سەرۆك كۆمار ئەلحاجی ساگاری كە پارتی نەتەوەیە نیجریا (NPN)ی دامەزراند، پشتگیری كرد. پێویستە بڵێین كە زۆرینەی دەسەڵات سەربە ناوچەی باكوور بوو، بەڵام پشتگیریكردنی ئەم پارتە لە ناوچەی باشوور بوو بە هۆی بەدەست هێنانی دەنگی



دانیشتوانی باشوور و مەشروعییەتی بە خواستەكانی ئەم پارتە بەخشی و وەك پارتێكی نەتەوەیی سەریهەڵدا. دووەمین كۆمار لە ساڵی ١٩٧٩-٨٣ ( لەلایەن گەلەوە) پشتگیریی لێكرا و بەپێی مۆدیلی" ئاڵوگۆڕی هەژمونیكی" دۆناڵد رۆس چیلد كاری كرد. بەڵام رەچاوی دەسەڵاتی نەژاد و ناوچەكانیشی دەكرد و سەرچاوەگەلی (وەك خۆراك)، بودجەی خۆجێیی، پۆستە سیاسییەكان (بەپێی نەژاد- ناوچە دابەش دەكرا. بۆ نموونە پارتی نەتەوەیی نیجریا بەڵێنیدا كە پۆستەكانی سەرۆك كۆمار، سەرۆك پەرلەمان، جێگری سەرۆك كۆمار، سەرۆكایەتی سێنا كە رەگی لەم پارتەدا داكوتا بوو و بەپێی خولەكان لەنێوان كەسایەتییەكانی باكوور، رۆژهەڵات، باشوور و ناوەندی هەڵبژاردنی كابینەی فیدراڵی كە نوێنەری لە گشت نەژادەكان هەبوو، هەڵبژێردرێت. هیچ یەك لە نەژادەكان، زۆرینە نەبوون، بەڵام رژێمی ساگاری لە شەوی سەری ساڵی نوێی ١٩٨٣ كودەتای سەربازی لە دژی ئەنجامدرا. نكوڵی كردنی رژێم لەم دامەزراوە دیموكراتیكانە بە هۆی سەرنەكەوتنیان لە دابین كردنی پێداویستی نەژادەكان و بە هۆی هەستی نەتەوایەتی نەبوو، بەڵكو سیاسەتمەداران توانای دروست بەڕێوەبردنی ئابووریان نەبوو. هەروەها ئەم سیاسەتمەدارانە لە نەهێشتنی گەندەڵی و بەرتیل شكستی هێنا.

لەسیستەمێكی حكومی كە بۆ مانەوەی دەسەڵاتی پشت بە وەفادارێتی نەژادیی دەبەستێت، كونترۆڵی گەندەڵی سەختە و سیاسەتمەداران لە پێناو بەرژەوەندیی كورت خایەن لە دەوری حكومەت كۆ بوونەتەوە و وەك قۆچكی دەسەڵات(گوشار) بە كار دێنن. پێویست بوو پلانە ستراتیژیكەكانی سیاسی و ئابووری بەپێی ئەم سیستەمەی جێگركراوەیەی ئاڵوگۆڕی سیاسی بەردەوام بێت. دابەش كردن و كونترۆڵ كردنی سەرچاوەكان بۆ سیاسەتمەدار و بۆرۆكراتەكان لەهەمبەر گەشەی راستەقینەی ئابووری بەرهەمێنەری ئەم سەرچاوانە گرنگی زۆری هەبوو. نیجریا رووبەڕووی گرفتگەلی نالێهاتوویی و مەشروعییەتی پشت بەستراو بە ئاڵوگوڕی هەژمونیك ببووە.

حكومەتی محەممەد بوهاری لە پێشكەش كردنی چارەسەرییەك بۆ چارەسەركردنی خێرای گرفتە ئابوورییەكان شكستی هێنا و رژێمەكەشی پشتگیریی گشتی لە دەستدا و ئەمەش بوو بە هۆی ئەنجامدانی كودەتای سەربازی لە ساڵی ١٩٨٥ كە تیایدا ژەنەرال ئیبراهیم بابانگیدا بوو بە سەرۆكی حكومەت. بابانگیدا پلانی هەموار كردنی ستراكتۆری ئابووری جێبەجێ كرد و بەڵێنیدا تاساڵی ١٩٩٢ زەمینە بۆ بەرقەراركردنی دیموكراسی فەراهەم بكات. بەمجۆرەش رژێم

هەوڵی دەدا تا یاسای پۆلین کردنی کۆمەڵایەتی بەپێی ئەزموونەکانی دیموکراتیکانەی کۆمـاری سێیەم بە سەرکەوتوویی جێبەجێ بکات.

دەستووری پەسەندکراوی سەردەمی بابانگیـدا کۆمەڵـە بیرۆکەیـەکی نـوێی سـەبارەت بـە سیاسەتی نیجریـای دارێـشتبوو. یەکـەم یاسـا ئـەوە بـوو کـە ئەنجومـەنی حکومـەتی سـوپا (AFRC) رایگەیاند کە سیاسەتمەدارە پێشوویەکانی ئەندام لەم ئەنجوومەنەدا ناتوانن خۆیان بۆ کۆماری سێیەم بپاڵێوەرێن و نابێت هاوسەنگی جێگیرکراوەی نەژادیی دووبارە زیندوو بکرێتەوە. لەبری ئەمەشدا بابانگیدا سیستەمی دوو پارتی بەپێی کاروباری نەتـەوەیی لـەبری رکابـەرێتی سیاسی و ناوچەییدا دامەزراند. هەر یەك لەم دوو پارتە ئەگەر خوازیاری گەیشتن بـە دەسـەڵات بانا، دەبوایا لە سەرتاسەری وڵاتدا لایەنگر بە دەست بهێنن. لە راستیدا لە رژێمی بابانگیـدادا بە هۆیەوە پارتی سیاسی دامەزران تا دوو پارتی یاسایی لە دەستووری نوێدا رکابەرێتی یـەکتر بکەن. لە ٤٠ گرووپی نـاو نووسـکراو، ١٣ گـرووپ لەلایـەن رژێمـەوە پەسـەن کـران و پـاش ماوەیەك ئەنجوومەنی حکومەتی ئـەم ١٣ گرووپەشـی هەڵوەشـاندەوە، چـونکە ئـەم گرووپانـە رایانگەیاند بوو کە ناتوانن خاوەن ئایدیۆلۆژیای لێك جیاواز بن و پەیوەندی نزیکیـشیان لەگـەڵ سیاسەتمەدارانی پێشوودا هەبوو کە چالاکییان قەدەغە کرابـوو. لـەبری ئەمەشـدا ئەنجوومـەنی حکومەتی سوپا، لەنێوان ئەم گرووپانەدا دوو پارت بەپێی مانفێستی ئەنجوومـەن دامەزرانـد و گواستنەوەی حکومەتیش بۆ حکومـەتی مـەدەنی هەڵپـسێردرا و دواجـار گوشـاری نـاوخۆیی سـوپای ناچـارکرد هەڵبژاردنـەکانی سـاڵی ١٩٩٣ هەڵبوەشـێنێتەوە و سـەرکەتووی ئـەم هەڵبژاردنەش مۆسۆ ئابیولا زیندانی کرا. بەڵگەنەویستە کە کاربەدەست و هێـزی چـەکدار لـە دەسەڵاتی سیاسی سوودمەند بوون و ئامادە نەبوون دەسەڵات بە کەسانیتر بسپێرن. دیموکراسـی فرە پارتی تا ساڵی ١٩٩٩ واتـە کاتێـك کـە سـەرۆك کۆمـار ئۆبـا سـانجۆ بـەپێی پێوەرەکـان هەڵبژێردرا تا کۆماری سێیەم پێـك بێنێـت، بەرقـەرار نـەکرا. خـودی ئۆبـا سـلانجۆ ژەنـەراڵی خانەنشینکراو بوو و لە ساڵی ١٩٧٦-٧٩ سەرۆکایەتی حکومەتی سەبازیی کردبـوو، ئەمـەش بەو مانایە دێت کە سوپا دەسترۆیی لە سیاسەتی نیجریادا هەبوو.

نیجریا لەهەمبەر ململانێیەکاندا کە لە تەواوی وڵاتـانی ئـەفریقیا دوای کۆڵۆنیـاڵ بـاو بـوو، بەرگری لەخۆ کرد. هەست و مەیلی سیاسی لێکجیاواز هێـزە (سیاسـییەکانی) بەسـەر چـەندین جەمسەر دابەشکرد. لەلایەك مەیل بۆ پاڕاستنی دەوڵەت- نەتەوە لە ئارادا بـوو و ئەفریقییـەکان لەو وڵاتانەی کە لە قۆناغی نەهێشتنی کۆڵۆنیال دەوڵـەت- نەتـەوەیان دامەزرانـدبوو، لـەم کـارە



رەزامەنـد بـوون. لەلایـەکیترەوە رێگەیـەکیتر لەبـەردەم ئەفریقییـەکان، بنیاتنـانی سیاسـییانەی "هاوپەیمانی براوە" بۆ مۆبیلیزەکردنی هێزەکان لە ئاست خوار دەوڵەت (sub-state) بـوو، واتـە لە ئاستی نەژادیدا. یاسای هاوسەنگی نەژادیی "ئالوگۆڕی هەژمونیك" لەوانەیە ئەم وڵاتە بـەرەو سەقامگیری رێژەیی لە چوارچێوەی ژینگەیەکی سیاسی تەواو رۆژئـاوایی ئاراسـتە بکـات. بـەڵام تێچوونەکەشی بریتییە لە ناکارامەیی و سیاسەتی دابەشکردنی (توزیع) نابەرهەمهێنەر و نیجریـا بوو بە یەکێك لەو وڵاتانەی کە بە سەرکەوتوویی سیستەمی دەوڵەت- نەتەوە وەك خـۆی مایـەوە. بەڵام ژمارەیەکی کەمی ئەم وڵاتانە بە جۆرێـك بـەرێوە دەبـردران تـا بتـوانن بـە سـەرکەوتوویی دامەزراوەگەلێك بنیات بنێن و لە رێگەیانەوە بە سەرکەوتوویی، مـۆبیلیزەکردنی نـەژادیی بـەرەو سیستەمی سیاسی بەرهەمهێنەر، کە بێتەهۆی گەشەسەندنی ئابووری، ئاراستە بکات.

**نایجیریا:**

| | |
|---|---|
| ڕووبەر | ٥٨٠/٧٦٨ |
| دانیشتوان | ١٢٠/٩ ملیۆن کەس |
| هێزی کۆڵۆنیالکار | بەریتانیا |
| ساڵی سەربەخۆیی | ١٩٦٠ |
| گرنگترین شارەکان | ئابۆجا (پایتەخت)، لاگوس، کانۆ، ئابادان |
| گرنگترین نەژادەکان | هۆسا، یۆرۆبا، ئیبۆ، فولانی و ٢٥٠ گرووپیتر |
| دانیشتوانی شار | ٤٣/٤ |
| زمان | ئەنگلیزی، هۆسا، یۆرۆبا، ئیبۆ |
| ناوەندی ژیان | ٥١ ساڵ |
| رێژەی خوێندەواری | ٩٥/٥ |
| گرنگترین هەناردەکان | نەوت وگاز |
| دراو | نایرا |
| رێژەی مردن | ٧٠ مردن لە هەر ١٠٠٠ لە دایك بوو |
| ئایین | ئانیمیست، مەسیحی، ئیسلام |
| بەرهـەمی ناپوختـەی نیـشتمانی (gdp) | ٣٧٧ دولار |

## زاراوە سەرەکییەکان:

**بڕوای ئانیمیستی:** جۆرە بڕوایەك کە وای بۆ دەچێت جیهانی فیزیکی لە ڕێگەی ڕۆحەکان، زەوی، ڕووبار، باران و... کونترۆڵ دەکرێت.

**سیاسەتی دابەشکردن (توزیع):** بەپێی ئەم سیاسەتە سەرچاوەکانی دەوڵەت بەپێی خواست و زۆرتر لە پێداویستییەکان دابەش دەکرێت و لێکدانەوە (محاسبات) سیاسییەکان بەسەر تێبینییە ئابوور و کۆمەڵایەتییەکاندا زاڵە.

**لێکدانەوەی (محاسبات) نەژادی:** واتە گشت نەژادەکانی کۆمەڵگا پشکێکی گونجاو لەگەڵ سەرچاوەکانی دەوڵەت بەدەست دێنن.

**دەلالە نەژادییەکان:** ناوبژیوانان و ئەندامانی نوخبەکانی دەوڵەت کە نوێنەرایەتی سەرچاوەکان دەکەن و هەوڵ بۆ فەراهەم کردنی سەرچاوە بۆ نەژادەکەیان دەدەن.

**گرووپی نەژادیی:** کۆمەڵە خەڵکێك کەخاوەن شوناس و چارەنووسی هاوبەشی پشت بەستراو بە پەیوەندیی خزمایەتی، داب و نەریت و یەکسانی کولتووریی و مێژوویی و زمانی هاوبەشن.

**ئالوگۆڕی هەژمونیك:** واتە دەوڵەت توانای کونترۆڵ کردنی گرووپە نەژادییەکانی نییە و لەبری ئەمەشدا پەسەندکردنی مەشروعییەتی حکومەت و وەفادرا بوون بەم حکومەتە لەلایەن گرووپەکانەوە، دەبێتە هۆی دەست گەیشتنی ئەم گرووپانە بە سەرچاوەکان.

**نەژادگەرایی ئامرازیی:** واتە هەوڵدان بۆ بنیاتنانی دروستکردنی گرووپی نەژادیی نوێ تا لەم ڕێگەیەوە سەرچاوەکان دەستەبەر بکەن.

**کۆماری ئیسلامی:** حکومەتێك کە پشت بەستراو بە یاساکانی شەریعەت بێت.

سیاسەتی ئیسلامگەرا: ئەو دەست و تاقمانەی کە هەوڵ بۆ دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی دەدەن.

**جیهاد:** ململانێیەکی مەعنەوییانە بەپێی بیرۆکەی ئیسلامی. دەکرێ ئەم ململانێیە خوێناوی یاخود لەپێناو بیرۆکەیەك یان بەرفراوان کردنی کۆمەڵگای ئیسلامی بێت.

**نەژادپەرستی هەتاهەتایی:** بیرۆکەیەکی نەگۆڕی تایبەت بە هاوبەندی نەژادیی کە لە پێشترەوە وەفادارییەکان دەست نیشان کراون و خێڵ بەپێی گومانە مێژووییەکان پێك هێنراوە.

**شەریعەت:** کۆمەڵە یاسایەکی وەرگیراو لە قورئان کە هەم پانتای گشتی و هەمیش پانتای تایبەتی دیار دەکات.

**خێڵگەرایی:** بوختانی ناسیۆنالیستەکان کە تیایدا شوناسەکانی نەژادیی بە فاکتەری پوکانە و دواکەوتوویی و مەترسیدار هەژمار دەکرێت و لەمپەری پێشکەوتن و گەشەسەندنە.



## پرسیارەکان:

١. بۆچی ئەفریقییەکان لە سەدەی نۆزدەیەم و بیستەمدا هێزەکانیان لەسەر بنەمای خێڵگەرایی مۆبیلیزە کرد؟

٢. ئایا گرووپە نەژادییەکانی ئەفریقیا هەتاهەتایین یاخود ئامرازین؟

٣. ئایا ئالوگۆڕی هەژمونیك، لە ئەفریقیادا شێوازێکی گونجاوی حکومەتی دامەزراندووە؟

٤. ئایا لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالدا شوناسی نەژادیی و ئایینی بۆ پرۆسەی سیاسی سوودمەند بوونە یاخود ڕێگری ئەم پرۆسەیە بوونە؟

٥. تا چ ڕادەیەك دامەزراندنی حکومەتی ئیسلامی لە ئەفریقیادا سروشتی سیاسەت دەگۆڕێت؟

## بۆ خوێندنی زۆرتر:

بۆ خویندنی زۆرتر بڕواننە بەشی تایبەت بە کرافۆرد یونگ لە پەرتووکی دیڤید ئەپتر و کارول ڕۆزنبرگ، هەروەها لویس دلا گراندیر، کنس کینگ، سارا ڤایۆگا. سەبارەت بە ڕواندا پەرتووکی جارد پرینر، سەبارەت بە یەکگرتنەوەی نەژادەکان و بەرپەرچدانەوی کۆلۆنیال، بابەتی سەرنجڕاکێشی هەیە.

بەکارهێنانی ئامرازی" ئالوگۆڕی هەژمونیك" لە پەرتووکی دۆناڵد ڕۆس چیلد  بە پوختی باسی لێکراوە. دێڤید ولش، وتارێکی لەم بارەوە هەیە.

چەمکێکیتری سیاسی کە لەم پەرتووکەدا خوێندنەوەی بۆ دەکرێ و لە سیاسەتەکانی دوای کۆلۆنیال لە ئەفریقیادا وەك ئامرازەکی متمانەپێکراو لەلایەن زانایانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە کاری پێکرا، چەمکی چینە. ئەم چەمکە بۆ لێکۆڵەرە سیاسییەکان زۆر بایەخدارە، چونکە ئەم چەمکە باشترین ڕێگەیە بۆ دیارکردنی مشتومڕی کۆنی نێوان دەوڵەمەندان و هەژاران لە کۆمەڵگادا. چین، خوێندنەوەی نایەکسانییەکان- لەو شوێنەی کە نایەکسانی بوونی هەیە- و پەیوەندی نێوان گرووپە ڕکابەرەکانە، وەك کۆلۆنیالکاران و ئەوانەی دەچەوسێنرێنەوە. سیاسەتڤانان ناچارن ئەم ناکۆکییانە چارەسەر بەکەن، زیاد لەمەش، مارکسیزم لەو بڕوایەدایە کە چین، پێوەری سەرەکی هەر کۆمەڵگایەکە، هەروەك چۆن مارکس و ئەنگلز لە پەرتووکی مانیفێستی کۆمۆنیستدا نووسیونانە: (تا ئێستا مێژووی گشت کۆمەڵگاکان، مێژووی جەنگی چینایەتی بووە).

ئەم بەشە سەرەتا لە بۆچوونەکانی کارل مارکس سەبارەت بە شیکرنەوەی چینەکان بۆ دەوڵەتە ئەفریقییەکان سوودی وەرگرتووە. ئەم جۆرە شیکردنە بۆ تێگەیشتن لە بەشەکانی پێشوو وەك بەرکارهێنانی مێژوو، ناسیۆنالیزم و نەژاد سوودمەند دەبێت ئەگەرچی ئەو کاتەی کە مارکسیزم دەچێتە ئەفریقیا ڕووبەڕووی سنووردارێتی دەبێتەوە. هەر بۆیەش لەوانەیە تیۆرییەکانیتر (کە لە نیوەی دووەمی ئەم بەشە روون دەکرێنەوە) بۆ خستنەڕووی وێنایەکی وردتر لە چۆنێتی ململانێی چینایەتی بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال سوودمەند دەبێت.

## مارکس و چینی کۆمەڵایەتی:

کارل مارکس، مۆدێلێك لە کۆمەڵگا دەخاتەڕوو کە لە ڕێگەی ململانێی چینایەتییەوە فەرمانڕەوای دەکرێ، ڕوانگەکانی ئەو یارمەتیمان دەدات بۆ دیارکردنی گرووپە ڕکابەرەکانی کۆمەڵگا و بناغەکانی پەیوەندی لەنێوان ئەم گرووپانە.

ئەگەرچی مارکس پیاگۆکارێکی باشە، بەڵام ئەو بە زیادکردنی دینامیزم و بزاڤ یارمەتی شیکردنەوەی چینەکانی کردووە، ئەو باس لەوە دەکات کە پێکهاتنی چین پەیوەستە بە پێشکەوتنی مێژوو و، ململانێی چینایەتی بزوێنەری گشت مێژوویە، لە ڕوانگەی مارکس کلیلی تێگەیشتن لە راڤە و شیکردنەوەی چینەکان بەتایبەتیش لە پانتای سیاسی ئەفریقیادا، ناسینی ئەو شتەیە کە مارکس بە (ئامرازی بەرهەمهێنان) ناودەبات. زیاد لەمەش، مارکس

چینەکان لە ڕێگەی پەیوەندییان بەم ئامرازانەی بەرهەمهێنانەوە روون دەکاتەوە. لە روانگەی مارکس، خاوەنداران چینی دەسەڵاتدار پێکدێنن و ئەوانیتری کۆمەڵگا لە پێگەی چەوسێنراوەکاندان.

هەروەك چۆن فریدریش ئەنگلز دەڵێت: (فاکتەری دەستنیشانکەر لە مێژوودا، لە دوایین قۆناغی بەرهەمهێنان و دووبارە بەرهەم هێنانەوەی ژیاندا، بە ژیاری (حیوی) هەژمار دەکرێت.

بەواتایەکیتر هەموو خەڵك ناچار بە بەرهەمهێنانی لاینکەمی پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیانن (خۆراك، خانوو، جل و بەرگ) ئەمەش حەقیقەتی ژیانە و دەست گەیشتن بەم ئامانجانە بۆ خاوەندارانی سەرچاوەکانی بەرهەمهێنان، ئاسانترە لە دەست گەیشتنی جەماوەر بەم سەرچاوانە. کەواتە سەرچاوەکای بەرهەمهێنان بریتین لە: فاکتەرە ماددییەکان وەك زەوی، ئامرازە میکانیکییەکان کە یارمەتی مرۆڤ دەدات تا پێداویستییە سەرەکییەکانی و هەر جۆرە دەرامەتی بەدەست هاتوو لە ئابوورییەکەیان بەرهەم بهێنن.

چینەکۆمەڵایەتییەکان بەپێی پەیوەندییەکانی بەرەهەمهێنانەوە دروست دەبن، بۆ نموونە لە شێوازگەلی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا، کۆمەڵگا بەسەر دوو چینی بورژواز و چینی کرێکار دابەش دەبێت خاوەنداران و سەرمایەداران بۆ بەدەستهێنانی ئاسایش و ستانداەرکردنی ئاستی ژیان و پاراستنی دەسەڵاتی سیاسی، بە سوود وەرگرتن لە خاوەندارێتی سەرچاوەکانی بەرهەمهێنان (زەوی و ئامرازی میکانیکی) چینی بۆرژواز پێك دینن و بە هاتنەدی ئەم بارودۆخەش ئەوان چینی کرێکار دەچەوسێننەوە.

بە پێچەوانەوە چونکە ئەندامانی چینی کرێکار خاوەنی هیچ جۆرە سەرچاوەیەکی بەرهەمهێنان نین و ناچارن پێداویستییە سەرەکییەکانی زۆر پێویست بەرهەم بێنن، کەواتە بۆ هێزی بەرهەمهێنەر دەگۆڕدرێن و ئەمەش دەبێتە هۆی چەوساندنەوەیان لەلایەن بۆرژوازەکانەوە. پرۆلتاریا لەرزۆکە چونکە بەتەنیا کاری خۆی بۆ فرۆشتن هەیە، کەواتە هیچ چارەیەکی نییە تەنیا کارکردن بۆ بۆرژوازی نەب چینی فەرمانڕەوا چەوسێنەرە، چونکە گشت بەهای کارەی (پرۆلتاریای) ناداتەوە، سەرمایەداران تا ئەو ئاستە حەقدەست دەدات کە هێزی کار بتوانێ دووبارە بەرهەمهێنانەوەی خۆی بکات و بتوانێ بەردەوامی بە ژیانی هێزی کار بدات. بەڵام کرێکاران، پشکێکی کەمی سوودی بەدەست هاتووە لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا بەدەست دێنن و هەر جۆرە زیادە بەرهەمهێنان کە بە هۆی کارکردنی لە رادەبەدەری چینی کرێکار بەدەست هاتووە لەلایەن بۆرژواکانەوە بۆ پاراستنی ستاندەرەکانی ژیان و سەرلەنوێ



سەرمایەگوزاریکردن لە کارە سەختەکاندا لەپێناو چەوساندنەوی زۆرتر بەکاردەهێنرێت. لەم شێوازەدا، ئەندامانی پرۆلتاریا بۆ ئاستێکی نزم دادەبەزن و دەبن بە یەکەگەلی تایبەت بە بەرهەمهێنان. واتە دەبن بە کرێکارانی چینی فەرمانڕەوا لە کارگە و کێڵگەکانیاندا. سروشتییە کە چینی چەوسێنەر لە ستراکتۆری سیستەمە دەسەڵاتدارێتیدا. رەنگ دەداتەوە بۆرژوازی هێزێکی هەژموونیکە و هەمیشە دەوڵەت لەهەمبەر پرۆلتاریادا بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی بۆرژوازەکان دەکات. مارکس لەو بڕوایەدایە کە دەسەڵاتی جێبەجێ کردنی حکومەتە هاوچەرخەکان تەنیا کۆمیتەیەکە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی چینی بۆرژوازی، کەواتە گشت سیستەمی سیاسی ئامرازێکە بۆ خزمەتکردنی چینی دەسەڵاتدار. ئەمەش هەر ئەو شێوازەیە کە مارکس لە پێشکەوتنی کۆمەڵگای هاوچەرخ رەچاوی دەکات و لە سەدەی نوزدەیەمدا دەینووسێتەوە مارکس بینی کە سەردەمی ئێمە، سەردەمی بۆرژوازییە و ئەم تایبەتمەندییانەی لەخۆ گرتووە: (بە سانایی ناکۆکییەکانی چینی کۆمەڵایەتی ئاشکرا دەکات). بەگشتی کۆمەڵگا دابەش دەبێتە سەر دوو گرووپی گەورەی چینایەتی کە راستەوخۆ لە بەرامبەر یەکتردا دەوەستنەوە: بۆرژوازی و پرۆلتاریا.

کارل مارکس یارمەتی زانایانی زانستە سیاسییەکانیدا کە نەك تەنیا شوناسی چینەکان، بەڵکو رۆحی ئەم چینانەش لە چوارچێوەیەکی مێژووییدا بخوێننەوە. ژێرخانی کاری مارکس بیرۆکەی (شۆڕش) بوو. چینەکان سەرهەڵدەدەن، یەکتر دەگرنەوە و لە کۆتادا بەدرێژایی مێژوو بەرەو بەدیهێنانی چینەکی نوێ ئاراستە دەبن، لەم رووەوە مارکس لەم بڕوایەدا بوو کە رەورەوەی شۆڕش بەرەو سۆسیالیزم دەچەمێتەوە و کاتێك کە سیستەم لە کۆتادا بەهۆی ناکۆکییە دەرونییەکانی بە تەواوی لاواز دەبێت کاپیتالیزم لە ناو دەچێت.

کلیلی هەرەسهێنانی کاپیتالیزم ئەوەیە کە ئەم شێوازە لە بەرهەمهێنان بە بڕاوی دەبێتە هۆی هێنانەدی کۆمەڵێکی گەورە لە چینی کرێکار، کە ئەم چینەش لەلایەن چینی فەرمانڕەواوە دەچەوسێتەوە و حەقیقەتیش ئەوەیە کە چینی کرێکار بە خێرایی روو لە زیاد بوون دەکات و لە کۆتادا کۆنترۆڵ ناکرێت. لە سەرەتادا دەبێ کرێکاران لە ڕێگەی کاری کۆمەڵییەوە وەکو چالاکییەکانی یەکێتی بازرگانی، پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانیان بکەن. ئەمەش دەبێتە هۆی تەشەنەکردنی بزاڤی شۆڕشگێڕانە کە شێوازی گواستنەوەی (سیستەمی) سەرمایەداری بۆ (سیستەمی) سۆسیالیزم کامڵ دەکات. دوای شۆڕش، سۆسیالیزم کۆمەڵگایەکی بێ چینی کۆمەڵایەتی دادەمەزرێنێ، کۆمەڵگایەك کە دەبێ تیایدا نایەکسانی و

چەوسانەوە بە کۆتا بێت. بە وتەی مارکس: (ئەو شتەی کە بۆرژوازی هەوڵ بۆ هێنانەکایەوەی دەدات لە کۆتادا هێنانەدی دوژمنکارییە، رووخانی بۆرژوازی و سەرکەوتنی چینی کرێکار وەکو یەك شیاوی خۆ لێ دوور خستەوە نین).

## گرفتەکانی هەناردەکردنی مارکیسزم بۆ ئەفریقیا:

ئەگەرچی لە رادەبەردەر (بیرۆکەکانی) کارل مارکس رەچاو دەکرا، بەڵام نەیتوانی خۆی لەنەمان رزگار بکات بەڵگەنەویستە کە کاری مارکس رەخنەگرتن لە سەرمایەداری ئەوروپای سەدەی نوزەدەیەم بوو. سەرمایەداری، جیهانێك بوو کە ئەو دەیناسی. مارکس لە نووسینەکانیدا بابەتگەلی زۆر سەبارەت بەو سەردەمە و زاراوە سەرکییەکان کە ئەو بۆ توێژینەوە هاوچەرخەکان ئەنجامی داوە فێرمان دەکان، کارێك کە تا سەردەمی مارکس ئەنجام نەدرابوو.

جیهانی نوێ شوێنەکی جیاوازە کە لەگەڵ توێژینەوەکانی مارکسیزم جیاوازی زۆری هەیە، تەنانەت لە سیستەمە ئەمڕۆییەکانی ئەوروپاش، شیکردنەوەکانی مارکیستی رووبەڕووی گرفتگەلی سەرەکی دەبنەوە ( بەهۆی گەشەی چینی مامناوەندی و نەبوونی چینی کرێکاری شۆڕشگێڕ) و لە دەرەوەی ئەوروپاش بەڵگەی کەم بۆ بەرگری کردن لە تیۆری مارکس هەن. بەڵگەنەویستە ئەفریقیاش هەر جۆرە بیرۆکەیەکی پەیوەست بە نموونەی مارکس بۆ شیکردنەوەی چینایەتی وەك دەڵالەتێکی جیهانی (گەردوونی)، بەتاقی کردوەتەوە. ئەفریقیا لە یەکەمین سۆنگەوە بەهۆی ئەوەی کە لە رێگەی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری کونترۆڵ نەکراوە، لێکدانەوە مارکیستییە کلاسیکییەکانیشی بەتاقی نەکردوتەوە. لەبەشی دووەمدا روون کرایەوە کە چۆن ئیمپریالیزم کەرتگەلی جۆراوجۆر لە ئابووری کۆڵۆنیالی بەرەو سیستەمی جیهانی سەرمایەداری راکێش کردووە، بەڵام سەرمایەداری لە گشت چالاکییەکانی وڵاتەکانی ئەفریقیا بە تەواوی زاڵ (**مسلط**) نەبوو و تا ئەمڕۆکەش ئەم رەوتە بەردەامە. بە پیشەسازی نەبوونی بەرفراوان لەم کیشوەرەدا، شایەتی ئەم حەقیقەتەیە جیا لە باشووری ئەفریقیا. لە هیچ یەك لە وڵاتانی ئەفریقیا شۆڕشی پیشەسازی بە واتای راستەقینە رووی نەداوە هەر بۆیەش هیچ جۆرە سەرمایەی زیادە بەهۆی نەبوونی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییەوە بوونی نییە پەیوەندییەکانی دامەزراوەکانی ئەم شێوازەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریش جێگەی سەرسوڕمان نییە، لە هەندێ لە وڵاتانی ئەفریقیا چینی پرۆلتاریا بوونی هەیە کە دەکرێ



گفتوگۆی لەسەر بکرێ بەڵام لەم چەشنە وڵاتانەدا، نەبوونی چینی بۆرژوازی کلاسیك بە تەواوی بەرچاو دەکەوێ هەر بۆیەش بە بێ بوونی بۆرژوا، هیچ جۆرە مارکسیزمێکی شۆڕشگێڕی جوڵێنەر کە ببێتە هۆی خێراترکردنی گۆڕانی مێژووی و گواستنەوە لە قۆناغی کاپیتالیزم بۆ سۆیالیزم سەرهەڵنەدراوە.

بە رەچاو کردنی ئەم حەقیقەتەش، هەندێ ئەفریقیا وەك دەوڵەتێکی بێ چین هەژمار دەکەن. بە بڕاوی تیۆری دژە ناسیۆنالیستی ئەفریقیایی بوو کە ئەم وڵاتانەی بەرەو سەربەخۆیی برد و لەبری جەخت کردنە سەر چین، جەختیان لەسەر (هاوبەش بوونی) ئەفریقیا کرد. ژیانی لادێیی پشت بەستراوە بە (مافی ناگۆازراوی زەوی بۆ هەمووان) و سەرکردەکانیش هەم بەرپرس و هەمیش وەڵامدەرەوەی خەڵکن و ئەم جۆرە پەیوەندییەش وەك نموونەیەکی ئایدیالی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە سەرتاسەری ئەم کیشوەردا بوونی هەیە. لەم بارەوە (تام ئێم بۆیا tom m.boya) ناسیۆنالیستی کینیایی لەو بڕوایەدایە کە: (دابەشکردنی وردی چینەکان بەو شێوەیەی کە لە ئەوروپا روویدا لە سۆسیالیزمی ئەفریقیادا هیچ پێگەیەکی نییە و هیچ وێکچوونێکیش لە کۆمەڵگای ئەفریقیادا بوونی نییە. لە کۆمەڵگای تەقلیدیدا هیچ گرفتێکی رێکخستنی (جەماوەری) بوونی نەبووە و هەر لە بنەڕەتیشدا لە کۆمەڵگای ئەمڕۆیی ئەفریقیادا بوونی نییە). گشت سیاسەتڤانە نەتەوەیی و ئەو کەسانەی کە لە ئەفریقیادا دەژیان لەگەڵ (ئێم بۆیا) هاودەنگن. (نایرێرە Nyerere)، سێنگهور، سکۆتۆرێ جەخت لەوە دەکەنەوە کە لە ئامرازە بەرهەمهێنەرەکان خاوەندارێتییەکی هاوبەش هەیە (بۆ نموونە هەموان زەوییان هەیە) و سەرکردەکانی ئەفریقیا خزمەت بە خەڵکی خۆیان دەکەن و نایانچەوسێننەوە. ئاشکرایە کە قەواری کاری مارکس گونجاوی روونکردنەوەی سیاسەتی ئەفریقیای دوای کۆڵۆینال نییە ئەگەرچی دەکرێ سەرسوڕهێنەریش بێ. مارکس پێش سەدەی بیستەم کۆچی دوایی کرد و هیچ کات هەوڵی نەدا کە چینە کۆمەڵایەتییەکانی ئەفریقیا شی بکاتەوە. ئەگەرچی ناکرێ بارودۆخی ئەفریقیا لە لێکدانەوە باڵادەستەکانی ئەوروپا سەبارەت بە چینی کۆمەڵایەتی بگونجێندرێت، بەڵام ئەمەش بەو مانایە نییە کە چینی کۆمەڵایەتی و ململانێی چینایەتی لە ئەفریقیادا بوونی نییە. لە بەشی داهاتوو بابەتەکانی ناسیۆنالیستی سەبارەت بە کۆمەڵگای بێ چین کە جەختیان لەسەر دەکرێت. ون دەکرێنەوە- ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەهۆی چینەوە دیار دەکرێن (یاخود بەنایەکسانی دادەمەزرێن) و چین هەر لە سەرەتاوە لە سەرووی سیاسەتەکانی ئەفریقیادا جێگر بووە و ئەم رۆڵە گرنگە تا ئەمرۆش دەرێژەی هەیە.

## شێوازی بەرهەمهێنانی ئەفریقیا:

گرفتێك كە زۆربەی خوێندكاران لە تێگەیشتنی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی حكومەتەكانی ئەفریقیا رووبەڕووی دەبنەوە، ئەوەیە كە ئەم حكومەتانە بە سەختی خۆیان لە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری دوور دەخەنەوە، ئەمە لە كاتێكدایە كە ژینگەی سەرمایەداری ئەو شوێنە بوو كە ماركس باشترین بەرهەمی خۆی تێدا ئافراند. زانا تازە پێگەیشتووەكانی سیاسیش كاتێك كە سەبارەت بە چینی سیاسی فێری بابەتگەلێك بوون، چاوپۆشیان لە زۆرێك لە داخوازییەكانیان كرد. ئەمە حەقیقەتێكە كە ئەفریقیا هێشتا زۆری ماوە تا بە تەواوی بكەوێتە ژێر كونترۆڵی سەرمایەداریدا. بۆیە ئەفریقیاناسان ناچارن كە سەرووتر لە بابەتی سیستەمی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، توێژینەوە لەسەر ئەم بابەتە بكەن.

هەڵبەت ئەمەش بەو مانایە نایێت كە كاپیتالیزم بە هیچ جۆرێك لە كیشوەری ئەفریقیادا بوونی نەبووە، بەڵكو كەرتگەلێك لە ئابووری ئەفریقیا لە ژێر دەسەڵات و كۆنترۆڵی كاپیتالیزمدا بووە. ئەمڕۆكە هەندێ لە وڵاتانی ئەفریقیا ئەو چالاكییە ئابوورییانە ئەنجام دەدەن كە چەندین وەچە پێشتر ئەنجامدراون. بۆ نموونە تەنیا بەشێك لە وەرزێر و جووتیاران پەیوەندییەكی كەمیان لەگەڵ بازاڕی سەرمایەداریدا هەیە، چونكە ئەوان خاوەنی ئامرازی بەرهەمهێنانی تایبەت بەخۆیانن واتە ئامرازە سەركییەكانی كشتوكاڵ و زەوی. كەواتە بە گشتی ئەوان بۆ خودی خۆیان (كاڵا) بەرهەم دێنن و لە چەوساندنەوەی چینی بەرامبەر خۆ دوور دەخەنەوە. بەم پێیەش پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان لەم كیشوەرەدا نەك تەنیا شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری بەرهەم نایێنێت، بەڵكو تا ئێستاش لە ژێر كاریگەی شێوازی بەرهەمهێنانی پێش سەرمایەداریدایە.

مێژوونووسانی ئەفریقیایی بەتایبەت لە دەیەكانی شەشەم و حەوتەم كاتێكی زۆریان تەرخان كرد بۆ دیاركردنی ناوەڕۆكی شێوازی بەرهەمهێنانی پێش سەرمایەداری، ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی كە تێگەیشتنێكی باشتر لەو هێزە كۆمەڵایەتییانەی كە لەگەڵ سەرمایەداریدا هەڵسوكەوت دەكەن بخرێتەڕوو. خاڵی دەستپێك بۆ ئەم مێژووناسانە، نووسینە كامڵكراوەكانی كارل ماركس بوو كە بە رەچاو گرتنی شێوازگەلی بەرهەمهێنانی غەیری كاپیتالیزم نووسراوەتەوە. بۆ نموونە ماركس بەڵگاندنی دەكرد كە لە ئەورووپادا فیودالیزم لە پێشوی سەرمایەداریدا بووە. ئەگەر چی بەڵگەی كەم سەبارەت بە بوونی ئەم جۆرە پەیوەندییە چینایەتییە لە ناو ئەفریقییەكاندا بوونی هەیە، بەڵام فیودالیزم پشتبەستراو بە پەیوەندییەكانی



نێوان خاوەندارانی زەوی بوو كە زیادەی سەرمایەیان لە دەست رەعیەتیان، كە لەسەر كێڵگەكانی ئەم خاوەنداران كاریان دەكرد دەرهێنا. فیودالیزم لە ئەسوپیادا بوونی هەبوو كە لەگەڵ فیودالیزمی ئێستای ئەم وڵاتە یەكتر ناگرنەوە، چونكە ئەوان وەك ئاریستۆكراسییەك خاوەنی كێڵگەی تایبەت بە خۆیان بوون، بەڵام لە كۆمەڵگاكانیتری ئەفریقیادا، كێڵگە لە دەست هەمووان‌دا بووە و هەر خێزانێك لە كۆمەڵەی خۆیدا مافی زەوت لێنەكراوی لە كێڵگەدا هەبوو، ئەمە لە كاتێكدایە كە فیودالیزم نەیدەتوانی بە بێ كێڵگە درێژە بە ژیانی بدات. بێگومان مێژووناسانی ئەم كیشوەرە هەوڵیان دەدا بۆ جێگر كردنەوەی ئەلترناتیڤ و شێوازێكی بەرهەمهێنانی ئەفریقیایی (بێ هاوتا و بێ وێنە). بۆ نموونە هەندێ لە ئەفریقییەكان ئاماژە بە شێوازی بەرهەمهێنانی باجدان یان خزمایەتی دەكەن كە دەبێتە هۆی دروستكردنی چینی كۆمەڵایەتی. لەم كۆمەڵگایانەدا هەندی خێزانی دیار، بە هۆی پێگەیانەوە دیاریی و باج وەردەگرن و ئەم خێزانانەش نوخبەی فەرمانڕەوا كە دەسەڵاتی سیاسی بە دەستەوەیە پێك دێنن. هەندێ لە مێژوونووسان جەخت لەسەر بازرگانی دەرەكی دەكەنەوە وەك سەرچاوەیەك بۆ كەڵەكە بوونی زیادەی (سەرمایە). بۆ نموونە گشت دامەزراوە كۆمەڵایەتییەكانی رۆژئاوای ئەفریقیا، بە هۆی رێگاكانی بازرگانی (وڵاتی) بیاوانەوە دامەزران. سەرمایەی زیادە لە رێگەی ئاڵوگۆری كاڵا، لەلایەن زنجیرە چینەكی بازرگانەوە بە بوون هات كە دواتر لە گواستنەوەی هێزی ئابووری بۆ هێزی سیاسی كاریگەری هەبوو و، لە یەك كاتدا سەرمایەی زیادە و چینی فەرمانڕەوای دروستكرد. لەبری چەوساندنەوەی كۆمەڵگای ناوخۆیی، هێرشە سەربازییەكان بۆ سەر كۆمەڵگاكانی دراوسێ سامانێكی بەدیهێنا كە لەو كاتدا ئەم سامانە بۆ دسەڵاتی سیاسی گەیێنرایەوە.

بە بوێرییەوە دەكرێ بووترێ كە ژمارەیەكی زۆر لە شێوازەكانی بەرهەمهێنان لە مێژووی ئەفریقیا و جیهاندا بوونی هەیە. شێوازە جیاوازەكانی بەرهەمهێنان بەهۆی هەلومەرجی جیاوازی خۆجێیی دروست بوونە، هەڵبەت ئەمەش شیكردنەوەی چینە كۆمەڵایەتییەكان ئاڵۆزتر دەكات. ماركس بە ئاسانی دوو مۆدیلی سەرمایەداری روون دەكاتەوە: (بۆرژوازی لەهەمبەر پرۆلتاریا) بۆیە هەوڵدان بۆ شێوازی بەرهەمهێنانی ئەفریقیای، بۆ ئەوانەی كە هۆگری ئەم شێوازەن سوودمەندە. ئەم پسپۆرانە نیشانیانداوە كە ئەفریقیا پێش كۆلۆنیال كۆمەڵگایەكی بێ چین نەبووە. نوخبە دەسەڵاتدارەكان لە مێژووی ئەفریقیادا، هەروەك هاوتایە ئەورووپییەكانیان، لە چەوساندنەوەی جەماوەر وێكچوونیان هەیە. لەوانەیە ئەو شتەی كە زۆر

گرنگ بێت، ئەوەیە کە ئەوان هەنوکە تێگەیشتن و ناسینەکی باشتریان لە شێوازی بەرهەمهێنانەکەیان لە سەردەمی پێش سەرمایەداریدا هەیە.

ئەم ناسینە زۆر گرنگە، چونکە هێشتاش ئەم شێوازانە لەگەڵ شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری پەیوەندییان هەیە. لەم رووەوە ئەفریقیا هەر لە شێوازی بەرهەمهێنانی پێش سەرمایەداری و هەمیش لە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا بێ لایەنە. ئەگەرچی ئامرازەکانی گەشەسەندن رۆڵی گرنگیان لە سەرمایەداریدا هەیە بەڵام هێشتا زۆر زووە کە ئەم ئامرازانە جێگرەوەی ئامرازە کۆنەکان ببنەوە و ئەم بابەتە گرنگەش دەتوانێ سیاسەتی ئەفریقیا لە رێگەی پەیوەندی نێوان ئەم دوو شێوازەی بەرهەمهێنان یان لێك جیا کردنەوەیان روون بکاتەوە. بۆ نموونە پێکهاتنی چین لە ئەفریقیادا لەسەر بنەمای نموونەی سەرمایەداری واتە (حەقدەست- کار) دامەزراوە و ئەفریقیا هەنوکەش شوێنێکی سەرنجڕاکێشە بۆ ئابوورە بەهێزەکەی ئەو بازرگانانەی لە شارەکاندا بازرگانی دەکەن. (واتە خاوەندارانی ئامرازی بەرهەمهێنان) کە بە مرسدس بنزەکانیانەوە بۆ ماڵ دەگەڕێنەوە تا رێز لە دەسەڵاتی سەرۆکی لادێییەکەیان بگرن. کارل مارکس ئاماژە دەکات کە هیچ سیستەمێکی کۆمەڵایەتی، پێش پێشکەوتنی تەواوی هێزەکانی بەرهەمهێنان، لە ناو ناچێت. هەروەها پەیوەندییەکانی دەسەڵاتی نوێش، پێش ئەوەی کە هەلومەرجی ماددی بۆ پاراستنیان لە دەروونی ئەم تۆرەی کۆمەڵگای کۆندا گەشەی نەکردبێت، جێگەی سیستەمی کۆن ناگرێتەوە.

دەوڵەتە ئەمڕۆییەکانی ئەفریقیا خاوەنی ستراکتورێکی ئاڵۆزی چینایەتین. لەلایەکەوە ئەوان نوێنەرایەتی پەیوەندییەکانی نێوان شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری و پێش سەرمایەداری دەکەن، لەلایەکیتریشەوە (بەداخەوە بۆ شیکاریستەکانی سیاسی) ستراکتۆرە ئاڵۆزەکەیان لە سیستەمی چینە سیاسەکاندا رەنگی داوەتەوە.

## روانگەیەکی تەواو مەیلدار بە چینی کۆمەڵایەتی لە ئەفریقیادا:

ئەفریقیاناسەکان هەوڵیانداوە راڤە و شیکردنەوەی مامەڵەی نێوان شێوازەکانی بەرهەمهێنان (لەم کیشوەرەدا) بکەن و زۆرترین کارە رۆشنبیرانەکەشیان بە ڕەچاو کردنی ئەم بابەتە بووە. ئەگەرچی سەرەڕای گشت هەوڵە زانستییەکان، ئێستاش پرسیارگەلی زۆر گرنگ ماون. بۆ نموونە پرسیارگەلی لەم چەشنە کە ئایا گشت ئەم تیورییانەی مارکسیستی دەتوانن گشت راستییەکانی مامەڵەکانی سیاسی لە سەردەمی دوای کۆلۆنیال لە ئەفریقیادا روون



بکەنەوە؟ پێویستە بزانین لە ئەفریقیا ململانێیەکی چینایەتی سادە لەنێوان چینی بۆرژوا و پرۆلتاریادا بوونی نییە، کەواتە ناوەرۆکی ململانێ لە کیشوەری ئەفریقیادا چییە؟ لە درێژەی ئەم بەشەدا هەوڵ دراوە کە بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە و دەستنیشانکردنی گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی وڵاتانی ئەفریقیا و هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکانی ململانێ لەنێوان ئەم گرووپانەدا، بابەتی چینی کۆمەڵایەتی لە ئەفریقیادا روون بکرێتەوە.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە سەرووتر لە دوکتۆرێنی مەیلدار و سەختی مارکسیزم بجوڵێینەوە. دەبێ ئیدەکانی مارکس لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا بگونجێندرێت و سەرلەنوێ دابرێژرێتەوە. کۆدەنگییەك بۆ بەکارهێنانی بابەتە باسکراوەکانی سەرەوە بوونی هەیە. بەڵام مارکیسزم ئەم پرەنسیپە گرییانە دەکات کە لە ئەفریقیادا هێشتا چینەکان (بەهۆی گوزەران لەنێوان شێوازەکانی بەرهەمهێناندا) لە دۆخی پێ گرتندان. بێگومان یەکگرتنی چینایەتی و هۆشیاری چینایەتی (بابەتێکی) ئاڵۆزە. ئەگەرچی گوماناویترین تیورییەکان، تیورییە نامارکسیستەکانن. زۆرێك لەو بڕوایەدان کە مودیلە گەورەکانی ستراکتۆری ئەوروپایی لە شیکردنەوەی چینایەتیدا لەبری ئەوەی کە سوودمەند بن زۆرتر وەك لەمپەرێك بۆ ئەفریقیا کار دەکات. ئەمانە هەوڵی روونکردنەوەی هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی و دانوسانی نێوان نوخبە و گرووپەکان دەدەن.

ئەگەرچی ئەم بابەتە راستە بەڵام جێی گومان نییە کە بە دەرەنجام نەگەیشتنی جەبری ئابووری لە هەندێ ژینگەی کۆمەڵایەتیدا دەبێتە هۆی کەمڕەنگ کردنەوەی ئەم راستییە. کەواتە بۆ پێناسەکردنی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان چوارچێوەیەك پێویستە، مومکینە ئەم بابەتانە زۆرتر وەسفکردنی ئیدەکانی مارکس دەربارەی بارودۆخی ئەفریقیا بێت.

## گرووپە کۆمەڵایەتییە بەرجەستەکانی کۆمەڵگای ئەفریقیا

لێرەدا ئایدیای ماکس ڤێبر بۆ دیارکردنی چینە کۆمەڵایەتییەکان سوودمەندە. ئەگەرچی ئەم روانگەیە لێکۆڵەران لە ئابوور و کاروباری پەیوەیست بە شێوازەکانی بەرهەمهێنان دوور دەخاتەوە، بەڵام پرسەکانی دەسەڵات و  پرسەکانی پێگەی کۆمەڵایەتی گەڵاڵە دەکات.

بەپێی ئایدیاکانی کارکردگەرایی ستراکتۆری چینە پێکەوە گرێدراوەکان دەکرێ پیشە و دەرامەتیش گرنگ بن. زیاد لەمەش، بە میتۆدی واقیعی و ئەزموونی توێژینەوە لەسەر گشت چینەکان دەکات. کاتێك کە لە کۆمەڵگای ئاڵۆزی ئەفریقیادا دەستنیشان گرووپە

کۆمەڵایەتییەکان دەکەین، ئەم بابەتە بەووردی لە بەشی داهاتوودا لە خشتەی ١-٥ دەخرێنەڕوو.

لە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیادا لە سەردەمی سەربەخۆیی، بە بەرفراوانی گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی هاوشێوە دەبینرێن. لە لوتکەی ئەم قوچکەدا نوخبەیەکی خوێندەوارەی بۆرۆکرات و شارەزا دێت. ئەمانە هەر ئەو ئەفریقییانە بوون کە لە یاساکانی کۆلۆنیال زۆرترین بەهەرەیان برد و سەرلەنوێش بەرژەوەندییەکانیان وەك کەسانێك کە زۆرترین و نزیکترین پەیوەندییان لەگەڵ دامەزراوە دەوڵەتییەکانی دوای کۆلۆنیالدا هەیە، ڕێکیان خستەوە و پێناسەیان کرد.

دەوڵەتە ئەفریقییەکان خاوەن چینی سەرمایەگوزاری بازرگانیش بوون کە شوێن پێی قایمیان لە بازاڕی سەرمایەداریدا کردەوە. ئەمە لەکاتێکدایە کە ئەم گرووپانە لەلایەن ڕژێمە کۆلۆنیالەکانەوە دروستکرابوون. زیاد لەمەش گرووپ و ڕێبەرە سوننەتییەکانیش (لە ئەفریقیادا) بوونیان هەبوو کە بۆ پاراستنی دەسەڵاتەکەیان، لەگەڵ کۆلۆنیال خۆیان گونجاند یاخود لە حکومەتی کۆلۆنیالەکان سوودیان وەرگرت. لە خوارووی ئەم پلەبەندییە، کرێکاری کانەکان، پیشەسازییە بچووکەکان یاخود کەرتی گواستنەوە دێت. زۆربەی هەرە زۆری ئەفریقییەکان لە سەردەمی سەربەخۆییدا وەرزێر (جووتیار) بوون کە چالاکییە ئابوورییەکانیان لە کێڵگە بچووکەکاندا بوو. ئەو فاکتەرانەی کە ناوەڕۆکی سیاسەتی دوای کۆلۆنیال ئاشکرا دەکات لە ڕێگەی چونێتی پەیوەندی نێوان گرووپە کۆمەڵایەتییەکاندا دیار دەکرێت.

## وەرزێرەکان:

لە کۆمەڵگاکانی ئەفریقیادا، ژمارەی وەرزێرەکان لە ژمارەی کرێکاران زۆرترە و دەکرێ وەك کۆمەڵ (mob) ناو بنرێن. تیۆدۆر شاینن، وەرزێرەکان وەك بەرهەمهێنەرە بچووکەکانی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان ناو دەبات کە بە ئامرازی ساکار و کارکردن لەگەڵ خێزانەکانیاندا بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بۆ کڕیار و لەپێناو جێبەجێ کردنی بەڵێنەکانیان بە دەسەڵاتدارانی سیاسی و ئابووری کار دەکەن.

کە واتە وەرزێرەکان چینێکی تایبەتن کە چالاکی ئابووری سەرەکییان، فەراهەمکردنی پێداویستییە سەرکییەکانە لە کێڵگە بچووکەکاندا و گردبوونەوەی کۆمەڵایەتییان لە کۆمەڵگای لادێیدایە. داب و نەریتی کۆمەڵایەتییان هێمای ئەوەیە کە ئەم خەڵکە دەست گەیشتنی



ئازادانەیان بۆ زەوی (کشتوکاڵی) هەیە. لەم ڕووەوە ئەوان بۆ بەرهەمهێنان پشت بەخۆیان دەبەستن. کەواتە بەمەبەستی مامەڵە کردن لەگەڵ بازاڕی کاپیتالیستدا دەتوانن پێداویستییەکانیان سنووردار بکەن. ئەگەرچی وەرزێرەکان بە هۆی وابەستە بوونیان بەو شتەی کە ناتوانن لە کێڵگەکانیاندا بەرهەمی بێنن (وەك ڕۆن بۆ خۆراك، نەوت بۆ چرا، تێچوونی قوتابخانە) یان بۆ فەراهەمکردنی خواستنەکانی دەسەڵاتی سیاسی (وەك باجدان) دەچنە ناو بازاڕدا.

پشت بە خۆ بەستن هێزی شاراوەی چینەکان بۆ چەوساندنەوەیان لەلایەن چینەکانیتر کەم دەکاتەوە، بەڵام چونکە وەرزێرەکان ڕێژەیەکی زۆر لە دانیشتوانی ئەفریقیا پێك دێنن لەلایەن چینەکانیترەوە ئەوان لە پلەبەندی کۆمەڵایەتیدا دەبن بە ئامانجی سەرەکی چەوساندنەوە. وەرزێرەکان بە هۆی ئەوەی کە مەودایەکی زۆرتریان لەگەڵ حکومەت هەیە، بۆیە زیانمەندترن (واتە زۆرتر تووشی قەیران دەبنەوە). ئەوان دەستگەیشتنێکی کەمیان بە دامەزراوە حکومییەکان و ئەو حکومەتانەی کە ئەم دامەزراوانەیان بە دیاری هێناوە، هەیانە. بە هۆی زۆری گرووپە کۆمەڵایەتییە چەوسێنەرەکان، بڕواگەلی تەقلیدی و ڕزگاریخواز، چینێکی پارێزگاری لە وەرزێرەکان دروست کردووە. لە ئەنجامدا بەڵگەگەلی کەم لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال سەبارەت بە مۆبیلیزە کردنی وەرزێرەکان وەك چینەك بۆ بەرنگاربوونەوەی چینی دەسەڵاتدار، لە بەردەست دایە. دەکرێ تێکۆشانی لیبرالی لە زیمبابوا و موزامبیك ڕیزپەر بکرێ. بەڵام بە بڕوای بزاڤێکی شۆڕشگێڕانەی وەرزێری وەك ئەوەی کە لە چین و ڤیەتنام لە هەمان سەردەمدا ڕوویدا، بوونی نەبوو. کۆلین لیز لەو بڕوایەدایە کە: (بۆ ئەوەی کە بتوانن شایەتی شۆڕشی وەرزێری بن پێکهاتەی حکومەتی ستەمکاری و هەژاری و نەهامەتییە کە دەتوانێ وەرزێرێکی شۆڕشگێڕ دروست بکات).

باشترین ڕێگەی هاوبەش بۆ وەرزێرە ئەفریقیەکان بۆ تولەسەندنەوە لە چەوسێنەران ئەوەیە کە هەوڵ بدەن لە ڕێگە مەترسیدارەکان خۆ بپارێزن، هەروەك چۆن سەرچاوەی بەرهەمهێنانی وەرزێرەکان کێڵگەیە، ئەمە دەکرێ لە ڕێگەی بازاڕی سەرمایەداریشەوە وێنا بکرێت. بۆ نموونە ئەگەر باجی دانراو لەلایەن حکومەتەوە بۆ سەر داهاتی کرێکار یان بۆ سەر باجی کاڵا زیاد بکرێت یان نرخی کاڵاکان لە بازاڕدا بەرز بکرێتەوە وەرزێرەکان بە ئاسانی لەم بارودۆخە ڕزگار دەبن. ئەوان بە پشت بەستن بە بەرهەمەکانیانەوە دەگەڕێنەوە بۆ دۆخی سەرەتاییەکەیان یاخود سوود لە دەرامەتە نافەرمییەکان وەردەگرن. هەڵبەت هەروەك لەبەشی دەیەمدا باس دەکرێت، لە دەیەی ٨٠ و ٩٠ لە دەرەنجامی ڕووخانی حکومەتەکان یاخود نزیك بوونەوە لە ڕووخان، کۆمەڵی وەرزێرەکان (لەگەڵ دانیشتوانی شارەکان) تا ڕادەیەك لەم بارودۆخە ڕزگار بوون.

ئەگەرچی هەندێ هەلومەرج هەن کە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، دەرفەتگەلێکی بۆ وەرزێرەکان رەخساندووە و وەرزێرەکان دەرامەتی بەدەست هاتوو لە کێلگە بچووکەکان تێکەڵ بە سەرچاوە دەرەکییەکانی کردووە و لەم رێگەیشەوە درێژەی بە ژیان داوە. هەروەها، هەم دەولەتە کۆلۆنیالەکان و هەمیش دەولەتەکانی دوای کۆلۆنیال هانی ئەم کارەیان داوە و زۆربەی جووتیارانی ناچار بەدەست هەلگرتن لە سەرەکیترین رێگەی ژیانەکەیان کردووە. بۆ نموونە، ئەو باجانەی کە لەلایەن حکومەتەوە دانراون، وەرزێرەکانی بەناچار بەرەو بازاڕی سەرمایەداری ئاراستە کرد، چونکە وەرزێرەکان بۆ دانی ئەم باجانە، ناچار بە فرۆشتنی کرێکارەکەی وەك کرێکاری بیانی و هەروەها ناچار بە چاندنی کەرەستەی سەرەتایی لە کێڵگەکەی کرا. چونکە هێشتاش بەرگریکردن لە نەچوون بۆ ناو (سیستەمی) ئابووری سەرمایەداری بوونی هەبوو، گوشاری زۆرتر دەخراسەر وەرزێرەکان. بۆ نموونە بە درێژای قۆناغی کۆلۆنیال لە کۆنگۆی بەلجیکیا و موزامبیك هێزی کار، بە زۆر (اجباری) کرا و جووتیاران ناچار بوون کە بۆ ماوەیەك واز لە کێڵگەکانیان بهێنن بۆ ئەوەی کە کارە بە زۆر دارێژراوەکانی دەولەت جێبەجێ بکەن. شێوازکانی دوای کۆلۆنیالەکانی خولقاندنی هێزی کار توندوتیژی کەمتری هەبوو. ئەگەرچی چەندین وڵات ئەم شێوازەیان پیادە کرد و خاوەندارە بچووکەکانی ناچار بە بەکارهێنانی بەشێك لە زەوییەکانیان بۆ بەرهەمهێنانی، بەرهەمی خاو بۆ بازاڕ کرد. لە زاراوەکانی زانستیدا، جووتیاران خۆبەخۆ بەرەو شێوازی بەرهەمهێنانی پێش سەرمایەداری ئاراستەکران و لەهەمبەر ئابووری مودێڕنیش رووبەڕووی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری بوونەوە.

هەڵبەت بەرژەوەندییەکانی چینی دسەلاتدار بە پێویستی دەزانی کە وەرزێرەکان لەنێوان شێوازی بەرهەمهێنانی نوێ و کۆندا جێگیر بکات. چونکە ئەم بابەتە دەرفەت بە سەرمایەدارییی دەدات کە کرێی کاری کەمتر بە کرێکارە کۆچبەرەکان بدات. بە واتایەکیتر خاوەندارانی کان و زەوییەکان ئەم راستییەیان دەزانی کە وەرزێرەکان بەمەبەستی بەرگری لە خۆ کردن و سەربەخۆبوون لە کێڵگەکانی خۆیان کار دەکەن (ئەو کێڵگانەی کە لە نەبوونی ورزێر لەلایەن خێزانەکەیەوە دەچێنرا).

لەو رووەوە کە جووتیاران خاوەنی ئەم زیادە سەرچاوەیە بوون کە لە دەرەوەی خاوەندارێتی و ساماندا بوون بۆیە کرێی کارەکان لە ئاستێکی خواروو رادەگیرا. ئەگەر ئەوان چینێکی کلاسیکی کرێکاری بوانا تەنیا هێزی کارەکەیان بۆ فرۆش هەبوو و هیچ ئامرازێکیتریان بۆ فرۆش نەبوو. ئەوکات بەرزکردنەوەی ١/٤ حەقدەست بە پێویست دەزانرا لە ساڵانی ٥٠دا



کرێکارە کۆچبەرەکانی ئەفریقیایی نیوەی داهاتەکەیان لە کاری بەردەوام لە پیشەسازییە تایبەتییەکاندا (خصوصی) بەدەست دێنا و ١/٤ ی هێزی کاریان پێکدێنا. جیاوازی لەنێوان حەقدەستی هێزی کاری کاتی و حەقدەستی هێزی کاری بەردەام تا ئەمڕۆکەش هەر بەردەوامە.

بە پۆختی، دەکرێ پێناسەی جووتیار بکرێ بە پشت بەستنیان بە کێڵگەی کشتوکاڵی بچووك. ئەگەرچی ئەندامانی خێزان هەوڵ دەدەن بۆ بەدەستهێنانی داهاتی زۆرتر لە رێگەی فرۆشتن و ئەو بەرهەمە خاوانەی کە بەرهەمیان هێناوە. کەواتە هەندێ لە وەرزێرەکان هەنگاوەکیان لە ئابووری تەقلیدی و هەنگاویتریان لە ئابووری سەرمایەداری هاوچەرخدایە و ئەمەش دەبێتە هۆی دروست کردنی چینی رەعیەت.

## کرێکاران:

هەروەك بینرا جیاوازی سەرەکی نێوان ئەوروپا و ئەفریقیا نەبوونی کۆمەڵی پرۆلتاریا بۆ پێکهێنانی چینەکانە. ئاستی پیشەسازی بوون بە تەنیا بەس نییە بۆ پێکهێنانی چینی کرێکار کە زۆرینەی دانیشتوانی دەولەت لە خۆ دەگرێت.

دەکرێ ئەفریقیا نموونەیەکی باش بێت بۆ درز تێکەوتن لە هۆشیاریی چینی کرێکار. بۆ نموونە دەکرێ ئاماژە بە کاری رێك خراو لەنێوان کرێکارانی کانەکان لە زامبیا و کرێکاران لە داروئیسلام و کرێکارانی رێگای شەمەندەفر لە غانا بکەین. بەلام ئەم وێنەیە رەنگدانەوەی چەمکی چینی کۆمەلایەتی نییە. هەڵبەت پێگەی باشی ئەم کرێکارانە، دەیانگۆڕێت بۆ (ئۆریستۆکراسی کار) نە بۆ کرێکارێك. ئەوان بە بەراورد لەگەڵ هاولاتییە وەرزێرەکانیان خاوەنی ئەمنێکی تاڕادەیەك سەقامگیرکراو لە دامەزراندن (لە دام و دەزگای حکومی) و ئاستێکی داهاتی بەرزن. بەرژەوەندییەکانی بەرقەرار، چینی کرێکاری ئەفریقیای کەمتر هان دەدات کە دۆخی بەرقەرار بخەتە ژێر پرسیارەوە، چونکە چینی ئەوان لە دوایین پێگەی پلەبەندی کۆمەلایەتیدا نییە.

تەنیا لە وڵاتی باشووری ئەفریقیا جێگەیەك کە بزاڤی یەکێتی بازرگانی رۆڵێکی گرنگی لە شەڕ دژی ئاپارتاید لە خۆ نیشاندا، پرۆلتاریا وەك مۆدیلێکی هاوشێوەی مۆدێلی مارکیستی سەریهەڵدا، ئەمەش لە ئەنجامی شۆڕشی پیشەسازی لە ئەفریقیادا بوو کە لە شوێنەکانیتری ئەم کیشوەرە رووی نەدا. بەڵام لەم وڵاتەدا هێشتا ژمارەیەك لە کرێکاری کۆچبەر هەن کە بە پشت بەستن بە خێزانەکانیانەوە لە (هۆملەند)ەکاندا، هەندێ لەپێداویستییەکانیان دابین دەکەن.

## بۆرژوازی بازرگانی:

بۆرژوازی بازرگانی ئەفریقیا نزیکترین گرووپی کۆمەڵایەتی لەم کیشوەرەدایە کە دەتوانرێ لە ڕێگەیەوە ئاماژە بە بیرۆکەی مارکس سەبارەت بە بۆرژاوزی کلاسیك بکەین. ئەوان زۆرتر گرووپی بازرگانی کردن بوون کە سەرەڕای سنووردارکردنی بازرگانی کە لەلایەن وڵاتە کۆڵۆنیالکار و ولاتانی دوای کۆڵۆنیالەوە سەپێنرا بوو، گەشەیان کرد. دەستتێوەردانی کاپیتالیزم لە کێڵگە بازرگانییەکانی بچووك و کارگە پیشەسازییەکانی ئەم کیشوەرەدا، دەبینرێت بەڵام بە بەراورد لەگەڵ کۆمەڵگای بازرگانی ڕێژەیەکی کەمە.

ئەم بازرگان و جووتیار وخاوەن کارگەکان سەرچاوەگەی بەرهەم هێنراوەکەیان بەکار دەهێنن بەڵام تا ئێستاش بۆ ئاستی بۆرژوازی بوون (بە مانا گشتییەکەی) گەشەیان نەسەندووە. بۆیە دەبێ زۆرینەی ئەم چینە وەکو بۆرژوازی بچووك وەسف بکەین. ئەمانە تەنیا خاوەنداری بچووکن کە لە چەوساندنەوەی چینەکانیتر تواناییان سنوورداره. ئەم چەوساندنەوەیەش تەنیا فرۆشتنی بەرهەمەکان لە کۆمپانیاکاندایە. بۆیە دەسەڵاتی ئابوورییان سنوورداره. چونکە دەبێ سەرەتا زۆربەی کاڵاکان لە بازاڕەکانی دەرەوە دەستەبەر بکرێن.

لە زۆرێك لە وڵاتانی ئەفریقیادا بۆرژوازی بازرگانی زۆرتر لە نەژادی نائەفریقین. بۆ نموونە لە ڕۆژئاوای ئەفریقیا، بازرگانە لوبنانییەکان ناودارن لە کاتێکدا بازرگانە ئاسیاییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیادا هێزی باڵادەستن. توێژینەوەیەك لە ساڵی ١٩٨٠دا، لە کیشانگالی نیشانیدا کە نیوەی خاوەندارانی بازرگانی لە کۆنگۆی کینشازا، بازرگانە یۆنانی و ئاسیاییەکانن. کۆمەڵگا کۆچبەرنشینەکانی پێشوو وەك وڵاتی باشووری ئەفریقیا و زیمبابوا وینەیەکی هاوشێوەی هەیە و ژمارەیەك لە پیشەسازییە گەورەکان و زەوییە گەورەکانی بازرگانی لە ژێر خاوەندارێتی ئەوروپییەکاندایە.

لە سەرتاسەری ئەم کیشوەرەدا، هەندێ لە سەرمایەگوزارە ناخۆجێیەکان بە ڕێژەیەکی زۆر لە کێڵگەکانی کشتوکاڵیدا هەن، بەڵام تەنانەت ئەو کاتەش کە ئەم گرووپە دەچنە پاڵ هاوکارە ئاسیاسی و ئەوروپییەکانیانەوە، بۆرژوازییەکی بەهێزی ئابووری یەکسان بە چینی دەسەڵاتدار پێك نایێنن. لەوانەیە بۆرژوازی بازرگانی بەشێك لە چینی دەسەڵاتدار پێك بێنێت، بەڵام پێگە لاوازەکەی نیشان دەدات کە پێویستە ئەفریقیاناسان بەدوای گرووپگەلی بەڕاستی بەهێز لە کۆمەڵگەی ئەفریقیادا بگەڕێن.



## بۆرژوازی بۆرۆکراتیك:

هەروەك پێشتر ئاماژە پێکرا دەبێ ئەفریقیاناسان بە مەیلدارییەکی زۆرترەوە ڕەچاوی چەمکی چین بکەن. ئەوان ناچاران کە بە وردی ئەم گوتەیەی ماکس ڤێبر بە کار بهێنن. ئەو ئاماژە دەدات کە "لە ڕەهەندی ئابوورییەوە، دەسەڵات تەنیا لە ڕێگەی دەسەڵاتی سیاسییەوە پێناسە ناکرێ بەڵکو بە پێچەوانەوە مومکینە سەرهەڵدانی هێزی ئابووریش هەڵقوڵاوی بوونی هێز لە بوارەکانیتردا بێت". دواتر ئەم پرسە لەلایەن نیومارکیست و لیبرالەکان کە لە سەردەمی مارکسەوە بنیاتنەری قۆناغەکی نوێ لەشیکردنەوەی چینایەتی بوون، بە باشی بەکارهێنرا. ئەم پسیۆرانە باس لەوە دەکەن کە کارەکەی مارکس بە تەواوی کەمکردنگەرایانەیە، هەروەك نیکۆلۆس پۆلانزاس دەڵێت: (شیکردنەوەی کلاسیکی مارکسیست هەر لە سەرەتاوە گرفتاری ئابوور بووە. پەیڕەوی کامڵی پێکهاتنی چین لە بابەتی جەبری ئابووریی زۆرێك لە فاکتەرە سیاسییەکانی گرنگ بەرجەستە دەکات). پۆلانزاس دەڵێتەوە کە: (ئەم فاکتەرە سیاسییانە دەتوانن قۆناغگەلێك لە مێژوودا بە بوون بهێنن بە تایبەتیش کاتێك کە چینی ئابووری باڵادەست لە خستنە ژێرکونترۆڵی دەوڵەت بە تەواوی شکستی خواردبێت. بەم پێیەش خاوەندارانی سەرچاوکانی بەرهەمهێنان، مەرج نییە چینی دەسەڵاتدار بن. لەبری ئەمەشدا مومکینە نوخبەیەکی سیاسی کونترۆڵی کاروبارەکان بگرێتە دەست). لەوانەیە دەرفەتە هەڵقوڵاوەکان لەم ڕووداوانە لە زۆرێك لە قۆناغەکانی ئالۆزی پەیوەندی کردندا (کاتێك کە بۆ پێکهێنانی چین زووە، یاخود کاتێك کە چین بەرەو نەمان دەچێت) بەرەو زیاد بوون بچێت.

بۆ دۆزینەوەی چین لە ئەفریقیادا هێشتاش عەقڵانی دەبێت کە بە جیددی پشت بە کاری مارکس ببەستین. بە گشتی هەنوکەش گرووپە باڵادەستەکان پێگەیان بۆ چەوساندنەوەی کۆمەڵی جەماوەر بەکاردێنن و بە تێچوونی خۆیان سەرمایە کەڵەکە دەکەن. خاڵی گرنگ ئەوەیە کە لەوانەیە نوخبەی دەسەڵاتدار لە هێزی سیاسی، زۆرتر لە هێزی ئابووری بە مەبەستی دەست گەیشتن و پاراستنی پێگەی لە دەسەڵاتدا سوود وەرگرێت. لەم ڕووەوە ئەستینلاو ئۆسۆ نەتەنیا ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی وەك ڕووەی باڵادەستی چین پێناسە کرد بەڵکو ئامرازی بەکاربەر و ئامرازی سەرکوتیشی پێوە زیاد کرد.

ریچارد سکلار ڕاستەوخۆ تیۆری ئۆسۆسکی سەبارەت بە وڵاتانی ئەفریقایی بەکار برد. سکلار نیشانیداوە کە پەیوەندی چینی دەسەڵاتدار زۆرتر لەگەڵ قەڵەمڕەوی سیاسیدایە تا

قەلەمڕەوی ئابووری. پێویست نییە نوخبەی دەسەڵاتدار خاوەنی سەرچاوەکانی بەرهەمهێنان بێت بەڵکو دەکرێ گرووپێك بێ کە کونترۆڵی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بکات. بە واتایەکتیر چینێکی پێشکەوتوو، لە رووی سیاسییەوە، لەبری بە دەستەوە گرتنی زیادەیی ئابووری دەسەڵاتی سیاسی بە دەستەوەیە. ئەم چینە خۆی پشکێکی کەمی لە بەرهەمهێنانی زیادەدا هەیە بەڵام ئێستا ئەو توانایيەی بەدەست هێناوە کە هەندێ سەرمایە بۆ ئەندامەکانی کەڵەکە بکات. ئەگەر دەسەڵاتی سیاسی لە دەستنیشانکردنی چینە فەرمانڕەواکاندا گرنگی زۆری هەبێت، بەم پێیەش جێی سەرسۆرمان نییە کە ئەم چینە، حکومەت وەك جێبەجێکەری سەرەکی دەسەڵات بگرێتە دەست. هەڵبەت لە ساڵی ١٩٦٢ دا دۆمۆند باس لە جۆرێکی نوێ لە بۆرژوازی بە ناوی (بۆرژوازی خزمەتگوزارییە گشتییەکان)ی کردووە کە مارکس بە دەگمەن دەیتوانی پێشبینی ئەم جۆرە بۆرژوازییە بکات.

دەوڵەتی ئەفریقیا ئامرازێکە بۆ کەڵەکەکردن کە ئیمکاناتی مۆبیلیزەکردنی کۆمەڵایەتی فەراهەم دەکات، لەبری ئەوەی کە دەوڵەت کۆمیتەی جێبەجێ کردنی بۆرژوازی بێت لە رێگەی چالاکییەکانی بازرگانی (کەرتی) تایبەتەوە یارمەتی ئەم چینە بدات، خودی خۆ گۆڕدراوە بۆ ئامرازی سەرەکی کەڵەکە کردنی سەرمایە. کە واتە تاك لە ئەفریقیادا بە پەیوەندیکردن لەگەڵ دامودەزگاکانی حکومەت دەسەڵاتی زۆرتر بەدەست دێنن، لە دەرەنجامدا دەسەڵاتی سیاسی بۆ ئەوان بەرژەوەندی ئابووری بەدیاری دێنێت. بەم پێیەش سەرەڕای بوونی چینی دەسەڵاتداری بەرقەرار لە ئەفریقیادا، لەبری بوونی بۆرژوازییەکی ئابووری پیشەسازی یان بازرگانی، چینێکیتر بە ناوی بۆرژوازی بۆرۆکرات (هەروەها لە ژێر ناونیشانی دەوڵەتی بۆرژوازی رێك خراو یان کارگێڕی) بوونی هەیە.

ئەم بۆرژوازییە بۆرۆکراتیکە، لە جێگر، کاربەدەستانی حیزبی، ئەندام پەرلەمان، کاربەدەستانی ئیداری، کاربەدەستانی سەربازی، بەڕێوەبەرانی پیشەسازییەکان و هەر کەسێك کە بتوانێ سوود لە سەرۆکایەتیکردنی دەزگاکان وەرگرێت، پێکهاتووە. ئەم گرووپە وەك چینێك، لەگەڵ دەزگاکانی کۆلۆنیال پەیوەندیی مێژوویی هەیە. هەروەك لەبەشی دووەمدا باسکرا نوخبەیەکی ئەفریقیایی خوێندەوار لەلایەن دەزگاکانی کۆلۆنیالەوە وەك کاربەدەستی جێبەجێکار و پسپۆر بەکار هات و کاتێك کە گرووپ پێکهات، ئەوە بۆرژوازییە بچووکەی پێکهاتوو لە بۆرۆکراتەکان، پزیشکان و بەڕێوەبەرەکان بوو کە بناغەی بزاڤە ناسیۆنالیستییەکانی کە بوو بە هۆی سەربەخۆ بوونی ئەفریقیا، پێکهێنا و پاداشتەکەی لە



سەردەمی سەربەخۆییدا، دەست پێگەیشتینان بە پۆستی سەرکردە پێشووەکانی سەردەمەمی کۆلۆنیال بوو.

بۆرژوازی بۆرۆکراتێك بە شارەزاییەکی تەواوەوە، دەسەڵاتی سیاسی بۆ دەسەڵاتی ئابووری گۆڕی و ئەندامەکانیش نەتەنیا لە مووچەی حکومەت بەڵکو لە خزمەتگوزارییەکانی کارگێڕیش (وەك ئۆتۆمبیلەکان، تێچوونەکان، خوێندن بۆ مناڵەکانیان، چاودێری تەندروستی، سلفەی ئەرزان و تەنانەت بێ گەڕانەوی ئەم سلفەیە) سوودمەند بوون. هەروەها سەرەڕای مووچەی کارگێڕیش کە حکومەت بۆیان فەراهەمی کرد، ئەوان لە سەرچاوەیتریش بەهەرەمەند بوون وەك: هەڵگرتنی بەشێك لەو تێچوونەی کە بۆ خزمەتگوزارییەکانی دەوڵەت دەبوایا بدرێت (وەك بەڵگەنامەکانی تاوانە یاساییەکان، پاسپۆرت، تۆمارکردنی لە دایك بوون و مردن و هەر شتێك کە پێویستی بە پوول یان واژووی هەبێ). هەروەها هەل و دەرفەتی کۆکردنەوەی کۆمیسیۆن، بۆ خزمەتگوزارییە پێشکەشکراوەکانیش بوونی هەیە (دیارییەك، کە لەوانەیە پێکەش بە کەسێك بکرێ بۆ دابین کردنی گرێبەستێکی حکومی). لە زۆر بابەتدا بۆرۆکراتەکان، پارەیەکی زۆرتر لە رێگەی دەستی شاراوە (نایاسایی) بە بەراورد لەگەڵ مووچەکەیان بە دەست دێنن. سەرەڕای ئەمەش، مووچە حکومییەکان زۆر کەمە و فەرمانبەرەکانیش دەزانن کە ئەوان دەتوانن پێگەیان لە دەسەڵاتدا، بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن بەکار ببەن. بەم پێیەش لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالدا هاوکاریکردنی دەزگاگانی حکومەت، فاکتەرێکە بۆ بەرزکردنەوەی ستاندەری ژیان. بۆ نموونە (ئێندیڤال کۆفلە کالە) بەم دەرەنجامە گەیشتووە کە بۆرژوازی بۆرۆکراتیك دوو لە سەدی دانیشتوانی کامرۆن پێك دێنێت، لە کاتێکدا کە زۆرتر لە سێیەکی دەرامەتی نیشتمانی لەدەستدایە.

بە جێگیر بوونی دەوڵەت لە دەروونی بۆرژوازی دیموکراتیك، هۆشیاریی هاوبەشی چینایەتی پەیوەندی راستەوخۆی لەگەڵ زاڵ بوونی ئەم گرووپە بەسەر ستراکتۆری دەوڵەتدا هەیە و ئەمەش دەبێتە هۆی ململانێی نێوان بۆرژوازی بۆرۆکراتیك و چینەکانیتر. بۆ نموونە مومکینە بۆرژوازی دیموکراتیك و بۆرژوازی بازرگانی بەرەنگاری یەکتر ببنەوە، لە کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ، دەوڵەت بەکردەیەکی تاکتیکی هەڕەشەی سەر بۆرژوازییەکی بازرگانی سەربەخۆی پۆچەڵ کردەوە.

لە ٣٠ی نۆڤەمبەری ١٩٧٣ مۆبۆتۆ سێسێکۆ زۆربەی کەرتە تایبەتییەکانی کردە کەرتی نیشتیمانی و گشت کاروباری بازرگانە بیانییەکانی وەستاند. دواتر کونترۆڵی ئەم داراییانە

راستەوخۆ کەوتە دەست دەوڵەت و دەسەڵاتدارانەوە. هەروەها لە گشت ئەفریقیادا بۆرژوازی دیموکراتیك هەوڵیدا تا ئەو رادەیەی لە توانایدایە زۆرترین چالاکی ئابووری لە کەرتی تایبەتدا بەدەست بگرێت. (تا دەسەڵات بدات بە دەستی بۆرژوازی بازرگانی). لە بەشی دەیەمدا ئەمە دەخەینەڕوو کە چۆن بۆرژوازی بۆرۆکراتیك توانی لە رێگەی ناردنە دەرەوەی نایاساییانەی زیادەی ئابوور لە بەردەم گەشەسەندنی ئابووریدا لەمپەر بنوێنی. لە حاڵی حازردا، بۆرژوازی بۆرۆکراتیك گرووپێکە کە زۆرترین دەسەڵاتی لە سیاسەتی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالدا لەدەستدایە.

## ڕێبەرە سوننەتییەکان:

سەرهەڵدانی بۆرژوازی بۆرۆکراتیك وەك گرووپێکی باڵادەست لە کۆمەڵگای ئەفریقیادا، بە تەواوی دەسەڵاتی سوننەتی نەخستووەتەوە ژێر رکێفی خۆیەوە. هەنوکەش نوخبە کۆنەکان لە دەوڵەتی هاوچەرخی ئەفریقیادا رۆڵیان هەیە. بۆ نموونە سوازیلەند، سیستەمی پاشایەتی کە لە قۆناغی پێش کۆلۆنیال لەم وڵاتەدا بەرقەرار بوو، پاراستی. لە هەندێ لە وڵاتانی ئەفریقیادا ئەم خاڵە دەبینرێ کە سەرکردە سوننەتییەکان لە دەسەڵاتی مێژووییەکەیان وەك پردی پەڕینەوە بەرەو دەسەڵات لە سیستەمە سیاسییە هاوچەرخەکاندا بەکاری دێنن. ئەم سەرکردە سوننەتییانەش، گشت کاتێك بۆ مێژوو ناگەڕێنەوە. لەوانەیە ئەوان بۆ بەدەست هێنانی بەشێك لە دەسەڵاتیان پشت بە داب و نەریت ببەستن. بەڵام پشت بەستن بە رابردوو، دەبێتە هۆی پەراوێز بوونیان. هەرکە کاربەدەست و پاشاکان، خۆیان لەگەڵ سیستەمی حکومەتی کۆلۆنیالدا گونجاندووە، ئەو شتەی کە دەیانویست لە حکومەتی کۆلۆنیال بە دەستی بهێنن دەستەبەریانکرد و، لە دوای ئەوانیش وەچەی نوێ، بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات لە کۆمەڵگا دوای کۆلۆنیالییەکاندا، هەستان بە هاوچەرخ کردنی خۆیان. بۆ نموونە، هەندێ لە حکومەتە ئۆریستۆکراسییەکان رۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە بزاڤە ناسیۆنالیستییەکاندا کە کۆتایی حکومەتە ئەوروپییەکانی هێنا. لەم روانگەیەوە، فەیلەسووف ماندلا نەك تەنیا رێبەری کۆنگرەی نەتەوەی ئەفریقیا لە باشووری ئەفریقیا بوو، بەڵکو ئەو لە ترانسکی خێزانێکی بەهێزی خاوەن دەسەڵاتی سەرکردایەتی بە میرات بردبوو. لە سەردەمی دوای کۆلۆنیالدا، کاربەدەستان یان لە پارتە خۆجێییەکاندا، پۆستێکیان بەدەست هێنان یان بوون بە ئەندام پەرلەمان یان سەرکردەی حکومەتی خۆجێی. هەندێ لە سەرۆك وڵاتەکانیش پەیوەندی بەهێزیان



لەگەڵ یەکتردا هەیە. ئەم رەوتە وەك رەوتێکی بەهێز لە دەسەڵاتداریێتی لە سەردەمی پێش کۆلۆنیال، بە درێژای حکومەتی ئیمپراتوری و تا سەردەمی هاوچەرخیش بوونی هەبووە.

## سەرمایەگوزارانی کەرتی نافەرمیدا

گرووپێکیتر کە لە کۆمەڵگای ئەفریقیادا دروست بوو و بەرنگاری شیکردنەوەکانی مارکیستی بووە بە (سەرمایەگوزاری کەرتی نافەرمی) ناوی دەرکردووە. ئەم کەسانە لە رێگەی بازرگانییەکی کەمەوە ژیانیان دابین دەکەن و زۆرتر لەنێوان چالاکییە یاسایی و نایاساییەکاندا مەلەوەرە. نزیکترین دەستە بەم گرووپە لە نووسینەکانی مارکسدا (لومپن پرۆلتاریا)یە. مارکس ئەم زاراوەیەی بۆ وەسفکردنی چینی (پەستی کۆمەڵگا) واتە دزەکان، قەرەجەکان، دەرۆزەکەران و ئەو گرووپانەی کە لە گەیشتن بە هۆشیاریی چینایەتی بە دوورن، بەکاری هێنا.

لۆمپن پرۆلتاریا زاراوەیەی هەڵە و سووکایەتی پێکردنە کە بە کار دەهێنرێت. بەڵام ئەم گرووپە، گرووپێکی گەورەی کۆمەڵایەتییە کە لە گشت کۆمەڵگاکانی ئەفریقیادا پێگەی کۆمەڵایەتی خواروویان داگیر کردووە. ئەمانە هەوڵ دەدەن کە پێداویستییەکانیان لە رێگای کارە بەدیلەکان و ئەو چالاکییانەی کە سەرمایەی کەمیان پێویستە دابین بکەن. بۆ نموونە ژنانی لادێ، هەندێکیان کە لە دەست ستەمی لادێ رزگار بوونە لە شارەکانی ئەفریقیادا خەریکی کاری وەك کارکردن لە مەشروب فرۆشییەکاندا، فرۆشتنی کەلوپەلی خۆراك و مەشروب دروست کردن و فرۆشتنی کارە دەستییەکان، لەسەر شەقامەکانن.

ئەم جۆرە سەرمایەگوزارییە ژێر پێ خستنی یاسایە. بۆ نموونە بازرگانانی سەر شەقام زۆر کەم باج دەدەن یاخود مۆڵەتی بازرگانیکردنیان نییە. هەڵبەت بە گەشەکردنی کەرتی نایاسایی لە گشت وڵاتەکانی ئەفریقیادا، دەکرێ رێژەی قاچاق و بازاڕی رەشی ئاڵوگۆڕکاران (بازرگانان) و رێکلامکارانیش بەم کۆمەڵە کۆمەڵایەتییە زیاد بکەن. سەرەڕای نەبوونی هۆشیاری و رێکخستنی چینایەتی بە هۆی پێگەی لاواز و ناسەقامگیری ئەم چینە، ئەم جۆرە کەسانەی رۆڵی کارایان لە چالاکییە سیاسییەکانی دوای کۆلۆنیالدا هەبووە. ئەم خەڵکە هەژارە، بەتایبەتیش لە دەوروبەری شارەکاندا، زۆرتر وەك سەربازی بێ چەکی هەر جۆرە (شۆڕشێك بۆ نان) بوون کە لە دژی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی رێك دەخرا. لە خراپترین بارودۆخ و دواین رێگادا، یەکگرتنی ئەم گرووپە لەگەڵ کرێکار و خوێندکاراندا دەتوانی گورزێکی سیاسی بەرچاو لە جەستەی حکومەت بدات.

## بورژوازی نێودەوڵەتی:

تا ئێستا ئەم توێژینەوەیە کۆمەڵایەتییە زۆرتر گرنگی بە پانتای ناوخۆیی داوە کە تیایدا وەرزێرەکان و گرووپێکی بچووك لە کرێکاران کە لەلایەن بۆرژوازییەوە کە دەسەڵاتەکەی لە رێگە و میکانیزمی دەزگا دەوڵەتییەکانەوە بە دەستی هێناوە، دەچەوسێندرێنەوە. هەروەها کارکردن لە پەراوێزی کۆمەڵگای سەرمایەگوزاری (کەرتی نافەرمی و بۆرژازی بازرگانی) و بۆرژوازی بازرگانیدا کە بۆرۆکەڵگەلێکن کە لە بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی بۆ ململانێ کردن لەگەڵ چینی دەسەڵاتداردا شکستیان هێناوە، خوێندنەوەی بۆ کراوە. ئەگەرچی تا هەنوکەش ئەم کێشەیە لە ئارادایە کە هیچ یەك لەم گرووپانە لە ئاستێکی بەرزدا، خاوندارێتی سەرچاوەکانی بەرهەمهێنانیان لە دەستدا نییە تا بتوانن دەسەڵاتی سیاسی بگرنە دەست.

ئەم دوو گرووپە واتە بۆرژوازی بۆرۆکراتێك و بۆرژوازی بازرگانی پێکەوە بۆرژوازی نەتەوەیی پێك دێنن. بەڵام بە هۆی ئەوەی کە ئەم خاوەندارانە لە شیکردنەوەی مارکسیستیدا پێگەی بەرزیان هەیە، زانایانی ئەم قوتابخانەیە بۆ دۆزینەوەی چینێکی دەسەڵاتداری راستەقینە درێژە بە هەوڵەکانیاندا. زۆرێك وەها وێنا دەکەن کە بە هۆی راڤە و شیکردنەوەکان و هاوجووت بوون لەگەڵ تیۆرەکانی گەشە نەکردن و وابەستەیی بوون، گرووپی باڵادەستیان دۆزیوەتەوە. بەڵام ئەم نموونەیە بە دوای بۆرژوازی راستەقینە لە دەرەوەی ئەفریقیادا دەگەرێت.

تیۆرکانی وابەستەیی (**تبعية**) ئەوە دەخەنەڕوو کە خاوەندارە راستەقینەکانی سەرمایەی نێودەوڵەتی نەتەنیا لە ئەفریقیادا بەڵکو لە سەرتاسەری جیهاندا چینی دەسەڵاتدار پێك دێنن و، تیایدا کۆمپانیا و دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان رۆڵی باڵا دەگێرن. لەم رووەوە، ئەندامە خۆجێیەکانی بۆرژوازی نەتەوەیی لە جیهانی سێیەمدا، تەنیا جێبەجێکاران یاخۆد فەرمانبەرانی بۆرژوازی نێودەوڵەتین.

کاربەدەستانی وڵاتانی ئەفریقیا کۆکەرەوەی قەرزی رێکخراوە دەرەکییەکانن کە خاوەنی پشتگیری نێودەوڵەتین و پشکێکی کەمی سوودی خزمەتکردنەکەیان بەدەست دێنن. کۆمپرادۆرەکان لە خزمەت و ئاسانکاریکەری سەرمایەی دەرەکین کە ئەم کۆمپرادۆرانەش لە رێگەی  داهاتەکانی بەرژەوەندی نەتەوەیی بەڕێوەدەبردرێن. بەواتایەکتیر لەبری ئەوەی ئەوان رەچاوی ئەوە بکەن کە چ کارێك بۆ نەتەوەکەیان سوودمەندە، رەچاوکەری پێداویستییەکانی سەرمایەی نێودەوڵەتی و سەرمایەی خۆیانن. ئەمەش نیشان دەدات کە بۆچی بۆرژوازی نەتەوەیی، سەرەڕای ئەوەی کە خاوەنی ئامرازی بەرهەمهێنان نین بەڵام دەسەڵاتیان بە



دەستەوەیە. بۆرژوازی راستەقینە لە وڵاتانی سەرمایەداریدا جێبەجێ دەکرێت بەڵام لە جیهانی سێیەم سوود وەردەگرێت، ئەمەش لەکاتێکدایە کە بۆرژوازی نەتەوەی لە جیهانی ئابووردا تەنیا رۆڵێکی ناوبژیوانی دەگیرێت. کەواتە کۆمپرادۆرەکان لە جێبەجێکار و فەرمانبەرەکانەوە دەسەڵات بە دەست دێنێت نە لە خاوەندارێتی سەرچاوەکانی بەرهەمهێناندا.

قوتابخانەی وابەستەیی (تبعیە)، لە ساڵانی هەفتا و هەشتادا توێژینەوەیەکی بەرفراوانی سەربارەت بە چین لە ئەفریقیادا ئەنجامدا و ئێستاش دەستڕۆییەکی زۆری هەیە. ئەگەرچی لەم ساڵانەی دواییدا هەندێ لە ئەفریقیاناسان هەوڵیانداوە پێداچوونەوەیەك لەم توێژینەوانەدا بکەن.

ئەندامانی ئەم قوتابخانەیە بەمجۆرە بەڵگەندن دەکەن کە کەمبوونەوەی دەستڕۆیی بۆرژوازی نەتەوەیی وەك چینێکی کۆمپرادۆر لەوەوە هەڵدەقوولێت کە چینی کۆمپرادۆر رۆڵی خۆی لە دەستداوە.

شێکردنەوەیەکی ورد لە گرووپە باڵادەستەکانی خۆجێی بە پێویست دەزانرێ. پەیوەست کردنی وڵاتانی ئەفریقیا بە تێۆرییە گەردونییەکانی گەشە نەکردن هاوکێشەیەکی بەرفراوان دەخاتەڕوو. بەڵام تەنیا ئاماژەدان بە ناوی ئەفریقیا لە پەراوێزی سیستەمی بەرفراوانی سیاسیی نێودەوڵەتیدا دەبێتە هۆی هەڵخەڵەتاندنی ئەفریقیاناسان بۆ زانینی راستییەکان. چ جۆرە رووداوگەلێکی سیاسی بە هۆی ململانێ چینایەتییەوە روو دەدات؟ چ شتێك بووە هۆی دابەشبوونی بۆرژوازی نەتەوەیی؟ (بۆ نموونە ململانێی نێوان باڵەکانی بۆرۆکراتێك و بازرگانی).

هەروەها پرسیارێکیش سەبارەت بە ئاستی راستەقینەی دەسەڵاتی کۆمپرادۆرەکان لە ئارادایە، کۆمپرادۆرێك تا چ ئاستێك خاوەنی دەسەڵاتی سیاسییە؟

راستی ئەوەیە کە لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال دەوڵەتە پەراوێزکراوەکان، ستراتیژیگەلی گەشەسەندنی جیاوازیان هەڵبژاد کە تیایدا کەڵەکەبوونی سەرمایە بوو بە هۆی هاتنەدی سیاسەتی نایەکسانی (نێوان هاوڵاتیان) لە ناوخودی وڵاتدا. دەوڵەت پارتەکانی بازرگانیکەری گۆڕی و سەرکردە خۆجێیەکانیش، بەرنامەی سیاسی لێك جیاوازیان هەبوو، رێژەیەکی بەرچاوی دسەڵاتیش، بۆ نوخبەکانی حکومەتی فەرمانڕەوایە. هەڵبەت مومکینە بۆرژوازی نەتەوەیی لە دژی بەرژەوەندییەکانی سەرمایەداری نێودەوڵەتی کار بکات. بۆ نموونە چەندین وڵات لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالدا سامان و دارایی کۆمپانیا بیانییەکان کە لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەم وڵاتانەدا بوون، کرد بە سامانی نیشتیمانی.

لەم رووەوە بۆرژوازی ئەفریقیای وەك بۆرژوازییەکانیتر هۆگری بەدەست هێنانی بەرۆژەوەندی و پاراستنی پێگە و دەسەڵاتیەتی. ئەوان لەو هیوایەدان کە دەستیان بە بەرژەوەندییەکانی سەرمایەداری نێودەوڵەتی بگات، بەتایبەت کاتێك کە سەرچاوەی سەرمایەی ناوخۆیی سنووردارە. ئەگەر پێویست بێت ئەوان ئامادەن بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان، دەسەڵاتەکەیان لە دژی سەرمایەداری نێودەوڵەتی بەکاربێنن. هەروەها ئەوان ناچارن لە رێگەی سەرمایەداری نێودەوڵەتییەوە درێژە بە ژیان بدەن و لەگەڵ ئەم سیستەمەدا کار بکەن. بەڵام ئەم کارەش بۆرژوازی نەتەوەیی دەگۆڕێ بۆ چینێکی هەڵچوو، دوو روو و بێ دەسەڵات. بۆ تێگەیشتن لەم بابەتەش پێویستە پێشگریمانە نادروستەکان سەبارەت بە رۆڵی بۆرژوازی نەتەوەی لە ناو کۆمەڵگای ئەفریقیادا وەلانێین.

**خشتەی ١-٥ پوختەی بەش: گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی ئەفریقیا**

| گرووپی کۆمەڵایەتی | تایبەتمەندییەکان |
|---|---|
| **وەزرێرەکان**<br>بەرهەمهێنەرانی بچووکی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان و بەرهەمهێنەرگەلێك کە بۆ بژێوی خۆیان بەرهەم دێنن | • زۆرینەی دانیشتوان<br>• پشت بەستراو بە کۆمەڵگاگەلی بچووکی لادێیی<br>• سەرقاڵ بوون لە (بەرهەمهێنانی) کاڵا کشتوکاڵییەکانی پێویست<br>• خێزان یەکەی سەرەکی بەرهەمهێنانە<br>• پەیوەندی کەم لەگەڵ ئابووردا<br>• لە پێگەی خوارو و ستەم لێکراوی کۆمەڵگادان |
| **پرۆلتاریا**<br>داهاتەکەیان لە کۆمەڵگا کاپیتالیستییەکاندا لە رێگەی پشت بەستن بە فرۆشتنی کارەکەیان بە دەست دێت | • بەشێکی بچووك لە دانیشتوان پێك دێنن<br>• هێز کاری لادێیی بێکێڵگە<br>• هێز کاری شار (پیشەسازیی، کانەکان، گواستنەوە و...) |
| **کەرتی سەرمایەگوزاری نافەرمی**<br>کەسانێکن کە لە رێگەی بازرگانییەکی | • هێزی کار نافەرمی لە ئابووری فەرمیدا<br>• زۆرتر نایاساییی /کاری مەترسیدار |



| | |
|---|---|
| سنووردارەوە بژێوی ژیانیان دابین دەکەن (زۆرتر چالاکییە نایاساییەکان) | • زۆرتر نایاسایی/ بە بێ مۆڵەت<br>• فرۆشیاری سەر شەقامەکان<br>• ئاڵوگۆڕی دراو (درawی دەرەکی)<br>• قاچاقچییەکان<br>• دزانی بچووك<br>• لەش فرۆشەکان |
| **بۆرژوازی بچووك**<br>خاوەنداری بچووك کە بەشێکی کەم لە هێزی کار دەچەوسێنێنەوە یاخود بەشێکی کەم لە دەرامەتەکانی بە دەست هاتوو لە بۆرۆکراسی دەوڵەتیان لە بەردەستدایە | • زۆرتر پیاون<br>• پیشەسازەکانی سەربەخۆ<br>• جووتیارانی خاوەن کێڵگەی بچووك کە ژمارەیەکی کەم لە هێزی کار دادەمەزرێنن<br>• بازرگانی بچووك<br>• مامۆستایان<br>• سەربازەکان<br>• ئەوانەی کە لە خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان سوود دەبینن |
| **بۆرژوازی**<br>بۆرژوازی نەتەوەیی (چینی دەسەڵاتداری نەتەوەیی)<br>**أ. بۆرژوازی بازرگان**<br>بۆرژوازی کلاسیك کە لە توێژینەوە و کارەکانی مارکسدا وەك کۆمەڵگای سەرمایەداری رۆژئاوایی خوێندنەوەی بۆ دەکرێ<br><br>**ب. بۆرژوازی بۆرۆکراتیك (کارگێڕی)**<br>ئەم گرووپە کۆنترۆڵی ئامرازەکانی | • چینی دەسەڵاتدار<br>• زۆرتر پیاون<br>• بەشێکی کەم لە دانیشتوان<br>• زۆرتر لە کەرتی بازرگانی و کشتوکاڵیدا خەریکن تا لە کارگەکاندا<br>• سەرمایەگوزارەکان<br>• بازرگانەکان<br>• جووتیارە بازرگانەکان<br>• خاوەندارانی زەوی<br><br>• زۆرتر شارنشین<br>• خوێندەوار |

| | |
|---|---|
| بەرهەمهێنان دەکات و خاوەنی ئەم ئامرازانە نییە و پێگەیان بۆ گوشار خستنە سەر دەزگاکانی حکومەت لەپێناو کەڵکە کردنی سەرمایە بەکار دێنن. | • سیاسەتمەدار<br>• چینی سیاسی (ئەندام پەرلەمان، وەزیرەکان، کاربەدەستانی حیزبی و...)<br>• کاربەدەستانی باڵای کارگێڕی<br>• ئەفسەرە سەربازییەکان<br>• بەڕێوەبەرە گشتییەکان (وەك پیشەسازی نیشتیمانی<br>• پسپۆر (کەرتی گشتی) |
| **ج . بۆرژوازی کۆمپرادۆر** | • هەر بەشێك لە بۆرژوازی نەتەوەیی کە وەك فەرمانبەر بۆ بۆرژوازی نێودەوڵەتی کار بکات |
| **د. بۆرژوازی نێودەوڵەتی** سەرمایەداری نێودەوڵەتی پشت بەسترا و بە باکوور (ولاتانی پیشەسازی) کە لە ئابووری پەراوێزکراو و دەوروبەری و باشووری ئەفریقیا سوود وەردەگرێت. | • ئەم چینە بەپێی تیۆرییەکانی وابەستەیی- گەشەنەکردن، دوایین چینە<br>• دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی<br>• کۆمپانیا فرەرەگەزەکان |
| **فەرمانڕەوا سوننەتییەکان**<br>گرووپێك کە دەسەڵاتیان پشت بەستراو بە داب و نەریتەکان | • سەرۆك هۆزەکان<br>• کاربەدەستە پلە بەرزەکان<br>• کاربەدەستانی هەمیشەیی<br>• میرەکان<br>• پاشاکان و... |

**گرنگی شیکردنەوەی چین لە روونکردنەوەی سیاسەتی ئەفریقیا:**

هەروەك باسکرا، دەتوانرێ گرووپگەلی کۆمەڵایەتی بێ ژمار لە وڵاتانی ئەفریقیادا دیار بکرێن. بەڵام ئەم پرسیارە لە ئارادایە کە چۆن دەکرێ شیکردنەوەی چینەکان بۆ ئەفریقیا سوودمەند بێت؟



تا چ رادەیەك پەرەگرافە باسکراوەکان بە دروستی لە روونکردنەوەی سیاسەتی ئەفریقیا پشکدارن؟ بۆ زانایانی سیاسی کە زانیارییەکانیان زۆرتر پشتبەستراوە بە توێژینەوە لە کۆمەڵگاکانی رۆژئاوادا، ئەزموونی سەرەوە گرنگە. مودیلەکانی چینی سەرهەڵداو لە نموونەی رۆژئاوایی و، زۆربەیان مارکسیزمی، بەهەمان رادە کە لە (روونکردنەوەی) چۆنێتی سەرنەکەوتنیدا لە پێکهێنانی چینی کۆمەلایەتی لە ئەفریقیادا سوودمەندە، بۆ تێگەیشتن لە سیاسەتەکانی ئەفریقیاش کاریگەرە.

ئەم مۆدیلانە جیاوازی گرنگ لەنێوان چینە رۆژئاواییەکان و ئەوانەی کە لەم کیشوەردا، چینگەلێکیان دروست کردووە ئاشکرا دەکات. ئەگەرچی گشت شتەکان (تایبەت بەم چینانە) نگەتیف نین. هاوجووت بوون لەگەڵ تیۆری چینی کلاسیك یارمەتی ناسینی گرووپەکانی کۆمەڵگاکانی ئەفریقیا دەدات. هەروەها بە ئاماژە کردن بە پەیوەندی نێوان شێوازەکانی بەرهەمهێنانی پێش سەرمایەداری و لە سەرمایەداریدا، چینەکان دەخاتە چوارچێوەیەکی مێژووییدا.

ئێستاش ئەم راستییە لە ئارادایە کە ئەفریقیا مەیلی نییە بۆ چوونە ناو مودیلگەلێك کە زانایانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە شوێنەکانیتر بەکاری دێنن. شیکردنەوەی چینایەتی بەو مانایەیە کە کاروبارەکان ئاسانتر بکات. ئەگەر کۆمەڵگایەك بە تەنیا دوو چینی هەبێت، چینی بۆرژوازی و چینی کرێکار، کاری ئاکادیمیکی ئاسانترە. بەڵام راستی ئەوەیە کە تەنانەت لە وڵاتە سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکانیشدا کارەکە بەم سادەییە نییە. بەڵام لە ئەفریقیادا کاروبارەکان بە ئاڵۆزی دەمێننەوە. تەنانەت ئەگەر دوای ماوەیەکی کورت ئەم دوو چەمکە سەریان هەڵدابێت واتە لەبری دوو چین، جەماوەری ئەفریقیا بەسەر دوو چینی وەرزێر و پرۆلتاریادا دابەش بووە. لە کاتێکدا کە بۆرژوازەکان لە سێ بەشی جیاواز پێك هاتووە (بازرگان، بۆرۆکراتیك و نێودەوڵەتی) لقێك کە لە ئەفریقیادا دەسترۆیی بەرفراوانی هەیە، چینێکی بۆرۆکراتیکە کە بە خاوەن بناغەی کۆمەڵایەتی تایبەت بە خۆیەتی رۆڵی کۆمەڵگای مەدەنی کە مارکس باسی لێدەکات دەگێڕێت. لە هەندێ شوێن لەنێوان ئەم کۆمەڵەدا، شوێنێك بۆ دامەزرێنەران واتە سەرکردە سوننەتییەکان، خاوەنداران و سەرمایەدارانی کەرتی نافەرمی بوونی هەیە. سەرەڕای ئەمەش بیرۆکەگەلێك کە مارکس بە (هۆشیاریی درۆین) ناو دەبات (وەك وەفاداری ئاییینزای یا نەژادی) بەم وێنایەوە ( هۆشیاری درۆین) ئاڵۆزتر دەبێتەوە.

خالێك كە دەبێ پێی بگەین ئەوەیە كە هاوجووت بوونی ئەفریقیا لەگەڵ مۆدیلە كلاسیكییەكاندا هەڵبوەشێندرێتەوە و لەبریدا پێشوازی لە بیرۆكی گرووپە كۆمەڵایەتییەكان بكرێت.

ئەم رێبازە ئەلترناتیڤە، پشت بەستراو بەو راستییەیە كە بە دەگمەن گرووپە دەسەڵاتدارەكانی ئەفریقیا هاوشێوەن. مومكینە نوخبەی پارێزگاریكەر لە دەسەڵات وەك هاوپەیمانێكی فاكتەرە ركابەرەكان بێتە بەرچاو تا وەك چینەكی یەكانەی یەكگرتوو. بۆ نموونە لە زۆربەی ئاستەكاندا بۆرژوازی نەتەوەیی بەشێكە لە بۆرژوازی بازرگان و بۆرۆكراتیك. مۆبیلیزەكردن بەپێی شوناسە نەژادییەكان لە سیستەمە سیاسییەكانی ئەفریقیادا بەرچاون. كەواتە ململانێی ناوخۆیی لەگەڵ گرووپی دەسەڵاتداردا بوونی هەیە. هەندێ لە نوخبەكانی دەوڵەت بۆ مانەوە لە دەسەڵاتدا نوێنەرایەتی بەرژەوەندیگەلی جۆراوجۆر دەكەن و لەگەڵ گرووپی جۆراوجۆردا هاوپەیمانی دەبەستن. ئەم نوخبەیە پۆلین كردنی بەرژەوەندییە جۆراوجۆرەكان لەپێناو یەكبووندا بەكاردێنن. بەم پێیەش هەندێ لە وڵاتە ئەفریقییەكان بەهۆی گۆڕینی هاوپەیمانێتی لەگەڵ گرووپی دەسەڵاتداردا لەرزۆكن. ژمارەیەكی زۆر لە كودەتا سەربازییەكانی دەوڵەتانی ئەفریقیا لە قۆناغی دوای كۆڵۆنیادا هەڵقوڵاوی ئەم بابەتەن.

حەقیقەتی دەسەڵات ئەوەیە كە بۆچی هەندێ لە پسپۆرانی سیاسەتی ئەفریقیا لە ژێر كاریگەری پاڵنەری هەژمونیكدان؟ لەم قۆناغە دواییانەدا ململانێی چینایەتی تەنیا لەنێوان بۆرژوازی و پرۆلتاریا یاخود گرووپەكانی پێش سەرمایەداری و سەرمایەداری بوونی نەبووە. بەڵكو هاوكاریی و ململانێ لەنێوان گرووپەكان لەپێناو بەدەست هێنانی دەسەڵاتی حكومەت بووە. بەم پێیەش یەكێتی گرووپە كۆمەڵایەتییەكان پشتبەستراو بە یەكگرتنی چینایەتی نەبووە، بەڵكو پشتبەستراو بە مەیل بۆ هاوكاریی یان یەكێتی ستراتیژی بووە. ئەمەش لەپێناو دەستەبەركردنی زۆرترین رێژەی بەرژەوەندییەكان لە ئەنجامی هاوكاری یەكتر كردن بۆ لەناوبردنی حكومەتی فەرمانڕەوا و دەست گەیشتن بە بەرژەوەندییەكانی حكومەتی تازە دامەزراوە. لە ژێر ئەم چەشنە بارودۆخەدا سەركردە كۆمەڵایەتییەكان خوێندنەوەی یەكتر دەكەن تا بزانن كە ئایا گرووپە بەشداربووەكان دەتوانن لەگەڵ یەكدیدا هاوكار بن و لە قۆناغی دواتردا جڵەوی حكومەت بگرنە دەست. لەم رووەوە جان فرانسیس بایارا ئاماژە بە (وێكچوونی نوخبەكان) "assimiltion of elites" دەدات. گرووپە بەهێزەكانی كۆمەڵگا رێز لە پێگەی یەكتر دەگرن و هاوپەیمانییەكی نەچەندان ئاسان بە ناوی (بلۆكی هەژمۆنیك) پێك دێنن.



ئەندامانی ئەم هاوپەیمانییە و پێگەیان لەم هاوپەیمانییەدا بەردەوام لە گۆڕان دایە. بەڵام هەمووان ئەم راستییە دەزانن كە رووبەڕووی ململانێیەكی توند و مەترسی پشێوی سیاسی و ئەگەری لەدەستدانی دەست گەیشتن بە حكومەتی نوێن. هیچ كەسێك بۆ بەدەستهێنانی سەرمایە خوازیاری لە دەست دانی ئەم پێگەیە نییە بۆیە نوخبەكان ناچارن تا رادەیەك هاوكاری یەكتر بكەن. بایارت بەم دەرەنجامە دەگات كە كۆمەڵە (چین) كلاسیكییەكان، هەڵخەڵەتێنەرن. چونكە ئەوان بە ناسروشتییانە بەشە پێكهێنەرەكانی پارتگەلی ئەم بلۆكەی هەژمۆنیك گوماناوی دەكەن.

پەیوەندیی لەنێوان بەشە جۆراوجۆرەكاندا دامەزراوە و سنوورەكانی گرووپ لاواز و ناسەقامگیرن. بۆ نموونە شایانی وەبیرهێنانەوەیە كە چۆن بۆرژوازی بۆرۆكراتیك لە رێگەی كونترۆڵ كردنی ستراكتۆری دەوڵەت سامانی كۆ كردووەتەوە و گشت ئەم سامانە بۆ تێچوونی (پرۆژە) فریۆدەرەكان تەرخان نەكراوە، بەڵكو ئەندامانی بۆرژوازی دیموكراتیك لە پرۆژە بازرگانییەكاندا سەرمایەگوزاری دەكەن و پیشە بازرگانییەكان پێكدێنن و مۆڵكەكان دەكڕنەوە و پێگەی خۆیان لە دەوڵەتدا بۆ سوود وەرگرتن لە ئیمكانات بەكاردێنن. بۆ نموونە مومكینە بۆرژوازێكی بۆرۆكراتیك پارچە زەوییەكی حكومەت بۆ خۆی تەرخان بكات و لەڕێگەی پلان دانان و گفتوگۆ، لە بانكی حكومی بۆ دروست كردنی پرۆژە سلفە وەربگرێت. هەندێ لە بەڕێوەبەرییەكانی حكومەت بە سوود وەرگرتن لە پێگەی خۆیان لە ماوەی بەڕێوەبەر بوونیاندا ئیمپراتوری بازرگانی تایبەتی (خصوصی) و گرنگیان دامەزراندوە. ئەم جۆرەش چالاكیگەی سەرمایەگوزاری لەلایەن كاربەدەستانی حكومەتەوە، درزی نێوان ئەوان و ئەندامانی بۆرژوازی بازرگان لە بلوكی هەژمونێكی فەرمانڕەوادا بە نزمترین ئاست گەیاندووە.

پەیوەندی لەنێوان نۆجنەكانی تریش دروست بووە، بۆ نموونە لەنێوان سەركردە سوننەتییەكان و كاربەدەستانی جێبەجێكاری حكومەت، یاخود لەنێوان سەركردەكانی یەكێتییە بازرگانییەكان و وەزارەتی كار. هەروەها هاوپەیمانی فەرمانڕەوا مەیلی هەیە بۆ هاوكاریكردن لەگەڵ گشت كەرتەكانیتری كۆمەڵگا. بەپێچەوانەی زاراوەی "وێكچوونی نوخبەكان" كە بایارت ئاماژەی بۆ دەكات، ئەمانە هەر ئەو كەسانەن كە سواری هەمان مرسدس دەبنەوە و یاخود هەمان شامپاین دەخۆنەوە یان هەمان جگەرە دەكێشن و یاخود لە هەمان ژووری چاوپێكەوتنی فڕۆكەخانە، پێشوازی لە نوێنەرەكان دەكەن و خاوەنی ئاستێكی وەك یەك لە دەسەڵات و خاوەنی یەك ئاست بۆ لێك نزیك بوونەوە لە دەزگا حكومییەكانن. جێی سەرسوڕمان نییە

ئەگەر ئەم سەرکردانە نەتوانن لە بەرەو پێشەوەبردنی بناعەکانی چین کاریگەربن و لەم ڕێگەشەوە بازرگان، بۆرۆکرات، سەرباز، کاربەدەستانی بەرز، یەکێتییە بازرگانییەکان، دەلالە نەژادییەکان، ڕێکخراوی ژنان، خۆیان لەگەڵ نوخبەی فەرمانڕەوای حکومەت دەگونجێنێن و دەچووێنن.

## دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی:

بەڵگەکانی سەرەوە نیشاندەری ئەم ڕاستییەن کە چینی کۆمەڵایەتی بۆ تێزی سەرەکی ئەم پەرتووکە، واتە پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی فاکتەرێکی گرنگ و کاریگەرە.

لەوانەیە پسپۆران لە چۆنێتی شوناس و ناسینی ئەم گرووپانە ناکۆکییان هەبێت و هەروەهاش لەگەڵ ناوەڕۆکی دروست بوونی کۆمەڵایەتی (ئەم گرووپانە) کۆك نەبن. بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە ناکرێ کۆمەڵگاکانی ئەفریقیا بە کۆمەڵگاگەلی بێ چینی کۆمەڵایەتی وەسف بکرێن. هەرچەندەش نایەکسانی بوونی هەبێت.

بە داخەوە چینی سیاسی لە ئەفریقیادا ناتوانێ بۆ ئاستی ململانێیەکی سادە لەنێوان بۆرژواز و پرۆلتاریا دابەزێت. هەڵبەت ئەم بابەتەش مراکێش لە بەکارهێنانی چیندا وەك ئامرازی وەسفکردن کەم دەکاتەوە. ئەگەرچی ئەم ڕاستییە لە ئارادایە کە ئەم کیشوەرە کۆمەڵگا ئالۆزە و جۆراوجۆرەکانی لەخۆ گرتووە کە (ئەم کۆمەڵگایانەش) پەناگای چالاکی گرووپی جۆراوجۆرە. تەنانەت ئەوروپاش لە سەردەمێکی نە چەندان دووردا لە پەیوەندییەکانی سەرمایەداریدا، ڕەنگدەرەوەی مۆدیلی مارکس نەبووە. ئەگەرچی ئەم جیددییەتە، ڕێگە بە ئەفریقییەکان دەدات کە گرووپە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان لە ناو کۆمەڵگاکانی ئەفریقیادا بناسن. دواتر لەم پەرتووکەدا هەڵسوکەوتی نێوان ئەو گرووپانەی کە بەشی هەرە زۆری مێژووی سیاسی ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیالدا دروست کردووە، ڕوون دەکرێتەوە.

زیاد لەمەش هەنوکەش دەکرێت مۆدیلێکی سادە بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەفریقییەکان بەکار بهێنن و لە گرفتەکانی شیکردنەوەی مارکسیتی ڕزگار بن. لە کاتی سەربەخۆییەوە، ئەم کیشوەرە ململانێی نێوان دوو پارتی بە تەواو لێك جیاوازی بەخۆوە بینیوە. ململانێیەکی کۆن لەنێوان دەوڵەمەند و هەژارەکان کە لە سەرەتای ئەم بەشدا ئاماژە پێکرا. لەم بارەوە ململانێی لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیدایە. هەروەك چۆن خەڵکی غانا لەو بڕوایەدان کە "ژینگەی سیاسی ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیال بە دابەشبوون بەسەر مرۆڤی گەورە



(دارا) و مرۆڤی بچووك (نەدار) دامەزراوە". مرۆڤە گەورەکان ئەو کەسانەن کە دەستیان بە دەزگا حکومییەکان دەگات و لەگەڵیدا هاوکارن. کە ئەمەش لە سەردەمی نوێدا کلیلی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لەم کیشوەرەدا بووە. هەرکە ئەگەری دەست گەیشتن هاتەکایەوە و کاربەدەستان، دەستیان بە دەزگای زۆر لێکردن (حکومەت) بگات، خودی ئەمە دەبێتە هۆی دەرفەت ڕەخساندن بۆ کەڵەکە کردنی سەرمایە و دەسەڵات. چین لە ئەفریقیادا لەبری ئەوەی کە بناغەی پەیوەندییەکان بێت بۆ دەست گەیشتنی ئابووری بە سەرچاوەکانی بەرهەمهێنان، چین بناغەی دەست گەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسییە. دەرەنجامی ئەم پرۆسەیە ئەوە بووە کە هاوپەیمانی هەژمونیك لە سەرتاسەری ئەم کیشوەرەدا بەرقەرار ببێت. بۆ ئەوەی کە ئەندامانی کۆمەڵگا خۆیان لەگەڵ نوخبەکانی دەوڵەت بگونجێنن و هەندێ جاریش ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی کە بلوکی هەژمونیك لاواز لە قۆناغی دوای کۆڵۆنیالدا بۆ بەدەستگرتنی سیاسەتی ئەم کیشوەرە دابمەزرێت. چۆنیەتی بەکارهێنانی دەسەڵات لەلایەن مرۆڤە گەورەکان و سەرقاڵ بوونی مرۆڤ بچووکەکان لەناو کۆمەڵگای مەدەنیدا، بابەتی بەشی داهاتوویە کە لە ژێر ناوی پرسی ڕەوایەتی تیشك دەخرێتە سەر.

## بابەتی توێژینەوە: چینی کۆمەڵایەتی لە بۆتسوانا:

وڵاتی بۆتسوانا لە ڕووی هەڵکەوتەی جوگرافییەوە داخراو و بە ١,٥ ملیۆن دانیشتوان لە باشووری ئەفریقیادا جێگیر بووە. زۆربەی خاکی ئەم وڵاتە بە بیاوانی کالاهاری دەور دراوە. لە سەردەمی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، ئەم وڵاتە یەکێك لە هەژارترین وڵاتانی جیهان بوو. لە ئەفریقیادا ئەمڕۆکە بۆتسوانا خاوەن مێژوویەکی سەرکەوتوو و موعجیزاوییە.

ئەوەی کە بۆتسوانا لە قۆناعی دوای کۆڵۆنیال بە دەستی هێناوە شایانی هەڵوەستە کردنە. بۆتسوانا لە کاتی سەربەخۆییەوە لە ساڵی ١٩٦٦دا، گەشەی ئابووری سەقامگیری هەبووە، هەڵبەت ئەم وڵاتە خێراترین گەشەی ئابووری لەم ساڵانەی دواییدا بەخۆوە بینیوە.GNP یاخود پوختەی بەرهەمی نەتەوەیی لە کەمتر لە ١٠٠ دۆلار لە ساڵی ١٩٦٦دا بە زۆرتر لە ٣٠٠ دۆلار لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەم گەیشت. زیاد لەمەش بۆتسوانا گرنگترین وڵاتی ئەفریقیایە کە لە لیبرال دیموکراسیدا لە سەردەمی سەربەخۆییەوە ڕکوردی تۆمار کردووە. یەکەمین هەڵبژاردنی فرە حیزبی لەم وڵاتەدا لە ساڵی ١٩٦٥ ئەنجامدرا و لەو کاتەوە هەر پێنج ساڵ جارێك هەڵبژاردنەکان ئەنجام دەدرێت. بە ڕەچاوگرتنی ئەوەی کە ئەم وڵاتە لە دەروازەی

دەسترۆیی ئاپارتایدی وڵاتی باشووری ئەفریقیا بووە، سەقامگیری سیاسی ئەم وڵاتە شتێکی سەرسوڕهێنەرە.

ستراتیژییەکانی گەشەسەندن لەم وڵاتەدا لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال لە بەخێوکردنی مەڕ و هەناردەکردنی گۆشت دامەزرابوو. ئەمەش لە کاتێکدایە کە ئەم وڵاتە پێش سەربەخۆیی چالاکی بازرگانی سنوورداری هەبوو و خاوەنی کانی ئەڵماس و کانەکانیترە کە پشکێکی کەمیان لە خۆشگوزەرانی هەبوو و هەروەك کۆلۆنی پێشووی بەریتانیا (بچوانالند) پشکی کانەکان لە پوختە بەرهەمی نەتەوەییدا کەم بوو. ئەمەش لە کاتێکدایە کە ئەم کەرتەی ئابووری لە ساڵی ٢٠٠٠-٢٠٠١ ڕێژەی سێیەکی داهاتی نەتەوەی لەخۆ دەگرت. ئەگەرچی ئەم سیاسەتەی دەوڵەت لە ژێر کاریگەری فاکتەرگەلی ئەوبەری موعەشیراتی مایکرو ئابوور و بژاردنی (خیارات) ڕێسامەند بووە. لەم بابەتەی توێژینەوەدا هەوڵدراوە کە پرسی چین لە بۆتسوانا شی بکرێتەوە.

بۆتسوانا وەك گشت کۆمەڵگاکان، مێوانداری گرووپگەلی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆری کردووە کە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات لە رکابەرێتی دان. یەکێك لەم گرووپانە بە بڕاوی چینی نوخبەی فەرمانڕەوایە. لە بنەرەتدا ئەم گرووپانە پشتبەستراو بە خاوەندارێتی کاڵا ئابوورییەکانە و گاداری وەك بناغەکانی دەسەڵات بووە (وەك ئەوروپا، کە لە زەوی وەك کاڵایەکی باو سوودیان وەردەگرت). نوخبە سوننەتییەکان لەم بەشەی ئەفریقیا بەدرێژای سەدەکان خاوەنی گاڕانە گا بوون و ئەم خاوەندارێتییەش سەرمایەی زیادی بەدی دێنا کە بۆ ئەم چینە دەبوو بە هۆی دەسەڵاتی سیاسی. تەنانەت لە سەردەمی کۆلۆنیالیشدا سەرکردە سوننەتییەکان لەم ڕێگەیەوە پێگەی خۆیان وەك چینی فەرمانڕەوا دەپاراست. کاربەدەستانی بەریتانیا بە ناڕاستەوخۆ پشت بەم چینەیان وەك (ناوبژیوانانی حکومەت) دەبەست. بەم پێیەش هەرکە ئەفریقیا چووە ناو قۆناغی دژە کۆلۆنیالدا، زۆرێك لە چینە سوننەتییەکانی خاوەن گاڕانە گا ڕۆڵی گرنگیان لە بزاڤە ناسیۆنالیستەکاندا گێڕا و لە ئەنجامدا دەسترۆیی فراوانیان لە حکومەتی دوای کۆلۆنیال بەدەست هێنا.

وەك وڵاتانیتری ئەفریقیا ئەو نوخبانەی کە ریشەی دەسەڵاتیان لە نەریت یان بازرگانی کردن وەردەگرت بە تەنیایی فەرمانڕەواییان نەدەکرد بەڵکو لە پاڵ ئەمانە بۆرژوازییەکی نەتەوەیی بۆرۆکراتیکی بەهێز و هاوچەرخ بوونی هەبوو. دوای گەشەی ئابووری، دەوڵەت بۆ بەڕێوەبردنی کەرتە نوێیەکان وەك کەرتە کۆمەڵایەتییەکان، پەروەردە و تەندروستی پێویستی بە بۆرۆکراسی



بەرفراوانی هەبوو. لە ئەنجامدا زۆریك لە کاربەدەستان بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت دامەزراند و ئامانجی ئەم کاربەدەستانە زیادکردنی دەسەڵاتی سیاسی و سامانی ئابووری خۆیان بوو. هەڵبەت لەنێوان ئەو بۆرۆکراتانەی کە بەڕێوەبردنی سیاسییان لە ئەستۆدا بوو مەیلێك دروست بوو کە هێدی هێدی دەسەڵات لە دەستی وەچەی کۆنی سەرکردە نەتەوەییەکان وەرگرنەوە. بەم پێیەش فەرمانبەرە مەدەنییەکان لە گرووپی ئازاد بۆ سیاسەتمەدار گۆڕدران. بە پوختی بۆرژوازییەکی بۆرۆکرات سەریهەڵدا و چووە ناو سیاسەتی بۆتسوانادا، ئەمەش نیشاندەری ئەو ڕاستییەیە کە سەرەڕای ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئازاد و رکابەرێتی تەنیا یەك پارت — پارتی دیموکراتی بۆتسوانا- هەر لە کاتی سەربەخۆییدا، لە دەسەڵاتدا ماوە.

بە تێڕامانێکی خێرا بۆ ژیانی یەکەم سەرۆکی کۆماری بۆتسوانا، سرۆشتی نوخبەی دەسەڵاتدار دیار دەکرێت. سرێتسی کامە لە کاتی سەربەخۆییەوە ١٩٦٦ تا مردنی ١٩٨٠ سەرۆکایەتی بۆتسوانای کرد. ئەو سەرۆکی میراتی بامانگواتۆ و بزاڤی کامای سێیەم بوو (پاڵەوانی یەکگرتنی خەڵکی بۆتسوانا و لە سەدەی ١٩دا بە وردی گفتوگۆی لەگەڵ کاربەدەست و حکومەتە ئەوروپییەکانی کرد). سرێتسی کامە خوێندنی باڵای تەواو کردبوو. ئەو لە وڵاتی باشووری ئەفریقیا خوێندبووی و لە ئەکسفۆرد زانکۆی تەواوکرد. لەم قوناغەدا کامە بە تەواوی ئاشنایی لەگەڵ کۆمەڵگای ئەوروپادا پەیدا کرد و لەگەڵ ژنێکی ئینگلیزی هاوسەرگیری کرد. پێگەی زانستی کامە یارمەتی کامەیدا تابوو سەرکردایەتی بزاڤی نەتەوەیی بۆتسوانا بگرێتە دەست و هەروەها ئەم پێگەیە یارمەتی کامەیدا تا پارتی دیموکراتیکی بۆتسوانا لە ساڵی ١٩٦٢دا دابمەزرێنێت. کامە مرۆڤێکی دەوڵەمەند بوو و دەستی بەسەر زەوییە بێ خاوەنەکان و ڕەوە مێگەلەکانی گرت. سرێتسی کامە وەك نوخبەی وێکچوو یاخود (بلوکی هەژموونێك بوو) و پەیوەندییەکی زۆری لەگەڵ کۆمەڵگای تەقلیدی، نوخبە سیاسییە هاوچەرخەکان، بۆرۆکراسی و کەرتی تایبەتدا هەبوو. کامە پاڵێوراوی سەربەخۆ بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری بوو و توانی گشت ئەو نوخبانەی کە لە ڕێگەی هاوپەیمانێتییەوە دوای کۆلۆنیال سەریهەڵدابوو شکست بدات و سەرکردایەتی کۆمەڵگا بە دەست بگرێت.

نوخبەی فەرمانڕەوا لە بۆتسوانا وەك زۆربەی هاوتاکانیان لەم کیشوەردا، هەوڵیاندەدا تا لە ڕێگەی سەرمایەی نێودەوڵەتییەوە پەرە بە ئابوور بدەن. لە تیۆرییەکانی وابەستەیی (التبعیة)دا ئەم گرووپە بە چینی کۆمپرادۆر ناو دەبردرێن و لەبری خزمەت گەیاندن بە گەلەکەیان بە فاکتەری سەرمایەداریی دەرەکی وەسفدەکرێن. هەڵبەت دەوڵەتی بۆتسوانا هەوڵی دەدا هانی

هاوکاری و سەرمایە بان نەتەوەییەکان بدات بۆ سەرمایەگوزاری لە سەرچاوەکانی ئەم ولاتەدا. بۆ نموونە ناوچەی (دی بێرز) و کانی ئەلماسی ئەم ناوچەیە کە دڵی ئابووری ولاتە گەشەی سەند و لە ڕێگەی سەمایەگوزارییەوە دەرهێنانی ئەلماس برەوی سەند و بۆتسوانا بۆ دابین کردنی تێچوونەکانی ئەم کەرتە ئامادەیی خۆی دەربڕی کە ئەمەش پرۆسەی کۆلۆنیالی نوێدا ڕۆڵی یارمەتیدەری هەبوو. بێگومان بەڕێوەبردنی سەرچاوە و کانەکان پێویستی بە سەرمایە و تەکنۆلۆژیای دەرەکی هەیە و ڕێژەیەکی زۆری سامان بۆ خەرجییە گشتییەکان فەراهەم دەکات. هەروەها دەوڵەت پەیوەندی باشی لەگەڵ سەرمایەدار و قەرزدەرانی نێودەوڵەتی دامەزراند. بە ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ، سەرمایەی زۆر لەلایەن کۆمەك بەخشە دەرەکییەکان بەم ولاتە درا. شیکردنەوەی چینایەتی تەنیا "چینی داراکان"ی کۆمەڵگا لەخۆ ناگرێ. چینەکانی دەرەوی بلوکی هەژموونی (جەماوەر) لە بۆتسوانا هەروەك لە سەرتاسەری ئەفریقیادا، لە ژێر چەوساندنەوەی نوخبەکانەوە دان بەخۆدا دەگرن. ئەگەرچی لەم ولاتەدا ململانێی چینایەتی بە هۆی پەیوەندی دیموکراتیك لەنێوان کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت بە بەراورد لەگەڵ شوێنەکانیتری ئەم کیشوەرە پێشکەوتووترە، بەلام هەنوکەش بە بەرفراوانی دەسترۆیی پەیوەندییە چینایەتییەکان لە چالاکییە سیاسییەکاندا دەبینرێت. بۆ نموونە، بە ستراکتۆریی هەنوکەیی (کار)، لە بەرژەوەندی نوخبەکاندایە کە حەقدەستی کرێکاران بە تایبەتیش کرێکارە بیانییەکان لە ئاستێکی کەمدا بمێنێتەوە، تا ئەم کرێکارانە هان نەدرێن پرۆلتاریایەکی سەقامگیر دابمەزرێنن. چونکە پرۆلتاریای سەقامگیر بوو ڕێگەگەلێك دەدۆزێتەوە تا بەئاسانی خۆی ڕێك بخات و بەرەنگاری نوخبەی دەسەلاتدار ببێتەوە.

بۆتسوانا لە ساڵی ١٨٨٥دا وەك کۆلۆنێك و بۆ یارمەتیدان بە هێزی کاری ولاتی باشووری ئەفریقیا دامەزرا. لە سەرتاسەری باشووری کیشوەری ئەفریقیادا کرێکاران کەوتنە ژێر گوشار و بە ئارستەکردنیان بەرەو ئابووری کرێکار، مافەکانیان پێشێل کرا. بۆ زۆربەی ئەم کرێکارانە ئەم پرسە بەو مانایە بوو کە دەبێ بۆ کارکردن لە کانەکانی ولاتی باشووری ئەفریقیادا بە دوای کاردا بگەڕێن. تا ساڵی ١٩٤٣ نیوەی پیاوانی ١٥ تا ٤٣ ساڵی بۆتسوانیای کە وەك بەرهەمهێنەر لە کێڵگەکانیاندا کاریان دەکرد لە بەشێك لە ساڵدا بۆ کارکردن لە کانەکاندا بەکار دەهێنران. ئەوان وەرزێری سەربەخۆ بوون و لە بۆتسوانا گەشەیان بە کانەکاندا و بە هێزی نەتەوەیی هەژمار دەکران. ئەگەرچی وەرزێرەکان وەك هێزی کۆچبەر دەناسێنران نە وەك هێزی کاری بەردەوام و داواکاریش بۆ سەرمایەی مۆدێرن لە ئارادا بوو بەلام سەرمایەی هێزی کار لە



ئاستێکی کەمبوو. حکومەتی بۆتسوانا (بۆرژوازی دیموکراتیك) مەیلی هەبوو کە لەبری هێزی کار سەرمایە وەگەڕ بخات. ڕێکخراوەکانی کار بەتوندی کونترۆڵ دەکران تا بەمجۆرە ژینگەیەکی پێشکەوتوو بۆ هاوکاری بان نەتەوەیی فەراهەم بکات. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٩١دا، ٥٠٠٠٠ کرێکار لە بۆتسوانا مانیان گرت و دەوڵەت بە بەرپەرچدانەوە ١٨٠٠٠ کرێکاری لە پۆستە گشتییەکاندا دەرکرد و بە گرێبەست و حەقدەستی کەمەوە بۆ سەرلەنوێ دامەزراندنەوەیان ڕەزامەندی نیشاندرا. دەبوا بۆتسوانا خۆی لەگەڵ ستاندەرەکانی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی کار بگونجاندبا.

هەروەك شەریکە هاوپەیمانەکان، بۆرژوازی بۆرۆکراتیکیش بە دوای بەرژەوەندییەکانی خۆیدا دەگەڕا. بۆ نموونە لە ساڵی ٩٣-١٩٩٢، ١٠٪ی بودجەی بۆتسوانا بۆ خەرجییەکانی بەرگری تەرخان کرا کە ڕێژەیەکی زۆری ئەم پارەیە بۆ دروستکردنی فڕۆکەخانەی سەربازی لە دەرەوەی (مۆلی پۆلی) لە سالانی نەوەددا تەرخان کرا. تەرخانکردنی ئەم کۆژمەیە لە سەرمایەگوزاری نابەرهەمهێنەر بۆ کاروبارەکانی بەرگری لە دابەزینی گەشەکردنی ئابووری بۆتسوانا جێگەی پرسیار بوو، ئەم کارەش لە کاتێکدا بوو کە نەمانی ئاپارتاید هەر جۆرە هەڕەشەیەکی سەربازی بۆ سەر بۆتسوانای کەم کردبووە. بۆرژوازی بۆرۆکراتیك لەبری ئەوەی کە ئەم سەرمایەیە بۆ کاروبارەکانی گەشەپێدانی لادێیەکان تەرخان بکات بۆ خۆی خەرج کرد. زیاد لەمەش گرێبەستەکانی دەولەت و هێزی کار لە فڕۆکەخانەکانی سەربازی لە مۆلی پۆلی دەرفەتی بۆ بەکارهێنانی هێزی کار لەم فڕۆکەخانەیەدا ڕەخساند. بۆرۆکراتەکان لە بڕی ئەوەی کە بە دوای گەشەسەندنی ئابووریدا بن کە بەرژەوەندییەکانی گشت دانیشتوانی دابین دەکرد هزریان لە ڕێکخستنی بەرنامە گشتییەکان و دابینکردنی بەرژەوەندییە کورت خایەنی خۆیان دەکرد.

بێگومان ئەم نموونانە نیشان دەدەن کە نادادپەروەری لە بۆتسوانادا بە بەرفراوانی بوونی هەبووە کە ئەمەش پشت بەستراو بە چینی سیاسی بوو و هیچ کەس بە دادپەروەرانە لە گەشەی خێرای ئابوور لە قوناغی دوای کۆلۆنیالدا سوودی وەرنەگرت. بۆ نموونە کەمتر لە ١/٤ دانیشتوان لە ئابووری حەقدەستدا کاریان دەکرد، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە زۆربەیان خاوەنی ڕادەی پێویست لە ئاژەڵ و ڕەوە مێگەل نەبوون تا بتوانن سوود لە بڕیارەکانی دەوڵەت لەم کەرتەی پیشەسازییدا وەرگرن. پێویستە فرامۆش نەکرێ کە بۆتسوانا گەشەی ئابووری باشی بەخۆوە بینیوە، بەلام ئەم گەشەیە، بە بێ سەرلەنوێ دابەشکردنی سامانی گشتی و هەروەها بە ئاگادار بوون لە وەی کە زۆربەی خەڵکی بۆتسوانا تەنانەت ناتوانن پێداویستییە

سەرەکییەکانیان بەرهەم بهێنن و بۆ گوزەرانی ژیانیان پشتبەستراو بە ناوچە شارییەکانن، ئەم (گەشەیە) چەندان بەرچاو نییە. ئامارەکان ئاماژە دەکەن کە ٤٠٪ی دانیشتوان تەنیا خاوەنی ١٠٪ سامانی نەتەوەیین، ئەمە لە کاتێکدایە کە ٢٠٪ی دانیشتوان ٦١/٥ سامانی نەتەوەیان لەدەستدایە.

سەرەڕای بوونی بەڵگە کە نوخبەی دەسەڵاتدار بۆ کەڵەکە کردنی ئابوور، گەندەڵی و دزی لە سەرچاوەکانی دەوڵەت بۆ خەرجییە کەسییەکان، دەسەڵاتی سیاسییان بەکارهێناوە، جێی گومان نییە کە بارودۆخی هاوڵاتیانی بۆتسوانا لە دانیشتوانی (وڵاتانیتری) ئەفریقیا باشترە و ئەم ڕێژەیە لە گەندەڵی بە ئەندازەی گەندڵی لە وڵاتانیتر نییە و ئەم سیستەمە تاڕادەیەك توانیویەتی، سامان لەنێوان گشت دانیشتواندا دابەش بکات، سەرەڕای بوونی ئیمکاناتی کەمی کۆمەڵایەتی لە بۆتسوانای سەردەمی سەربەخۆییدا، هەنوکە بۆتسوانا خاوەن تۆڕی بەرفراوانی تەندروستییە. خوێندن لە دە ساڵی یەکەمدا بێ بەرامبەرە. بەڵام بابەتی گرنگ ئەوەیە کە نوخبەی دەسەڵاتدار بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی پشت بە دەسەڵاتخوازی نابەستێت ئەوان بە سەرکەوتوانە لە ڕێگەی دامەزراندنی سیستەمی سیاسی فرەحیزبی، وەرزێرەکانیان لەگەڵ خۆ هاودەنگ کردووە. ئەگەرچی لە سەردەمی سەربەخۆییەوە تەنیا پارتێك ئەویش لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە دەسەڵاتی لە دەست گرتووە بەڵام ئەم شێوازە بەردەوام و دیموکراتیکە لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیاڵدا بێ وێنە بوو و ئەم بابەتەش مافی مرۆڤ و دیموکراسی بەهێز کردووە و خزمەتگوزارییە گشتییەکانی بەدیهێناوە و دانیشتوانی بۆتسوانا ڕەزامەندن لەسەر سەرلەنوێ دەنگدان بە پارتی دەسەڵاتدار. بەجۆرە دەسەڵاتی بۆرژوازی بۆرۆکراتیکیش پارێزراو دەبێت. جەك پارسۆن لەو بڕوایەدایە کە: "سیاسەتەکانی بەشداریکردن و ئاوردانەوی بێ بەرامبەر بە خۆشگوزەرانی گشتی، لە کیشوەرێکدا کە هیچ یەك لەم فاکتەرانەی نەبووە، "لێوی تیژی چینی سیاسی " لە بۆتسوانای کۆل کردووە".



**بۆتسوانا:**

| | |
|---|---|
| ڕووبەر | ٥٨٢،٠٠٠ |
| دانیشتوان | ١/٧ ملیۆن کەس |
| وڵاتی کۆلۆنیالکار | بەریتانیا |
| ساڵی سەربەخۆیی | ١٩٦٦ |
| گرنگترین شارەکان | گابرۆنی (پایتەخت)، فرانسیس تاون، مۆلی پۆلی |
| نەژاد | باتسوانا سان |
| زمان | ستسوانا، ئینگلیزی |
| دانیشتوانی شار | ٧٣٪ |
| ناوەندی ژیان | ٤٤ ساڵ |
| ڕێژەی مردن | ٥٨/٦ دایکبوو لە ١٠٠٠ مردن |
| خوێندەواری | ٧٤/٤ |
| ئایین | سونەتی، مەسیحی |
| هەناردەکان | ئەڵماس، مەکاین، گۆشت، مس، نیکل |
| دراو | پیولا |
| بەرهەمی ناپوختە ساڵانی نیشتمانی | ٣/٠٤٦ دولاڕ |

**زاراوە سەرەکییەکان:**

**شێوازی بەرهەمهێنانی ئاسیایی:** شێوازێکی بەرهەمهێنانی پێش سەرمایەدارییە کە لەلایەن مارکسیستەکانەوە ناونرا و وێکچوونی زۆری لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداری فیودالیزم لە کۆمەڵگاکانی ئەورووپیدا هەیە.

**ئەرسیتۆکراسی هێزی کار:** شوێنێك کە پرۆلتاریا لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لە کۆمەڵگادا دواکەوتوو نەبێ.

**لێك گرێدانی شێوازەکانی بەرهەمهێنان:** واتە پاشماوەی شێوازی بەرهەمهێنانی ڕوو لە نەمان، لەگەڵ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا لە ڕێگەی شێوازی نوێی بەرهەمهێنانەوە دووبارە بەرهەم دەهێنرێتەوە.

**وێکچوونکردنی نوخبەکان:** دامەزراندنی هاوپەیمانی دەسەڵاتدار کە لە نوێنەرانی زۆربەی گرووپە بەهێزەکانی کۆمەڵگا پێکهاتووە.

**بۆرژوازی:** چینی دەسەڵاتدار لە سەردەمی سەرمایەداری کە دەسەڵاتەکەی پشت بە خاوەندارێتی ئامرازی بەرهەمهێنان دەبەستێت.

**بۆرژوازی بۆرۆکراتیك:** ئەوانەی کە کونترۆڵ کردن نەك خاوەندارێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانیان لە دەستە و، پێگەکەیان لە دام و دەزگاکانی حکومەتدا بۆ کەڵەکە کردنی سامان بەکار دێنن.

**کۆمپرادۆر:** هەر بەشێك لە بۆرژوازی نەتەوەی کە وەك کارگێڕێك بۆ بۆرژوازی نێودەوڵەتی کاربکات.

**بۆرژوازی بازرگانی:** بۆرژوازی کلاسیك کە مارکس لە توێژینەوەکانی لەسەر کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکاندا بەکاری هێنا.

**بلوکی هەژمونێك:** هاوپەیمانی سیاسی کە هەوڵ بۆ بەدەست هێنان و کونترۆلی دەسەڵات دەدات.

خاوەندارانی کەرتی نافەرمی: ئەو کاربەدەستانەی کە تواناییەکەیان لە بازرگانی بچووك و ناياساييەوە بەدەست دێت.

**بۆرژوازی نێودەوڵەتی:** سەرمایەداری نێودەوڵەتی لە باکوور (ئەورووپا و ئەمریکا) کە لە ئابووری (وڵاتە) پەراوێزکراوەکان لە ئەفریقیا و ناوچەکانیتری باشوور بە خراپی سوود وەرناگرێت و چەوساندنەوە ئەنجام نادات.

**ئامرازی بەرهەمهێنان:** کەرەستەی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی پێداویستییەکانی مرۆڤ و کەڵەکەی ئابووری (کێڵگە، مەکاین و...)

**بۆرژوازی نەتەوەیی:** چینی دەسەڵاتداری نەتەوەیی و خۆجێیی.

**وەرزێرەکان:** چینێکی بچووك لە جووتیارانی بەرهەمهێنەر کە بەرهەمەکانیان بۆ خەرجی و پێداویستییەکانی خۆیانە.

**وردە بۆرژوازی:** کۆمەڵە کەسانێکی خاوەن خاوەندارێتی کەمی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان کە چەوسانەوەی کرێکاران لەلایەن ئەم کۆمەڵەوە زۆر کەمە.

**پرۆلتاریا:** مووچە خۆرانێك لە کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکاندا کە پشت بە فرۆشتنی هێزی کارەکەیان دەبەستن.

**سەرکردە سونەتییەکان:** کەسانێك کە دەسەڵاتیان پشت بە داب و نەریت دەبەستێت.



**پرسیارەکان:**

١. تا چ ئاست دەتوانرێ مۆدێلی مارکس بۆ چین لە کۆمەڵگاکانی ئەفریقیادا بە کاربهێنرێ؟

٢. ئایا شێوازی بەرهەمهێنانی پێش سەرمایەداری لە ئەفریقیادا بوونی هەبووە؟

٣. چۆن پەیوەندی نێوان شێوازەکای بەرهەمهێنان دەتوانێ بە پێکهێنانی چین لە ئەفریقیادا یارمەتی بدات؟

٤. ئایا دەکرێ چینەکان تەنیا لە رێگەی ئامرازی بەرهەمهێنانەوە پێناسە بکرێن، یاخود لەم پرسەدا فاکتەری سیاسیی رۆڵی کارا دەگێڕێ؟

٥. ئایا دەتوانرێ زاراوەی چین بۆ نوخبەی دەسەڵاتدار لە وڵاتانی ئەفریقیا بەکار بهێنرێت یاخود هاوپەیمانی نوخبەکان، بلوکێکی هەژموونێك پێك دێنێت؟

**بۆ خوێندنی زۆرتر:**

بۆ هەر کەسێك کە هۆگری روونکردنەوەکانی مارکسیزمی کلاسیك سەبارەت بە پێکهاتن و ململانێی چینایەتییە، دەست پێکردن بە مانیفێستی کۆمۆنیست، نووسراوی ئەنگلز و مارکس باشترین شتە. سەبارەت بە چینی کۆمەڵایەتی بەتایبەتیش لە ئەفریقیادا، روانگەی کرافۆرد یونگ، سەبارەت بەوەی کە ئەفریقییەکان چۆن لەگەڵ ئەم بابەتە هەڵسوکەوتیان کرد، شایانی خوێندنەوەیە. بەرهەمی کاترین کۆپری ڤیدڤۆڤیچ سەبارەت بە شێوازی بەرهەمهێنان لە ئەفریقیا، لە ناوڕاستی حەفتایەکاندا سەرەکیترین تەوەری ئەم بابەتەیە و بەشێك لە پەرتووکی گواتکیند و والرشتاین، زۆر سوودمەندە.

سەبارەت بەو بیرۆکەیەی کە لەو بڕوایەدایە کە دەسەڵاتی سیاسی نەتەنیا لە بەرهەمهێنانی ئابووریدا رۆڵی گرنگی هەیە، بەڵکو لە شیکردنەوەی ئەفریقیاشدا رۆڵ دەگێڕێت، بڕواننە وتاری ریچارد شیکلار و وتاری ئیمانویل والرشتاین کە پێکهاتنی چین لە ئەفریقیا لە دەروونی ئابووری نێودەوڵەتیدا شی دەکاتەوە. بۆ ئاگادار بوون لە روانگەی ئەفریقییەکان سەبارەت بە شیکردنەوەی چینەکان بڕواننە پەرتووکی جان فرانیس بایارت بە ناوی (دەوڵەت لە ئەفریقیادا). ئەم پەرتووکە چینی دەسەڵاتدار لە ئەفریقیادا وەك نوخبەیەکی وێکچوو دەخاتەڕوو کە بلوکێکی هەژمونیك پێك دێنێت.

## پێشەکی:

مەشروعییەت، تەوەری سەرەکی هەر حکومەتێکە (پێویستە لە چەقی هەر حکومەتێکدا جێ بگرێ) بە بێ بوونی مەشروعییەت، فاکتەرەکانی زۆرلێکردن بۆ پاراستنی دەسەڵات پێ دەنێنە گۆرەپانەوە. گرووپی دەسەڵاتدار بۆ پاراستنی گشت کۆمەڵگا و دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکان پشت بە زۆرلێکردن و توندوتیژی دەبەستن. بۆیە پێویستە گرێبەندی نێوان چینی دەسەڵاتدار و هاوڵاتیان لە سەر بنەمای متمانە و ڕێز لێك گرتن بێت نەك ترس و زۆرلێکردن. بەم پێیەش دەکرێ مەشروعییەت بەم جۆرە پێناسە بکرێت:

((پەیوەندییەکی دروونناسی لەنێوان دەسەڵاتداران و هاوڵاتیان، کە بە پێی ئەم پەیوەندییە ڕێبەرانی دەوڵەت و دامەزراوەکان ئەم مافە بە دەست دێنن کە دەسەڵاتی سیاسی خۆیان بە سەر کۆمەڵگادا جێبەجێ بکەن)) مەشروعییەت بۆ مل کەچ کردنی هاوڵاتیان بۆ دەوڵەت ڕەزامەندترە لە (بەکارهێنانی) زۆر. ماکس ڤێبر ئاماژە بۆ سێ جۆری مەشروعییەت دەکات: تەقلیدی، کاریزماتیك و عەقڵانی — یاسای مەشروعییەتی تەقلیدی پشت بە کولتوور و مێژووی کۆمەڵگا دەبەستێ. لە ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاستدا هەندێ بابەت وەك — پرسگەلی تایبەت بە مافی پاشاکان بۆ فەرمانڕەوایی کردنی خەڵك کە مافی میراتیان (وەك مافی خواوەندی پاشاکان) پێ دەبەخشی — بە ئاشکرا سەریهەڵدابوو. زۆرێك لەو بڕوایەدا بوون، کە ئەمە هەمان حکومەتە کە خوا بە مەبەستی ڕێکخستنی کاروباری جیهان بۆیان هەڵبژاردووە، بۆیە مل کەچ بوون بۆ سەرۆکی حکومەت وەك خواستێکی تەقلیدی بوونی هەبوو لە روانگەی ڤێبر لە حکومەتی کاریزمادا، واتە دووەمین سەرچاوەی دەسەڵات، بە هۆی کەسایەتی و ئایدیاکانی سەرۆك، تاکەکان بە ئاسانی مل کەچی دەبن و پەیڕەوی لێدەکەن، بۆ نموونە مامۆستایانی ئایینی و جەنگاوران بۆ بەدەست هێنانی مەشروعییەت لەنێوان پەیڕەوانیاندا پشت بە فاکتەری کاریزما دەبەستن. ئەگەرچی چاوەڕوان دەکرا، کە لە ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیاڵدا مەشروعییەت لە سەر بنەمای عەقڵانی — یاسایی بێت و ئەم بابەتەش لە ڕێگەی دامەزراوە لیبراڵ دیموکراتیکەکانەوە، کە لە کۆڵۆنیاڵکار بە جێماوە، بەهێز بکرێت لەم رووەوە حکومەتی عەقڵانی — یاسایی بۆ حکومەت کردن پشتبەستراو بە کری بەندی کۆمەڵایەتی بوو. لەم سیستەمەدا، چونکە ڕێکخراوەکانی دەوڵەت لە خزمەت بەرژەوەندییەکانی هاوڵاتیاندایە، بۆیە هاوڵاتیان ملکەچی ئەم سیستەمەن. حکومەت کردن لەم سیستەمەدا لە سەر بنەمای داواکارییەکان پلان دانان راویی کردنی یاساکانە. ئامانجی ئەم



سیستەمە بەهێز کردنی خێری گشتییە بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکانە، کاربەدەستانی حکومەت بە دوای بەرژەوەندی تاکەکەسی نین و بەرژەوەندی گشتی لە سەرووی بەرژەوەندی تایبەت دادەنێن. فەرهەنگی بۆرۆکراتیك ڕێگر نییە لە بەردەم بیرۆکەی کاربەدەستان لە بەکارهێنانی دامەزراوەکانی دەوڵەت لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی، بەڵام بەپێچەوانەوە لە سیستەمی عەقڵانیدا هاوڵاتیان ملکەچی یاساکانن و مەشروعییەتی عەقڵانی و یاساییە کە پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای لە دوایین دیموکراسییەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ئەمریکای باکوور داڕێشتووە.

بەم پێیەش دامەزراوە یاسایی — عەقڵانییەکان دوای سەربەخۆیی وڵاتانی ئەفریقیا ئاوڕیان لێ نەدرایەوە چالاکییەکانی دیموکراسی لیبراڵ قەدەغەکران. لە یەکەم دیددا دامەزراوە سیاسییەکانی ئەم کیشوەرە وەك پەرلەمانەکان و دەسەڵاتی جێبەجێکردنی لێکچوونێکی زۆریان لەگەڵ دامەزراوەکانی ڕۆژئاوا دا هەبێت، بەڵام بە لێکۆڵینەوەیەکی ورد بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم دامەزراوانە جیاوازی زۆریان لەگەڵ دامەزراوە ڕۆژئاواییەکان هەیە. لە رواڵەتدا مومکینە ئەم دامەزراوانە بوونیان هەبێت، بەڵام لە پشت ئەم رواڵەتییە دا، ئەم دامەزراوانە لە ژینگەیەکی تەواو جیاواز لە ژینگەی سیاسیدان. (ئەمەش دواتر روون دەکرێتەوە) حکومەتە کەسییەکان هەر جۆرە بیرۆکەیەکی عەقڵانی — یاسایی سەرکوت دەکەن. ئەم چالاکییەش (سەرکوت کردنە) لە ڕێگەی دامەزراندنی دامەزراوە و چالاکیگەلی چەق بەستو ئەنجام دەدرێت. دەسەڵات لە کۆمەڵگای مەدەنی و دامەزراوەکانی دەوروبەری دەوڵەت دەردەچێت و دەگوازرێتەوە بۆ دامەزراوی جێبەجێکاری چەق بەستو کە زۆرتر پشت بە هزرگەلی تاکەکەسی دەبەستێت. لە دەرەنجامدا مەشروعییەتی یاسایی — عەقڵانی دەوڵەت بە هۆی ناوەندگەرایی دەوڵەت لە ناوچوو و نوێنەرایەتیگەلی نوێ جێگیری پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بوونەوە و، سیستەمی دەرەبەگایەتی — رەعییەتی پشت بەستراو بە دابەشکردنی سەرچاوەکانی دەوڵەت، (واتە) گرنگترین پردی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتداران و هاوڵاتیان لە قۆناغی دوای کۆڵۆنیاڵکاری لە ئەفریقیادا جێگیر کرا. بە کورتی، سەرکردەکانی ئەم کیشوەرە کە دەوڵەتی مۆدێڕن بۆیان بە میرات مابووە دامەزراوەکانی لیبراڵ دیموکراسییان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خۆیان هاوجووت کرد و دوای ئەویش سیستەمی باوك سالاری پێکهێنرا. لەم بەشەدا روونکردنەوەی زۆرتر سەبارەت بەم دوو پرۆسەیە خراوەتەڕوو. ناوەندگەرایی دەوڵەتی ئەفریقیا و پێکهاتنی باوکسالاری نوێی دەوڵەت.

## ناوەندگەرایی دەوڵەتی ئەفریقیا:

حکومەتی کارامە، بەرپرس و هەڵبژێردراو بۆ دابەشکردنی مافەکان لە کۆمەڵگادا، پێویستی بە دەسەڵاتی سیاسی هەیە و نابێ هیچ کات ببێت بە دەسەڵاتێکی هەژمونیك. بۆ نموونە لە ناو دەوڵەتدا پێویستە هەندێ لق هەبن وەك هێزی (هاوسەنگکەر) لە سەر هێزەکانیتر کار بکەن. ئەم چەشنە ((لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان)) رێگرە لە بەردەم مەترسی کەڵەکەبوونی دەسەڵات لە لقێکی حکومەتدا، هەروەها پێویستە دەسەڵات لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا دابەش بکرێت. پێویستە دامەزراوەکانی دەوڵەت لە پرۆسەی سیاسیدا بۆ تاك جەمسەری نەگۆڕدرێن. پێویستە پارتە سیاسییەکان توانایی رکابەرێتی یەکسانیان بۆ کۆنترۆل کردنی و دەست بە دەسەڵات گەیشتنیان هەبێ و گرووپە دەستڕویەکانیش دەبێ توانایی دەستتێوەردان لە پرۆسەی بڕیاردانی سیاسەتە گشتییەکاندا هەبێ نەبوونی ئەم چەشنە فرەییە، مەترسی گۆڕانی دەوڵەت، سەرقاڵبوونی بەخۆیەوە و جەختکردنە سەر بەرژەوەندییەکانی خۆی لە بڕی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگای بە دواوەیە.

لە پاڵ لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و پەیوەندی (نێوان) دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، دەبێ نوێنەر بوونی دەوڵەت لە دوایین شیکردنەوەیدا خەڵکی ئاساییش لێی تێبگەن. هەڵبژاردنی فرەپارتی مافێکی گەردونی دەنگدانە و لەوانەشە یەکێك لە باشترین رێگەکانی گەرەنتی کردنی وەڵامدانەوەی دەوڵەت بێ، ئەم دەنگ و دەنگدانانە هەلەکانی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات لەلایەن کاربەدەستانەوە بەوپەری کەمی دەگەیێنێ ئەگەربێتوو دەسەڵات بەنێوان یەکێك لەم سێ رەگەزانەی کۆمەڵگادا (دەوڵەت، کۆمەڵگای مەدەنی و خەڵك بەگشتی) کۆ نەبێتەوە، نوێنەرایەتی کردن و لێپرسینەوە (وەڵامدانەوە) گەرەنتی دەکرێت.

بە پێچەوانەوە، لە دەوڵەتێکی ناوەندگەرادا، چەقگرتنی مەترسیداری دەسەڵات لە ئارادایە و دابەشکردنی دەسەڵات سنوودار دەبێت. دەوڵەتێکی ناوەندگەرا دەتوانی لە هەر شوێنێك کە هێزەکانی دژی ناوەندگەرا ببنە هۆی جیابوونەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە کۆمەڵگای مەدەنی و دامەزراوەکانی ((دەوروبەر))ی دەوڵەت، بوونی هەبێ لەبری ئەمەشدا، کەڵەکە بوونی دەسەڵات لە ناوەند و بەتایبەتیش لە لقی جێبەجێکردندا زورتریش لە نووسینگەی سەرۆك کۆمار یان سەرۆك وەزیراندا بوونی هەیە و کاربەدەستانی لقی جێبەجێکردندا هەوڵ دەدەن گشت شێوەکانی چالاکی سیاسی لە کۆمەڵگادا بخەنە ژێر قۆرغی خۆیاندا.



کلیلی پاراستنی چەقگرتنی دەسەڵات، سنووردارکردنی هەڵەکانە لە گرووپە بەرهەڵستکارە رێکخراوەکان. هیچ هێزێکی رکابەر لەلایەن نوخبەی سیاسی دەسەڵاتدارەوە پەسەند ناکرێت. بۆ نموونە، چالاکی پارتە سیاسییە بەرهەڵستکارەکان قەدەغە دەکرێ و تەنیا پارتی فەرمی دەوڵەت رووخسەتی چالاکی گێڕان و رکابەرێتی کردنی هەیە. تەنانەت لە هەندێ کاتدا ئەم تاك پارتەش بە توندی لەلایەن نوخبەی دەسەڵاتدارەوە کۆنترۆڵ دەکرێ.

زیاد لەمەش، نوخبە پشتگیری خۆی لە تاك جەمسەر بوونی سیاسی، یاخود پۆچەڵ کردنەوە تەحەدا فەرمییەکان و کەناڵە فەرمییە سیاسییەکاندا سنوودار ناکات، بەڵکو چالاکی سیاسی کۆمەڵگای مەدەنی لە دەروونی (خودی) کۆمەڵگای مەدەنیدا پوچەڵ دەکاتەوە یەکێتییە کرێکارییەکان. گرووپە پسپۆرەکان و ئەنجوومەنە لەرزۆکەکان، گشتیان لەلایەن حکومەتی ناوەندگەرا کونترۆڵ دەکرێن. دەسەڵاتداران لە رێگەی پێشنیارکردنی پۆست بۆ رێبەرانی کۆمەڵگای مەدەنی خوازیاری هاوکاریکردنی ئەم رێبەرانن لە دەروونی ستراکتۆری دەوڵەتدا و بە بەخشینی پۆست. ئەم سەرکردانە دەکەن بە کەسێکی لایەنگری پاراستنی بارودۆخی بەرقەرار. هەر وەك چۆن خەڵك لە کامیرون دەڵێن: ((ئەو زارەی کە دەخوا ناتوانێ قسە بکا)). ئەنجوومەنە لەرزۆکەکان کە لە هەمبەر ئەم گوشارەدا بەرگری دەکەن و خوازیاری درێژەپێدانی سەربەخۆییانن لە هەمبەر دەوڵەتدا، لەوانەیە لە بەین ببرێن یاخود چالاکییەکانیان قەدەغە بکرێت. لە سێدارەدانی (کین سارۆ ویوا) و هەشت بەرهەڵستکاریتر لە نایجیریا بۆ بەدەستهێنانی مافی ئۆگۆنی (ogoni) نموونەیەکە لەنێوان دەیان کردەی توندوتیژاوی کە نیشان دەدات. سەرکردە هەمیشەییەکان بۆ پاراستنی تاك جەمسەری دەسەڵاتی سیاسی خۆیان درێژە بەم کردەیانە دەدەن. هەروەها چالاکیگەلی ئابووری کە لە رۆژئاوادا بە بەرفراوانی لە دەست کۆمەڵگای مەدەنیدایە (چالاکییەکانی کەرتی تایبەت لە بەرهەمهێنان. دابەشکردن و فرۆشتنی کاڵاکان) لە دەوڵەتێکی ناوەندگەرادا بە توندی لەلایەن دامەزراوەکانی حکومەتەوە کۆنترۆڵ دەکرێن. سنووردارکردنی چالاکییەکانی ئابووری بازاڕی ئازاد مەترسی زیان پێکەوتنی کاربەدەستانی دەرەوەی دامەزراوەی حکومەت زیاد دەکات. دەوڵەت و دامەزراوە سەرەکییەکان لە پێناو ئامانج و مەبەستەکانیان هیچ رێگرێکیان لە بەردەمدا نییە بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەو شتەی کە دەبێ کۆنترۆڵ بکرێ کاتێك کە پرۆسەی ناوەندگەرایی کامڵ دەبێ هیچ سەرچاوەیەکی پتانسێل بۆ بەرهەڵستکاری کردنی چ لە ناوەوە و چ لە دەرەوەی سیستەمی دەوڵەتی بوونی نامێنی. غانا لە ساڵانی شەستەکاندا بە تەواوی پرۆسەی ناوەندگەرایی دەوڵەتی بەدیهێنا لە

ساڵی ١٩٥٧دا پارتی کۆنگرەی گەل (بە سەرۆکایەتی) قەوام نیکرۆمە لە هەڵبژاردنەکانی فرەپارتی سەردەمی سەربەخۆیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنـا و حکومـەتێکی لـە ژێـر سیـستەمی (وێـست مینستر) دامەزرانـد. ئەگەرچـی لـە هەڵبژاردنەکانـدا ئـەم پارتـە بـە پـشتیوانی زۆرینـەی گـەل سەرکەوتنی بە دەست هێنا، بەڵام لە چەندین ناوچەی وڵاتـدا رووبـەڕووی دژایـەتیکردنی رێکخـراو بووەوە بۆ نموونە، بەتایبەتیش گرووپی ئاشانتی (Ashanti) بۆ خودموختاری هـەوڵی دەدا قـەوام نیکرۆمە بە بیانووی (جیا خوازەکان) دژی داواکارییەکانیان وەستا. بەم پێیەش یەکەمین هەنگاوی پارتی دەسەڵاتدار لە ساڵی ١٩٥٧ دا سوود وەرگرتن لە زۆرینەی پەرلەمان بوو بـۆ قەدەغـەکردن و نایاسایی هەژمارکردنی رێکخراوە ((خێڵ گەراکان)) لە ژێر ناوی یاسای دوورکەوتنەوە لە جیاکـاری و ناوچەگەرێتی، بە پەسەندکردنی ئەم یاسایەش، کەناڵێکی مۆبیلیزەکردنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای مـەدەنی و نەتـەوە گـەرایی لـە ناوچـوو چـالاکییەکانی ئەنجوومەنـە ولایەتـەکان و ناوچـەییەکان قەدەغەکران. دوایی ساڵێك، پەرلەمان یاسای دەستگیرکردن و دەست بەسەرداگرتنی پەسەندکرد بـە پێی ئەم یاسایە ئەو کەسانەی کە دژایەتی پارتی دەسەڵاتداریان دەکرد بە بێ بڕیـاری ئامـادەبوون و بە بێ دادگایی کردن دەستبەسەر دەکران. لە دەرەنجامدا سـەرکردە بەرهەڵـستکارەکان دەسـتگیر و زیندانی و تەنانەت لە سێدارەش دەدران، هەروەها سەرکردە سوننەتییەکانیش لە دەسەڵاتی یاسایی خۆیان دوورخرانـەوە و لـە بەشـداریکردن لـە ئەنجوومەنـەکانی راوێـژکاری بێبەشـکران هـەنگاوێتر هەڵگەڕانەوە لە سیستەمی دادوەری سەربەخۆ بوو. لقی دادوەری لە رێگەی دادگاکانی تایبـەت بـە لێکۆڵینەوە لە بابەتە سیاسییەکانی خیانەت و ئاژاوەگێڕان پەرەی سەند بـوو و ئـەم دادگایانـە لـە رێگەی دادوەرانی هەڵبژێردرا و لەلایەن نیکرۆمەوە چاودێری و کۆنترۆڵ دەکران، سەرەڕای گشت ئـەم بابەتانە جێی سەرسوڕمان نییە کە لە ریفراندۆمی ساڵی ١٩٦٤ دا، کاتێك کە پرسیار لە خەڵك کرا کە ئایا ئەوان خوازیاری سیستەمێکی تاك پارتین، هیچ گرووپێکی بەرهەڵستکار لە دژی ئەم یاسـا ناوەندگەرایەدا سەری هەڵنەدا. لە دەرەنجامیشدا، حکومەتی تـاك پـارتی بـە ٢٧٣٣٩٢٠ دەنگـی رازی لە هەمبەر ٢٤٥٢ دەنگـی نـارازی پەسـەند کـرا. لـەو رووەوە کـە ناوەندگـەرایی دەوڵـەت، فاکتەرێکی گرنگە بۆ تێگەیشتن لە سیاسەتی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال، لە دوو بابـەتی داهـاتووی ئەم بەشەدا باس لە دوو فاکتەری هاوبەشی ئـەم پرۆسـەیە دەکـەین: (p) پوچـەڵکردنەوەی پارتـە سیاسییە بەرهەڵستکارەکان و دامەزراندنی دەوڵەتی تاك پارتی، ب) دەستتێوەردان لـە دەسـەڵات لەلایەن خودی دەوڵەتەوە، کاتێك کـە دەسـەڵاتی ناوەنـدی دامـەزراوەکانی دەوروبـەری خـۆی وەك پەرلەمان. حکومەتی ناوچەیی و دەسەڵاتی دادوەری پوچەڵ دەکاتەوە.



## دەوڵەتی تاك پارتی:

رۆیشتن بەرەو دەوڵەتی تاك پارتی تەنیا لەلایەن نوخبەکانی سیاسییەوە وەك کاربەدەسـتانی جێبەجێکاری کەڵەکە کردنی دەسەڵات، راستەوخۆیانە نەبووە، بـەڵکو سـەرکردەکانی ئـەفریقیا گفتوگۆی بەرفراوانیان سەبارەت بە بەناوەنـدی کردنـی دەوڵـەت ئـەنجام داوە. قـەوام نیکرۆمـە سیستەمی فرە پارتی لە غانادا بە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵگای غانا لە رووی کۆمەڵناسەکییەوە فرە چەشنە (جۆراوجۆرە) لە ناوبرد. هویفیـت بـوینگی (Boingy – Hou ghouet) هـەر ئەم کارەی لە کەناری عاجدا ئەنجامدا بەو بیانوویە کە بەرهەڵستکاری راستەقینە لـەم وڵاتـەدا بوونی نییە. سێکو تۆرێ (sekou toure) ، چـونکە لـە گینـە ئایـدیۆلۆژیای کۆمەڵایـەتی، پەسەندی سیستەمی تاك پارتی دەکرد، ئەم کـارەی ئەنجامـدا (واتـە سیـستەمی تـاك پـارتی دامەزراند). لە تانزانیادا جولیوس نایرێرێ سیستەمی تاك پـارتی بـەو بیانوویـە کـە رێگـەی راست و گونجاو بۆ هێنانەدی دیموکراسییە، پیـادە کـرد. زۆربـەی وڵاتـانی ئـەفریقیا پرۆسـەی ناوەندگەراییان دەرباز کردووە و هەر یەك لـە سـەرکردەکان بەڵگـەی تایبـەتیان بـۆ ئـەم کـارە هەبووە. لەو کاتـەدا ئـەم پاسـاونانەوە راسـت دهاتنـە بەرچـاو. هەنـدێ لـە ئەفریقییـەکان و ئەفریقیاناسان پێشوازییان لەم گۆڕانکارییانە کرد. ئەوان باسیان لەوە دەکرد کـە هـیچ هۆیـەك نییە کە دیموکراسی لە ئەفریقیادا پەیڕەوی لە سیستەمی فرە پارتی رۆژئاوا بکات بە تایبەتیش بە رەچاو گرتنی ئەوەی کە دیموکراسی فرە پارتی لە کیشوەری ئەفریقیادا رەگی دانەکوتاوە. لـە روانگەی پاسـاونانەوە، زۆربـەی سـەرکردەکان لـە یـەکبوون (وحـدە) وەك هۆکـاری سـەرەکی سنووردارکردنی چالاکییەکانی فرە پارتی، سوودیان وەرگرتووە. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کـە بـە هـۆی سروشـتی بێگانـەی دەوڵـەتی کۆلۆنیـاڵی لـە ئـەفریقیادا، حکومەتـە سـەربەخۆکان، کۆمەڵگاگەلی چەند پارچەی نەژادییان بۆ بەمیرات ماوەتەوە و هەندێ لە وڵاتـەکانیش مـەیلی جوداخوازییان تێدا هەیـە. ئەگـەر چـاو بـە هێزەکـانی ناوچـەیدا نەخـشێنریتەوە، مومکینـە دەسەڵاتی حکومەتی نەتەوەیی و یەکپارچەی دەوڵەت رووبەڕووی هەرەشە ببێتەوە.

لەم رووەوە، سەرکردەکانی ئەفریقیا جەخت لەوە دەکەنەوە کە ئەفریقیا هێشتا توانـایی لـە ئەستۆگرتنی سیستەمی فرە پارتی نییـە. مـۆبیلزەکردنی ئەفریقییـەکان بـە پێـی لێکـچوونی نەژادی و ململانێ سیاسی، دەبێتە هۆی دووبـەرەکی و درزتێکـەوتن لـە دەوڵەتـدا. هـەروەها دامـەزراوە گـەلێك کـە یـەکگرتوویی و یەکپارچـەیی بـەهێز دەکـات بـە پێویـست دەزانـرێ و دامەزراوەگەلێك کە دەبێ لە پرۆسەی دەوڵەت دروستکردندا بەشداری بکات پێویستە ئەنـدامی

سیستەمی تاك پارتی بێ. لە بەرامبەر جۆرج واشنگتون کە سەبارەت بە ((کاریگەرییە وێرانکارەکانی ناوەرۆکی پارت لە ٢٠٠ ساڵ لەمەوبەر لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هۆشداریدا)) نەتەوەگەراکانی ئەفریقیا وەك نایرێرێ لەو بڕوایە دابوون کە لە قۆناغە سەرەتایی و ژیارییەکانی سەربەخۆیی ئەفریقیا، سیستەمە فرە پارتەکان (بۆ ئەفریقیا) فاکتەری نەهامەتی و نەگبەتی بوونە. پێویستە وەبیر بهێنرێتەوە کە بزاڤە نەتەوەگەراکان کە دەوڵەتە تاك پارتییەکانیان دامەزراند بە توندی سوودیان لە پشتگیری خەڵك و کۆمەڵ وەرگرت. زۆربەی ئەم وڵاتانە مەشروعییەتیان لە ئەنجامی ئازاد کردن و سەربەخۆکردنی وڵاتەکانیان لە حکومەتە کۆلۆنیاڵکارەکان بەدەستهێنا و بەم هۆیەش لە هەڵبژاردنەکانی سەربەخۆیدا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. هەندێ لەم وڵاتانە بە پراکتیك و بە فەرمی بە شێوازی تاك پارتی بەڕێوەدەبران بۆ نموونە تانزانیا لە سەردەمی سەربەخۆییدا، پێش دامەزراندنی دەوڵەتی تاك پارتی لە ساڵی ١٩٦٥ دا، تەنیا خاوەن یەك گرووپی بەرهەڵستکار لە پەرلەماندا بوو، بەڵام پرسیار ئەوەیە کە بۆچی لە تانزانیادا خەڵك سەرەڕای بوونی رکابەرێتی فرە پارتی بە شێوازی وێست مینستر، سیستەمی تاك پارتیان هەڵبژارد ؟

ئایا باشتر نەبوو کە سیستەمی سیاسی بەپێی واقیعییەتەکانی ئەفریقیا دامەزرابا؟ سەرکردە نەتەوەگەران جەخت لەوە دەکەنەوە کە هیچ پێشینەیەکی سونەتی لە دیموکراسی فرە پارتی لە ئەفریقیادا بوونی نییە. هەروەها باس لەوە کراوە کە کولتوورێکی سیاسی بەرهەڵستکار لەم کیشوەردا شتێکی نەناسراوە سەرکردە نەتەوەییەکان پەیڕەوی و هاوجووت بوون لەگەڵ دامەزراوەگەلێك کە لە کیشوەری ئەوروپادا بۆ بەڕێوەبردنی نایەکسانی کۆمەڵایەتی و ململانێی چینایەتی شتێکی پێویست بوو، بێ سوود دەزانن و لەو باوەڕەدا بوون کە ئەفریقیا لەم درزە کۆمەڵایەتییانە بە دوورە، جارێکیتر پێشنیار کرا کە پێویستە دامەزراوە سیاسییەکانی ئەفریقیا رەنگدەرەوەی نەریتەکانی ئەفریقیا بێ. سەرکردە گەلی وەك سێنگۆر (senghor) و نایرێرێ لێکدانەوەیەکیان لە رابردوو بەرجەستە کرد بەم وەسفە کە چۆن باپیرەکانیان لە رووی نەریتەوە کۆمەڵگایان بەڕێوەبردووە، ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە لە بڕیاردانداندا تاکگەرایانە کار بکەن. لە ژێر دارێك لە لادێدا، گەورەکان لەگەڵ یەکتردا گفتوگۆ دەکەن تا بە کۆدەنگی دەکەن، ئەوکات کۆدەنگی، نەك رکابەرێتی دەبێت بە کلیلی سیاسەتی ئەفریقیا.

بەم پێیەش ئەوان بەم ئەنجامە گەیشتن کە مودیلی تاك پارتی باشترین شێوازە بۆ هێنانەدی ئەم چەشنە لە هۆشیاریی سیاسی لە دەوڵەتە مودێرنە بە میرات ماوەکانی کۆلۆنیال.



باسە ئابوورییەکانیش بۆ پاساونانەوەی سیستەمی تاك پارتی بەکارهێنران. سەرکردەکانی ئەفریقیا لەم بڕوایەدا بوون، کە بۆ بەرپەرچدانەوەی گەشە نەسەندنی مێژوویی سەرکردەی بەهێز لە دەوڵەتە نوێیەکاندا پێویستە و ئەمەش باشترین رێگایە بۆ فەراهەمکردنی گەشەسەندنی ئابووریی. لەم رووەوە ئەفریقیا لە توانایدا نییە بچێتە ژێر باری رێبازگەلی کورتخایەن و سەرچاوەکانی مانوردان کە هانی رکابەرێتی دەدات لە بری ئەمەشدا ستراتیژی ئابووری بۆ دەوڵەتی تاك پارتی پێویستە.

زیاد لەمەش. ئایا لە سەردەمی سەربەخۆیی وڵاتانی ئەفریقیادا، سۆڤیەت (وەك دەوڵەتی تاك پارتی) یەکێك لە باشترین مودیلەکانی گەشەی ئابووری لە سەدەی بیستەمدا نەبوو.

یەکگرتوویی بێ بەرهەڵست، نەریت و ئەولەوییەتەکانی گەشەی ئابووریی فاکتەرێکی سەرەکی بۆ رێکخستنی گەلی دەوڵەتێکی تاك پارتییە، تەنانەت ئەمڕۆکەش کارکردی دەوڵەت لە ئەفریقیادا لاوازە. ئەولەوییەت و داواکارییەکان لە رێگەی ئەنجامەکانەوە پاڵپشتی نەکران، تەنانەت ئەو زیانەی کە هەر یەك لە سیستەمەکانی خاوەن ستراکتۆری تاك پارتی رووبەڕووی بوونەوە لە ژینگەی سیاسیدا جیاواز بوو. بەڵام سەرەڕای ئەمەش دەکرێ بزاڤگەلی هاوبەش بەپێی ئەزموونە سیاسییەکان بدۆزرێتەوە ئەم روونکردنانە نیشان دەدەن کە بۆچی لە ساڵانی نەوەدەکاندا گوشاری بەرفراوان، زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیای ناچار بە قەدەغەکردنی ستراکتۆری تاك پارتی کرد و لە بەشی یازدەیەمدا روونکردنەوەی زۆرتر دەخرێتەڕوو.

گرفتی دەوڵەتی تاك پارتی لەوەدایە کە ئەم سیستەمە پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی و نێوان دەسەڵاتداران و هاوڵاتیان بەرتەسك دەکات. سەرەکیترین ئامانجی پارت لە سیستەمی سیاسیدا ناوبژیوانی کردنە سەرکردەکان و ئۆرگانەکانی پارت بۆ کۆنترۆڵ کردنی خەڵك بەکاردێنن، لە کاتێکدا کە کۆمەڵگای مەدەنی لە ستراکتۆرەکانی پارت بۆ بەدواداچوونی داواکارییەکانیان لە رێگەی نوخبەی سیاسییەوە سوود وەردەگرێت لە جێگەیەك کە سەرکردەکان لە وەڵامدانەوەی داواکارییەکانی خەڵك بە بەردەوامی تووشی شکست دەبن مەشروعییەتیان لە ناودەچێت. لە چەند دەیەی یەکەمی دوای سەربەخۆیی بە هۆی نەبوونی رکابەرێتی سیاسی ئازادانە، هەندێ لە سیاسەتمەدار و بۆرۆکراتەکان پێگە و پلەی خۆیان گرەنتی کرد. زیاد لەمەش، بەپێی بوونی پارتگەلی رکابەر کە بتوانن جێگری کاربەدەستەکان ببنەوە، ئەم کاربەدەستانە پێگەی خۆیان لە دەوڵەتدا بە خراپی بە کاردێنن. بۆ نموونە، لە بەشی پێشوودا روونکرایەوە کە چۆن ستراکتۆرە تاك پارتییەکان، هانی گەندەڵی و پێکهێنانی

بۆرژوازییەکی بۆرۆکۆاتیکی کۆلۆنیالکار دەدەن. رکابەرێتی فرە پارتی دەتوانێ بە شێوازی تپانسیل (بالقوە) بەرەنگاری تاك جەمسەری نوخبەی دەسەڵاتدار ببێتەوە. دەکرێ بیرۆکەکانی تاکە تازە سەرهەڵداوەکان لە کۆمەڵگای مەدەنی لە رێگەی رکابەرێتی هەڵبژاردنەوە بخرێنەڕوو ئەگەرچی ئەم شێوازی گۆڕینی رژێم بە بێ توندوتیژی لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال بە ئاسانی بەدی نەهات. هیچ کەناڵێکی ئاشتیخوازانە بۆ چارەسەرکردنی ململانێیەکان بۆ گۆڕینی نوخبەکانی دەسەڵاتدار بوونی نییە. لە ئەنجامی نەبوونی دەستاودەست کردنی (دەسەڵاتی) سیاسی ئەگەر هەلێك دەرەخسا، کودەتاگەلێك روودەدان. هەروەك چوون لە دوو دەیەی یەکەمی دوای سەربەخۆیی کیشوەری ئەفریقیا رووبەڕووی ئەم (دیاردەیە) بووینەوە باسکردن لە حکومەتی تاك پارتی لە ئەفریقیادا، کاتێك رەچاوکرێ کە ئەم پارتانە چۆن دەتوانن لە ژینگەی دوای سەربەخۆییدا کار بکەن. کارێکی بێ سوودە. لە بڕی دامەزراندنی، دامەزراوە سەروکییەکان لە سەنتەری پرۆژەی دەوڵەت دروستکردن و تێکەڵ بە یەك کردنی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی زۆربەری ئەم دەوڵەتانە. لە دوای سەربەخۆیی لە کۆمەڵگا جیا بوونەوە دوای ئەم مەیلە گشتییە بۆ ناوەندگەرایی دەوڵەت ئەو دەسەڵاتەی کە پارتەکان بە درێژای قۆناغی خەبات دژی کۆلۆنیالکاری لێی بەهەرەمەند بوون، دابەزی و دەسەڵات لە پارتەوە بۆ پلەداری جێبەجێکاری ناوەند گوازرایەوە و لە دوای ئەمەش سەرکردەکانی پارت، لە ناوەندی دەوڵەتی دوای سەربەخۆیی جێگیربوون. لەم رووەوە بە دەگمەن پارتەکان بوون بە دامەزراوەی سەرەکی لە پرۆسەی سیاسەت داڕیشتن و گفتوگۆکانی دوای سەربەخۆ بوونی ئەفریقیا لە بڕی ئەمەشدا، ئەندامانی (پارت) ملکەچی بڕیاری رێبەری (پارت)بوونەوە و روخسەت بە سەرلەنوێ خۆڕێکخستنەوەی پارت درا. لە ئەنجامدا پارتەکان هیچ دەسەڵاتەکیان نەبوو تووشی تووڕەیی نوخبەی دەسەڵاتدارەوە (وەك دەسەڵاتی جێبەجێکردن) بوونەوە پەرلەمانەکانی ئەفریقیا و حکومەتە ناوچەییەکان و دەسەڵاتی دادوەری کەوتنە ژێر رکێفی دەسەڵاتی جێبەجێکردندا.

**پەیڕەوی کردنی دامەزراوەکانی ((دەورووبەر)) لە دامەزراوەی جێبەجێکاری ناوەند:**

لە سەدەی بیستەمدا، پەرلەمانەکانی جیهان هەندێ لە دەسەڵاتی خۆیان بە حکومەت و لقە جێبەجێکارەکان سپارد، بەڵام لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال کەم بوونەوەی و لەدەستدانی دەسەڵات خێراییەکی زۆرتر هەبوو بەدرێژایی ئەم سەردەمە زۆربەی ئەنجوومەنە نیشتیمانییەکانی ئەم کیشوەرە وابەستەی دەسەڵاتی جێبەجێکردن بوونەوە.



لەم بارەیەوە سنووردارێتی دەسترۆیی پەرلەمانی کێنیا نموونەیەکی سەرنجڕاکێشە نێوان ساڵی **١٩٦٣** واتە سەردەمی سەربەخۆیی کێنیا و چاکسازیی بنەڕەتی لە ساڵی **١٩٨٢** دا کە بوو بە هۆی پێکهێنانی حکومەتی تاك پارتی لە کێنیادا، پەیوەندی و رکابەرێتییەکی کەم لەنێوان ئەندامانی پەرلەماندا بوونی هەبوو ئەمەش لە ئەنجامی ئەم راستییە بوو کە پارتی یەکێتی نیشتمانی کێنیا (کانۆ Kanu) تاکە پارتی سیاسی ئەم سەردەمە بوو و کێنیا بە پراکتیکانە بە شێوازی تاك پارتی بەڕێوەدەبرا.

دەبوایا ئەندامانی پارتی کانو بۆ بەدەستهێنانی کورسی پەرلەمان، وەك ئەندامی فەرمی کانۆ، لەگەڵ یەکتردا رکابەرێتییان کردبا، بەم پێیەش بارودۆخێکی بێ رکابەرێتی بۆ ئەندامانی پەرلەمان لە ئارادا بوو، ئەگەرچی کۆمیتەی کارگێڕی پارت دوایین بڕیاری دەدا و پالێوراوەکان بە ناچار ملکەچی داواکارییەکانی پارت بوون. بەپێی سیاسەت و بۆچوونەکانی سەرۆکی پارتی سیاسی، گشت کێنیاییەکان (ئەوانەی بە تەمەنی یاسایی گەیشتوون) دەیانتوانی بەشداریی لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەماندا بکەن. هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان سەلماندیان کە هەڵبژاردنەکان لە بنەڕەتدا رکابەرێتی کردنە، بۆ نموونە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی **١٩٦٩** دا، **٧٧** ئەندام پەرلەمان شکستیان هێنا کە **٥** وەزیر و **١٤** جێگر وەزیری لەخۆ دەگرت. ئەمە لە کاتێکدایە کە لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا رێژەیەکی کەم لە کاربەدەستەکان لە هەڵبژاردنەکاندا شکست دێنن ستراکتۆری تاك پارتی ئەفریقیا ناتوانێ لە ئاستی هەڵبژاردنەکانی سیاسیدا، کە پشت بە سیستەمی وێست مینستری رۆژئاوا دەبەستێ، سوود وەرگرێ تەنانەت لە هەندێ پرسگەلی وەکو کێنیا لە ساڵانی شەستەکاندا، کە هەڵبژاردنی ئازاد تیایدا ئەنجامدا ئەمانە (واتە ئەندامانی پارتەکە) لە پێشنیاری گۆڕینی سیاسەت سەرنەکەوتن، چونکە دەرکردنی بڕیارەکان لە ئاستێکی باڵای دەسەڵاتی جێبەجێکردندا ئەنجام دەدرێ پەرلەمان رۆڵێکی کەمی لە بڕیار دەرکردنەکاندا هەبوو، گۆران هایدن و کالین لیز لە توێژینەوەکانیاندا سەبارەت بە هەڵبژاردنی ساڵی **١٩٦٩** کێنیا ئاماژە بەوە دەکەن کە: ((دیارکردنی هەر جۆرە بڕیارێکی سیاسی یاخود یاسای پەرلەمانی کە بکرێ لە ئەنجامەکانی هەڵبژاردندا دەستەبەر بکرێ. زۆر ئاستەمە)) بێگومان لەو شوێنانەی کە هەڵبژاردنی تاك پارتی تیایدا ئەنجام دەدرێ پەیوەندییەکی زۆرتر لەنێوان ئەم دوانەدا بوونی هەیە، بەڵام تەنانەت لەم شوێنانەش کاریگەری کۆمەڵگای مەدەنی بەسەر سیاسەتە گشتییەکاندا سنووردارە لە بڕی ئەمەشدا تەنانەت دەنگدەرانیش بەدوای لۆبیەکدا دەگەڕێن کە بتوانێ بەرژەوەندییە بەردەوامەکانی دەوڵەت

بپارێزێ (بۆ نموونە پەینی کیمیاویی هەرزان، سەرچاوەی نوێ ئاو، رەخساندنی هەلی نوێ) . ئەندام پەرلەمان ناچارە بە پاراستنی سەرچاوە سەرەکییەکان و پاراستنی رێڕەوی کاروباری ژیان. شکست هێنان لە دەستەبەرکردنی ئەم سەرچاوانە دەبێتە هۆی دەنگدان بە پالێوراوێکیتر لە یەکەمین هەڵبژاردنی داهاتوودا ئەگەرچی خزمچێتی لە بەرپرسیارێتی ناوچەیی نوێنەری پەرلەمان بۆ یاسادارێشتن و دادوەری سەبارەت بە توانایی لە پاراستنی سەرچاوەکاندا، کورت دەبێتەوە.

لەم رووەوە کاربەدەستانی ئەفریقیا سیستەمێکی تاك جەمسەری سیاسییان لە کۆمەڵگادا پەیڕەو کرد، لە هەندێ بارودۆخدا کە نوێنەری پەرلەمان بەرەنگاری دەسەڵاتی جێبەجێکردن ببێتەوە، وەك مرۆڤێکی مەترسیدار ناوی دەبەن. لەم چەشنە بارودۆخەدا، بە ئەندام پەرلەمان پێشنیار دەکرێ کە لە بری کاروباری نیشتیمانی و نێودەوڵەتی لە سەر پرسگەلی سەرچاوەکانی ناوچەیی ورد ببێتەوە. یەکێك لە ئەندامانی پەرلەمان، کە بەرەنگاری نوخبەی سەرۆکایەتی کۆمار بووەوە جی. م. کاریوکی بوو دوای ئەوەی کە کاریوتی لە ساڵی ١٩٧٥ دا لە هەڵومەرجێکی گوماناوی کۆچی دوایی کرد، پەرلەمانی کێنیا بە پێچەوانەی خواستی سەرۆك کۆمار (جۆمۆ کنیاتا) خوازیاری بەدواداچوونی رۆڵی هێزەکانی ئاسایش لە کوشتنی کاریوکی بوو، کنیاتا بە لە کار لابردنی ئەو وەزیرانەی کە پشتگیرییان لەم لێکوڵینەوە دەکرد بەرپەرچی ئەم کارەی دایەوە و سەردەستەکانی ئەم شۆڕشەی پەرلەمانی دەستگیر کران. لە ئەنجامدا دەسەڵاتی جێبەجێکردنی کێنیا بەو ئەنجامە گەیشت کە پەرلەمان هیچ کات سەربەخۆ بوونی بەدەست نایەنێت و جێگری کنیاتا، دانیل ئاراپ مۆیی، لە کاتی گۆڕینی یاسایی بنەڕەتی و راگەیاندنی کێنیا وەك دەوڵەتێکی تاك پارتی لە ساڵی ١٩٨٢ دا، پشتگیری لەم بابەتەی کرد. لە گشت رێکخراوە لیبراڵ دیموکراتەکان کە بۆ وڵاتانی ئەفریقیا لە دوای کۆلۆنیالکاری بە میرات مابووە. حکومەتی ناوچەیی (خۆجێیی) خاوەن ستراکتۆری باش بوون هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هێزە کۆلۆنیالکارەکان زۆرتر سەرقاڵی حکومەتی ناڕاستەوخۆ بوون و وەك بەشێك لە پرۆسەی دژە کۆلۆنیال زۆرتر جەختیان لە سەر دیموکراسی ناوچەیی وەك بناغەی پشت بە خۆبەستن، دەکردەوە، زۆربەی فەرمانڕەوا و کاربەدەستانی کۆلۆنیال، بە نەتەوەگەراکان بۆ دواخستنی سەربەخۆیی سەرتاسەری وڵات دەسەڵاتی ناوچەییان دەبەخشی. ئەگەرچی دوای سەربەخۆیی بەهێزکردنی دیموکراسی ناوچەیی لەم کیشوەرەدا بەخێرایی روو لە کەمبوونەوەی کرد.



گرفتێك کە ئەم چەشنە حکومەتە رووبەڕووی دەبوویەوە، ئەوە بوو کە بە ئاسۆیی دەستی لە دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی وەردەدا، لە بڕی ئەوەی کە بە شێوازی یەك لە دوای یەك کار بکات ئەمەش نیشاندەری ئەوە بوو کە لە دەوڵەتێکی ناوەندگەرادا، سەرکردەکان نەیاندەتوانی دەسەڵاتی سیاسی لە دەرەوەی دامەزراوە ناوەندییەکان کۆنترۆل بکەن. لە ئەنجامدا حکومەتی ناوچەیی هەرەسی هێنا و هەڵبژاردنی ناوچەیی و دامەزراوە وەڵامدەرەکان بوونیان نەما، لە بڕی ئەمەشدا ئەو کاربەدەست و دامەزراوانەی کە راستەوخۆ لەلایەن ناوەندەوە کۆنترۆڵ دەکران جێگری دامەزراوە ناوچەییەکان بوونەوە. لەم رووەوە دامەزراوەیی جێبەجێکار ناوچەیی شوێنی حکومەتی ناوچەیی گرتەوە لە حالی حازردا، کاروباری وەك پەروەردەو تەندروستی، چاودێری کردنی رێگاوبان، باج کۆکردنەوە، لە رێگەی کاربەدەستە جێبەجێکارەکانی ناوچەیی کە بڕیارەکانی کاربەدەستە بالاکانی پایتەخت جێبەجێ دەکەن، کۆنترۆڵ دەکرێ لە ئەنجامدا ئەفراندنی نیشتیمانی بەسەر بڕیارەکانی ناوچەییدا زاڵ بوو لە کاتێکدا کە کۆمەڵگای ناوچەیی لە سەر ئەو بڕیارانەی کە بۆیان دەردەچوو دەستڕۆیی کەمتریان هەبوو جارێکیتر دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە سەر تەختی دەسەڵات نیشتەوە.

هەروەك چۆن پارت، دەسەڵاتی یاسادانان و حکومەتە ناوچە (خۆجێی)ییەکان لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال لە ئەفریقیادا، دەسەڵاتیان لە دەستدا، دەسەڵاتی دادوەریش دەسەڵاتی خۆی لەدەستدا. لە دەوڵەتە خاوەن سیستەمی یاسایی – عەقلانیدا ئەگەرچی لە زۆربەی دادگاکاندا رۆڵی بڕیاردەری فەرمییان نییە بەڵام دامەزراوەیی بەهێزن، ئەم دادگایانە دەسەڵاتەکەیان لە بەجێ گەیاندنی رۆڵیان بۆ پاراستنی حکومەتی یاسا بەدەست دێنن گشت ئەم کۆمەڵگایانە تەنانەت خودی یاسادارێژەرانیش ناچار بە ملکەچی بۆ دادگاکانن. ئەگەرچی دەسەڵاتی دادوەری لەلایەن دەوڵەتە ناوەندییەکانی ئەفریقیاوە وەلا دەنرێن، بەڵام لە ژینگەیەکی سیاسیدا، لە شوێنەك کە دەسەڵاتی جێبەجێکردن زۆر بەهێزە، یاساکان دەبن بە شتێکی رواڵەتی کە ملکەچ بوون بۆیان بەزۆر (اختیاری) نییە، سیاسەتمەدار و پرۆکراتەکان کاتێك کە بەرژەوەندییەکانیان رووبەڕووی مەترسی دەبنەوە ناچار نین پابەندی یاساکان بن. یاساکان بۆ ئەو کەسانەی کە دەوڵەت بەڕێوەدەبەن سنووردارە، لە کاتێکدا کە دەبێ کۆمەڵگای مەدەنی ملکەچی بێت زیاد لەمەش هەندێ لە سەرکردەکان بە تێچوونێکی کەم بەراشکاوانە یاساکان بە سوودی خۆیان دەگۆڕن ئیدی ئەمین (Idi Amin) لە ئۆگاندا، جان بیدێل بۆ کاسا ( Bokassa Bedel Jean) لە کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست، مایس نگیوما (Macias Nguema) لە گینەی

ئەستوا، نموونەی بەرچاون، بەڵام تەنانەت لەو وڵاتانەشدا کە سەرکردەکانیان خاوەنی بیرۆکەگەلی یاسامەندێتین، هێشتاش دەسەڵاتی جێبەجێکردن مەیلدارە بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی کۆتایی بۆ ڕێگرتن لە دەستتێوەردانی دەسەڵاتی دادوەری لە کاروباری سیاسیدا.

بە چەق بەستنی دەسەڵات لە دەست دەسەڵاتی جێبەجێکردندا، لە زۆرێك لە وڵاتە سەربەرخۆکان، مودیلی یەك لە دوای یەکی (سلسلة مراتبی)، ناوەندگەرا و دەسەڵاتخوازی حکومەت. پێش سەربەخۆیی و لە کاتی سەربەخۆییدا، پێکهات، حکومەتەکان لە ناوەندەوە کونترۆڵ دەکران و کۆمەڵگای مەدەنی ڕۆڵێکی کەمی لە پێکهێنانی پرۆسەی سیاسیدا هەبوو. ئەگەرچی ئەفریقیا دوای کۆلۆنیال لەلایەکەوە لەگەڵ حکومەتی کۆلۆنیال جیاوازە چونکە کیشوەری ئەفریقیا لەڕێگەی حکومەتی کەسییەوە (نەك حکومەتی دامەزراوەیی) بەڕێوە دەچێت کە لەم حکومەتە بۆ بەدەستهێنانی مەشرعییەتی سیاسی سیستەمی سیاسی تێکەڵ بە سیستەمی دەرەبەگایەتی بووتەوە.

## حکومەتی تاکە کەسی (فردی) :

کۆلۆنیال، دەوڵەتی یاسایی عەقلانی بۆ ئەفریقیا بەدیاری هێنا لە دەروونی ئەم شێوەیە لە سیستەمی سیاسیدا، دامەزراوە و دەزگاکان بەپێی دەسەڵاتی یاسایی بۆ گێڕانی ڕۆڵی حکومەت دامەزران. کۆمەڵگای مەدەنی بۆ پەسەندکردنی ئەم شێوازە لە حکومەتکردن ملکەچی ئەم دامەزراوانە بوونەوە، چ ئەوانەی کە لە ناو کۆمەڵگادا بوون چ ئەوانەی کە حکومەتیان بەدەستەوە بوو، هەر یەکەیان پێگەی خۆیان دەزانی. هەر لایەنێك بەڕوونی پابەندی یاسا و بڕیارەکان بوون و پرۆسەی حکومەتیش بەڕوونی دەکرا پێشبینی بکرێ. بە کورتی فۆرمە دامەزراوییەکان بەسەر مەیلە کەسییەکاندا زاڵبوو و ئەمەش ئەو شوێنە بوو کە مەشروعییەت سەرلەنوێ بەرهەم هێنرایەوە. سەبارەت بە ڕۆڵە گشتی و تایبەتییەکانی سیستەمی حکومەتی عەقلایی، یاسایی، دادوەرییەکی ڕاست و دروستبوونی هەیە، شتێکی نایاسایی یاخود بەلانیکەمەوە نارەوشتییە بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی کاربەدەستانی کە دەست لە ئەرکە گشتییەکاندا وەربدەن. بەرژەوەندییە گشتییەکان گرنگییەکی تایبەتیان هەیە. لەم رووەوە، ماکس ڤێبر ئەم مۆدیلە لە دامەزراوە یاسایی ــ عەقلانییەکان بەکاریگەرترین شێوازی حکومەت دەزانێت.



هەروەك بینرا، دەوڵەتانی ئەفریقیایی دوای کۆلۆنیال بەردەوام ئەم نموونەی یاسایی ــ عەقلانی بەکاردێنن. حکومەتی یاسا هەمیشە گەرەنتی ناکرێ و هەندێ لە کاربەدەستانی گشتی، پێگەکەیان لە دەوڵەتدا بۆ بەرژەوەندییە (تایبەتییەکان) بەکاردێنن و ڕەچاوی بەرژەوەندی گشتی ناکەن. لەم رووەوە، سیاسەتی ئەفریقیایی زۆرتر وەك ژینکەیێگە کە میکاڤیلی لە پەرتووکی (میر)دا باس دەکات نەك لە پەرتووکی (ڕۆحی یاساکان) مۆنتسکیو. بەڵام ئەمەش بەو مانایە نییە کە کۆمەڵگاکانی ئەفریقیا پشێوی خواز ئانارشیکن. هەنوکەش ڕێکخراوەی سیاسی و مەشروعییەت لە ئەفریقیادا بوونی هەیە. شکست هێنانی دامەزراوە یاسایی ــ عەقلانییەکان لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیاڵ، ئەفریقیاناسانی ناچار بە ڕوونکردنەوەی سیاسەتەکانی ئەم کیشوەرە لە ژێر زاراوەی حکومەتی تاکەکەسی کردووە.

حکومەتی باوك پاشایەتی وەك حکومەتی تاکەکەسییە و شێوازێك لە حکومەتە کە تیایدا هێز لە (دەست) دەسەڵاتی تاکەکەسێکی فەرمانڕەوای دیارکراو دایە. سەرکردە پێگەی خۆی لە پێگەکەی لە کۆمەڵگادا بەدەست دێنێت. لەوانەیە سەرکردە لەلایەن داب و نەریتەکانەوە سنووردار بکرێت، بەڵام هیچ سنوورداریییەکی یاسایی — عەقلانی لە حکومەتەکەیدا بوونی نییە. سەرکردە لە سەرووی یاسایە و زۆرجار یاساکان بەپێی بڕیارەکانی دەردەچن. لەم رووەوە، سەرکردە پاتریمونیالەکان، وردبوونەوە بەسەر حکومەت بە کارێکی تایبەت بە خۆیان هەژمار دەکەن، دەوڵەت موڵکی تایبەتییەکەیانە لە ئەنجامدا کارکردنی بەپێی یاساکان کارێکی تەواو ئیختیارییە (بە زۆر نییە) هیچ سیستەمێکی حکوومی ناتوانرێ لەلایەن تاکەکەسێکەوە بەڕێوەببرێ ئەگەرچی سەرکردە پاتریمونیالەکان لە بری دامەزراوە یاسایی — عەقلانییەکان بۆ ڕاپەراندنی ئەرکەکان. ڕەچاوی دەزگاکان وەك سیستەمێکی خزمایەتی، هاوڕێیان و ڕەعیەتەکان، دەکەن لە ئەنجامدا، گشت ئەم کاربەدەست کارگێڕییانە وەك وەفادارانی سەرکردە (بۆ پاراستنی پێگەی خۆیان) وەسف دەکرێن. لەم رووەوە ڕەعیەتەکان (هاوڵاتیان) بە بەرژەوەندییەکانیانەوە، تا دەگاتە مافی کارگێری هەڵقولاو لە خزمەتگوزارییەکانی حکومەت لەو دەزگایانەی کە تیایدا دامەزراون وابەستەن. وەفاداربوونی سەرکردە هەندێ پاداشت و مەزایایان بۆ بەدواوەیە، ڕەعیەتەکان لە سوود وەرگرتن لە پلەکانیان و ڕەخساندنی هەل بۆ خودی خۆیان ئازادن. دەکرێ نموونەگەلێکی مێژوویی لە سیستەمی باوك پاشایی لە دەوڵەتە ئایینی و پاشایەتی ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست بهێنرێ ڕاستی ئەوەیە کە بەدەگمەن دەتوانرێ زۆربەی تایبەتمەندییەکانی حکومەتی باوك پاشایی لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال لە

ئەفریقیادا ببینرێ بەمپێیەش ناکرێ بووترێ کە رژێمەکانی ئەفریقیا بە تەواوی و بە پەتی باوك پاشایی بوونە، باوك پاشـایی هـەڵقولاوی نەریتـە و دامـەزراوە یاسـایی — عەقلانییـەکان لـە پێکهێنانی سیستەمی سیاسیدا بەکارناهێنرێت لەبری ئەمەشدا مومکینە دامـەزراوە یاسـایی — عەقلانییەکان لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال لاواز بن، بەلام (هەروەك چۆن لە هەر دەولەتێکی مۆدێرندا پێویستە) هێشتا درێژە بە خۆیان دەدەن و رۆڵ دەگێرن هـەروەك باسـکرا، پێویـستە سیاسەتەکانی ئەفریقیای سەربەخۆ وەك پەیوەندییەکی نێوان دامەزراوە باوك شـاهی و یاسـایی — عەقلانی رەچاو بکرێ. لە سیستەمی عەقلانی یاساییدا بەرژەوەندییە تایبەتییـەکان رەچـاو دەکرێن، لەم رووە، دەولەتی مۆدێرنی ئەفریقیایی زۆرتر سیستەمێکی ژێـر دەسـەلاتی سـەرۆك کۆمار — پاشادایە، تاکو بە تەواویی رژێمێکی باوك پاشایی بێت، بەم پێیەش دروستتر ئەوەیـە کە زاراوەی کەیستۆفر کاپلان، بە ناوی باوك پاشایەتی نـوێ بـۆ ئـەفریقیا بـەکاربێنن. رابـرت جەکسۆن و کارل رۆزنبرگ بە باشتر دەزانن کە زاراوەیەکیتر بەکاربێنن ئەوان لـەو بڕوایـەدان کـە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال لە ژێر حکومەتی تاکەکەسی دایە.

**تایبەتمەندییەکانی حکومەتی تاکەکەسی:**

دەکرێ حکومـەتی تاکەکەسـی ئـەفریقیا لـە ژێـر ناونیـشانی، دەسـەلاتخواز، ئیختیـاری، رووکەش و نالێهاتوو وەسف بکرێ ئەم تایبەتمەندییانە تەنانەت لـە دەولەتگـەلێك کـە سـەرۆك کۆمار — پاشا بۆ چەندین دەیە حکومەتیان کردووە، حکومەتگـەلی بناغـە لـەرزۆك بـەبوون دێنن، ئەم سیستەمە سیاسییە کەسییە دامەزراوەگەلێك دادەمەزرێنێ کە لەبری پشتبەستن بـە دامەزراوەکان پـشت بـە کوتلـەبازی دەبەسـتێ. کـاتی ئـەوە هـاتووە کـە تایبەتمەندییـەکانی حکومەتی تاکەکەسی بە قوول بوونەوەیەکی زۆرتر روون بکەینەوە.

زۆربەی سەرکردەکانی ئەفریقیا لـە قۆنـاغی دوای سـەربەخۆیی، چ وەك پێـشەنگی بزاڤـی ناسیۆنالیستی لە ولاتدا و چ وەك سەرکردەی کۆدەتایـەکی سـەربازیی بـە پلـە و پۆسـتی بـالا گەیـشتن، لـە ئەنجامـدا هەنـدێکیان وەك (بـاوکی) گـەل و ئـەم جـۆرە گریمانـە لـە دەرەوەی (چوارچێوەی) یاسا هەلسوکەوتیان کرد، دەسەلاتخوازان بە زۆری خاوەن تایبەتمەنـدی حکومـەتی تاکەکەسین ئەوان بۆ پاراستنی پێگەکەیان بە بەردەوامی سەرچاوەکانی سەرکوت کردنی دەولەت سەرلەنوێ بەرهەم دێنن، لەم سیستەمەدا بەرهەلستە شەخسییەکان رووبەڕووی هەرەشە دەبنەوە یا خود لەلایەن هێزی ئاسایشەوە دەکوژرێن. لە کاتێکدا کە چالاکی گرووپـە ئۆپۆزیـسیونەکان



قەدەغە دەکرێن و راوەدوودەنرێن و دەولەت لە رێگەی ساختەکردن لە هەلبژاردنەکانـدا لـە دژی ئەم ئۆپۆزوسیۆنە و بڕینی سەرچاوەکانی دەولەت لـەو ناوچـانەی کـە پـشتگیریان لێ دەکـرێ، دەبێتە هۆکاری کەمبوونەوەی پشتگیری خـەلکی ئـەم ناوچـانە لـە گرووپـە ئۆپۆزوسـیۆنەکان. بەپێچەوانەی سیستەمە یاسایی — عەقلانییەکان کە سەرکردەکانیان مەیلدارن بـۆ ئـەوەی کـە بەردەوام بگۆڕدرێن، حکومەتی تاکەکەسی لە سەرکردایەتی کردنـی ئـەفریقیا درێـژەی هەیـە. روخساری بەردەوامی ((مرۆڤی گەورە)) روخساری ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالە، رژێمی کۆمار — پاشا بۆ زۆرتر لە دەیەك درێژەی هەیە. سیاسەتمەدارگەلێکی شـارەزا وەك بۆرقیبـە لـە تـونس، مۆبۆتۆ لە کونگۆی کینشازا، باندا لە مالاوی و هۆیفیت برینگی لە کەناری عـاج، کانیـدا لـە زامبیا، نایرێرێ لە تانزانیا، کنیاتا و مۆیی لە کێنیا، تیوبمەن لە لیبریا و مۆگابە لە زیمبابوێ، دەستڕۆیی زۆریان لەم ولاتانەی ئەفریقیادا لە یەکەمین دەیەی دوای سەربەخۆیی هەبوو تەنیا لـە کۆتایی سالەکانی هەشتا و سەرەتای نەوەد، کاتێك کە سەردەمی کۆن و هەلبژاردنی فرە پارتی دەستیان بە کەمکردنەوەی (رۆلی) تیۆری مرۆڤی گەورەیان کرد تەمـەنی درێـژمی حکومـەتی تاکەکەسی بە سەرهات.

حکومەتە تاکەکەسییەکان، بەگشتی فریۆدەر (تظاهریـة)ن. لـە رۆژئـاوادا جیـاوازی هەیـە لەنێوان تاك و پلەکەیان. لە ئەفریقیادا ئەم هەولـە لـە ئـارادا نـەبووە رژێمـە سـەرۆکایەتی — پاشاییەکان بەرژەوەندییە تایبەتی و گشتییەکان پێکەوە گرێ دەدەن و لەوانەیە ئـەو سـامانەی کە کەلەکەیان کردووە لە ئەنجامی پلەکەیان بێت لە ئەنجامدا سەرکردەکانی ئەفریقیایی هزر لـە فرۆکە، ئۆتۆمبیل، لیموزین، کۆشك و شوێنی پێشوازیی و بوونەکان دەکەنەوە لـە دوو بابـەتی زۆر سەرنجڕاکێش فلیکس بوینگی گوندەکەی خۆی (یاما سۆکۆرو)ی وەك پایتـەخت راگەیانـد و ٣٦٠ ملیۆن دۆلاری بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکرد ئەمەش لە کاتێکدایە کە جان بیـدێل بوکاسـا ٢٠ ملیۆن دۆلاری بۆ تاج گوزراییەکەی لە کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاستدا تەرخانکرد.

هێما و نیشانەکانی سەرۆك کۆماریش شایانی گرنگی پێدانـە، وێنـەی سـەرۆك و راپـۆرتی کارەکانی بزاڤەکەی (هەر چەند بێ ئەنجام) لە رۆژنامەکاندا بلاوکرایەوە چالاکی و خانووەکـەی دەبوایا بۆ هەمووان نمایش کرابا. زیاد لەمـەش فاییلـە و پۆسـتێر بـە وێنـەی سـەرۆك کۆمـار بەرهەمهێنران، هەروەها دەبوایا یاریگە و قوتابخانە و نەخۆشخانەکان بە ناوی ئـەو ناوکرابـان، گشت ئەم کارانە بۆ ئەوە بـوو کـە جێـی هـیچ گومانێـك بـۆ کـەس نـەمێنێ کـە چ کەسـێك فەرمانڕەوایی ولات دەکات. هەروەك چۆن ماکس ڤێبر لە توێژینەوەی سەرکردەکانی میراتی لەو

بڕوایەدا بوو کە ئەم حکومەتانە بە دڵخوازانە (هەر چییەك کە لە حەزی سەرۆك دابێ) بەڕێوەدەبرێن، لەوانەیە حکومەتگەلی ستەمکاری پاشایەتی نوێش لە سنووردار بوونیان بەپێی یاسا فەرمییەکان، تەنانەت ئەو یاسایانە کە خودی خۆیان دایدەرێژن دوورەپەرێزی بکەن. حکومەتی یاسا ناتوانێ بۆ گەرەنتی کردنی ئەم چەشنە سیستەمگەلی سیاسی بێت سەرکردەکانی دوای (تەواوبوونی) کۆلۆنیالکردنی ئەفریقیا یاساکانیان لە بیر بردەوە، بەڵام بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانیان یاسای نوێیای داڕێشت. ڕێساکانی گەمەکردن لە شەوێکدا دەگۆڕدرێت لەم شێوازەدا پێویستە هێزە بەرهەڵستکاران هەروەك پەیڕەوانی سەرۆك کۆمار — پاشا بە توندی کۆنترۆڵ بکرێن لە کاتێکدا کە خودی سەرۆك ئازادە. لە ئەنجامدا لە هەندێ بارودۆخ سیاسەتی ئەفریقیا پێشبینی ناکرێ و گشت کۆمەڵگای ئاسایشی کە سیستەمی حکومەت (شتە) عەقلانی — یاساییەکان بەرهەم دێنێت، ڕەتدەکاتەوە.

تایبەتمەندییەکیتری حکومەتی تاکەکەسی ئەوەیە کە ڕکابەرێتی نێوان بەش و کوتلەکانی دەرەوەی حکومەت هان دەدات. جەکسۆن و ڕۆزنبرگ لە توێژینەوەکی ورد سەبارەت بە حکومەتی تاکەکەسی لە ئەفریقیادا، بەم چەشنە وسفی ئەم سیستەمە دەکەن: جیهانێکی بەبزاڤ (حراك) لە داواکاری و کاری سیاسی کە کەمتر لەلایەن دامەزراوەکان و زۆرتر لەلایەن کاربەدەستان و دەسەڵاتەوە بەرهەم دێت. جیهانێك لە ڕێ و شوێن (گەتنەبەر) بۆ کردە و پەرچەکرداری، بەڵام بە بێ بوونی ناوبژیوان و ڕێکخستنی دامەزراوەگەلی سیاسی کارامە دەسەڵاتی سیاسی وەك هەر شوێنەکیتری ئەفریقیا ئامادەی هاوسەنگییە، بەڵام ئەم کارە زۆرتر لەلایەن دەسەڵاتی زاڵ ئەنجام دەدرێت تا دامەزراوە فەرمییەکان، ئەم هەلومەرجەی ژینگەی سیاسی دەبێتە هۆی دووبەرەکی دووڕوویی، دوو دەستەیی و یەکلاکردنەوە و کودەتا. گرووپەکان بە دوای پێگەیەکی گونجاوی ژێر (کونترۆڵی) سەرکردایەتی کارامەدا دەگەڕێن تا لەم ڕێگەیەوە بەرژەوەندی و لایەنگر بەدەست بێنن، بەڵام ئەگەر سەرکردەکەیان لاواز بێ بە بڕوای ئەم پەیڕەوانە دەسەڵاتەکانی سەرۆکایەتی کۆمار (سەرۆك) دەخەنە ژێر پرسیاردا. زۆرێك لە دەوڵاتانی ئەفریقیا بەدەست ڕکابەرێتی کەسی کراو و کورتکراو لە سیستەمی سیاسیدا دەناڵێنن ڕکابەرێتی بەرەو ناسەقامگیریی و توندوتیژی دەچەمێتەوە و لە زۆربەی کاتەکاندا سوپا لە ئەنجامدانی کودەتادا خاوەن بەرژەوەندی بووە، تەنانەت سیستەمگەلی سەرۆکایەتی — پاشایەتی درێژخایەنیش لە هەمبەر ڕکابەرێتی گرووپی لەرزۆکن و مومکینە لە ئەنجامی ئەم ڕکابەرێتییە دەسەڵاتەکەیان لە دەست بدەن.



ئەگەرچی بەرژەوەندی زۆربەی سەرکردەکان لەوەدایە کە کۆنترۆڵی زۆرتریان بەسەر ڕکابەرێتییە گرووپییەکاندا هەبێ ئەگەر ئەم گرووپانە بە هۆی ڕکابەرێتییەوە تووشی دووبەرەکی و دژیەك بوون ببنەوە سیاسەتمەدارانی پلە نزم ناتوانن بەرەنگاریان ببنەوە و دەبێ سەرۆك کۆمار ئۆلتیماتۆم و دواین بڕیار دەربکات مۆبۆتو سێ سێ کۆ لە کونگۆی کینشازادا ڕێبەری گرووپی چاودێری کردن و ڕکابەری خاوەن هێز و سەرۆکی ئەم دادگایە بوو و خۆی دواین بڕیاری دەرکرد. ریچارد سندبرۆك ڕژێمی مۆبۆتۆ بەمجۆرە وەسف دەکات: ((بە هیچ هێزێکی بەرهەڵستکار روخسەتی چالاکی نادرێت تا لەم ڕێگەیەوە بتوانێ بە دەسەڵات بگات. کاربەدەستانی مۆبۆتۆ دەیانزانی کە پۆستەکانیان بە بڕیاری سەرۆك کۆمار پشت بەستراوە. بۆیە بە بێ هیچ بیانوویەك هەرەشەی لە (کابینەی حکومەت) دەکرد. مۆبۆتۆ ئەفسەر و هێزە وەفادارەکانی (لە پۆستی) کاربەدەستانی خۆجێیی دەگومارد، بەڵام ئەم گومارنانە لە ناوچەکانی دەرەوەی ناوەند بوونی هەبوو و ئەو بەردەوام هێز و ئەفسەرە پلە بەرزەکانی پاکسازیی دەکرد هەموو ڕۆژێك گۆڕانکاریگەلێك بە ئاراستەی هاوسەنگی هێز ئەنجام دەدرا و گشت کەسێك بۆ (سەلماندنی) پشتیوانی و وەفاداری خۆی بە مۆبۆتۆ ڕکابەرێتی یەکتریان دەکرد، مۆبۆتۆ گشت کارتەکانی بە دەستەوە بوو و و کۆنتررۆڵی گەمەی دەکرد)). لە ئەنجامدا سەردەمی حوکم کردنەکەی **٢٢** ساڵی خایاند زیاد لەمەش حکومەتی تاکەکەسی دەبێتە هۆی نالێهاتوویی. هەروەك لە بەشی چوارەمدا سەبارەت بە نەژادگەرایی روونکرایەوە، کاربەدەستانی ئەفریقیا مەیلیان هەیە، کە سەرچاوەکان بەپێی خواست نەك نیاز دابەش بکەن حکومەتی تاکەکەسی لەم گرفتەدا بەشداری دەکات. گرووپە بەهێزەکان کۆنترۆڵیان بەسەر پشکەکەیاندا لە ڕێگەی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە بەدەست دێنن و ئەم کارەش بەلادانی هێزە لاوازەکان ئەنجام دەدرێت، هەروەها سیاسەتی گشتیش پەسەندکردنێکی کەمی (لەلایەن هاوڵاتیانەوە) دەبێت، یاخود مەیلی بۆ جێگیربوون لە حکومەتی تاکەکەسیدا هەیە. لە وڵاتێکدا کە نە سیستەمی پاداشت هەبێ نە سیستەمی سزادان لەلایەن بێبەشکراوەکانەوە، مەیلێکی کەم بۆ بەرفراوانکردنی سیاسەت بە شێوازی سیستەماتیکانە بوونی دەبێت زیاد لەمەش هیچ کەسێك لە پێگەیەکدا نییە کە بتوانێ سیستەمی سەرۆکایەتی — پاشایی بخاتە ژێر پرسیاردا بۆ کۆتایی هێنان بە بابەتی حکومەتی تاکەکەسی ئاماژە بە وتەی جەکسۆن ڕۆزنبرگ دەکەین:

چەمکی حکومەتداری وەك چالاکییەك یاخود ڕێنماییکردنی دەوڵەت بەرەو ئاراستەی ئامانجێکی دیارکراو — بە بۆچوونی عەقلانییەتی مۆدێرن و زانستی سیاسەت- لە زۆربەری

حکومەتە هاوچەرخەکانی وڵاتانی ئەفریقیای ڕەش ئەزموونێکی ناگونجاوە. لە وڵاتانی ئەفریقیاییدا حکومەتداری زۆرتر بە مانای کاپیتانی پاپۆربوون دێت نەك بەمانای بەڕێوەبردن و ڕێنمایی کردنی خودی پاپۆر، ئەمەش بە مانای مەلەوەربوونە تا بەرەو ئاراستەیەکی تایبەت (دیارکراو) ڕۆیشتن.

## گەڕان بەدوای مەشروعییەت:

تەنانەت لە وڵاتە پاشایەتییە نوێیەکانیش کە لەلایەن حکومەتی تاکەکەسییەوە بەڕێوەدەچن پێویستە مەشروعییەت هەبێت. دەسەڵاتی سیاسی ناتوانێ تەنها پشت بە هێزی زۆر ببەستێ بوکاسە ئەمین، ماسیس ئەنجوما پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ ئەم سەرچاوەیەی دەسەڵات هەبوو. لە کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست ئوگاندا، گینەی ئۆستوایی، ئەم چەشنە مەشروعییەتە دەبینرێ ئەوان بەپێی زۆر لێکردن فەرمانڕەواییان کرد نەك بەپێی ئاشتی. تەنانەت ئەمرۆکەش بەکارهێنانی توندوتیژی سنووری تایبەتی هەیە و ئەم پرسەش ئەنجامی نیگەتیڤی لێ دەکەوێتەوە. توندوتیژی لە ماوەیەکی کورتدا کارایی زۆری هەیە، بەڵام بۆ ماوەیەکی دورودرێژ توندوتیژی دەبێتە هۆی بەرهەڵستکاری و بەرپەرچدانەوە بەم پێیەش حکومەتێکی تاکەکەسی لێهاتوو و ئەزمووندار لە تێکەڵ بە یەکدی کردنی توندوتیژی و مەشروعییەت بە مەبەستی پاراستنی حکومەت و بەردەوامی دیسپلینی کۆمەڵایەتی کەڵك وەردەگرێت.

**کەواتە پرسیار ئەوەیە کە چۆن مەشروعییەت دروست دەبێت :**

لە روانگەی ڤێبر سەرچاوەی مەشروعییەتی ڕەسەن تەنها بەشێکە لەم چیرۆکە مەشروعییەتی یاسایی – عەقڵانی بە هۆی حکومەتی پاشایەتی نوێ سنووردارە. کاریزما فاکتەرێکە کە ئەفریقییەکانی لە هەمبەر ((مرۆڤی گەورە)) و ئایدیولۆژیای نەتەوەگەرایدا ملکەچ کرد، بەڵام ئەم پرسە بەتەنیا نابێتە هۆی هێنانە ئاراوەی پشتگیری تەواو. لە دوایین شیکردنەوەدا کەرەستەی پێویست بۆ جێگیرکردنی حکومەتگەلی ئەفریقیا لە سیستەمی تاك پارتیدا بوونی هەیە. حکوومەتە تاکەکەسییەکان بۆ بەدەستهێنانی مەشروعییەتی ڕژێمەکانیان جەخت لەسەر دابەشکردنی سەرچاوەکانی دەوڵەت دەکەنەوە، هەروەك چۆن پێویستە کە لە درێژخایەندا خاوەنداران (فەرمانڕەواکان) بژێوی وەفاداری و پەیڕەوانیان دابین بکەن، ئەوان لە ڕێگەی ساختەکاری کردن لە کاڵاکان، خزمەتگوزاری و (دەستکاری) دامەزراوەکان، تاڕادەیەك



ئاسایشی خۆیان دەپارێزن لە ئەنجامدا هەندێ پاداشت بۆ پەیڕەوان تەرخان دەکرێ، بەم پێیەش سیستەمی دابەشکردن لە ڕێگەی میکانزمی (سیستەمی) دەرەبەگایەتییەوە ئەنجام دەدرێ، کە ئەمەش فاکتەرێکی جێگرەوەی مەشروعییەتی لەدەستچووی ئەفریقیای دوای سەربەخۆییە کە تیایدا دامەزراوە لیبڕاڵ دیموکراسییەکان لە بەین چوون و حکومەتە تاکەکەسییەکان.

## سیستەمی دەرەبەگایەتی:

کریستۆفر کلافهام سیستەمی دەرەبەگایەتی بە ((پەیوەندی ئاڵوگۆڕی نێوان نایەکسانەکان)) وەسف دەکات، کە پەیوەندییەکی دوو لایەنەی سوودمەند لەنێوان گرووپە دەوڵەمەند و هەژارەکانە. ئاغا خزمەتگوزارییە گشتییەکان (مافەکان و دەست گەیشتن بە دەوڵەت) و ئاسایش (لە هەندێ کاتدا کاروبارگەلی وەك ڕزگارکردنی توندوتیژی زۆردارەکی) و سەرچاوەکان (کەناڵی ئاو، ڕێگاوبان و بنکەی تەندروستی) بۆ ڕەعیەتەکان دابین دەکات، لە بڕی ئەمەشدا ڕەعیەتەکان پشتگیری و لایەنگری خۆیان بۆ ئاغا دەردەبڕن کە ئەمەش دەبێتە هۆی بەرفراوانبوونی مەشروعییەتی ئاغا لەمەو بەدواش، سیستەمی دەرەبەگایەتی دەبێت بە شێوازێکی گرێ بەندی سیاسی.

سیستەمی دەرەبەگایەتی لە گشت کۆمەڵگاکانی ئەفریقیادا لە سەرەوە تا خوارەوە بوونی هەیە و تەنیا لە سیستەمەکانی سەرۆکایەتی – پاشایەتیدا ئاڵوگۆڕ لەپێناو پشتگیری لەنێوان کاربەدەستانی حکومەتدا بوونی نییە زنجیرەیەك لە تۆڕەکانی دەرەبەگایەتی بوونی هەیە کە لە دەرەوەی باسی ئێمە دایە. لەم تۆڕەدا هەندێ لە وەرزێرەکان لە ڕێگەی هێڵەکی بێ ژمار تا ئاستی خوارەوەی کۆمەڵگا لەگەڵ سەرۆکی کۆمەڵگادا لە پەیوەندیدان.

هەر ڕەعیەتێك سەرچاوە بەدەست هاتووەکان لە ئاغاوە بۆ دامەزراندنی سیستەمی ئیمپراتۆری بە کاری دێنێت بەم پێیەش تاکەکان لە یەك کاتدا هەم وەك ڕەعیەتێك و هەمیش وە ئاغایەك ڕۆڵ دەگێڕن. بۆ نموونە لە سیستەمی سەرۆکایەتی ــ پاشایەتیدا (فەرمانڕەوا) ئاغاییێکەوە بۆ کاربەدەستانی ژێردەستی، بەڵام ئەم کاربەدەستانە لە پشکی تایبەت بە ئاغا سوود وەردەگرن بۆ دامەزراندن و بەکارهێنانی ڕەعیەتەکانی چینی بۆڕۆکراتێکی ناوەڕاست خودی ئەم کاربەدەستە ناوڕاستانەش ڕەعیەتگەلێکیان لەبەر دەستدایە. ئەم زنجیرەیە لە دەرەبەگایەتی لە گشت ئاستەکانی کۆمەڵگادا تا ئاستی ئاغاکانی ناوچەیش بەرفراوان دەبێت کە تەنانەت لەوانەیە خاوەنی گوندێك بە ڕەعیەتەکانیشەوە بێت، لەم ڕووە، تۆڕەکانی

رەعیەتەکان، ((هێلی پەیوەندی ئەستونی)) لە کۆمەڵگادا پێك دێنن کە دەبێتە هۆی سەقامگیری و دیسپلینی کۆمەڵایەتی. سیستەمی دەرەبەگایەتی بۆ ئەفریقیا گرنگی تایبەتی هەیە، چونکە ئەو کەناڵە سیاسییانەی کە لە کۆمەڵگادا بوونیان نییە، فەراهەم دەکەن لە ژینگەیەکدا کە حکومەتە تاکەکەسییەکان سیستەمێکی تاك جەمسەری لەسەر بنەمای چالاکی سیاسی فەرمی پێك دێنن و چالاکی گشت کۆمەڵگا گەلی سیاسی قەدەغە دەکرێ. تۆڕەکانی دەرەبەگایەتی جۆرێکی سنوورداری ئاڵوگۆڕی سیاسین ئەوان یارمەتی کۆمەڵگای مەدەنی دەدەن بۆ گەڕانەوەیان بۆ پانتایی سیاسی. نوخبەی فەرمانڕەوا لە هەمبەر ئاغا بچووکەکان دان بەخۆدادەگرن، چونکە گشت سیستەم پشت بەستراوە بە سیستەمی سەرۆکایەتی — پاشایەتی کە بەشێکی زۆر لە سەرچاوەکانی دەوڵەت بۆ خۆ تەرخانکردووە لە کۆتاییدا ئەم سیستەمە، سیستەمێکی ((دلۆپ)) یە. سەرۆك پشت بە تۆڕێك دەبەستێ تا لەم ڕێگەیەوە گشت کۆمەڵگا کۆنترۆڵ بکات هەر چەند خەڵك زۆرتر هەست بکات کە بە بەرژەوەندییەکانی سیستەمی سیاسی دەگەن، مەشروعییەت و پشتگیری زۆر لە سیستەم و ڕژێم دەکرێ.

مەشروعییەت لە ڕێگەی ئاغاوە بەدەست دێت هەرچەندە ئەم مەشروعییەتە لەرزۆکە. ئەگەرچی سیستەمی دەرەبەگایەتی خۆی لە توندوتیژی دوور دەخاتەوە و بە شێوەیەکی دوولایەنە لە بەرژەوەندی هەردوولایەن سوودمەند دەبێت، بەڵام بە هیچ جۆرێك ئەم سیستەمە گرێبەندێکی دادپەروەرانە نییە. تا ئەو ڕادەیەی کە بکرێ ئاغاکان سامانێکی لەڕادەبەدەر کۆ دەکەنەوە و تەنیا هەندێ لە سەرچاوەکان کە بۆ پاراستنی ڕەعیەتەکان بەپێویست دەزانرێ تەرخان دەکرێ. لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال بە هۆی نەبوونی بازاڕی جێگیرەوە کە لە ڕێگەیەوە ڕەعیەتەکان بتوانن سەرچاوە بەدەست هاتووەکان لە ڕکابەرێتییەکی گەورەدا (وەك ڕکابەرێتی چەند پارتی) بفرۆشن، سەرچاوەکانی دابەشکردن لە ئاستێکی نزمدا ڕادەگیردرێت لە ئەنجامدا زۆربەی ئەفریقییەکان لە دەیەی یەکەمی دوای کۆلۆنیال تەنیا هەوڵیان دەدا درێژە بە ژیان لە چوارچێوەی سیستەمی بەرقەراردا بدەن. ڕێگەی ئەلترناتیڤ بۆ بەرپەرچدانەوەی بارودۆخی بەرقەرار تێچوونی زۆری پێویست بوو و ڕووبەڕووی مەترسی بوونەوە لەلایەن ڕەعیەتەکانەوە (ئەگەر ئەوان لە توانایاندا با بەرەنگاری سیستەمی دەرەبەگایەتی ببنەوە) ئەگەری ئەوەی هەیە کە گشت ئیمکاناتەکانیان لەدەست بدەن. بۆیە سیستەمی دەرەبەگایەتی سەقامگیری و مەشروعییەتی بۆ ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال بەدیاری هێنا.



بەم پێیەش سیستەمی مەشروعییەت پشت بەستراو بە فەراهەم کردنی ئیمکاناتی ماددی بوو. هەروەك لە بەشی دەیەمدا دەبینین، کاتێك سیستەمی دەرەبەگایەتی بەرەو ئاوابوون چوو کە ئابوور لە ساڵانی هەشتا و نەوەددا ڕووبەڕووی گرفت ببووە لە دەرەنجامدا مەشروعییەت و پشتگیری کردن لە حکومەتە تاکەکەسییەکان کەم بووە بە بێ دابەشکردنی سەرچاوەکان سیستەمی دەرەبەگایەتی، ئاغایانی ئەفریقیا بۆ ماوەیەکی درێژ تەنیا هەرەشەکردن لە بەکارهێنانی توندوتیژدا نەبێ هیچ بیانوویەکیان نەبوو.

## دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی:

لە ڕووی بابەتی سەرەکی ئەم پەرتووکەوە، پرۆسەی ناوەندگەرایی بەخێرایی دەبێتە هۆی بەرفراوانبوونی دەوڵەت لە هەمبەر تێچوونی کۆمەڵگای مەدەنی. دامەزراوە بەجێماوەکان لە هێزی کۆلۆنیال لە سەردەمی دژە کۆلۆنیالی لە ناو چوون و دەسەلات لە کۆمەڵگای مەدەنی و دامەزراوە پەراوێزەکانی دەوڵەت دوورکەوتەوە و لە بڕی ئەمەشدا بە دەسەڵاتی ناوەندی سپێردرا و ئەم کارەش بوو بە دامەزرێنەری سیستەمی سەرۆکایەتی — پاشایەتی کە لە حکومەتی تاکەکەسی دا بەرجەستە کرا.

ستراکتۆری سیاسی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال، ئەگەرچی دوای سەربەخۆیی سیستەمی دەوڵەتی مۆدێرنی پاراست، بەڵام چەندین وڵات هێدی هێدی بەرەو قۆناغێکی پێشوویی هەنگاویان نا. بە گشتی ئەفریقییەکان لە ژێر (دەسەڵاتی) حکومەتگەلێك دەژیان کە سەقامگیری و دیسپلێنی بە دیاری هێنابوو. زیاد لەمەش لە کۆمەڵگاگەلێك کە شووناسی نەتەوەیی لەرزۆك و سەرچاوەکان کەم بوون، دەوڵەتی ناوەندگەرا سەریان هەڵدا. سەرکردەکان، پشت بەو بیانوویەیان دەبەست کە دامەزراوەکانی لیبڕاڵ دیموکراسی بۆ ژینگەی سیاسی ئەفریقیا ((نەناسراون)) و ئەم بابەتەش دەبێتە هۆی ئازادی خوازی و خودموختاری کە ئەفریقییەکان لە سەردەمی سەربەخۆییدا بەدەستیان هێنابوو لە حکومەتە ناوەندگەراکاندا، پێویستە کۆمەڵگا لەرزۆکەکان پەیوەندی لەگەڵ یەکتریدا بەرقەرار بکەن و یەکتر بەو تواناییە بگەینن کە بتوانن سوود لە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی مۆدێرن وەربگرن. ئەگەرچی ئەم سەرچاوانە لە ڕووی ماددییەوە فەراهەم نەکران، بەڵام لە لایەکیترەوە کۆمەڵگای مەدەنی بە شێوەیەکی تایبەت دواکەوتوو ڕاگیردرا. زیاد لەمەش بە توندی بەرەنگاری لە موبیلیزەکردنی سیاسی ئەلترناتیڤ کرا و تەنانەت بە توندوتیژاویش سەرکوت کران.

سیستەمە دەرەبەگایەتییەکان لەبری کۆمەڵگای مەدەنی پێشنیاریان بۆ خەڵك کرد و رایانگەیاند کە نوێنەرانی کۆمەڵگای مەدەنی کەم و کوری زۆریان هەیە. سیستەمی دەرەبەگایەتی بە بێ سوود وەرگرتن و بەکارهێنانی رەعیەتەکان لەلایەن ئاغاوە، نەیدەتوانی بوونی هەبێ نوخبەی سیاسی لەم رووەوە خەڵکی بێ پەنای فریودا. ئاغاکان برێك لە سامانەکەیان بۆ رەعیەتەکان تەرخانکرد، بەڵام خۆشگوزەرانی و سامان لە خزمەت پێویستییە شاراوەکانیاندا بوو. کاتێك کە چالاکییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی قەدەغەکرا. بۆرۆکراسی دەوڵەتی ورووژایەوە و پەیوەندی نێوان هەر دوو لایەن (ئاغا و رەعیەت) بە نایەکسانی بوو. دەوڵەتە ناوەندگەراکان لە دامەزراندنی حکومەتێکی تاکەکەسی شکستیان خوارد. دەوڵەتە ساغلەمەکان رەنگدەرەوەی پێداویستی هاوڵاتییەکانی بوو و ئەوان (دەوڵەتە ساغلەمەکان) لە هەوڵدانن بۆ راوێژکردن لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنی، بەڵام بە پێچەوانەوە دەوڵەتە ناوەندگەراکان پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنیدا لە ناو دەبەن. ئەو دامەزراوانەی کە لە توانایاندا بوو بەرهەمهێنان بکەنەوە (Feed baek) و راوێژکاری پێویست پێشکەش بکەن و وەك بەهایەك سەیر بکرێن، وەك رێبازگەلی جیاخواز سەیر دەکران لە دوای کۆلۆنیال یەکسەر لە ناوچوون و لە بری ئەمەشدا دامەزراوە جێبەجێکارەکانی ناوەند و سەرکردەکانی پشتیان بە ئەزموون و رێ و شوێن گرتنەبەری خۆیان بەست. ئەمەش هەر ئەو شتەیە کە زۆربەی کەسایەتییە سەرەکییەکانی دەوڵەتانی ئەفریقیا، بە هۆی بەکارهێنانی ئەم (ئەزموون و رێ و شوێنانە) پەیوەندییەکانیان لەگەڵ خەڵك لەدەستدا و درزی نێوان ئەم سەرکردانە و خەڵك پەرەی سەند.

لەو وڵاتانەی کە خاوەن سەرچاوەی پێویست بوون درزی نێوان فەرمانڕەوا و هاوڵاتیان نەبوو بە گرفتێك، چونکە سەرچاوەکان لە رێگەی تۆڕی دەرەبەگایەتییەوە بۆ نەهێشتنی هەر جۆرە دڵەڕاوکێی خەڵك لە حکومەتەکەیان بەکاردێن، ئەگەرچی لە کیشوەری (ئەفریقیادا) سەرچاوەکان سنووردارن، کەواتە درز تێکەوتن نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا زۆر مەترسیدارە. رژێمە نالێهاتوو و گەندەڵەکان سەرچاوەی پێویستیان بۆ بەدەستهێنانی ئەزموونەکانی کۆمەڵگای مەدەنی (لە رووبەڕووبوونەوەی) قەیرانی مەشروعییەتیان لە دەستدایە. لە ئەنجامدا لەوانەیە هێزی سەرکوتکردن بۆ پڕکردنەوەی ئەم درزە بەکاربهێنرێ، بەڵام تەنانەت بە بەکارهێنانی هێزی سەرکوتکاریش، حکومەتی ئەفریقیا هەمیشە لە پاراستنی دەسەڵاتدا سەرکەوتوو نەبووە. لەم ئاراستەیەدا دەتوانرێ ئاماژە بە هەندێ کودتای سەربازی لەم کیشوەرەدا لە ساڵانی شەستەکان و حەفتاکان و هەشتاکان بکەین. بە کۆتایی



هاتنی ساڵانی هەشتا، ئەم گەمەیە کۆتاهات. لە ئەنجامی شکستی ئابووری هیچ سەرچاوەیەك بۆ پاراستنی مەشروعییەتی پێویست بوونی نەبوو و تۆڕی دەرەبەگایەتی بە خێرایی لەرزۆك و بۆ ئاستێکی نزم دابەزی، لە ئەنجامیشدا هەندێ ناوچە بەرەو هەرەس هێنان رۆیشتن. بە واتایەکیتر سیستەمی سەرۆکایەتی — پاشایی هەوڵی دەدا رژێمەکەی لیبراڵ بکات و رکابەرێتی فرە پارتی بۆ بەدەستهێنانی مەشروعییەت لە دوایین چرکەساتەکاندا سەرلەنوێ پێناسەکرایەوە (بڕوانە بەشی یازدەیەم). ئیتر سەردەمی دەوڵەتی ناوەندگەرا و حکومەتی تاکەکەسی بەلانیکەم لە شێوەی توندڕەوەکەیدا بەسەرهات.

**خشتەی ژمارە ١-٦: تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی ناوەندگەرا**

**حکومەتی تاکەکەسی و سیستەمی دەرەبەگایەتی:**

| | |
|---|---|
| تایبەتمەندییەکان دەوڵەتی ناوەندگەرا | . کەڵەکە بوونی دەسەڵات لە لقە جێبەجێکەرەکاندا، زۆرتر لە دەست سەرۆك کۆمار یان سەرۆك وەزیران.<br>. مۆبیلیزەکردنی سیاسی بە شێوەیەکی زاتی لە رێگەی یەك پارت کە دواجارە پەراوێز دەکرێ.<br>. کۆمەڵگای مەدەنی لە بڕیاردانە گرنگەکانی دەوڵەت بێبەشە.<br>. سەرچاوەکانی بەهێزبوونی بەرهەڵستکاران سەرکوت یاخود لە بەین دەبرێن.<br>. رێزگرتنێکی کەم بۆ مافی مرۆڤ.<br>. نەبوونی هەڵبژاردنی ئازاد و رکابەرێتی.<br>. حکومەتە ناوچەییەکان، پەرلەمان و دامەزراوە دادوەرییەکان لەلایەن نوخبەی دەسەڵاتدارەوە دەستنیشان دەکرێن.<br>. یاساگەلی توندی ئاسایش بەدەست سەرکردەکانی دەوڵەتەوە.<br>. یاساکان، رۆڵی سەرەکی لە ئابووردا دەگێڕن و ئابوور لەلایەن دەوڵەتەوە دیار دەکرێت.<br>. دەوڵەت لەلایەن کەسێکی کاریزماتیك و حکومەتی تاکەکەسی بەرێوە دەبرێت. |

| | |
|---|---|
| | مەشروعییەت لە رێگەی سیستەمی نیوپاتریمونالیزم (باوك پاشایەتی نوێ) و سیستەمی دەرەبەگایەتی سەرلەنوێ بەرهەم دەهێنرێتەوە. |
| تایبەتمەندییەکانی حکومەتی تاکەکەسی | . دەوڵەت لەلایەن کەسێکی کاریزماوە بەڕێوە دەبرێ.<br>. دامەزراوەکانی دەوڵەت و دەسەڵات وەك موڵکی تایبەت هەژمار دەکرێ تا موڵکێکی گشتی.<br>. پەیوەندییەکانی پشت بەستوو بە سیستەمی دەرەبەگایەتی مەشروعییەت لە ناو کۆمەڵگادا سەرلەنوێ بەرهەم دێنێتەوە.<br>خۆبایی بوون و دووڕوویی (تظاهر) لە رێگەی سامانی سەرکردەوە نمایش دەکرێ.<br>. حکومەتی تاکەکەسی شوێنگری حکومەتی یاسایی دەبێتەوە.<br>. رکابەرێتی گرووپی لەپێناو نوخبەی فەرمانڕەوا لە ئارادایە.<br>. دەوڵەت ناکارامەیە. زۆرتر سەرقاڵ بوونی دەوڵەت بە هۆی خۆراك دانی تۆری.ِ دەرەبەگایەتییەوەیە تا بەڕێوەبردنی سیاسەتی گشتی |
| تایبەتمەندییەکانی سیستەمی دەرەبەگایەتی | . پەیوەندی ئاڵوگۆڕکردن لەنێوان نایەکسانەکاندا.<br>. دەسەڵات لە دەوڵەتدا بۆ بەرهەم هێنانی ئاغا بەکاردەهێنرێ.<br>. زنجیرەیەك لە ئاغا و رەعیەتەکان کە بە خێرایی لە کۆمەڵگادا پەرەدەستێنن.<br>بەرهەم هێنانی کەمترین مەشروعییەت. |

### بابەتی توێژینەوە: حکومەتی تاکەکەسی لە کەناری عاجدا

هەڵکەوتەی کەناری عاج بە ١٤ ملیۆن دانیشتوان لە رۆژئاوای ئەفریقیا و کەنداوی گینەدایە. ئەم وڵاتە لە مرداوەکانی کەناری زەریای ئەتلانتیك و دارستانی پڕ باران لە باشوور و دەشت و پێ دەشت لە باکووردا پێکهاتووە. ئەم وڵاتە دوای ئەوەی کە بە فەرمی لە ساڵی ١٨٩٣دا بووبە کۆلۆن، لە ساڵی ١٩٦٠ دا سەربەخۆیی وەرگرت زۆرترین وەرچەرخان لە



قۆناغی دوای کۆلۆنیال سەبارەت بە پرسی بووژانەوەی ئابووری روویدا، کارکردنی ئەم وڵاتە بە بەراورد لەگەڵ دراوسێییەکانیدا زۆرتر بوو و وەپێشیان کەوت بە چەشنێك کە دووەمین بووژانەوەی ئابووری لە رووی داهاتی تاك لە دوای ئەفریقیای باشووری، بەدەست هێنا ئەگەرچی موعجیزەی کەناری عاج لە زۆربەی کاتەکان لە هەشتا و نەوەدەکاندا لە ئەنجامی هەڵبەزین و دابەزینی نرخی قاوە و کاکائۆ زیانی زۆری بینی.

لە رووی سیاسییەوە، کەناری عاج لە سێ دەیەی یەکەمی دوای سەربەخۆیی لەلایەن فیلیکس هۆیفیت حوکمڕانی دەکرا ئەو کونترۆڵی بەسەر گشت چالاکییەکانی دەوڵەتدا هەبوو و مێشکی بیرکەرەوەی ناوەندگەرایی دەوڵەت بوو بوینگی لە سەردەمی بەدەسەڵات گەیشتنیدا حکومەتی تاکەکەسی دامەزراند و مەشروعییەتی لە رێگەی کۆمەڵێك لە تۆڕەکانی دەرەبەگایەتییەوە کە بە سەر گشت ناوچەکانی کۆمەڵگادا دەستڕۆییان هەبوو، بەدەستهێنا. ئامادەیی بۆ (دامەزراندنی) دەوڵەتی تاك پارتی بەخێرایی دەستی پێکرد، پارتی دیموکراتێکی کەناری عاج، بە درێژیی ساڵانی ١٩٥٢ تا ١٩٥٧ بە ئامانجدارانە هەوڵیدا گرووپە نەیارەکان بۆ خۆی راکێش بکات، لە دوای ئەمەش کاتێك کە پارت زۆرینەی دەنگەکانی لە هەڵبژاردنی دوای سەربەخۆییدا بەدەستهێنا بوویە پارتی فەرمانڕەوای کەناری عاج. ئەم بابەتەش یارمەتیدەری ئەو راستییە بوو کە سیستەمی هەڵبژاردن تەنها لیستی پێشکەشکراو لەلایەن ئەم پارتەوە لەخۆ دەگرت و هیچ یاسایەك کە دەرفەت بە پارتە نەتەوەییە بچووکەکان بدات بوونی نەبوو و لە بری ئەمەشدا هەر پارتێك ناچار بوو کە رکابەرێتی یاخود پشتگیری لە پارتی دیموکراتێك بکات و پاڵێوراوەکانیش تا کاتی هەڵبژاردنەکانی (داهاتوو) بێبەش دەکران و ئەمەش گەرەنتیکەر بوو بۆ ئەوەی کە نابێ پاڵێوراوەکان وەك پاڵێوراوی سەربەخۆ یاخود رێکخراوێکی کۆمەڵی وەکو پارتێکی بەرهەڵستکاری جیا بێنە گۆڕەپانەوە.

پارت، پەیڕەوی لە تاکتیکە کلاسیکییەکانی تایبەت بە دەوڵەتانی تاك پارتی کرد و لەڕێگەی لەناوبردنی سەرچاوەکانی بەرهەڵستکاران ئەو کەسانەی کە دەیانتوانی بەرەنگاری تاك جەمسەری سیاسی ببنەوە لەڕێگەی دەستکاریکردنی هەڵبژاردنەکان و ترساندنی بەرهەڵستکاران، لابران. هەر کە پارت توانی بەسەرکەوتوانە گشت بەرهەڵستکارە نەتەوەییەکان دژی حکومەتی کۆلۆنیالی مۆبیلیزە بکات، لە دوای سەربەخۆیی بەرهەڵستکارە ماوەکانی سەرکوت کرد و بە پراکتیکی بوو بە رژێمێکی تاك پارتی. بوینگی بوو بە هۆکاری نوشست هێنان و لاوازبوونی پارت. رکابەرێتی بۆ بەدەستهێنانی پۆستەی پارتەکان بەخێرایی پەرەی سەند لە کاتێکدا لە

هەوڵدانێکی کەم بۆ پاراستنی پەیوەندی لەگەڵ گەلی کەناری عاجدا لە ئاستێکی بەرفراوان ئەنجامدرا. هەڵبەت ستراکتۆرەکان، لەبری ئەوەی کە لە خزمەتی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتداران و هاوڵاتیاندا بێ دووبارە بەرەو لایەنی سەرچاوەی ئاغاکان ئاراستەکران.

بەپێی راپۆرتی ئەفریقیا سەردەم، لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٧٠دا پارت وەك ئەنجوومەنی لوردەکانی بەریتانیا- جێگەیەك کە دەبێ پارتی وەفاداری کۆن بەرێز و بەپاراستنی سەرچاوەی داهات، خانەنشین بکرێ- کاری کرد. بەڵام بەبێ ئەنجامدانی ئەم کارە ئەم پارتە دەسەڵاتی فراوانی بەدەستهێنا. هەڵبەت لە ناو ئەندامانی ئەم پارتە تەنیا سەرکردەکانی بەڕێوەبردنی سیاسی توانییان دەسەڵات بگرنە دەست، چونکە ئەم بەڕێوەبەرایەتییە لە کاربەدەستانی متمانەپێکراوی بوینگی پێك هاتبوو کە زۆربەی پۆستە باڵاکانی دامەزراوی جێبەجێکردنی ناوەندیان لە ئەستۆ بوو و بە وتەی فرانس فانون پارت ببوو بە ((ئەسکە پەیکەری بەراییەکەی خۆیی)).

کەناری عاج لە ساڵانی ١٩٦٠ تا ١٩٩٠ دا دەوڵەتێکی ناوەندگەرای بەرجەستەکرد کە تیایدا هەر جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە ناو حکومەتدا دەتوایەوە ئەگەرنا سەرکوت و لادەبردرا. هویفیت بوینگی رایگەیاند کە ((رکابەرێتی لە وەرزشدا سوودمەندە، بەڵام لە سیاسەتدا ئەو شتەی کە پێویستە سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، رۆحی گرووپییە)) هەر بۆیە بە هیچ سەرچاوەیەکی سەربەخۆ لە دەسەڵات دەرفەتی بوورژانەوە و گەشەکردن نەدرا. بۆ نموونە ئەنجوومەنەکانی کۆمەڵگای مەدەنی یان بەپێی سیاسەتی دەوڵەت گۆڕدران یاخود بەتەواوی لەناوبردران. بۆ نموونە سەرۆکەکانی یەکێتییە بازرگانییەکان، پۆستگەلێکیان لە دەوڵەتدا بەدەستهێنا، بەڵام کرێکارە خەباتکەرەکان کە خوازیاری چالاکی گێران لە دەرەوەی (چوارچێوەی) حکومەتدا بوون بە توندی سەرکوتکران. هەروەك چۆن کاتێك کە بە سەرکردە سوونەتییەکان پێشنیارکرا کە لە ژێر ناوی گفتوگۆکردن بە سەرپەرشتی دەوڵەت و بە ئیفتخاری سەرۆك کۆمار بچنە ژێر رکێفی دەوڵەتەوە، لقی گەنجانی پارت دامەزرا. لە سەر تابلۆی بەکارهێنرای یەکەمین کۆنگرەی پارت دوای سەربەخۆیی نووسرابوو کە ((یەك پارت بۆ یەك خەڵك بە یەك سەرکردە)) ئەم بابەتە بە جوانی وەسفی ژینگەی سیاسی کەناری عاج دەکات، دەسەڵاتەکانی دادوەری و یاسادانان هەروەك (دەسەڵاتی) حکومەتی خۆجێی بە هۆی ناوەندگەرایی کردنی دەوڵەت لەلایەن هویفیت بوینگییەوە، دەسەڵاتەکەیان لەدەستدا. ئەنجوومەنی ناوچەییەکان بێکەڵك لێهاتن و لە بریدا دامەزراوە ناوچەییەکان کە راستەوخۆ لەلایەن دەوڵەتی ناوەندییەوە ئاراستە و بەڕێوەدەبران، جێگیریان بوونەوە، ئەنجوومەنی نیشتیمانی گۆڕدرا بۆ ئەنجوومەنێکی مەشروعییەت بەخش و پشتیوانی سیاسەتەکانی بوینگی، تا دەمەزراوەیەك بێت کە سیاسەتەکان تاوتوێ بکات یاخود کێشە گشتییەکان چارەسەر بکات. دوای ناوەندگەرایی کردن دەسەڵاتی دادوەریش کەوتە ژێر دەستی دەوڵەت و دادگای تایبەت بۆ پرسە سیاسییەکان دامەزران و بە گشتیش دەسەڵاتی دادوەری بووبە پەناگایەك بۆ سەرۆك کۆمار. لە چەقی ئەم سیستەمە ناوەندگەرایە سیاسییەدا خودی هویفیت بوینگی دەهات. ئەو بە کۆنترۆڵ کردنی پارت و تاك جەمسەرکردنی سیاسەتەکانی کەناری عاج تا کاتی مردنی لە ساڵی ١٩٩٣ دا درێژەیدا. جەکسۆن و رۆزبنرگ هویفیت بوینگی بە کەسێکی دژی سیاسەت وەسف دەکەن، هۆکاری ئەمەش ئەوە بوو کە ئەو فەرمانڕەوایەك بوو هەوڵی دەدا سیاسەت لە پانتای گشتی دوور بکاتەوە، لە هەمان کاتیشدا ئامادەیی خودی خۆی بە توندی لە دەسەڵاتی سیاسیدا مایەوە و تەشەنەی سەند. هەر کەسێك کە شتێکی لە کابینەی هویفیت بوینگیدا بەدەستهێنا تەنیا ئامرازێکی جێبەجێکار و بە رەعیەتی خودی سەرۆك کۆمار هەژمار دەکرا. ئەم چەشنە سیاسەتمدار و بۆرۆکراتانە کە هەوڵیان دەدا بۆ بە دەستهێنانی پلەی بەرز لە کەناری عاجدا لە رێگەی پشتگیری خودی بوینگی بەم پلەیە دەگەیشتن، تەزکییەی پاسەوان و ئەفسەرانی سەرۆکایەتی کۆمار لەلایەن بوینگییەوە دەردەکرا تا بە باشی ئەرکەکانیان ئەنجام بدەن، ئەوان لە سەرۆکایەتی بوینگی بۆ بنیتانانەوەی ئیمپراتوری لە بناغەی ئاغاگەرایەتی خۆیان، سوودیان وەردەگرت، بەڵام ئەگەر ئەوان لە وەفادارییان بۆ سەرۆك شکستان دێنا، پێگەکەیان لە دەست دەدا و سەرچاوەی سامانەکەشیان دەبڕدرا. زیاد لەمەش سیستەمی حکومەتی هویفیت بوینگی ئاڵۆزییەکی زۆری هەبوو، هەندێ لە ئەندامان و کاربەدەستان، لە سێ دامەزراوەی سەرەکیدا، واتە بەڕێوەبردنی پارتی سیاسی ئەنجوومەنی نیشتمانی و ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی دا، ئەندام بوون و بە توندی پێکەوە گرێدرابوون. (تیسیلی می با کاری) بەپێی ئەو ئەنجامەی کە بەدەستهێناوە ئاماژە بەوە دەدات کە تەنیا ٣٢٠ کەس لە کاربەدەستان ١٠٤٠ پۆستیان لە دامەزراوە دەوڵەتییەکاندا لەنێوان ساڵانی ١٩٥٧ تا ١٩٨٠ لە دەستیان دابوو. هەروەك چۆن گشت گەنجانی کەناری عاج دەزانن کە چانسی چوونەناو سیستەم و تەنانەت ئەگەری بەدەستهێنانی پۆستی جێبەجێکردن کاتێك مومکین بوو کە ئەوان بەپێی رێساکانی گەمەی سیاسی کاریان کردبا، زیاد لەمەش لە گشت کاتەکاندا وەفاداربوونیان بۆ ئاغاکەیان (هویفیت بوینگی) نیشان دابویا.

لێرەدا بوو کە هویفیت بوینگی مەشروعییەتی بەدەستهێنا، زیاد لەمەش، دەوڵەتی کەناری عاج دەرفەتێکی کەمی بە دامەزراوە یاساییەکانی بەخشی، ستراکتۆرە دیموکراتییەکان قەدەغەکران و بەشداری گشتی لە پرۆسەی سیاسیدا سنووردار و تەنانەت بوونیشی نەما. لەبری ئەمەشدا سیستەمی حکومەتی تاکەکەسی هویفیت بوینگی بۆ بەردەوامی پشتگیری سیاسی پشتی بە دابەشکردنی شانازییەکان (افتخارات) بەست و لەم رووەوە، سەرۆك کۆمار لەوبڕوایە دا بوو کە سیستەمی دەرەبەگایەتی هەڵقوڵاو لە بووژانەوەی ئابووری دەتوانێ جێگری بەشداری سیاسی ببێتەوە. هویفیت بوینگی لە تروپکی سیستەمی دەرەبەگایەتیدا بوو کە بەتوندی و بەقوڵی لە کۆمەڵگای ئەفریقیادا چەقی گرتبوو، رژێمی درێژخایەنی بوینگی (٩٣ - ١٩٦٠) بۆ پاراستنی ئەم تۆڕە پشتی بە تواناییەکانی سیستەمی سەرۆکایەتی- پاشایی گرێدا. دەکرێ زۆرترین نموونە بۆ سیستەمی دەرەبەگایەتی هویفیت بوینگی لە ئاستی خۆجێی (ناوچەیی) ببینرێ. کاربەدەستە دەوڵەتییەکان و کۆمەڵگا ناوچەییەکان پێشنیاریان دەکرد کە پشگیری لە سەرۆك کۆمار بکەن: بۆ نموونە دوای قۆناغێکی کاتی لە کەمبوونەوەی (افول) سیاسی لەسەرتاسەری وڵاتدا. شاری (ئاجاما) لەساڵانی شەستدا رێژەیەکی زۆر لە بودجەی گشتی بازاڕی بەدەستهێنا و لە بۆنەی کردنەوەی بازاڕی ئاجاما وەزیری ناوخۆ (ئاگۆستی دێنیس) لەدانیشتوانی ئەم شارە بە هۆی وەفاداربوونی کاربەدەستەکانی (خۆجێی) بۆ سەرۆك کۆمار، دەوڵەت و کەسایەتییە سیاسییەکانی پارت لە سەردەمی ناڕەزایی دەربڕینەکانی دژی حکومەت، سوپاسگوزاری کرد. ئەم کارە لە بۆنەی ساڵیادی سەربەخۆیی کە هەر ساڵ بە مەبەستی هاندان یاخود بەدەستهێنانی وەلا لە ناوچەیەکی تایبەتدا بەڕێوەدەبرا، دەبینرا. هەڵبەت لەپێناو بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگایی ناوچەی دەوڵەت ناچاربوو یەکێك لە ئەندامانی ئەم ناوچەیە بکات بە ئەندام کابینە. بۆنموونە وەزیری ئاوەدانکردنەوە و پلانداناني شارەکان گشت کات هاوشارەکانی بۆ پلانی گەشەکردنی سوودمەند هاندەدات. ئەگەرچی گوندی هویفیت بوینگی واتە (یامۆسۆکۆرۆ) زۆرترین سوودی وەبەرکەوت و گوندەکەی بوو بە پایتەختی کەناری عاج و ئەمەش دیاری سەرۆك کۆمار بۆ وڵاتەکەی بوو. هەروەهاش بەتێچوونی چەند ملیۆن دۆلار بینایەکی ئاواکرد کە لەکاتی ئاواکردنی دا، گەورەترین کەنیسەی جیهان بوو.

لەکۆتایی ژیانی هویفیت بوینگی زۆربەی خەڵك داواکارییەکانیان بۆ (دیاریکردنی) جێگر و نوێنەری دەوڵەت، خستەڕوو، بۆیەش ئاغاکان نەیاندەتوانی بۆ ماوەیەکی درێژ لەم تەحدا سەرەکییە بۆ حکومەتی تاکەکەسی سوود وەرگرن. لە کەناری عاجدا خەڵك لە سەرتاسەری



وڵاتدا چوونە ناو کۆمەڵگای مەدەنی، ئەم داواکارییەش لە سەرتاپای وڵاتدا لەپێناو گەڕانەوەی دەوڵەت بۆ دیموکراسی فرەپارتی ساڵانی هەشتا و نەوەد سەری هەڵدابوو. ئەم بارودۆخە دەرەنجامی کارکردنی لاوازی ئابووری بوو کە لە ئەنجامدا لاوازی تۆڕەکانی دەرەبەگایەتی دروستبوو و ئەمەش راستەوخۆ لە ئەنجامی کارکردی لاوازی ئابووری و دابەزینی نرخی قاوە و کاکائو بوو کە بوو بە هۆی لەناو چوونی سیستەمی دەرەبەگایەتی. سەرەتا (١٩٦٠) هویفیت بوینگی لەو بڕوایەدا بوو کە رکابەرێتی فرە پارتی لە کەناری عاجدا، تا ئەو کاتەی کە گشت وڵات بە تەواوی یەکگرتوو نەبێ مومکین نییە. ئەگەرچی ئازادسازی سیاسی لە ساڵی ١٩٨٥ دا دەستی پێکرد و دەرفەت بە رکابەرێتی ئازاد بە پالێوراوانی پارت لە ئەنجوومەنی نیشتمانی درا و رکابەرێتی بۆ دیموکراسی فرە پارتی پەرەی سەند، بەڵام ئەم وڵاتە لە ساڵی ١٩٩٠دا یەکەمین رکابەرێتی بۆ خولی سەرۆك کۆماری (دوای ٣٠ ساڵ حوکمڕانی) بە خۆوە بینی ئەگەرچی بوینگی بە جیاوازییەکی زۆر لەم هەڵبژاردنانەدا سەرکەوت و پێگەی وەك ئاغایەکی پلە باڵا و وەك سەرۆك کۆمار – پاشا قایم کرد، بەڵام ناوەندگەرایی دەوڵەتەکەی لەرزۆك و لاواز بووە و بیرۆکەی مەشروعییەتی یاسایی – عەقڵانی برەوی سەند و ئەم بابەتەش لە کۆتایی تەمەنی هویفیت بوینگی، واتە لە ساڵی ١٩٩٣دا دیارکرا. ناتوانایی بەرفراوانی سیاسی لە ساڵانی دوای مردنی هویفیت بوینگی نمایشت کرا و هیچ کەس و پارتێك لە توانایدا نەبوو بۆ کۆنترۆڵ کردنی شۆڕش و پشێوییە بەهێزەکانی گۆڕەپانی کەناری عاج، مەشروعییەتی پێویستی یاخود زۆلێکردن (بۆ خۆی) بەرهەم بێنێت. ئەگەرچی جێگری بوینگی، (هنری کۆنان بێدیە) توانی لە هەڵبژاردنەکانی فرە پارتی ساڵی ١٩٩٥دا سەرکەوتن بەدەست بهێنێ و توانی دەسەڵاتەکەی لە رێگەی ترساندنی پارتە نەیارەکان و گۆڕینی یاسای بنەڕەتی کە دەسەڵاتی بەرفراوانی بە سەرۆك کۆمار دەبەخشی بپارێزێ. بێدیە لە قۆناغێکی پڕ لە بارگرژی سیاسی، نەژادی مانگرتنی کرێکاران و خۆپێشاندانی خوێندکاران. فەرمانڕەوایی ئەم وڵاتەی کرد و سەرئەنجام لە ساڵی ١٩٩٩دا بە هۆی کودەتای سەربازی لە سەر کار لادرا و قۆناغێك لە نائارامی و پێشوی سیاسی بە سەر وڵاتدا زاڵبوو و هێزە سیاسییەکانی وڵات بەرەڵا (بە مانای تەواو نیگەتیڤی وشە) بوونەوە.

ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە بە هۆی پشێوی سیاسی هەڵقوڵاو لە چاکسازیی و ئاشت بوونەوەی دووبارە توندوتیژی سیاسی پەرەی سەند و لە ساڵی ٢٠٠٢دا رکابەرێتی لێکەوتەوە کە بە هۆی دەستتێوەردانی فەڕەنسا و پاسەوانانی ئاشتی کۆمەڵگای ئابووری رۆژئاوای

ئەفریقیا ((community of west African statescecowas)) بە کۆتا هات ئەگەرچی حکومەتێکی ئاشتی نەتەوەیی لە ساڵی ٢٠٠٣دا پێکهات، بەڵام وەها دەبینرا کە سیاسەت لە کەناری عاجدا زۆر مەترسیدار و پەرۆشاوی بێت و هیچ کەسێك لە توانایدا نەبێ کە دووبارە فۆرمولی هویفیت بوینگی بۆ سەقامگیری هەڵقولاو لە ناوەندگەرایی، سیستەمی دەرەبەگایەتی، مەشرعییەت و سەرکوتکردن سەرلەنوێ بەرهەم بێنێتەوە.

**کەناری عاج:**

| | |
|---|---|
| رووبەر | ٣٢٢/٤٦٢ کیلۆمەتری چوار گۆشە |
| دانیشتوان | ١٥/٤ ملیۆن کەس |
| هێزی کۆلۆنیالکار | فەرەنسا |
| ساڵی سەربەخۆیی | ١٩٦٠ |
| گرنگترین شارەکان | ئابیجان، بوئاکە و یامۆسۆکۆرۆ |
| گرووپە نەژادییەکان | ئاکان، ڤۆلایکە، مانی نۆرد، کرۆیۆ |
| زمان | فەرەنسی، بایلی، دیائۆلا، بتی |
| دانیشتوانی شار | ٤٦/٥ |
| ناوەندی تەمەنی ژیان | ٤٧ ساڵ |
| رێژەی خوێندەواری | ٤٢/٦ |
| رێژەی مردن | ٨٣/٢ لە دایکبوون لە هەر هەزار مردندا |
| هەناردەکان | کاکائۆ، نەوت، قاوە، دار |
| ئایین | سوونەتی و مەسیحی |
| دراو | فرانکی سی. ف. ئا |
| بەرهەمی ناپوختەی نیشتیمانی | ٦٤٨ دۆلار |



**زاراوە سەرەکییەکان:**

ناوەندگەرایی دەوڵەت: پرۆسەیەك کە دەسەڵات لە کۆمەڵگای مەدەنی و دامەزراوە پەراوێزەکانی دەوڵەت وەردەگیرێت و لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن و دامەزراوە ناوەندییەکاندا چەق دەگرێت سیستەمی دەرەبەگایەتی: پەیوەندیگەلی سیاسی و ئامرازیی بەرفراوان لەنێوان کاربەدەستە سیاسییەکانی خاوەن پێگەی بەرز لە رووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە (ئاغاکان) کە دەسترۆیی و سەرچاوەکانیان بەسەر کەسی خاوەن پێگەی نزم (رەعیەت) جێبەجێ دەکرێت و تاکەکانی خاوەن پێگەی نزم لە رێگەی هاوکاریکردن و پشتگیری کردن لە ئاغاکانی، پشتگیرییان لێدەکرێت. تۆڕی دەرەبەگایەتی (ئاغا — رەعیەتی): پەیوەندیگەلی ئەستونی کە ئاغا و رەعیەت پێکەوە گرێ دەدات، پرۆسەیەك کە تیایدا ئاغا تۆڕی ئاغایەتییەکەی لە رێگەی گرێدانی بە تۆڕە بچووکترەکان بەرفراوان دەکات.

سیستەمی یاسایی عەقلانی: دەسەڵاتی سیاسی پشتبەستراو بە دامەزراوە دەوڵەتییە غێر کەسییەکان (گشتی) کە تیایدا حکومەت رێز لە رێڕەوی فەرمی حکومەتکردن، دەگرێ و بە فەرمی دانی پێدەنێت.

مەشروعییەت: پەیوەندییەکی دەروونناسانە لەنێوان فەرمانڕەواکان و هاوڵاتیاندا کە تیایدا سەرۆك و دامەزراوە دەوڵەتییەکان لەلایەن خەڵك دان پێدەنرێن (بە فەرمی دەناسرێن) تا لەم رێگەیەوە بتوانن دەسەڵاتی سیاسی بە سەر گشت کۆمەڵگادا جێبەجێ بکەن.

حکومەتی باوك پاشایی نوێ: شوێنێك کە حکومەتی باوك پاشایی لە رێگەی دامەزراوە یاسایی — عەقلانییە بەجێماوەکان درێژە بە ژیان دەدات و بەپێی ئەم دامەزراوانە کار دەکات.

دەوڵەتی تاك پارتی: دەوڵەتێك کە تیایدا مۆبیلیزەکردنی سیاسی فەرمی لە رێگەی یەك پارتی دەوڵەتمەدار کانالیزە و رێنمایی دەکرێ.

حکومەتی تاکەکەسی: سیستەمێك لە حکومەت کە تاکەکەسێك بەڕێوەبەرایەتی دامەزراوە باڵاکانی دەوڵەت و تۆڕی دەرەبەگایەتی (ئاغا — رەعیەت) دەکات کە سیستەمە تاك جەمسەری و گشت چالاکی سیاسی فەرمی لە وڵاتدا بۆ (سوودی) تایبەتی بەکاردێنێت.

حکومەتی باوك پاشایەتی: دەسەڵاتی سیاسی پشت بەستراو بە تاك، کە دەوڵەت و کاروباری دەوڵەت لە خزمەت بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی فەرمانڕەوادایە. سەرکەوتنی گشت تاکەکان لەم سیستەمەدا بەندە بە وەفاداربوونیان بۆ سەرکردە.

## پرسیارەکان:

١. ئایا لە روانگەی سەرکردەکانی ئەفریقیایی، ناوەندگەرایی و حکومەتی تاك پارتی کارێکی رێگەپێدراو پەسەندکراوە؟

٢. سیستەمی دیموکراتیك بەپێی هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئازاد تاچ کاتێك لە دەوڵەتگەلی وەك تانزانیا و کێنیا درێژەیان هێنا؟

٣. بۆچی لە ئەفریقیادا رێز لە حکومەتە ناوچەییەکان و سیستەمی دادوەری سەربەخۆ ناگیرێ؟

٤. ئایا حکومەتە تاکەکەسییەکانی ئەفریقیا، شێوازێکی پێویستە بۆ حکومەت کردن؟

٥. تا چ رادەیەك (سیستەمی) دەرەبەگایەتی و حکومەتی تاکەکەسی لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالدا مەشروعییەتی هەیە؟

## بۆ خوێندنەوەی زۆرتر:

دوو پەرتووك سەبارەت بە ناوەندگەرایی دەوڵەت لە ئەفریقیادا و هەنگاونان بەرەو حکومەتی تاك پارتی زۆر گرنگن. پەرتووکی ئەریستید زۆلبرگ بە ناونیشانی ((کۆمەڵ و هێنانەدی دیسپلێنی سیاسی)) و پەرتووکێك کە جێمز کۆلمەن و کارل رۆزبرگ نووسیویانە ئەگەرچی ئەم دوو پەرتووکە لە حالی حازردا کۆن بوونە، بەڵام رێژەیەکی زۆر لە رووداو و گفتوگۆکانی سەردەمی رابردووی لەخۆگرتووە بۆ خوێندنەوەیەکی پتەو و تایبەت بە حکومەتی تاك پارتی بگەڕێنەوە بۆ پەرتووکی فیلیپ ماوهود بە ناونیشانی ((دەوڵەتی خۆجێیی و جیهانی سێیەم)).

هەر دەوڵەتێك خاوەن رەهەندی جۆراوجۆری دەسەڵاتە. لە جێگەیەکدا کە دەسەڵاتی پێویست (کافی) بوونی هەبێ، هاوڵاتیان لەوبڕوایەدان کە رێزگرتن لە دامەزراوە یاساکانی دەوڵەت بە سوودیانە و ئەنجامی ئەم کارەش دیسپلێنی سیاسی سەقامگیرە کە تاکەکان لە بەرامبەر حکومەتەکەیان ملکەچ بن. بەپێچەوانەوە ئەگەر دەوڵەت دەسەڵاتەکەی لە دەست بدات و پانتای دەسترۆیەکەی رووبەڕووی شڵەژان دەبێتەوە و کەناڵەکانی ئاشتییانەی گفتوگۆکردن بەرەو نەمان دەچن. گرووپەکان کەڵك لەم بارودۆخە وەردەگرن و لەگەڵ نوخبەکانی شکست خواردوو لەگەڵ یەکتری بۆ هێنانەدی دیسپلینی سیاسی رکابەرێتی دەکەن. ئەم جۆرە بارودۆخە هۆکارێکە بۆ هاوکاریکردنی یەکتری ئەو گرووپانەی کە چالاکییەکانیان قەدەغە کراوە و توندوتیژی وەك ئەلترناتیڤێك بەکاردێنن. ریشەی دەسەڵاتی سیاسی بۆ دوو سەرچاوەی سەرەکی دەگەڕێتەوە: ١-دەسەڵاتی رەوا. ٢- هێزی زۆرلێکردن (سەرکوت). لە بەشی پێشتردا چەمکی مەشروعییەت روونکرایەوە کە هاوڵاتیان بە خۆبەخشانە لەهەمبەر دەوڵەتدا سەردەنوێنن و هەروەك ماکس ڤێبر ئاماژەی بۆ کردووە ئەوان ئەم کارە لە ئەنجامی نەریت، سەرکردەی کاریز ماتیك، یاخود بە نیشانەی رێزگرتن لە دامەزراوە یاسایی- عەقلانییەکان ئەنجام دەدەن. زیاد لەمەش مەشروعییەت بە دەست گەیشتن بە کاڵا ماددییەکان (لە ئەفریقیادا لەڕێگەی تۆڕە بەرفراوانەکانی دەرەبەگایەتیوە) زۆر دەبێت. بەکورتی تاکەکان رەزامەند دەبن کە پەیڕەوی لە دەوڵەتەکەیان بکەن بە هۆی ئەو بەرژەوەندییە پۆزەتیڤانە کە بە شێوەی دامەزراوی کۆمەڵایەتی بۆیان بەدیاری هێناوە و لێی سوودمەند دەبن. رووەکەیتری دراڤی دەسەڵات سەرکوتکردنە، بەکارهێنانی توندوتیژی تواناییەکان زیاد دەکات و دەوڵەتان دەتوانێ کۆنترۆڵیان بۆ سەر کۆمەڵگای مەدەنی تەنانەت لە کاتی نەبوونی مەشروعییەتیش بپارێزن. بەواتا یەکیتر دامەزراوەکانی سەرکوتکردنی دەوڵەت لە دژی هاوڵاتیان بە مەبەستی پەسەندکردنی دیسپلێنی سیاسی براوە (لەلایەن هاوڵاتیانەوە) چالاکی دەگێڕن. لەکاتێکدا کە کۆمەڵگای مەدەنی بەدەگمەن سەرچاوەکانی زۆر هەماهەنگ دەکات، (بەکارهێنانی) توندوتیژی لەلایەن دەوڵەتەوە یاخود هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی توندوتیژی دەبێتە هۆی ملکەچ بوونی هاوڵاتیان بۆ یاسا سیاسییەکان. ئەمەش لە ترسی ئەنجامەکانی ملکەچ نەبوون بۆ یاساکان. بەم پێیەش دەکرێ زۆر (سەرکوت) وەك ((بەکارهێنان یاخود هەڕەشەکردن (بەبەکارهێنانی) توندوتیژی بۆ گەیشتن بە ئامانجی سیاسی یان کۆمەڵایەتی)) پێناسە بکرێ. راستی ئەوەیە کە گشت وڵاتەکانی ئەو دوو سەرچاوەیە تێکەڵ بەیەکتر دەکەن. لە رۆژئاوادا



زۆرترین پشت بە دەسەڵاتی مەشروع دەبەستریێ تا سەرچاوەی زۆر. ئەگەرچی ئێستاش زۆرلێکردن وەك ئامرازێکی حکومەت بەکاردەهێنرێ. بۆ نموونە هێزەکانی ئاسایش، پۆلیسی سەربازی و دادگاکان، پاسەوانانی بەندیخانەکان، گشتیان ئەم ئامرازە بەکاردەهێنن بۆ ترساندن و سزادانی تاوانبارەکان. پێویستە سەروەری یاسا بپارێزرێ و هەندێ کاتیش توندوتیژی پێویستە تا ئەم سەروەرییە گەرەنتی بکات. لە گشت جیهاندا سەرکوتکردن گشتگیرە و زۆرتر ئەم ئامرازە بەکاردەهێنرێت تا بەرژەوەندییەکانی گرووپ زۆرتر لە بەرژەوەندییەکانی نەتەوەیی گەرەنتی بکات. ئەگەرچی ئەم راستییە هەر دەمێنێتەوە کە وڵاتەکان کەم تا زۆر بۆ پاراستنی دەسەڵاتەکەیان پێویستیان بە دامەزراوەی سەرکوتکردن هەیە.

ڕاستییەکی بەرچاوە، کە هێزەکانی سەرکوتکردن، گرنگی تایبەتی لە کاملبوونی سیاسەتەکانی ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیاڵدا هەبی. لەوانەیە دامەزراوەکانی سەرکوت کردنی بۆ دەوڵەت وەك زەرورەتێك بێ، بەڵام زەرورییە کە سوپا و پۆلیس وەك پاسەوانانی دەوڵەت، توندوتیژی وەك کارێکی سوودمەند بۆ سەرکردە سیاسییەکان بەکاربهێنن. ئەم کارەش لە ئەفریقیادا بابەتێکی رێزبەر نەبووە. بەڵکو لە زۆربەی کاتەکاندا سەربازەکان (هێزی سوپا) تواناییەکانیان بۆ جێبەجێکردنی توندوتیژی لەپێناو کودەتایەکی سەربازیدا بەکاریان هێناوە. لەڕاستیدا ئەو کەسانەی کە بەکارهێنراون تا توندوتیژی لەپێناو پاراستنی دەوڵەتدا بەکاربهێنن، هەنوکە توندوتیژی لە دژی دەوڵەت بەکاردەهێنن تا خودی خۆیان دەسەڵاتی سیاسی بگرنەدەست. سەرەڕای کودەتای سەربازی، هەر پەرتووکەك کە سیاسەت لە ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیالکردندا دەخاتەڕوو. ناچار دەستتێوەردانەکان بەووردی شی بکاتەوە و ئەم بەشەش ئەم کارە ئەنجام دەدات. لەم بەشەدا سێ پرسیار لە ئارادایە: بۆچی ژمارەیەکی زۆری کودەتا روویداوە؟ چ گرفتێك دوای ئەوەی کە سوپا حکومەتی بەدەستەوەگرت روودەدات: حکومەتی سەربازی چ ئەنجامێك بەدەست دێنێ؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، هەڵسەنگاندنەکی شایانی تێگەیشتن، لە هەڵسوکەوتی دامەزراوەکانی سەرکوتکردن بەسەر سیاسەتی ئەفریقیا کە لە دوای سەربەخۆییدا جێبەجێکراوە، بە پێویست دەزانرێ؟ هەروەهاش نیشان دەدرێ کە حکومەتی سەربازی چەندین رکەبەری سیاسی لەم کیشوەرەدا هەبووە کە دەتوانن هێزەکانیان هەماهەنگ بکەن. ئەگەرچی سەلمێنراوە کە رووخاندنی رژێمی کۆن ئاسانترە لە دامەزراندنی حکومەتێکی نوێ کارامە و بەهێز. حکومەتە سەربازییەکان بەخێرایی تێگەیشتن کە سەرەڕای دەست گەیشتن بە سەرچاوەکانی سەرکوتکردن، دەوڵەت ناتوانێ بە تەنیا پشت بە قەبارەی

سەپاندنی توندوتیژی ببەستێ. لەوانەیە لە کورت ماوەدا سەرکوتکردن دەرەنجامی رەزامەندبەخش دەستەبەر بکات، بەڵام سیستەمێکی سیاسی سەقامگیر پێویستی بە دەوڵەتێك هەیە. کە هێزی رەواش فەراهەم بکات. زۆربەی حکومەتە سەربازییەکانی ئەفریقیا لە بەئەنجام گەیاندنی ئەم ئەرکە شکستیان هێناوە. لە ئەنجامدا هەنوکەش ناسەقامگیری سیاسی درێژەی هەیە.

## کودەتا سەربازییەکانی ئەفریقیا:

سەربازگەرایی، بەشی نەپچڕاوی هەر حکومەتێکە. بۆ دەوڵەتەکان پێویستە کە هێزی ئاسایشیان هەبێت. هەروەها پێویستە کە لە کۆمەڵگایەکی دیموکراتیکدا ئەم هێزە لە خزمەت بەرژەوەندی گشتیدا بێت. هەر کە ئەم هێزە لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی یاخود لەلایەن حکومەتی سەربازییەوە یان لەلایەن نوخبەی فەرمانڕەواوە بەکارهێنرا، ئەوکات دیموکراسی لەناو دەچێت. حکومەتە دیموکراتیکەکان (عەقلانی- یاسایی) بانگەشە دەکەن کە سوپاییەکان لەڕووی سیاسییەوە بێ لایەنن و دامەزراوەکانیان سەر بە حکومەتی سیڤیلن. سەرەڕای رەوشتی پیشەیی دەستتێوەرنەدان، گشت هێزەکانی ئاسایش تاڕادەیەك بەشداری لە پرۆسەی سیاسیدا دەکەن. تەنانەت لە رژێمە دیمەکراتیکەکاندا کاربەدەستە بەرزەکان لە دروستکردنی هێزەکانی بەرگری، هەروەك پرسی بودجەی پەیوەست بە کاروباری دارایی هێزەکانیان سەرقاڵن. هەروەها لە دیموکراسی لیبڕالیشدا بینراوە کە ئەندامە سەربازییەکان (میلیتارەکان) (بۆ نموونە سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئایزنهاور و سەرۆك کۆماری فەرەنسا شارڵ دۆگۆڵ) پۆستی بەرزیان بەدەستهێنا. جیاوازی سەربازانی پرۆفیشناڵی (خاوەن) ئامانجی سیاسی لە رۆژئاوادا بە بەراورد لەگەڵ هاوتا ئەفریقییەکانیان لەوەدایە کە کاربەدەستانی وەك دۆگۆڵ و ئایزنهاور (پێش بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك کۆماری) سەرەتا لە فەرماندەیی هێزەکانی سەربازی دەستیان لەکار کێشایەوە. بەجۆرەش ئەوان بەشدارییان لە پرۆسەی هەڵبژاردندا کرد. لەڕاستیدا ئەوان پێش رکابەرێتی بۆ (بەدەستهێنانی) دەسەڵات لە توانایەکانیان لە دەست گەیشتن بە ئامرازەکانی هێز و سەرکوتکردن چاوپۆشییان کرد. بە پێچەوانەوە سەرکردەکانی کودەتاکانی ئەفریقیا بە نایاساییانە بوون بە سەرۆك دەوڵەت و تەنیا بەڵگەی بە دەستیانەوە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی، هەڕەشەکردن لە (بەکارهێنانی) توندوتیژی بوو، کە وەك ئەفسەرانی سەربازی چالاك پارێزگارییان لێ کرد، کودەتایەکی سەربازی بە((گۆڕانێکی لە ناکاو



و نایاساییانەی حکومەت کە ئەندامانی هێزی ئاسایش تیایدا رۆڵی بەرجەستە دەگێڕن)) پێناسە دەکرێ. دەکرێ کودەتاکان گەڕانەوە بۆ دواوە یان شۆڕشگێڕانە، بە خوێنڕێشتن یان بێ خوێنڕێشتن بێ. ئەگەرچی کودەتاکان لە ناکاو روودەدەن، بەڵام ئەم بابەتە بۆ چەند کاتژمێر یان چەند رۆژ درێژە دەخایەنێ، یاخود دەکرێ بۆ چەندین هەفتە درێژ ببێتەوە. لەم رووەوە، کودەتا سەربازییەکان لەگەڵ شێوازەکانیتری رووخاندنی سیاسی جیاوازیان هەیە. نابێ کودەتاکان وەك گۆڕینی لەڕێگەی هەڵبژاردنی دیموکراتیکانە یاخود وەك دەستتێوەردانی دەرەکی، شۆڕشی ناوخۆی بەرفراوان یاخود تێکەڵێك لە هەریەك لەمانە هەژمار بکرێ.

لەنێوان سالآنی ١٩٥٢ تا ١٩٩٠، ٧١ کودەتا لە ئەفریقیا روویداوە کە بوو بە هۆی گۆڕینی رژێمەکان لە ٦٠٪ ولآتانی ئەم کیشوەرە، (بڕوانە خشتەی ژمارە ١-٧) هەندێ لەم ولآتانە وەك گەروی سەوز یاخود گینەی ئۆستوایی تەنیا یەك کودەتایان بەخۆوە بینیووە. بەڵام زۆربەی ولآتان دوو تا سێ کودەتا تیایدا روودواوە. لە کاتێکدا لە ولآتانیتری وەك بنین، بۆرکینافاسۆ، غانا و نێجیریا بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی یاسایی بە بەردەوامی کودەتا یان دژە کودەتا روویداوە. دوور لە راستییە ئەگەر بارودۆخی ئەم سەردەمە وەها لێك بدەینەوە کە یاسای سەربازی لەبەر رێزبەربوونی بوو بە فۆرمێك. دیپلۆماتکارێکی ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە ناوی جۆرج باڵ لە بیرەوەرییەکانیدا نووسیویەتی:

((بەدرێژایی ئەو سالآنەی کە لە وەزارەتی دەرەوەدا کارم دەکرد هەر مانگ یەك یان دووجار بە پەیوەندییەکی تەلەفۆنییەوە لە نیوەکاتی شەودا کە رایدەگەیاند لە هەندێ بەشی پایتەختدا کودەتا روویداوە لە خەو هەڵدەستامەوە)). رزگاربوون لەم کودەتاکارانە تەنیا لە سالآنی ٩٠ دا هاتە دی. بە درێژای ئەم دەیەیە ژمارەی کودەتاکان بۆ گۆڕینی رژێم کە هەنوکە لە بیری شۆڕشە بەرفراوانەکان لەڕێگەی هەڵبژاردنی دیموکراتیکەوە ئەنجام دەدرێ زۆر کەمی کردووە.

ئەم نموونەیە لە دەیەی ٦٠، ٧٠، ٨٠ زۆر باو بوو. فراکسیۆنی سەربازی لە ژێر سەرکردایەتی ئەفسەرانی چینی مامناوەندی یان خواروو (هەندێ جاریش ئەفسەرانی پلەبەرز) دامەزراوە و بینا دەوڵەتی و ناوەندەکانی پەیوەندی کردنیان بە دەستەوە دەگرت و دواتر سەرۆك کۆمار یان ئەندامانی کابینەیان زیندانی دەکرد هەرکە دامەزراوە و بینا دەوڵەتییەکان دەستیان بەسەردا گیرا پلان داڕێژەرانی کودەتا وێستگەی رادیۆیان بۆ بلآوکردنەوەی بۆچوونەکانیان لە سەرتاسەری ولآتدا بەکارهێنا. ئەوان روون دەکەنەوە کە چۆن گەندەڵی و نالێهاتوویی دەوڵەت ناچاریان کردووە کە دەستتێوەردان لە کاروبارەکانیان بە ئەرکی خۆیان بزانن و بەڵێن دەدەن هەر

# Page 213

کە حکومەتی سەربازی توانی کۆمەڵگا رێك بخاتەوە دووبارە بۆ سەربازگەکان دەگەڕێنەوە. لەم رووە کودەتا سەربازییەکان تاڕادەیەك ئاشتیخوازانە بوون. بەگشتی قوربانییەکان هی ئەو گرووپە بچووکانە بوون کە بەشدارییان (لە کودەتادا) کردبوو هەندێ جاریش ئەم کودەتایانە خوێناوی بوون. ئەمەش بەو هۆیە بوو کە ژمارەیەکی کەم ئامادەیی بەرگری کردن لە دامەزراوە نامەشروعەکان و نایاساییەکان بوون. شێوازەکانیتری گۆڕینی رژێم لە ئەفریقیادا. وەك ئۆپراسیونی شۆڕشگێڕانە، شەڕە ناوخۆییەکان (تەنانەت هەڵبژاردنی دیموکراتیك) بەرەو توندوتیژی زۆرتر دەچەمایەوە. لە بەراوردکردندا، کودەتا سەربازییەکان سادە و خێرا بوون بەجۆرێك کە ((کلیلی جبەخانەکان وەرگرن، چەکەکان لە سەربازگەکاندا بێنە دەرەوە، دەست بەسەر وێستگەی رادیۆ، فەرمانگەی پۆست و فڕۆکەخانەکاندا بگرن و سەرۆك کۆمار دەستگیر بکەن)).

سەرەڕای کاریگەری سوپا بەسەر سیاسەتی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالّدا، کارێکی دروستە کە ئەم پەرتووکە خوێندنەوەی کودەتاکان بکات و گشت وردەکارییەکانی بخاتەڕوو. ئەم جۆرە شیکردنە دەتوانێ ببێتە هۆی هەڵە تێگەیشتن و بەهێزکردنی چەمکی کلێشەیی ((کیشوەری کودەتاکان))، بەڵام پێویستە ئاماژە بکرێ کە مومکینە حکومەتی سەربازی لە ئەفریقیادا کاریگەری بنوێنێ، بەڵام هیچ کاتێك نەیتوانیوە رێڕەوی سیاسی گشت کیشوەری ئەفریقیا بخاتە قۆرغی خۆیەوە. لە کاتی سەربەخۆییەوە تا ساڵی ١٩٩٠، ٦٠٪ی وڵاتانی ئەفریقیا کودەتای سەربازی لە رەهەندی جۆراوجۆرەوە بە خۆوە بینیوە، بەڵام ئەمەش بەو مانایەیە کە لە ٤٠٪ لەم وڵاتەدا ئەم کارە روونەدراوە. بۆ نموونە مەغریب و تونس لە قۆناغی دوای کۆلۆنیاڵ لە ژێر دەستی حکومەتێکی خەڵکسالاری دا بوونە، هەروەها وڵاتانی وەك کێنیا، تانزانیا و زۆربەی وڵاتانی باشووری کیشوەری ئەفریقیا کودەتای بە خۆوە نەبینیوە. تەنانەت وەڵاتگەلێك کە تووشی حکومەتی سەربازی بوونەوە زۆربەیان لە قۆناغێکی دووردرێژی حکومەتی خەڵکسالاری دەباز بوونە و ئەمەش یان پێش دەسەڵات بە دەستگرتنی سوپاییەکان (میلیتارەکان) یان دوای گەڕانەوەیان بۆ سەربازگەکانیان بووە. بۆ نموونە گامبیا پێش کودەتای ساڵی ١٩٩٤، ٣٠ ساڵ دیموکراسی بەخۆوە بینی بوو. لە خوێندنەوەی ئەم بەشەدا پێویستە رەچاو بکرێت کە گشت وڵاتانی ئەفریقیا دیکتاتۆری و هاوشێوە نەبوونە.



# بۆچی ئەفریقیا ژمارەیەکی زۆر لە کودەتا سەربازییەکانی بەخۆوە بینیوە؟

گشت کودەتاکان، قۆناغێکی کورت خایان لە پرۆسەی سیاسییاندا هەبووە کە بووەتە هۆی هەلّ رەخساندن بۆ توندوتیژی وەك فاکتەری بڕیاردان. لەم کاتانەدا حکومەتی سەربازی پەرەدەسێنێ و کودەتاکارەکان لەپێناو بەرژەوەندییەکانیاندا کۆنترۆڵی دەوڵەت دەکەن، ئەگەرچی سەلمێنراوە وێناکردنی بەراوەردکارییەکی وردی ئەم راستییە ساکارە، کارێکی سەختە. ئەمەش بە هۆی جیاوازی هەر کودەتایەك لەگەڵ کودەتایەکیتردا. ئەنجامی گشت شێوەکانی حکومەت (دیموکراتیك، رژێمە تاکەکەسییەکان و کاربەدەستە سەربازییەکان) ئەنجامی هەستگەلی جیاواز (مرۆڤدۆستانە، نەتەوەگەرایانە، هەستی خۆپەرستی و جۆشی ئایدیۆلۆژیکی)ە، کە دەبێتە هۆی (هاتنەکایەوەی) شێوازە جۆراوجۆرەکانی حکومەتی ستەمکاری، دیموکراتیکی لیبڕاڵ، سۆشیالیزم، پارێزگاری و شۆڕشگێڕانە و هەندێ حکومەتیتر، کە لەم دابەشکردنە ساکارەدا ناگونجێت.

ئەگەرچی کودەتا سەربازییەکانی لە گشت جیهاندا کاریگەرییان بە سەر زۆرێك لە سیستەمە سیاسییەکاندا داناوە، بەڵام زانا سیاسییەکان هەوڵیانداوە فاکتەرە هاوبەشەکان کە دەبنە هۆی رووخانی ئەم رژێمانە، دەستنیشان بکەن. لە پۆلین کردنێکدا، کودەتاکان بە سەر سێ پۆل دابەش دەبن: ١. کودەتای پارێزگارەکان (پاسەوانان) ٢. کودەتای نکۆڵی کردن (Veta) 3. کودەتا لەپێناو رزگار بوون لە گوشار. کودەتای پارێزگارەکان کاتێك روودەدات کە حکومەتی سەربازی بە مەبەستی رزگاربوون لە خراپ بەڕێوەبردنی بەرپرسانی وڵات و دەوڵەت کودەتا ئەنجام دەدەن لەم کودەتایەدا پیاوە یونیفۆرم پۆشەکان (ژی موحد) ئەم کارە بە ئەرکی خۆیان دەزانن تا حکومەتی نەویستراوی پێشوو بڕووخێنن. لەم کودەتایەدا هێرش دەکرێتە سەر گەندەڵی، ناکارامەیی و نالێهاتوویی و سیاسەتمەدارانی رژێمی پێشوو پاکسازی دەکرێن و لە زۆربەی کاتەکاندا حکومەتی سەربازی بەپێی گەڕانەوە بۆ سەربازگەکان کاردەکەن. واتە کاتێك کە هزر دەکەن دیسپلێن بۆ پڕۆسەی سیاسی گەڕاوەتەوە ئەوان بۆ سەربازگەکان دەگەڕێنەوە. سەرەڕایی پشێوی سیاسی، کودەتاکارەکان کۆمەڵگا و ئابوور دەست لێ نەدرا و بەجێ دەهێڵنەوە دەکرێ نێجریا وەك وڵاتێك کە چەندین کودەتای پارێزگاری (پاسەوانی) لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال بە خۆوە بینیوە، ئاماژە پێ بکرێ.

لەلایەکیترەوە کودەتای نکۆڵی کردن (veta) لەڕێگەی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتییەوە کە راستەوخۆ هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانی سەربازەکان و هاوپەیمانانی دەکات، بەهێز دەکرێت

هێزەکانی ئاسایش بەم دەرەنجامە دەگەن، کە ناتوانن لە کاتێکدا کە گرووپێکی نوێ لە کۆمەڵگادا هەوڵ دەدات تا حکومەت بگرێتە دەست، دەستەوەستان بن. ئەم جۆرە کودەتایە لە ناوەند و باشووری ئەمریکا جێگەیەك کە حکومەتی سەربازی هەوڵی داوە ڕێگر بێت لە بە دەسەڵات گەیشتنی هێزە چەپگەراکان، زۆر باوە. بەڵام ئەفریقیاش لەم بارەوە نموونەگەلی هەیە. بۆ نموونە دەکرێ کودەتای ئەلجەزایر لەساڵی ١٩٩٢دا لەم جۆرە کودەتایانە پۆلین بکرێ. لەم وڵاتەدا سوپا لە ترسی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی فرەپارتی دەستیان لە (هەڵبژاردن) وەردا. بزاڤی ئیسلامی لە توانایدا بوو لە هەڵبژاردندا سەرکەوتن بەدەست بێنێت و حکومەتی نوێ پێك بهێنێت. سوپا لەم جۆرە ڕژێمەدا نیگەرانی پێگەکەی بوو، بۆیە هەوڵیاندا ئەم مەترسییە کەم بکەنەوە و دەسەڵات بگرنە دەست.

لەم پۆلین بەندییەدا دوایین جۆری کودەتا، کودەتا لەپێناو ڕزگاربوون لە گوشارە کە حکومەتی سەربازی، ئەو ڕژێمەی کە مێژووی بەکارهێنانی بەسەر چووە (ستەمکاری یان سوننەتی) دوور دەخاتەوە و هەوڵی گۆڕینی ریشەیی کۆمەڵگا دەدات و ئەم جۆرە کودەتایەش بە کودەتای دەربازبوون لە رابردوو ناونراوە، لەڕاستیدا سوپا، پێشەنگی ئەم جۆرە شۆڕشەیە. ئەسیوپیا ئەم جۆرە کودەتای لە ساڵی ١٩٧٤دا بەخۆوە بینی، واتە کاتێك کە هێزە سەربازییەکان لەگەڵ هێزەکانیتری کۆمەڵایەتی بوون بە هاوپەیمان و دەوڵەتی سۆشیالیستیان لە دوای رووخانی حکومەتی سوونەتی ٤٤ ساڵەی ئیمپراتۆری هایلە سلاسی، دامەزراند.

زانایانی (بواری) سیاسی هەوڵی زۆریان داوە بۆ خستنەڕووی چۆنیەتی ڕوودانی کودەتایەك و دوو قوتابخانەش لەم بارەوە بالادەست. یەکەمین گرووپ لە پسپۆڕان جەخت لە ژینگەی کۆمەڵایەتی-سیاسی دەوڵەت دەکەنەوە. ژینگەگەرایانی وەك هانیتنگتۆن و سی.ی. فیند ئاماژەیان کردووە، کە لەوانەیە کودەتاکان زۆرتر لەو وڵاتانەدا ڕوودەن کە کولتووری سیاسی دامەزراوەییان نییە و ڕووبەڕووی کەمی سەرچاوەکان و ململانێی پەیوەست بە دابەشبوونە کۆمەڵایەتییەکان دەبنەوە. قوتابخانەی دووەم جەخت لە توانایی ڕێکخستن و تایبەتمەندییەکانی حکومەتی سەربازی دەکاتەوە. زانایانی وەك مورس جانویتز ئاماژە بە هەستی نیشتیمانپەروەری، دسیپلین، پسپۆڕگەرایەتی، پەیوەندی پتەو لەنێوان سوپایەکان، دەکات. ئەو باس لەوە دەکات کە لە کۆتادا ئەم فاکتەرانە سەربازەکان ناچاردەکات لەپێناو ڕزگارکردنی وڵاتەکەیان لە حکومەتی گەندەڵ و نالێهاتوو بێنە گۆڕەپانەوە. دروست نییە ئەم دوو فاکتەرە گرنگە لێك جیا بکەینەوە کودەتا سەربازییەکانی ئەفریقیا سەرەتا بە هۆی ژینگەی سیاسی و



کۆمەڵایەتی کە ئەم کودەتایانە هان دەدات و دواتر بە هۆی ئەوەی کە لەم کێشوەرەدا دامەزراوە سەربازییەکان بوونی هەبوو کە بۆ کەڵك وەرگرتن لەم بارودۆخە بەرادەی پێویستن ڕێکخرابوون و هان (تحريك)درابوون، ئەم کودەتایانە ڕوویاندا.

زیاد لەمەش نیشتیمانپەروەری و پسپۆڕێتی تەنیا فاکتەری دیاریکەر نەبوون. زیاد لەم فاکتەرانە سەربازەکان زۆرتر لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی لەم شۆڕشانەدا بەشدارییان دەکرد.

دواجار بە هۆی ئەوەی کە سوپاییەکان خاوەن هێزن، دەست لە پرۆسەی سیاسیدا وەردەدەن. لەڕووی هێزو زۆر، سەربازەکان بەهێزترین دامەزراوەکانی دەوڵەتیان لە کۆنترۆل دایە. بەهەر حاڵ ئەوان کاربەدەستانێکن کە ڕاستەوخۆ ئامرازەکانی توندوتیژی دەوڵەتیان لەبەردەست دایە لەوانەیە زۆرێك کە کودەتاکان بەبێ خوێنرێشتن بن، بەڵام ئەمەش ناتوانێ ئەم ڕاستییە بشارێتەوە کە سوپاییەکان خاوەن توانایی ڕێکخستن و تەکنۆلۆژیای کۆنترۆڵ کردنی هەر گەرووپێکیتری ناو دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنین. لە ئەنجامدا ئەگەر حکومەتی سەربازی بخوازێت بۆ پاراستنی ئامانجە سیاسییەکان توندوتیژی بەکاربهێنێت هیچ کەسێك ناتوانێ ڕێگری لێ بکات. بەم پێیەش، ئەم ڕاستییە بە تەنیا ناتوانێ ئەم بابەتە ڕوون بکاتەوە کە بۆچی لە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیادا کودەتای سەربازی ڕوو دەدات. لە سەرتاسەری جیهاندا، زۆربەی وڵاتە مۆدێرنەکان سوپاکەی پاراستووە، بەڵام ڕێژەیەکی کەم لەم سوپایانە ڕەوشت و بەڵێنی دەستتێوەرنەدانی شکاندووە.

هەربۆیەش هانیتنگتون و فانیر دەڵێن کە حکومەتی سەربازی، پێش ناچاربوون بۆ دەستتێوەردان، نەتەنیا پێویستی بە ئیمکانات و توانایی هەیە بەڵکو پێویستی بە ژینگەی سیاسی ئابووریشی هەبێ، بە شێوەیەکی ڕێژەیی ئەم حەقیقەتە بوونی هەیە، کە زۆربەی ئابوورەکانی ئەفریقیای دوای قۆناغی کۆلۆنیال بۆ گەیشتن بەو شتەی کە لە گەشەکردندا چاوەڕوانی بوون شکستی هێنا و بوو بە هۆی نارەزامەندی ئەفریقییەکان و زیانی بە رادەی مەشروعییەت گەیاند. بۆ نموونە راس فرست باس لەوە دەکات کە ڕژێمی قەوام نکرۆمە نەتەنیا بە هۆی سوپای غانا و هێزەکانی پۆلیس، بەڵکو بە هۆی دابەزینی نرخی قاوە، لە ناوەڕاستەکانی شەشەکاندا ڕووخا. هەروەك لە بەشەکانی سێیەم و چوارەم لە باسی دابەشکردنە کۆمەڵایەتییەکان ئاماژە پێکرا، ململانێی نەژادی و چینایەتی بە مەبەستی ناسەقامگیرکردنی زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا ڕوویداوە. بەم پێیەش پرسی کولتووری سیاسی لە ئارادایە. وڵاتانی ئەفریقیا بە هۆی کێشەگەلی ئابووری و کۆمەڵایەتی بۆ ناوبردنی ململانێی سیاسی پێویستیان

به دامەزراوەی بەهێز هەیە. ئەگەرچی هەروەك لە بەشی شەشەمدا بینیمان، رژێمەکانی ئەفریقیا زۆرتر مەیلیان بەرەو حکومەتی تاکەکەسی هەیە تا بەستراکتۆری یاسایی ـ عەقلانی لە ئەنجامدا زۆربەی ولاتانی ئەفریقیا لە پرۆسەی سیاسی بێبەشن و ئەم پرسەش ئەفریقیا بەرەو دابەشکردنی فایز لە کولتووری سیاسی ئاسۆیی بە بەراورد لەگەڵ کلتووری سیاسی پێگەیشتووی رۆژئاوا راکێش دەکات و بەمجۆرەش رژێمەکانی ئەفریقیا زۆربەیان لە هەمبەر قەیرانی مەشروعییەتدا لەرزۆکن.

لە رۆژئاوادا کاتێك کە ئەم قەیرانانە روودەدەن سیاسەتمەداران پشت بە کەناڵە یاسایی ـ عەقلانییەکانی دووبارە زیندووکردنەوەی سیاسی (لەوانەیە هەڵبژاردنی گشتی یان حکومەتی هاوپەیمانی نیشتیمانی) دەبەستن. بەلام لە ئەفریقیای پێش سالانی نەوەد. چونکە میکانیزمەکانی دەست گەیشتن بە گەرەنتی کردنی گۆڕانێکی سەقامگیر لە دەوڵەتدا بوونی نەبوو. گۆڕینی ئاشتیخوازانەی رژێم کارێکی نامومکین بوو و هەرکە توندوتیژی بوو بە میکانیزمی باوی گۆڕینی رژێم، حکومەتی سەربازی بە هۆی لەبەردەستدا بوونی زۆرترین سەرچاوەکانی سەرکوتکردن، رۆڵی سەرەکی سیاسی دەگێڕن، هەروەك هانیتنگتون باس دەکات، لە دەوڵەتی بێ دەسەلات گرووپە کۆمەلایەتییەکانی ململانێکار، ئامرازگەلێك کە رەنگدانەوەی ناوەڕۆك و لێهاتوویی تایبەتیان بێت، وەك بەرتیلی گەورە، شۆڕشی خوێندکاری، مانگرتنی کرێکاران، خۆپیشاندانی جۆراوجۆر و کودەتای سەربازی بەکاردێنن. بە نەبوونی رێرەوەکانی پەسەندکراو، گشت شێوازەکانی کاری راستەوخۆ بە گۆڕەپانی سیاسیدا سەر هەڵدەکات. تەکنیکەکانی دەستتێوەردانی سەربازی بە بەراورد لەگەڵ ئامرازەکانیتر کاریگەرترن، هەروەك هابز ئاماژە بۆ دەکات ((کاتێك کە ئامرازیتر لەبەردەستدا نەبێت، پێویستە زۆر بەکاربهێنرێ)).

ئەمەش ئەو شوێنەیە کە فاکتەرە ژینگەییەکانی کودەتا کە هانتینگتون و فایز ئاماژەیان بۆ کردووە بەرەو جەختکردنەوەی جانویتز کە پشت بەستراوە بە تایبەتمەندیی تایبەت (خاص) و پسپۆڕێتی سوپاییەکان دەچەمێتەوە. سوپاییەکان بە قەیرانی مەشروعییەت کە هەڕەشە لە قەوارەی (موجودیە) دەوڵەت و نەتەوە دەکەن. هەست بەوە دەکەن کە پێویستە دەستبەکاربن. سوپا بە هۆی قەبارەی جولانەوە و توندوتیژی نواندن دامەزراوییەکی بەهێزی دەوڵەت نییە، بەڵکو هێزی چەکدارەکان خاوەن رێکخستنی بەرز و وەفادار، تەبا و دامەزراوەی سەرەکین. بڕیارەکانیان گەرەنتی ئەو دەکەن کە سوپایەکی رێکخراو خاوەن دیسپلین دەتوانێت



چالاکییەکانی جێبەجێبکات و بەم هۆیەشەوە جانوتیز باس لە تایبەتمەندییەکانی خزمەتگوزارییە گشتییەکان و ((شوناسی نەتەوەیی)) سوپا و توانایی بەڕێوەبردنیان وەك حالەتێکی بوێرانە، دەکات. سوپاییەکان ناچارن کە بە نەبوونی گرووپی کۆمەلایەتییەکانیتر لە پرۆسەی سیاسیدا، بە دەسەلاتی حکومەتەوە بە سوودمەندانە دەست لە (دەسەلاتی حکومەت) وەربدەن. نیشتمانپەروەری و نەژادگەرایی کە هێزە سەربازییەکان لە مکانیزمە سیاسییەکانی جێبەجێکردن لە ولاتە رۆژئاواییەکاندا دووردەخات، هەر ئەو تایبەتمەندییە کە ئەفسەرانی ولاتانی ئەفریقیا ناچار بە شۆڕشکردن دەکات. ئەوان لەو بڕوایەدان کە کۆمەڵێکی تەبا ناتوانن تەنیا بە بەرگری کردن لە قەلەمڕەو، کاتی خۆیان بێ سوود بەسەر بەرن، لە کاتێکدا کە هاولاتیان دەبنە هۆی تێکدان و لە ناوبردنی دەوڵەت. لە ژێر ئەم چەشنە بارودۆخەدایە کە کودەتای سەربازی روودەدات.

گومان لەوەدانییە، کە تایبەتمەندییەکانی سوپا بە بڕوای دەتوانێ لە کاتی لەناوچوونی مەشروعییەتی حکومەت، هانی شۆڕش بدات بەلام پێویستە جارێکیتر ئاماژە بکرێ کە ئەمە وەلامدانەوەیەکی تەواو بۆ دەستتێوەردانی سەربازەکان نییە. تارادەیەك گشت ولاتانی ئەفریقیا کێشەی ئابووری و کۆمەلایەتی لە سەردەمی دوای کۆلۆنیال بە خۆوە بینیوە، بەلام مانەوەی ئەم ولاتانە بەندە بە زالبوونی سوپاییەکان.

هەروەك چۆن کودەتای پارێزگاران (پاسەوانان) زۆرتر شوێن پێیەك لە واقیعییەتە تا روونکردنەوەی رووداوە راستەقینەکان سوپا بە تەنیا ناتوانێ لە بەرژەوەندییە نەتەوەییەکاندا بەشدار بێ لە دوایین شیکردنەوەکاندا، کودەتا کاتێك روودەدات کە ئەندامانی سوپا هەست بکەن کە بەرژەوەندییەکانیان ناچاریان دەکات سەرکردە سیاسییەکان، لە دەسەلاتی سیاسی دووربخەنەوە. بە بڕوای ئەوان توانایی و تەکنۆلۆژیای رێکخراو بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کودەتایە سەرپەرشتی دەکەن، ئەگەرچی کودەتا پێویستی بە ژینگەیەکی کۆمەلایەتی گونجاوی هەیە، بەلام گەڕانەوەی سوپاییەکان بە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیانەوە گرێدراوە. لەم رووەوە سەرەڕای بەلێنە رەوشتییەکان پێویستە حکومەتە سەربازییەکان لە ئەفریقیادا وەك بەشێکیتر لە نوخبەکانی فەرمانڕەوا سەیر بکرێ (هەروەك چۆن کریستوفرکا پلان حکومەتی سەربازی وەك ((بالی چەکداری بۆرژوازی بۆروکرایتگ)) وەسفدەکات) بە هۆی کەمی دامەزراوە یاسایی — عەقلانییەکان لە ئەفریقیادا، حکومەتی سەربازیی ناچارە بۆ بەرگری کردن لە بەرژەوەندییەکانی لە مانورەکانی رۆژانەیی سیاسی لە بەشەکانیتری دەوڵەتدا دەست وەربدات.

حکومەتی سەربازی ناتوانی بە ئاسانی خۆی لە گۆڕانکارییە سیاسییەکان جیا بکاتەوە و وەك هەر تاك (گرووپ)یتر دەبێ لە بەرژەوەندییەکانی لە پانتای سیاسیدا، کە گشت گرووپەکان هەوڵ دەدەن لە ڕێگەی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە بەرژەوەندییەکانیان فراوان بکەن، پارێزگاری بکەن. لە ئەنجامدا هەندێ کات سوپا ناچارە گوشار بخاتە سەر گرووپە سیڤیلەکان لەپێناو بە فەرمی ناساندنی داواکارییەکانی. لەوانەیە ئەم گوشارە بە شێوازی کودەتایەکی هەمەلایەنەی سەربازی بێ و ئەمەش لە کاتێکدایە کە پیاوانی یونیفۆرم پۆش، هەست بکەن کە بەرژەوەندییەکانیان لە مەترسی دایە و تەنیا ڕێگەی بەرگری کردن لە بەرژەوەندییەکانیان ئەوەیە کە ئەوان بە پراکتیکانە دەسەڵاتی دەوڵەت بگرنە دەست، نموونەیەك لەو مەترسییانەی کە هەڕەشە لە خۆشگوزەرانی سوپاییەکان دەکات بریتییە لە کەمبوونەوەی بودجەی بەرگری و سنووردارکردنی دەسەڵات و سەروەری ڕێك خراوەکەیان بۆ نموونە کودەتای گامبیا لە ساڵی ١٩٩٤دا بە هۆی کەمی خۆراك و کەڵەکەبوونی گرفتەکان و مووچەنەدان بە یەکەکانی پاراستنی ئاشتی کە لە لیبریادا ئەرکیان دەگێڕا، ڕوویدا، زۆرترین گلەییەکان لەلایەن هێزەکانی گامبیایی بە هۆی درێژە کێشانی مانەوەی هێزەکانی پلە دووی نایجریا وەك ئەفسەرانی فەرماندە، بوو. سەربازانی گامبیا چاوەڕوانی هەلێك بوون کە دژی سوپا بوەستنەوە، ئەم سەربازانە کاتێك کە ئەفسەرە پلە نزمەکان، حکومەتی فرەپارتی سەرۆك کۆماری ٢٩ ساڵە (داودا جاوارا) یان لە ساڵی ١٩٩٤دا لە حکومەت دووریخستەوە، بە ئامانجەکانیان گەیشتن، پێش ئەمە لە ساڵی ١٩٦٨دا لە وڵاتی مالی گاردی تایبەت لەلایەن سەرۆك کۆمار مۆدیبە گیتا پێکهێنرا و چونکە ئەم کارە بووبە هۆی لاوازبوونی پێگەی سوپاییەکان لە ستراکتۆری دەوڵەتدا، کودەتا بەرپا بوو.

وەك دوایین خاڵ لە توێژینەوەکەدا سەبارەت بەوەی کە بۆچی ئەفریقیا ژمارەیەکی زۆری دەستتێوەردانی سەربازی بەخۆوە بینیوە، پێویستە وەبیربهێنرێتەوە کە دەبوایا ڕوانگەکانی دەرەکیش سەبارەت بەم کودەتایانە بە کورتی باس بکرێت. ئەگەرچی زۆربەی کودەتاکانی ئەفریقیا لە ئەنجامی سیاسەتەکانی ناوخۆیی بوو، بەڵام هەندێ جاریش دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان (لە ناکاو) تیایدا ڕۆڵیان هەبوو. بۆ نموونە سەربازانی ئینگلیز لە ساڵە سەرەتاییەکانی سەربەخۆییدا یارمەتییان بە سەرکوتکردنی هێزە شۆڕشگێڕەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا کرد، لە کاتێکدا کە دەزگای سیخوری ئەمریکا لەم کیشوەرەدا چالاك بوو (ئەگەرچی ئەم چالاکییە بە ڕادەی باشوور و ناوەڕاستی ئەمریکا نییە). فەڕەنسا لە زۆربەی سیاسەتەکانی ئەفریقیا دەستی وەرداوە. چەندین کودەتا لەلایەن فەڕەنساوە پشتگیری کراوە لە کاتێکدا کە چەندین کودەتاش بە هۆی دەستڕۆیی فەڕەنسا شکستی



هێناوە بۆ نموونە لە گابون هێزەکانی فەڕەنسا دەوڵەتی لیون مێبا کە لە ئەنجامی کودەتای ساڵی ١٩٦٤دا شکستی هێنابوو ڕزگارکرد. لە کاتێکدا کە بە پێچەوانەوە لە ساڵی ١٩٧٩دا هێزە سەربازییەکانی ئێمپریۆر بۆکاسا لە کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاستدا بە هۆی دەستتێوەردانی هێزەکانی فەڕەنسا دەرکران، کە ئەمەش زۆرتر نیشانەی هێرشی فەڕەنسا بوو تا لە ئەنجامی کودەتایەکی ناوچەیی بێت (ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە حکومەتەکانی پێشووی پاریس پشتگیرییان لە ڕژێمی بۆکاسا دەکرد). ئەم بەڵگانە شایەتی ئەوەن کە کودەتاکاران دەزانن کە پێویستە بەرپەرچدانەوەی دامەزراوە سەرەکییە نێودەوڵەتییەکان پێش ئەنجامدانی کودەتا بخوێندرێتەوە.

## گرفتەکانی بەردەم حکومەتی سەربازی لە ئەفریقیادا:

لە زۆرکاتدا حکومەتی وڵاتانی ئەفریقیا مانگرتنی سوپا ڕووخاوە هەڵبەت سوپا بە هۆی ڕووخساری ڕێك و ئامانجە نەتەوەییەکەی (لەلایەن گەل) پێشوازی دەکرێ، بە بڕاوی ڕژێمە سەربازییەکان — بە پێکهاتەی یەك بە دوای یەکی (سلسله مراتب) سادە کە تیایدا چاوەڕوان دەکرێ کاربەدەستان ڕێز لە یاسا بگرن (تاکو لە سەر سیاسەتەکان دەمەقاڵێ بکەن) —خاڵی دەستپێکی نەهێشتنی کێشەگەلی وەك گەندەڵی کارگێڕی و ناکارایی بوون. ئەگەرچی ئەم بڕوایە کە سەربازەکان دەتوانن بە پێشینەی شانازی پێکەری خۆیان بچنە ناو دامەزراوە حکومییەکان تاڕادەیەك خۆش باوەڕانەیە. لەڕاستیدا سوپا گرفتی زۆرتری بۆ دەسەڵاتی جێبەجێکردنی وڵاتانی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیاڵ بە دیاری هێنا. گرفتگەلی بینراو کە گشت ڕژێمە سەربازییەکان ڕووبەڕووی بوونەوە، ئەوەبوو کە کودەتا بوو بە ڕێڕەوێك هەنوکە سوپا بە ڕەوشتی پیشەیی دەستتێوەردان، زۆرتر هەوڵ دەدات ئەفسەر گەلێك پەروەردە بکات کە خوازیاری ڕێزگرتن لە یاساکان بن و ئەگەر بە پێچەوانەی بەرژەوەندی نەتەوەیی و دژی بەرژەوەندی سوپایی کار بکات، ڕووبەڕووی دادگاییکردن دەبێتەوە. هەڕەشەی دژە کودەتا زۆرجیدییانەیە. کاربەدەستانی حکومەت، سوپا بەڕێوە دەبات و سوپاییەکانی دەسەڵاتدار هاوتایەکانیان ڕازی دەکەن کە بۆ سەربازگەکان بگەڕێنەوە، بەڵام لە ڕاستیدا کێشەکان لە ئەنجوومەنی سەربازییەوە سەرچاوە دەگرن. بۆ نموونە حکومەتە سەربازییەکان بە هۆی ترس لە بەرپەرچدانەوەی کاربەدەستانی پلە نزمی سوپا بەڵێنەکانیان (گەڕانەوە بۆ سەربازگەکان) جێبەجێ نەکەن. سەڕەرای ئەم پێکەوە گونجانە. لە چەندین وڵات لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال کودەتا و دژە کۆدەتا ڕوویداوە کاتی ڕوودانی

حکومەتی سەربازی (کودەتا) بڕیاری سەرەتایی بۆ دەستتێوەردان لە پرۆسەی سیاسیدا دەدرێت و سەختە کە وەچەی داهاتوو رازی بکرێت کە بۆ سەربازگەکان بگەڕێنەوە.

دووەمین کێشەی گەورە کە حکومەتی سەربازی لە حکومەتکردندا رووبەڕووی بووە، ئەوە بوو کە سەربازەکان، پەروەردە و ئەزموونی کەمیان لە حکومەتکردندا هەبوو و ستراکتۆری ناوەوەیان ئەوەندە پێشکەوتوو بوو کە بە تەواوی دەوڵەتی بەڕێوەببەن. سەرکردەکانی کودەتا بەم ئەنجامە گەیشتن کە رووخاندنی حکومەتێك زۆر سادەترە لە دامەزراندنی حکومەتی ئەڵتەرتتیڤ. بۆیەش حکومەتی سەربازەکان ناچارە کە بە وردی فێری هونەری رازی کردنی سیاسی ببێتەوە و ئەم کارش لە پاڵ شارەزایی لە کردەکانی وەك سەرکوتکردن برەوی پێ دەدات هاوڕێی سروشتی سوپا لەم کارەدا بۆرۆکراسییە، ئەگەرچی سوپاییەکانی ئەفریقیا شوێنی سیاسەتمەدارانی بەدەست گرتووە و هەمیشە بۆرۆکراتەکانی خزمەتکاری رژێمی پێشوویان سنووردار کردووە، بەڵام ئەم کەسانە خاوەن ئەزموونی حکومەت کردنن. زیاد لەمەش سوپاییەکان سەرکردە سیاسییەکانی پێشوو پاکسازی دەکەن، بەڵام هەمیشە سەرکردەکانی کودەتا هێلکارییەك لە دژایەتیکردن وێنا دەکەن و تەنانەت کەسانێك لە ئەنجوومەنی دەوڵەتی پێشوو (زۆرتر نوێنەرانی گرووپێکی نەژادی تایبەت) بە ئەندامێتی رژێمەکانیان پەسەند دەکەن، هەروەها ئەوان پێویستیان بە جێگرێك هەیە بۆ نەهێشتنی کەم و کوڕییەکان لە بڕی کاربەدەستە سیاسی و جێبەجێکارەکانی پێشوو، هەر بۆیەش زۆر جار شیکاریستەکان لە باسکردن لە حکومەتە دژە کودەتاکان تووشی هەڵەکردن دەبنەوە و بە ((رژێمی سەربازی)) وەسفی دەکەن. ئەوان زۆرتر هێزی دوولایەنەی پێکهاتوو لە هاوڵاتیان و کادیری سوپان.

سێیەمین لوغزی سەرەکی کە حکومەتی سەربازی لە کاتی بەدەست گرتنی دەسەڵات رووبەڕووی دەبێتەوە پرسی مەشروعییەتە. ئەمانە وەك گشت سەرکردە و کاربەدەستەکان ناچارن کە پەرە بە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنیدا بدەن. چونکە ئەو کەسانەی کە دەسەڵات دەگرنە دەست ژمارەیان کەمە هەر بۆیەش پەیوەندییان لەگەڵ کۆمەڵگادا کەمە، بۆیە ناچارن بە دووبارە زیندووکردنەوە یان جێگرکردنی تۆڕەکانی دەربەگایەتی رژێمی پێشوو (کە ئەم دامەزراوانە هەڵقولاوی دامەزراوە جێبەجێکار و راوێژکاری قۆناغی پێشترن). چونکە رژێمە نوێیەکان نوخبە گەندەڵەکانی پێشوویان لە پۆستەکانیان دوورخستووتەوە خۆشەویستن، بەڵام کاتێك کە مانگی هەنگوێنی تەواو دەبێ پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنی بۆ بەدەست هێنانی مەشروعییەت لەپێناو گەرەنتی کردنی سەقامگیری حکومەت دەبێت بە



(کارێکی) ژیاریی. بەڵام هەر کە حکومەتی سەربازی مەشروع لەگەڵ گرووپە کۆمەڵایەتییە بە فەرمی ناسراوەکان هەوڵ بدەن سیستەمی دەرەبەگایەتی زیندوو بکەنەوە ئەو کاتە ناکارایی مشتومڕی سیاسی بەرجەستە دەبێت.

بەم پێیەش پرسی وەفاداربوون بە پەیمان لە ئارادایە. حکومەتەکان لە پرۆپاگەندەکانیاندا بۆ گەل باس لە رێگەگرتن لە گەندەڵی و گەشەسەندی ئابووری دەکەن. کارێك کە باس کردنی ئاسانترە لە ئەنجامدانی. بە شێوەیەکی کاریگەر حکومەتی سەربازی سەرکەوتوو ناچارە بە هەمان شێواز کە سیستەمی پێشوو کاری دەکرد کاری زۆرتر ئەنجام بدات لە یەکەمین قوناغدا کودەتاکانی سەربازی بە هۆی بارودۆخی سەختی ئابوورییەوە روویانداوە و ئەم بارودۆخەش، چونکە لە حاڵی حازردا سەربازەکان لە ژێر کونترۆڵ دان کەمتر روودەدات، دەوڵەتی ناکارامە لە ئەفریقیادا لە هاوسەنگی نەژادی بەمەبەستی خزمەتکردن بە بۆرژوازی بۆرۆکراتیك و تۆڕەکانی دەربەگایەتی، هەڵدەقولێ. هەر کە سوپا کۆشکی سەرۆکایەتی کۆماری داگیر کرد، تێدەگەن کە بۆچی رژێمی پێشوو ئەمجۆرە پەیوەندی سیاسی پەسەند کردووە بۆ پیشتیوانی کردن لە گرووپە کۆمەڵایەتییەکان پێویستە دیسپلینی سیاسی بەرقەرار بکرێت. دووبارە پێویستە جەخت بکرێتەوە کە روخاندنی حکومەتێکی خراپ لە دامەزراندنی حکومەتێکی چاك ئاسانترە.

دوایین لوغز کە سوپا لە کاتی گرتنە دەستی دەسەڵات رووبەڕووی دەبێتەوە ئەو شتەیە کە سوپاییەکان هەوڵ دەدەن لە داهاتوودا جێبەجێی بکەن. پرسیارگەلێك وەك ئایا هەڵبژاردن ئەنجام دەدرێ؟ ئایا سەربازەکان بێ یەك و دوو دەگەڕێنەوە سەربازگەکان؟ ئەگەر ئەمانە مەبەستیان بێ کە دامەزراوەیەکی جێبەجێکاری بە ئامانجی هێنانەدی ژینگەیەکی گونجاو دابمەزرێنن تا چ کاتێك دەسەڵاتیان بە دەستەوە دەبێ؟

ئایا سەرکردەکانی کودەتا کۆمیسیونە کاتییەکان لە ناو دەبەن ئەرکە سیاسییەکانیان وەك هاولاتییەك ئەنجام دەدەن؟

خاڵی سەرنجراکێش، ئەوەیە کە ئەوان دەیانتوانی سوپا وەك کۆڵەکەی بەرگری لەخۆکردن بەکاربهێنن و لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بە بەرفراوانی ئەندامگیری بکەن تا دەوڵەتێکی تاك پارتی بە بەشداری بەرفراوانی جەماوەر دابمەزرێنن. زۆربەی کودەتاکانی ئەفریقیا بە بێ پلان داڕێشتن بۆ داهاتوو روودەدات. ئەگەرچی کاتێك کە سوپا دەسەڵاتی گرتە دەست ناچارە بە خێرایی وەڵامی گشت پرسیارەکانی سەرەوە بدات.

## ئەنجامەکانی حکومەتی سەربازی لە ئەفریقیا:

چونکە هۆی ڕوودانی هەر کودەتایەکی سەربازی جیاوازە بۆیە ئەنجامی ئەم ڕووداوەش جیاوازە، و هیچ (سیستەمێکی سیاسی) تایبەت لەم ڕژێمانە هەڵناقوڵێت سوپاییەکان بە هۆی ناوەرۆك و دەست پێگەیشتنیان بە سەرچاوەکان هەروەك هاوتا مەدەنییەکانیان بە شێوازی جۆراوجۆر دامەزراوەگەلی جێبەجێکردن بەڕێوەدەبەن. هەندێ جار بیرۆکە سەرەکییەکانی ڕوودانی کودەتا بە تایبەتیش سەبارەت بە کودەتای پارێزگاران (پاسەوانان) و کودەتا لەپێناو ڕزگاربوون لە گوشار بووە هۆی سنووردارکردنی حکومەتەکان لە بەشەکانیتری کیشوەری ئەفریقیادا، ئەگەرچی هێزە سەربازییەکان ناچار بە دروستکردنی پەیوەندی نزیك لەگەڵ بۆرۆکراسی و کۆمەڵگای مەدەنین، ئەم ڕژێمانە بەرەو ئاراستەی هاوشێوەکردن (وەك حکومەتە تاکەکەسییەکان و تۆڕەکانی دەرەبەگایەتی) بە شێوەی باب و باپیرانیان هەنگاو دەنێن. ئەمەش کارێکی باوە بۆ حکومەتە ئەفریقیاییەکانی دوای کۆلۆنیال تا بۆ دۆخی سەرەتایی بگەڕێنەوە.

یەکێك لە ئەنجامە هاوبەشەکانی حکومەتە سەربازییەکان ئەوە بوو، کە لەو کاتەی ئەوان دەسەڵات دەگرنە دەست، سوپاییەکان مەیلداربوون کە خەرجە گشتییەکانیان وەك بودجەی لەشکری تا ڕادەیەکی بەرچاو لە پاش ڕوودانی کودەتا زۆر بکەن. بە ئاسایی، بەرژەوەندی هاوبەش کە دەبێتە هۆی ڕوودانی کودەتا لە یەکەمین قۆناغدا پشتگیرییان لێدەکرا، بەم پێیەش ئەو کەسانەی کە حکومەتیان لە دەستدا بوو ناچار بە پارێزگاری کردنی هاوپەیمانەکانیان بوون تا بە هۆی ترسیان لە دژە کودەتا بۆ سەربازگەکان بگەڕێنەوە. لەم چەشنە هەڵ ومەرجەدا ئاوردانەوە لە هێز و توانستی سەربازییەکانیان بە ڕادەیەکی بەرچاو زیادی کرد، بۆ نموونە تێچوونەکانی بەرگری لە غانا دوای ساڵی ١٩٦٦ تا ٢٢٪ زیادی کرد. ئەمەش لە کاتێکدا بوو. کە بە هۆی گوشارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی هەڵقوڵاو لە خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان، لە هەمان سەردەمدا بودجەی بەشی کۆمەڵایەتی و ئابووری تا ٢٨٪ کەم کرایەوە لە چاکسازییە ساکارەکانی جۆرناسی (تایپۆلۆژی) کە پێشتر خرانەڕوو کودەتا سەربازییەکانی کاتی بەرەو نموونەیەکی (نموذج) ساکار مەیلدارن. دوای بەدەست گرتنی دەسەڵات، هێزە سەربازییەکان بەڵێنیاندا دوای بەرقەرارکردنی دیسپلینی سیاسی گونجاو بگەڕێنەوە سەربازگەکان، بەڵام ڕێژەیەکی کەم ئەم کارەیان ئەنجامدا (واتە گەڕانەوە بۆ سەربازگەکانیان). بۆ نموونە غانا لە ساڵانی ١٩٦٩ و ١٩٧٩ دا حکومەتەکەی بۆ حکومەتێکی



سیڤیل گۆڕی. نێجرییەش لە ساڵانی ١٩٧٩ و ١٩٩٩دا ئەم پرۆسەیەی دەستپێکرد. لە ئەنجامدا ڕژێمە پارێزگارێتییەکان، سوپاییەکانیان وەك مەرجەعێکی سیاسی هەژمار کرد، بۆ نموونە ئەوان  دەبن بە دامەزراوەیەك کە هەم ڕێساکانی گەمەکردن و هەمیش یاسای بنەڕەتی نوێ دادەڕێژن. هەروەها هێزی سەربازی ئەم مافەی بۆ پاراستووە ئەگەربێتو هاوڵاتیان لە تاقیکردنەوەکانیان و لە ڕوانگەی سوپاییەکانەوە شکستیان هێنا، دووبارە دەست لە (کاروبارەکان) وەربدەن چەندین وڵاتی ئەفریقیا لە زنجیرەی نێوان حکومەتی مەدەنی و حکومەتی سەربازیدا جێگیربوونە. سەرەڕای وەها نیشاندنی (تظاهر) حکومەت، هەر سیستەمێك بۆ پاراستنی حکومەت بە پێچەوانەی بانگەوازییەکانیان  بۆ سپاردنی دەسەڵات بە خۆبەخشانە ئەم کارەی ئەنجام نەدا، حکومەتە سەربازییەکان وەکو یەك بەرەو کاملکردنی دامەزراوە هەمیشەییەکان هەنگاوی نا کە بەرەو ڕژێمە دوو لایەنەی سەربازیی — مەدەنی چەمایەوە.

کودەتاکانی سەرکەوتوو ئەنجامی تەواو جیاوازیان هەیە. ئەو ڕژێمانەی کە لەم کودەتایانە بەرهەم دێن وازیان لە ستراکتۆرە سیاسییەکانی پێشوو هێنا و سیاسەتی تایبەت بە خۆیان بۆ دامەزراندنی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی دەگرنەبەر ئەمەش ئامرازێکە بۆ یەکگرتنی سوپا و جەماوەر و بە ڕووکەشانە ڕۆحی نەتەوایەتی بە هێز دەکات. یەکێك لەم پەیوەندییانەش دامەزراندنی دادگای سەربازی و مەدەنییە کە لە ساڵە سەرەتاییەکانی حکومەتی ماریام مەنگستۆ لە ئەسیوپیا دامەزرا کە ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرا بۆ شۆڕشی سەربازییە و تەنانەت ڕژێمە سەرکەوتووەکانیش، لە واقیعییەتە سیاسییەکان بێ ئاگان (بڕواننە ڕژێمی توماس سانکاری  و جڕی  ڕاولینگ  کەلە  بەشی  سێیەمدا باسکراون)، بۆ نموونە پارتە جەماوەرییەکانی (کۆمەڵی) نوێ وەك هاوتاکانیان لاوازدەبن. بەهەرحاڵ تاك پارتی کە زۆرتر بە مەبەستی بەرزکردنەوەی هەستی بەشداریکردن لە کۆمەڵگای مەدەنیدا و نە وەك میکانیزمێك بۆ کۆمەڵەکان کە بتوانن لە سیاسەتە گشتییەکاندا بەشداربن، بوونیان هەبوو. ئەم بارودۆخانە نیشاندەری ئەوەن کە کارێکی سادەیە کە حکومەتگەلی خاوەن تایبەتمەندی کودەتا لە ستراکتۆرەکاندا بەرەو حکومەتی تاکەکەسی و دەوڵەتی تاك پارتی ئاراستەبن، کە تیایدا تۆڕەکانی دەربەگایەتی، میکانیزمی باڵادەستی گۆڕانکاری سیاسییە. ئەفریقیا دوای کۆلۆنیاڵ ژمارەیەکی زۆری کودەتای سەربازی بەخۆوە بینیووە. ئەم کودەتایانە بەسەر سێ پۆل. کودەتای نکۆڵی کردن (veta) کودەتای ڕادیکاڵی بۆ ڕزگاربوون لە گوشار و کودەتای پارێزگاران (پاسەوانان) دابەش کراون. بەڵام ئەنجامەکەی بە

بنبەست گەیشتنی پەیوەندییەکانی نێوان هاوڵاتیان و دەسەڵاتی سەربازی بوو. هێزە سەربازییەکان هیچ پیلانێکیان بۆ چوونە دەرەوە لە پرۆسەی سیاسیدا نەیان خستەڕوو. ئەگەرچی ئەوانیش نەیانتوانی بەبێ پشتگیری کردنی هاوڵاتیان بەسەرکەوتوانە حکومەت بکەن. لە ئەنجامدا، بەرهەمی ئەم بارودۆخە حکومەتی دوو لایەنە (سەربازی–مەدەنی) بوو. سەرکردە سیاسییەکان ناچاربوون کە خۆیان بە شارستانێتی (پێشکەوتوو) دیارخەن و لەگەڵ بەرپرسانی رژێمی پێشوو بە مەبەستی پاراستنی دەسەڵاتەکەیان، هاوکاری بکەن. بەڵام بەوتەی کۆنڵ ئامیوو (Kunle Amuwo) ((هەر کە سەربازەکان کەوتنە ناو قوڕئاوی سیاسیدا، بۆیان دەرکەوت کە کەم تا زۆر لە پرۆسەی ناوخۆی کۆمەڵگای مەدەنیدا نوقم بوونەتەوە)) بەم جۆرەش لەم حکومەتانەدا، گوشار و کەم و کوڕی ئابووری باس نەکراوە، چونکە ئیتر سەرۆك کۆمار یونیفۆرم پۆش (کەسێکی سەربازی) بوو. کارکردنی مامناوەندی رژێمە سەربازییەکانی ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیاڵ سەلماندیان کە لە هاوتا مەدەنییەکانیان سەرکەوتووتر نەبوونە.

## دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی:

تێزی سەرەکی ئەم پەرتووکە شیکردنەوەی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنییە. کودەتا سەربازییەکان گۆڕانکارییەکی کەمیان بەسەر هاوکێشە و هاوسەنگی هەمەلایەنەیان هەبووە. ئەگەرچی لە روانگەی دەوڵەتەوە، کودەتا شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو. دەستتێوەردانی سەربازی ((خێرایی ئاڵ وگۆڕی نوخبەکان و نوێکردنەوەی ستراکتۆری دەستەبەندییەکان))ی گۆڕی: لەم رووەوە کودەتا سەربازییەکان بەرپەرچدانەوەیەك بوو لەهەمبەر فرێودانە ناوخۆییەکانی دەسەڵاتی بۆرژوازی بۆرۆکراتیك کە لە بەشی پێنجەمدا باسکرا. چونکە سەربازەکانی بە ئاسانی دەستیان بە سەرچاوەکانی توندوتیژی دەگەیشت. ئەمە سوپا بوو کە وەکو باڵی چەکداری نوخبەکانی دەسەڵاتدار بۆ پاراستنی (حکومەتی نوخبە) کاری دەکرد. ئەگەرچی کاتێك کە (سوپا) بە دەسەڵات دەگەیشت، کاربەدەستە فەرمانڕەواکان ناچار دەبوون لەگەڵ هەندێ ئەندامی چالاکی رژێمی جەماوەری پێشوو سازش بکەن و ئەم کارەش (پشتگیری کردن و دابینکردنی پێداویستییەکانی ئەم بەشانە) دەبێتە هۆی بەردەوامی و پاراستنی دەسەڵاتی حکومەتی سەربازی. ئەم بابەتەش نیشاندەری ئەم راستییەیە کە پاش ماوەیەکی کورت، هێزی سەرکوتکردن بە تەنیایی ناتوانێ پارێزگاری لە حکومەت بکات.



ڕێژەیەکی زۆری کودەتا سەربازییەکان رۆڵی لاوازیان لە گۆڕینی بارودۆخی چەوساندنەوەی (نەهێشتنی ئەم بارودۆخە) کۆمەڵگای مەدەنی لە ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیاڵدا گێڕا. لە زۆربەی کاتەکاندا یونیفۆرم پۆشەکان (سوپا) هەروەك حکومەتەکانی پێشوو لە بەشداری پێکردنی کۆمەلانی خەڵك لە پرۆسەی سیاسیدا شکستیان خوارد، ئەگەرچی زۆرێك لە کودەتا ستراکتۆرییە رادیکالییەکان هەوڵیاندا ئەم رۆڵە بگێڕن، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە دوای کودەتا نوخبەیەکی دەوڵەتی، کۆنترۆڵی دەوڵەتی گرتە دەست، دامەزراوە جێبەجێکارەکان ئەم کارەیان ئەنجام دەدا، بەڵام لێرەشدا نوخبەیەك بوونی هەبوو کە کۆنترۆڵی کاروبارەکانی لە دەست گرتبوو، چونکە دامەزراوەگەلی جێبەجێکاری سیاسی ژێر کۆنترۆڵی بۆرژوازی بۆروکراتیکدا بوو، حکومەتی تاکەکەسی و سیستەمی دەربەگایەتی جێگری شێوازە پۆزەتیڤەکانی بەرهەمهێنانی مەشروعییەت بوونەوە. گەندەڵیی و نالێهاتوویی، بەرهەمی ئەم جۆرە حکومەتانە بوو کە گەلانی ئەفریقیای خستەژێر فەرمانڕەوایەتی سەربازی کە لە حکومەتە مەدەنییەکان باشتر نەبوون، ئەمەش تا ئەو سەردەمە درێژەی خایاند کە خودی کۆمەڵگای مەدەنی دوور لە سوپا دەستیکرد بە گۆڕینی رێسامەندانەی رژێم (لە نەوەدەکاندا گۆڕینی رژێم لە رێگەی هەڵبژاردنی فرە پارتییەوە ئەنجامدرا) تا وڵاتانی ئەفریقیا لە هەمبەر گەلەکەیاندا بەرپرسیار و وەڵامدەرەوە بن.

**خشتەی ژمارە ١ — ٧: کودەتای سەربازی لە ئەفریقیا لە سەردەمی سەربەخۆییەوە**

| ناوی وڵات | مێژووی سەربەخۆیی | دەیەی ٥٠-٦٠ | دەیەی ١٩٧٠ | دەیەی ١٩٨٠ | دەیەی ١٩٩٠ | دەیەی ٢٠٠٠ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەنجرایە | ١٩٦٢ | ١٩٦٥ | – | – | ١٩٩٢ | – | ٢ |
| ئەنگۆلا | ١٩٧٥ | – | – | – | – | – | ٠ |
| بنین | ١٩٦٠ | -١٩٦٥<br>١٩٦٣<br>-١٩٦٧<br>١٩٦٥<br>١٩٦٩ | ١٩٧٢ | – | – | – | ٦ |
| بۆتسوانا | ١٩٦٦ | – | – | – | – | – | ٠ |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بۆرکینافاسۆ | ١٩٦٠ | ١٩٦٦ | ١٩٧٤ | ١٩٨٢و<br>١٩٨٠<br>١٩٨٧و<br>١٩٨٣ | – | – | ٦ |
| بروندی | ١٩٦٢ | ١٩٦٦ | ١٩٧٦ | ١٩٨٧ | ١٩٩٦ | – | ٤ |
| کامرون | ١٩٦٠ | – | – | – | – | – | ٠ |
| کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست | ١٩٦٠ | ١٩٦٥ | ١٩٧٩ | ١٩٨١ | – | ٢٠٠٣ | ٤ |
| چاد | ١٩٦٠ | – | ١٩٧٥ | – | – | – | ١ |
| کۆمۆر | ١٩٧٥ | – | ١٩٧٥<br>١٩٧٨ | ١٩٨٩ | ١٩٩٩ | ٢٠٠١ | ٥ |
| کۆنگۆی دیموکراتیک (کینشازا) | ١٩٦٠ | ١٩٦٥ | – | – | – | – | ١ |
| کۆماری کۆنگۆی برازاویل | ١٩٦٠ | ١٩٦٨<br>١٩٦٣ | -١٩٧٩<br>١٩٧٧ | – | – | – | ٤ |
| کەناری عاج | ١٩٦٠ | – | – | – | ١٩٩٩ | – | ١ |
| جیبوتی | ١٩٧٧ | – | – | – | – | – | ٠ |
| میسر | ١٩٢٢ | ١٩٥٤و<br>١٩٥٢ | – | – | – | – | ٢ |
| گینەی ئەستوایی | ١٩٦٨ | – | ١٩٧٩ | – | – | – | ١ |
| ئەریترە | ١٩٩٣ | – | – | – | – | – | ٠ |
| ئەسیوپیا | – | – | ١٩٧٤ | – | – | – | ١ |
| گابون | ١٩٦٠ | ١٩٦٤ | – | – | – | – | ١ |



| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کامبیا | ١٩٦٥ | – | – | – | ١٩٩٤ | – | ١ |
| غانا | ١٩٥٧ | ١٩٦٦ | ١٩٧٩<br>١٩٧٨<br>١٩٧٢ | ١٩٨١ | – | – | ٥ |
| گینە | ١٩٥٨ | – | – | ١٩٨٤ | – | – | ١ |
| گینەی بیسائۆ | ١٩٧٤ | – | – | ١٩٨٠ | – | ٢٠٠٣ | ٢ |
| کێنیا | ١٩٦٣ | – | – | – | – | – | ٠ |
| لسۆتۆ | ١٩٦٦ | – | – | ١٩٨٦ | ١٩٩٣<br>١٩٩١ | – | ٣ |
| لیبریا | ١٨٤٧ | – | – | ١٩٨٠ | – | – | ١ |
| لیبی | ١٩٥١ | ١٩٦٩ | – | – | – | – | ١ |
| ماداگاسکار | ١٩٦٠ | – | ١٩٧٢ | – | – | – | ١ |
| مالاوی | ١٩٦٠ | – | – | – | – | – | ٠ |
| مالی | ١٩٦٠ | ١٩٦٨ | – | – | ١٩٩١ | – | ٢ |
| موریتانی | ١٩٦٠ | – | ١٩٧٨ | ١٩٨٤<br>١٩٨٠ | – | – | ٣ |
| موریس | ١٩٦٨ | – | – | – | – | – | ٠ |
| مەغریب | ١٩٥٦ | – | – | – | – | – | ٠ |
| موزامبیک | ١٩٧٥ | – | – | – | – | – | ٠ |
| نامبیا | ١٩٩٠ | – | – | – | – | – | ٠ |
| نیجر | ١٩٦٠ | – | ١٩٧٤ | – | ١٩٩٦<br>١٩٩٩ | – | ٢ |
| نێجریا | ١٩٦٠ | ١٩٦٦ | ١٩٧٥ | ١٩٨٥<br>١٩٨٣ | ١٩٩٣ | – | ١ |
| سائۆتۆمەوپرنسیپ | ١٩٧٥ | – | – | – | ١٩٩٥ | – | ١ |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سێنگال | ١٩٦٠ | – | – | – | – | – | ٠ |
| رواندا | ١٩٦٢ | – | ١٩٧٣ | – | – | – | ١ |
| سیشل | ١٩٧٦ | – | ١٩٧٧ | – | – | – | ١ |
| سیراليون | ١٩٦١ | ١٩٦٨<br>١٩٦٧ | – | – | ١٩٩٢<br>١٩٩٦<br>١٩٩٧ | – | ٥ |
| سومالی | ١٩٦٠ | ١٩٦٩ | – | – | – | – | ١ |
| ئـــــەفریقیای باشوور | ١٩١٠ | – | – | – | – | – | ٠ |
| سودان | ١٩٥٦ | ١٩٥٨<br>١٩٦٤<br>١٩٦٩ | – | ١٩٨٩<br>١٩٨٥ | – | – | ٥ |
| سوازیلند | ١٩٦٨ | – | – | – | – | – | ٠ |
| تۆگۆ | ١٩٦٠ | ١٩٦٣<br>١٩٦٧<br>١٩٦٩ | – | – | – | – | ٣ |
| تونس | ١٩٥٦ | – | – | – | – | – | ٠ |
| ئۆگاندا | ١٩٦٢ | – | ١٩٧٩<br>١٩٧١ | ١٩٨٥<br>١٩٨٠ | – | – | ٤ |
| زامبیا | ١٩٦٤ | – | – | – | – | – | ٠ |
| زیمبابوه | ١٩٨٠ | – | – | – | – | – | ٠ |
| کۆی گشتی | – | ٢٩ | ٢٢ | ٢٠ | ١٤ | ٣ | ٨٨ |



**خشتەی ژمارە ٢-٧ i پوختەی بەشی حەفتەم: جۆرناسی کودەتا سەربازییەکان**

| | |
|---|---|
| **جۆری کودەتا سەربازییەکان:** | |
| ١. کودەتـــــای پارێزگــــــاران (پاسەوانان) | * دەستتێوەردانی سەربازی بە مەبەستی رزگـارکردنی دەوڵەت لە خراپ بەڕێوەبردنی حکومەتی مەدەنی<br>– وەستان دژی گەندەڵی و نالێهاتوویی، ئامانجی رژێمی نوێیە. نموونە نیجریا |
| ٢. کودەتـــا نکـــۆڵی کـــردن (Veto) | – دەستتێوەردانی سەربازی بە مەبەستی رێگـەگرتن لـە گەشەی کۆمەڵایـەتی بـە هـۆی دروسـتبوونی مەترسـی لەسەر بەرژەوەندییەکانیان.<br>– ئەمانە رێگـرن لـە بـەردەم بـە دەسـەڵات گەیـشتنی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان. نموونە: ئەلجەزایر |
| ٣. کودەتا لە پێناو رزگار بوون لە گوشار | – دەســـــتتێوەردانی ســــەربازی بـــــە مەبەســـــتی دوورخستنەوەی رژێمی سوننەتی و کۆن.<br>– ئــەم جــۆرە کودەتایانــە لــە ئــەنجامی گۆڕانکــاری کۆمەڵایەتی شۆڕشگێڕانە روودەدات، نموونە ئەسوپیا |
| **فاکتەرەکانی خێراکردنی کودەتا:** | |
| أ) توانایی سوپاییەکان: | – سوپاییەکان سەرچاوەکانی توندوتیژی کۆنترۆڵ دەکەن، لە یەکەم قۆناغدا ئەوان لە تواناياندایـە کودەتـا ئـەنجام بدەن. |
| ب) هەڵومـــەرجی گونجـــاوی ئـــابووری، کۆمەڵایـــەتی و سیاسی: | – ململانێی کۆمەڵایـەتی سیاسـی و بـارودۆخی لاوازی ئابووری کە زەمینەی لەباری بۆ کودەتا فەراهەم کرد. |
| ج) فەرهەنگی سیاسی لەبار: | کودەتا لە هەڵومەرجگەلێك لە وڵاتێکـدا روودەدات کـە ستراکتۆری بەهێزی دیموکراتیك و عەقڵانی بوونی نەبێ. |
| د) رەوشـــــــتی پیـــــــشەیی سوپاییەکان | لەوانەیە سـوپاییەکان هـان بـدرێن بـۆ دەسـتتێوەردان، ئەویش کاتێك کـە، دەوڵـەت لـە بـەدیهێنانی دیـسپلین توانـایی نـەبێت یـاخود دژی بەرژەوەنـدی نەتـەوەیی |

| | |
|---|---|
| | بوەستێتەوە. |
| ﻫ) بەرژەوەندی تاکەکەسی | کودەتا کاتێك روودەدات کە سوپا هەست بکات بەرژەوەندییەکانی رووبەڕووی مەترسی بووەتەوە یاخود هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانی بکرێت. |
| | **به دواهاتەکانی کودەتای سەربازی:** |
| أ) گرفتەکانی رووبەڕووبوونەوەی حکومەتی سەربازی | * ئەگەری بوونی دامەزراوە و رێکخراوگەلی دەستتێوەردەری سەربازی.<br>* ئەگەری ئەنجامدانی دژە کودەتا.<br>* ئەزموونی کەم لە بەڕێوەبردنی حکومەت.<br>* نەبوونی مەشروعییەت (گشت کودەتاکان نایاسایین). |
| ب) ئەنجامەکانی حکومەتی سەربازی | * زیادبوونی بودجەی سەربازی.<br>* پەیوەندی نێوان سوپا و بۆرۆکراسی ناکارامە.<br>* فاکتەر و سیاسەتی کۆمەڵی هەوڵ دەدەن بۆ دەستەبەر کردنی مەشروعییەت. |

## بابەتی توێژینەوە: کودەتای سەربازی ئۆگاندا لە ساڵی ١٩٧١ دا:

ئۆگاندا دەکەوێتە بانێکی بەرفراوان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئەفریقیا. وڵاتێکی بە پیت و سەوزایی و دەریاچەی گەورە و هەندێ چیای بەرز. ئۆگاندا جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ وڵاتانی ئەفریقیادا لە پێکهێنانی دەوڵەت لە دوای سەربەخۆیی هەیە سەرەڕای ئەمەش لە روانگەی جیهانی دەرەوەی ئەفریقیا، رژێمە تایبەتییەکەی ئۆگاندا کە لە سەردەمی (ئەیدی ئەمین) دامەزرا، نیشاندەری نموونەیەك لە ناسەقامگیری و توندوتیژی لە سیاسەتەکانی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالە. لەم توێژینەوەیەدا، باس لە کودەتای ساڵی ١٩٧١ی ئەم وڵاتە دەکرێت، کودەتایەك کە لە رێگەیەوە ئەیدی ئەمین دەسەڵاتی گرتە دەست. لەم توێژینەوەیەدا رەگ و فاکتەرەکانی کودەتا و دەستکەوتەکانی دەخرێنەڕوو. ئەم بەشە لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا پێش حکومەتی



کۆلۆنیالی، پێگەی سیاسی نەتەوەی بیوگاندا (Buganda) و پاشایەتییەکانی بچووك بوو لە ساڵی ١٨٩١دا کۆمپانیای بەریتانیایی رۆژهەڵاتی ئەفریقیا گرێبەستێکی لەگەڵ پاشای بیوگاندای واژوو کرد و ئەم سەرزەمین و ناوچەیەی خستەژێر کونترۆڵی خۆیەوە کاتێك کە کۆمپانیا بە هۆی کێشە داراییەکان ئیفلاس بوو، دەوڵەتی بەریتانیا بەڕێوەبردنی (بیوگاندا) ی لە ئەستۆگرت و لە ساڵی ١٨٩٤دا بوو بە کۆلۆنی فەرمی بەریتانیا. دوای دوو ساڵ دراوسێیەکانی ئەم کۆلۆنە، واتە بیونیورۆ، تۆرۆ، ئانکولی و بویوگسا گرێبەستێکی هاشێوەیان واژووکرد و دەوڵەتی یەکگرتووی ئۆگاندایان پێك هێنا.

ئۆگاندا بەپێچەوانەی دراوسێیەکە واتە کێنیا، کێشەی دانیشتووە سپی پێستەکانی لە کاتی سەربەخۆییدا نەبوو و ناچار نەبوو سەرقاڵی پرسی چۆنیەتی پێگەی بیوگاندا لە دەوڵەتی دوای کۆلۆنیال بێ. خەڵکی ئەم ناوچەیە، داهاتووی خۆیان لە جیابوونەوە لە ئۆگاندا دەبینی و بەریتانیاش سەرکردەی (ئەم ناوچەیەی) داوای داواکاری و شکایەت کردنی سەبارەت بەوەی کە پێویستە بەشێکی جیا و بە دەسەڵاتی خودموختاری بێ، دوورخستەوە، بەڵام بە دوورخستنەوەی سەرکردە، داواکاری خەڵك بۆ ئۆتۆنۆمی کەم نەبووە نارەزای دەربڕینیان لە بایکۆتی هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی نیشتمانی لە ساڵی ١٩٦١دا (پێش سەربەخۆیی) کە ٩٥٪ی خەڵکی بیوگاندا بەشدارییان نەکرد نیشاندەری ئەم بابەتە بوو.

بایکۆتی هەڵبژاردنەکان بەرپرسانی کۆلۆنیالی بەریتانیا بۆ کۆتایی هێنان بە دوورخستنەوەی رێبەری ئۆگاندا رازی کرد و بەریتانیا پێشنیاری کرد کە بیوگاندا دوای سەربەخۆیی وەك حکومەتێکی نیمچە فیدراڵ بەڕێوەبرێت. بە گەڕانەوەی سەرکردە، پارتی وەفادار بە (کاباکا یێککا (Kabaka yekka) دامەزرا و بە هاوکاری کۆنگرەی گەلی ئۆگاندا (بە سەرکردایەتی میلتۆن ئۆبۆتێ) زۆرینەی دەنگەکانی لە هەڵبژاردندا بەدەستهێنا و زەمینەی بۆ سەربەخۆیی ساڵی ١٩٦٢ خۆشکرد. ئەم هاوپەیمانییە یەکەمین حکومەتی دوای سەربەخۆیی بەسەرکردایەتی کاباکا وەك سەرۆك کۆمار و ئۆبۆتێ وەك سەرۆك وەزیران پێکهێنا، ئەگەرچی ئەم یەکگرتن و هاوپەیمانییە زۆر لەرزۆك بوو. سیاسەتی ئۆگاندا لە سەردەمی نۆ ساڵەی نێوان سەربەخۆیی و کودەتای ئەمین بە ململانێی بەردەوام نێوان نوخبە سیاسییەکانی ئۆگاندا دیار دەکرێت. سیاسەتی کوتلە بازی شێوازی زاڵی سیاسەت لەم وڵاتەدا بوو، هەر لە سەرەتاوە ئۆبۆتێ هەوڵی دەدا، کە بە هاوکاری ئەمین و سوپاییەکان دەسەڵات لە کاباکا وەربگرێت. بەرەبەرە سوپاییەکانی لایەنگری ئۆبۆتی دەسەڵاتیان گرتە دەست و لە ئەنجامدا

رژێمی ئۆبۆتی لە جانوێری ساڵی ١٩٧١دا لەلایەن ئەمینەوە رووخا. ئۆبۆتی پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەك پێگەی دەسەڵاتەکەی بەکارهێنا و درێژەی بە بەناوبانگترین رێڕەو لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالدا، واتە سیاسەتی ناوەندگەراییدا. ئامانجی ئەو سیستەمی تاك پارتی بوو و ئەمین کۆنگرەی گەلی ئۆگاندای وەك پارتێك رایگەیاند و بەمجۆرەش بزاڤی کاباکا و خودی کاباکا وەك هێزی رکابەر هەژمار دەکران کە دەبوایا لە گۆڕەپانی سیاسەت و ململانێ دووربخرێتەوە و ئەمەش هەر ئەو شتە بوو کە روویدا. تا ناوەڕاستی شەستەکان چەندین سیاسەتمەداری بیوگاندایی و هەندێ لە لایەنگرانی بە هۆی رەخنەگرتن لە پارتی کۆنگرەی گەلی ئۆگاندا کەوتنە ژێر راوەدوناندا و بەرهەڵستکارەکانیتریش لە رێگەی ترساندن و هەڕەشەکانی دەوڵەتەوە سەرکوتکران، لە ئەنجامی ئەم پلانەی ناوەندگەرا، هەندێ لە ئۆگاندایییەکان وڵاتیان بەجێهێشت، لە توێژینەوەیەکدا کە لەلایەن ئی. ئەی. برت (E. A. Bertt) ئەنجامدراوە، هاتووە کە ئۆبۆتێ تا کۆتایی ساڵی ١٩٦٥ رووبەڕووی نارەزایی دەربڕینەکی توند بووە کە بە تەواوی لە هەڵبژاردنەکانی خۆلی داهاتوودا دوور دەخرایەوە. ئۆبۆتێ بە دامەزراندنی بناغە سەرەکییەکانی سوپا و لابردنی زۆردارانەی نەیاران هەڵبژاردنەکانی دواخست. ململانێی دەسەڵات لەنێوان کاباکا و ئۆبۆتێ لە ساڵی ١٩٦٦دا قول بووە. ئۆبۆتی لەم ساڵەدا فەرماندەیی سوپا لە شابان ئۆبۆلێت (وەفادار و فەرماندەی سوپای کاباکا)ی سەندەوە و ئەم پۆستەی لەئەستۆ گرت و یەکەکانی وەفادار بە سەرۆك وەزیران لە سوپادا بۆ دەرەوەی کامپالا نارد، دەکرێ ئەم کارە وەك کردەیەك بۆ رێگە خۆش کردن، بۆ (ئەنجامدانی) کودەتای سەربازی دژی کاباکا هەژمار بکرێ و ئۆبۆتێ زۆر بە خێرایی دەست بەکار بوو، ئەو خۆی وەك سەرۆك کۆمار راگەیاند و هەڵبژاردنەکانی هەڵوەشاندەوە و کۆلۆنێل ئەیدی ئەمینی بۆ دەستگیر کردنی کاباکا رەوانە کرد و کۆشکی کاباکا تاڵانکرا و ئەیدی ئەمین بوو (پۆستی) سەرۆکی نووسینگەی ئۆبۆتێ بەرز کرایەوە.

ئەم کارە سەرەڕای رووخاندنی پێگەی دەسەڵاتی کاباکا بوو بە هۆی بێهێزکردنی سیاسی ئۆپۆلۆت (Opolot) . ئۆبۆتێ پۆستی راوێژکار و فەرماندەیی سوپای بە ئەمین بەخشی. ساڵی دواتر لە چاکسازییەکانی یاسای بنەڕەتیدا مانور و بەرپەرچ دانەوە سیاسییەکانی ئۆبۆتە جێبەجێکران و ئەو زۆرینەی لایەنگرانی لە پەرلەماندا بە مەبەستی سەرکوتکردنی شۆڕشی گەلی بیونگاندا بەکارهێنا و وڵاتێکی یەکگرتووی دامەزراند. بەم کارە پێکەوە لکاوی دەسەڵاتی ئۆبۆتێ کامڵبوو، ئەگەرچی دواتر پشتبەستنی ئۆبۆتێ بە هێزی سەرکوتکردن بوو بە



هۆی هەرەس هێنانی، بەڵام لە هەوڵدانەکانی بۆ لابردنی نەیاران، دامەزراوەکانی (بەکاربەری) توندوتیژی دەوڵەتی بەهێزکرد و دەستیان واڵکرا. هێزی سەربازی ببوو بە ئەکتەرێکی بەردەوام لە سیاسەتی ئۆگاندا دا و لە ئەنجامدا ململانێیەکی توند لە ناو نوخبەی دەسەڵاتداردا دژی ئەمین و سوپا روویدا. ئەم ململانێیە لە ساڵی ١٩٧١دا، کاتێك کە ئەیدی ئەمین دەسەڵاتی لە ئۆبۆتێ (کاتێك کە ئۆبۆتێ لە کۆنفرانسی وڵاتانی کومون و لس (بەرژەوەندی هاوبەش) لە سەنگاپور بوو) وەرگرت، دەستی پێکرد. پرسیار ئەمەیە کە چۆن کودەتا لەم وڵاتەدا روویدا ئایا فاکتەر تیۆریکییەکانی کودەتاکانی ئەفریقیا، توانایی، ژینگە، رێکخستن و هاندان دەتوانن دەربڕ و فاکتەری سەرەکی کودەتای ئۆگاندا بن؟

رووداوەکانی جانیوەری ساڵی ١٩٧١ بە بڕوای سەلماندی کە سوپای ئۆگاندا توانایی رێکخستنی کودەتای سەربازی هەیە. لە کاتی سەربەخۆیی سوپای بچووکی ئۆگاندا بە پێشینە و بوونی تفەنگدارانی ئەفریقیایی پاشایەتی کۆلۆنیالی بەریتانیا. گرنگی سیمبولێکی بۆ بەرگری کردن لە وڵاتی تازە سەربەخۆی وەرگرتوو، بەدەستهێنابوو، بەڵام هەنوکە گرنگی سیاسی سوپای ئۆگاندا زۆرتر لە گرنگی سیمبولێکەکەی بوو. هەر کە ئۆبۆتێ ناچار بوو لەپێناو مکوم کردنی دەسەڵاتەکەی پشت بە سوپا ببەستێ رێژەیەکی زۆری سامانی وڵاتی لە سوپادا (١٠٪ بودجەی نیشتمانی بە بەراورد لەگەڵ ٧٪ لە کێنیا و ٤٪ لە تانزانیا) سەرمایەگوزاری کرد و کادری لەشکرییەکەی بەخێرایی لە ٧٠٠ کەس لە ساڵی ١٩٦٢دا بە ٧,٠٠٠ کەس لە ساڵی ١٩٦٩ دا گەیشت. تا ساڵی ١٩٧١ سوپای ئۆگاندا سەرچاوەگەلی بەشەکانیتری کۆمەڵگا و سەرچاوەی نوخبەی سیاسی ئۆگاندای- یەکەمین فاکتەری بەهێزی (بالقوە) جولێنەر بۆ هەر جۆرە کودەتایەکی سەربازی-گرتە دەست.

ئەگەرچی کودەتا سەربازییەکان سەرەڕای سوپا بەپێی فاکتەریتریش بەهێز دەکرێن و پێویستیان بە ژینگەی گونجاوی ئابووری — کۆمەڵایەتی و سیاسی هەیە. بە بڕوای ئۆگاندا لە شەستەکاندا لە هەر یەك لەم سێ کەرتەدا کێشەگەلێکی لە پێش بوو، بۆ نموونە سەرەڕای داواکاری باباگاندا بۆ خودموختاری گرووپە نژادییەکانیتریش جەختیان لە سەر شوناسگەلی جۆراوجۆر دەکردەوە و لەم رووە ئۆگاندا هەست بە کێماسی هەماهەنگییەکی بەهێز (بالقوە) لە دەوڵەت — نەتەوەدا دەکرد. ئەم بارودۆخە بەرەو شۆڕش و نارەزایی دەربڕین چەمایەوە. ئۆبۆتۆ و کاباکا بەرەنگاری یەکتر بوونەوە و ئەم رەفتارەش بوو بە هۆی ناوەندگەرابوونی دەوڵەت و کەناڵە یاساییەکانی بەرهەڵستکارانی داخست و هەلەکان بۆ بەرهەڵستکاری یاسایی کە بە

((بەهای متمانە پێکراو)) هەژمار دەکرا، لە ناوەڕاستی شەستەکاندا لە ئۆگاندا زۆر سنووردار کرا. تەنانەت زاراوەی ((جوڵانەوە بەرەو چەپ)) لە دەیەی دواتردا، کاتێك کە سەرۆك کۆمار هەوڵی دەدا کە لەم ڕێگەیەوە مەشروعییەت بەدەست بێنێت، شکستی هێنا و لە ئەنجامدا ئۆبۆتێ نەیتوانی ڕای خەڵك بەدەست بهێنێت.

زمینە بۆ کودەتا فەراهەم ببوو، ژینگەی ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتی گونجاو سەرچاوەی بەهێز و ڕێکخستنی سوپاش ئامادەیی تەواویان بۆ ئەم کارە (کودەتا) هەبوو، گشت شت و گشت کەسێك چاوەڕوانی تروسکەیەك بوون و سوپا بۆ دەستتێوەردان خۆی ئامادەکردبوو و ئەم هاندانەش وەك هەڕەشەکردنێکی کەسی (شخصی) لەلایەن ئەمینەوە لە دەروونی دەوڵەتدا ڕوویدا. ڕکابەرێتی لەنێوان ئۆبۆتێ و سەرۆکی دەزگای زانیاری سوپا بۆ دەست گرتنی دەسەڵات لە جانیوەری ساڵی ١٩٧١دا بە ترۆپك گەیشت و دەبوایا یەکێك لەم دوو بەرپرسانە وەلا نرابان.

دوای ئەوەی کە ئەمین بوو بە سەرۆکی ڕاسپێردراو (مأمور)ەکانی ئۆبۆتێ بۆ یەکگرتنی پێگەی کۆمەڵایەتییەکەی لە سوپا و دەوڵەتدا هەولیدا و کەسانێکی لە باکوورەوە هێنا ناو سوپادا و دادگای سەربازی لە باشووردا بەرفراوان کرد. ئۆبۆتێ دوای ئەوەی کە دەسەڵاتێکی ڕێژەیی بەدەستهێنا هەوڵیدا کە وابەستەبوونی خۆی بە سوپا کەم بکاتەوە و لەبری ئەمەشدا هەوڵی فراوانکردنی هێز و یەکە تایبەتییەکانی خۆیدا و ئەم هەوڵانەشی بە ئاراستەی گۆشەگیرکردنی سوپا بوو و بەم کارەش سوپا کەوتە قۆناغی تەقینەوەدا.

هەروەها ئەو بە تاوانبارکردنی ئەمین بە کوشتنی ئەفسەر ئۆکایا (وەفادرێك بە ئۆبۆتێ) زەمینەی بۆ دەرکردنی ئەمین لە سوپادا فەراهەم کرد. لێکۆڵینەوە لە ئەمین لەسەر ئەم کوشتنە لە خودی سەرۆك کۆمار دەرکرا و ناوبانگ و پێگەی (اعتبار) ئەمین وەك سەرۆکی دەزگای زانیاری بوو بە هۆی بێ تاوانی ئەمین و بەهێزکردنی پێگە و هەڵویستی ئەمین لە وڵاتدا و لە ئامادە نەبوونی ئۆبۆتێ (لە وڵاتدا) سوودی وەرگرت و خۆی وەك سەرۆکی دەوڵەت ڕاگەیاند و گشت ئەو ڕێز و پێگەیەی کە لە دەستدا بوو، بە دەستی هێناوە ئەمین حەزی لە وەلانان، دابەزاندنی پێگە، دوورخستنەوە و بەندکردنی و تەنانەت زیانگەیاندن بە ئۆبۆتێی نەبوو، ئەم فاکتەرەش دوایین هۆکار لە ڕووخانی ئۆبۆتێ و بەهێزکردنی کودەتا بوو. ئەمین سەرەڕای ئەو ناوبانگەی کە بەدەستهێنابوو لە جێبەجێکردنی یاساکانی ئۆبۆتێ لە ئۆگاندا و، ئەم ڕاستییە کە لە یەکەمین ڕاپۆرتدا بەڵێنی ئەنجامدانی هەڵبژاردنی دیموکراتییانە لە ماوەی ٥ ساڵدا دابوو،



نەیتوانی پێشکەوتنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووری بەدی بێنێت، ئەو وەك گشت ڕژێمە سەربازییەکان ڕووبەڕووی لوغزێك بووە و بە سادەیی لێی دەرباز بوو. ئەو هەوڵی کەمیدا بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی دامەزراوەکان و پەیوەندییەکانیان بە کۆمەڵگای مەدەنییەوە و هێنانەدی مەشروعییەت بۆ حکومەتەکەی. لە بڕی ئەمەشدا بەتووندی پشتبەستراو بە هێزی سەرکوتکردنی دەوڵەت بوو. بە بڕیاری ئەمین ئەنجوومەنی نیشتمانی هەڵوەشایەوەو دادگای سەربازی جێی دادگای گشتی گرتەوە و (کادر) سەربازی بە فەرماندار و پارێزگار و دەسەڵاتدارانی ولایەتەکان گوماردران، لە کردەیەکی بێ سووددا، ئەمین لە پێناو بە ئەفریقیایی کردنی ئۆگاندا گشت ئەو ئاسیایی ڕەگەزانەی کە لە ئابووری وڵاتدا ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لە وڵات دەرکران و گشت کارگە ئابوورییەکانی بەریتانیا لە ئۆگاندا بە نەتەوەیی کران، هەر پارتێکی بەرهەڵستکار و هەر جۆرە دژایەتییەکی بەهێز (بالقوە) بەتووندی سەرکوت و لابردران، گاردی ئاسایشی گشتی سەر بە ئەمین لە ساڵانی نێوان ١٩٧١ تا ١٩٧٩ سەدان هەزار تیرۆری سیاسییان ئەنجامدا. تەنیا سوپا سوودی لە حکومەتی ئەمین بینی و هەروەك زۆربەی حکومەتە سەربازییەکان بەخێرایی پەرەی سەند، دوای کودەتا لە ساڵی ١٩٧١ ئۆگاندا ٦٨٠و٧ سەربازی هەبوو بەڵام ئەم ڕێژەیە لە ساڵی ١٩٧٤دا گەیشتە ٢٠,٠٠٠ سەرباز و سوپا دەسەڵاتێکی فراوانی لە کۆمەڵگادا بەدەستهێنا و ئەو شتەی کە بە دڵی ئەمین بوو ڕوویدا و کاتێك کە بارودۆخی بە گونجاو دەزانی بڕیاری خێراو بەپەلەی دەردەکرد. بۆ نموونەی نیوەی سامانی ئەم وڵاتە بە دوورخستنەوەی کۆمەڵگای ئاسیایی لە وڵاتدا هاتەدەر و ڕێگەی سوپای بۆ بە دەستگرتنی سامان خۆشکرد. بوون بە سەرباز پێشەیەکی متمانە پێکراوبوو لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی ئەمیندا. سوپا لەلایەن کاربەدەستە وەفادارەکان بەرە بەرە لە هێزە نەیارەکان پاك کرایەوە و سەربازانی ڕەگەز لانگی و ئاچولی ڕووبەڕووی ڕەشەکوژی بوونەوە و گرووپە سەربازییەکان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات ڕکابەرێتی یەکتریان دەکرد و ئەم پرسەش بوو بە هۆی متمانە بە یەکتر نەکردن لەنێوان کاربەدەستە پلە بەرزەکان و پلە نزمەکان و حکومەت تا کۆتایی هاتنی حکومەتی ئەمین کەوتە ژێر کونترۆڵی ژمارەیەکی کەم لە شەڕڤانانی سەبازیی.

ململانێی نێوان هەندێ بەش لە سوپادا گەیشتە ئاستێك کە ئەمین خۆی بۆ هێرشکردنە سەر باکووری تانزانیا ئامادەکرد تا لەم ڕێگەیەوە سەرلەنوێ یەکگرتوویی نێوان سوپا دروست بکات. سوپای تانزانیا بە سەرکوتکردنی هێرشبەرەکان وەڵامی ئەم کارەی دایەوە و دواتر خۆی هێرشی کردە سەر کامپالاو بە هۆی شەڕ لەنێوان بەرهەڵستکارە ئۆگاندایییەکان هێزی تانزانیا

توانی لە ساڵی ١٩٧٩دا ئەمین لەکار لابدات. ئەگەرچی دەوڵەتی ئەمین هەمیشە دەڵەتێکی لاواز بوو بەڵام هیچ کات هەوڵی نەدا کە مەشروعییەتی حکومەتەکەی لەرێگەی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنیدا بەدەست بهێنێت. بەکارهێنانی هێزەکانی دەوڵەت بۆ توندوتیژی لەلایەن سوپاوە، حکومەتە ستەمکارییە هەشت ساڵەی گەرەنتی کرد. ئەمەش نموونەیەکی مێژوویی بۆ ئەم گریمانەیەیە کە بۆ سوپا رووخاندنی حکومەتێك زۆر ئاسانترە تا ئەوەی کە بە سەریدا حکومەت بکات.

مێژووی نوێ ئۆگاندا ئاماژەدەرە بۆ ئەوەی کە ئەم وڵاتە لە ساڵانی هەشتادا هەڵی گەشەی سیاسی و ئابووری لە دەستدا و پارتی کۆنگرەی گەلی ئۆگاندا، دووبارە لە رێگەی هەڵبژاردنەکانەوە پاش دەرچوونی هێزەکانی تانزانیا لەم وڵاتەدا (سەرەڕای بوونی بەڵگە لە ساختەکاری لە دەنگداندا) دەسەڵاتی گرتە دەست، بەڵام جارێکیتر پارت لە یەکگرتنەوەی (اتحاد) ئەم وڵاتە سەرکەوتوو نەبوو. هەڵبەت مەزەندەکراوە کە نزیکەی ١٠٠,٠٠٠ ئۆگاندایی لە توندوتیژییەکانی سیاسی نێوان ساڵانی ١٩٨٠ و کودەتای ساڵی ١٩٨٥ گیانیان لەدەستداوە. ئەم کودەتایە یارمەتی یووری موسڤینی (yoweri musevinl) و سوپای بەرگری نەتەوەی دا تا ساڵێك دواتر کامپالا داگیر بکەن و لە ساڵی (١٩٨٦دا دەسەڵات بگرنە دەست و قۆناغێك لە سەقامگیری سیاسی و رێزگرتن لە مافی مرۆڤ بۆ وڵات گەڕایەوە.

سەرەڕای سیاسەتی ((حکومەتی بێ پارت)) و بەڵگەگەلێك لەسەر نەهێشتنی سیاسەتمەدارە بەرهەڵستکارەکان، رژێمی موسڤینی وەك حکومەتێکی ویستراو لە کیشوەری ئەفریقیادا چ لەلایەن بانکی جیهانی چ لەلایەن وڵاتە رۆژئاواییەکانەوە دانی پێنراوە. ئەمەش نیشاندەرە کە پێگەی رژێمی ئۆگاندا پشتبەستراو بە مەشروعییەتە لەبری ئەوەی کە پشت بە سەرکوتکردن و زۆر ببەستێت، هەروەها بە بڕوای دەتوانرێ، بووترێ کە بە پێچەوانەی نێجریا، لە سەردەمی حکومەتی موسڤینی بازنەی کودەتا و دژە کودەتایی پێهات.



**ئۆگاندا:**

| | |
|---|---|
| رووبەر | ٢٤١\\١٣٩ کیلۆمەتری چوارگۆشە |
| دانیشتوان | ٢٤\٨ ملیۆن کەس |
| هێزی کۆلۆنیال | بەریتانیا |
| ساڵی سەربەخۆیی | ١٩٦٢ |
| شارە گەورەکان | کامپالا (پایتەخت) . جینجا، میبالی |
| نەژادەکان | باگاندا، باسوگا، بانیانکۆلی |
| دانیشتوانی شار | ١٤\٢ |
| ناوەندی ژیان | ٤٢ ساڵ |
| رێژەی مردن | ١٠٠ مردن لە هەر ١٠٠٠ لە دایکبوون |
| رێژەی خوێندەواری | ٦٤ |
| ئایین | سوننەتی و مەسیحی |
| دراو | شلینگی ئۆگاندا |
| هەناردەکان | قاوە، زێڕ، ماسی، پارچە و ریس |
| بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی | ٢٦٢ دۆلار |

## زاراوە سەرەکییەکان:

**کودەتا لەپێناو رزگاربوون لە گوشار:** جێگەیەك کە سوپا وەك پێشەنگ کودەتا دەکات و تیایدا ستراکتۆرە رادیکالییەکان جێگری دامەزراوە کلاسیکییە سیاسییەکان دەبنەوە.

**هێزی سەرکوتکردن:** بە کارهێنان یان هەڕەشە بە بەکارهێنانی توندوتیژی بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجگەلی سیاسی و کۆمەڵایەتی.

**کودەتا:** گۆڕینی لە ناکاوی حکومەت لە رێگەی کردەیەکی نایاساییەوە کە تیایدا ژمارەیەك هێزی ئاسایشی (امن) رۆڵی بەردەوام و سەرەکی دەگێڕن.

کودەتای پارێزگارەکان (پاسەوانان) : جێگەیەك کە گرووپی سەربازی، حکومەتی ناکارا لە دەسەڵات لادەدەن و (بە نیگەتیڤانە) چاویان لە بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان بڕیوە. **دەسەڵاتی سیاسی:** پەیوەندیکەی دەروونناسانە نێوان دەسەڵاتدار و هاوڵاتیان کە لە ڕێگەی بیرۆکەی ملکەچ بوون بۆ هێزەکانی دەوڵەت و دامەزراوەکانی سەربە دەوڵەت، بەرقەرار دەبێت.

**کولتوری سیاسی:** ئایدیای سیاسی، ڕێبازەکان و ڕەفتاری هاوبەش کە لە کۆمەڵگایەکدا باوە.

**ڕەوشتی پیشەیی دەستێوەرنەدان:** ئایدیایەك لە سوپادا کە دەبێ هێزی سەربازی لە ژێر کۆنترۆڵی سیاسیدا بێت و نابێ تواناییەکانیان بە مەبەستی توندوتیژی نواندن لەپێناو دەستڕۆیی لە پرۆسەی سیاسیدا بەکاربێنن.

**کودەتای نکوڵی کردن (veto) :** جێگەیەك کە سوپا دەست لە (کاروبارەکان) وەردەدات تا دامەزراوە کاتییە سیاسییەکان برووخێنێت و پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی گرووپی خۆی بکات.

**پرسیارەکان:**

١- تا چ ڕادەیەك فاکتەرە ژینگەییەکان (کولتووری سیاسی، ئابووری وکۆمەڵایەتی) کاریگەرییان بە سەر کودەتای سەربازیدا هەیە؟

٢- ئایا تایبەتمەندییەکانی بەرچاوی هێزی سەربازی، لە دەستتێوەردان لە پرۆسەی سیاسیدا، لە ئەفریقیا کاریگەرە؟

٣- ئایا کودەتای سەربازی دەتوانێ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی کودەتاکاران فەراهەم بکات؟

٤- چ گرفتگەلێك دوای کودەتای سەربازی و بە دەسەڵات گەیشتنی سوپا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە؟

٥- چۆن دەتوانرێ توێژینەوە و خوێندنەوەی کارکردی ڕژێمە سەربازییەکانی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال بکەین؟



**بۆ خوێندنی زۆرتر:**

بۆ هۆگران بە (خوێندنی) کودەتای سەربازی پەرتووکی ساموێل هانتینگتون (لە ڕوانگەی لێکۆڵینەوەی ژینگەیی) و پەرتووکی جانوتیرز (لە ڕوانگەی تایبەمەندییەکانی ڕێکخستن) و پەرتووکی سی، ئی، فالیز (لە ڕوانگەی کولتووری سیاسی) بەسوودن، سەبارەت بەم بابەتە پێشنیار دەکرێ پەرتووکی ساموێل دیکالۆ کە پەرتووکێکی نوێیە لە سەر ئەم بابەتە توێژینەوە لە سەر ئەفریقیادا ئەنجامداوە، بخوێنێتەوە.

وردبووەتەوە و ململانێی و هاوکاری نێوان ئەم دوو رەگەزە و رێڕەوی سیاسی لەم کیشوەرەدا بەووردی روونکردووتەوە. هەروەك لە پێشەکی ئەم پەرتووکەدا ئاماژە پێکرا پێویستە رەچاوی سێ فاکتەر بکرێ لە خوێندنی سیاسەتەکانی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال. سەرەڕای دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی پێویستە کاریگەری بەرژەوەندییە دەرەکییەکانیش رەچاو بکرێ بابەتی بەرژەوەندییە دەرەکییەکان لە بەشەکانی پێشوودا لە رێگەی شیکردنەوەی سیستەمی کۆلۆنیالی، گەشەنەسەندنی ئابووری و ئەگەری کاریگەرییەکان لەلایەن ((بۆرژوایی ناوخۆییەوە)) باسکراوە. هەنوکە کاتی ئەوە هاتووە کە فاکتەری سێیەم بە وردبوونەوەیەکی زۆرتر خوێندنەوەی بۆ بکرێ. ئەم بەشە بە خوێندنەوەی کاریگەرییە سیاسییەکان بەسەر حکومەتگەلی هەڵقوڵاو لە وڵاتانی دەرەوەی ئەم کیشوەرە بە وردی لەم بابەتە قوڵ دەبێتەوە زیادە بێژی نییە ئەگەر بڵێین دەستتێوەردانی دەرەکی لە چەندین وڵاتدا، رەوڕەوەی مێژووی ئەم وڵاتانەی زۆر گۆڕیووە بە هۆی فاکتەری دەستتێوەردانی دەرەکی، بابەتی سەروەری بابەتی سەرەکی شیرازەی ئەم بەشە پێك دێنێت و ئەمەش بەم هۆیەوە کە دیارکردنی سەروەری، سەرەڕای لاوازییەکانییەوە میکانیزمی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان مەیلدار و رەوان دەکات. لەم روانگەیەوە دەکرێ سەروەری وەك بانگەشەیەك بۆ (بوونی) دەسەڵاتی سیاسی بەهێز لە وڵاتێکدا پێناسە بکرێت و ئەم پێناسەیەش بۆ حکومەتگەلێك راستە کە خاوەنی خودموختاری و ئازادی لە ناو سنووری وڵاتەکەیدا بێت.

ناوەرۆکی سەروەری لە سەدەی بیستەمدا بناغەی سیاسەتی نێودەوڵەتی دارێشت و ئێستاش هەر بەردەوامە سەروەری چەمکێکە کە بەها و ئیعتبارەکەی بە هۆی بەرژەوەندی دوو لایەنە لەنیوان حکومەتەکانی گشت جیهان بەدەست دێنێت. دان داننا بە سەروەری B لەلایەن دەوڵەتی A یەوە دەلالەتە بۆ دان پێدان بە سەروەری دەوڵەتی A لە ئەنجامدا سیستەمی نێودەوڵەتی بەهۆی پشتگیری کردن لە ((دەستتێوەرنەدان)) لە دەسەڵاتی (صلاحیە) وڵاتانیتر پێشکەوتووە. هەر دەوڵەتێکی فەرمانڕەوا لە سنووری وڵاتەکەیدا خاوەن دەسەڵاتێکی بێ سنوورە کە بە تەکە دەسەڵاتی سیاسی لەم قەلەمڕەوەدا هەژمار دەکرێ، تێگەشتن لە دەستتێوەرنەدان لە کەمکردنەوەی ململانێی نێوان دەوڵەتاندا کاریگەری هەبووە و لە پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانیشدا تۆمارکراوە.

سەرەڕای رێزگرتنی نێودەوڵەتی بۆ سەروەری و دەستتێوەرنەدان لە راستیدا هیچ وڵاتێك خاوەن دەسەڵاتی بێ سنوور لە چوارچێوەی سنووری وڵاتەکەیدا نییە، دوو سەرچاوە بەرەنگاری دەسەڵاتی رەهای دەوڵەت دەبنەوە: ١- ئۆپۆزیسیۆنی ناوخۆیی سەروەری (کە لە بەشی دەیەمدا روون



دەکرێتەوە). ٢- دەستڕۆیی دەرەکی. بەڵام پرسی پەیوەست بەم بەشە بەرەنگاری و دەستڕۆیی دەرەکییە.

هەروەك حەسارە لە کاکشاندا، دەوڵەتان لە گۆرەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا، کاریگەرییان بە سەر یەکتردا هەیە. بۆ نموونە ناوچە بچووکەکان لەلایەن دەوڵەتە گەورەکانەوە، سنووردار و گەمارودراون و وڵاتە بچووکەکان ملکەچی دەستڕۆیی قورس و خاوەن راکێشی دراوسێیەکان دەبنەوە. هەروەها کارکردی وڵاتە بەهێزەکان لەم سیستەمەدا، کاریگەری بەرفراوانی بەسەر گشت جیهانی سیاسەتدا دەبێت و لەم رووەوە حکومەتەکان دەتوانن تا ئاستێك لە پشت سەروەرییەکەیان خۆیان بشارنەوە. بۆ نموونە تەنانەت پاشایەتی ئینگلترا خاوەنی زۆرترین پێگەی سەروەرییە، لە گۆڕەپانی ناوخۆییدا لەگەڵ رووداوە ناوخۆییەکان رووبەڕوو دەبێتەوە و ئەنگلیز بەرەبەرە سەروەرییە سیاییەکەی بە دامەزراوەکانی یەکێتی ئەوروپا سپاردووە. هەربەم چەشنە، دەوڵەتی بەریتانیا بەشێك لە سەروەری ئابوورییەکەی بە دامەزراوە فرەنەتەوەکان کە لەم وڵاتانەدا سەرمایەگوزارییان کردووە، سپاردووە. وەها دێتە بەرچاو کە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی سارد سەروەری وڵاتان لە گشت جیهاندا زۆر دابەزییەوە.

لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەم و سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا، شایەتی شکاندنی سەروەری وڵاتانی بچووك لەلایەن هێزە رۆژئاواییەکان لە بواری ((دەستتێوەردانی مرۆڤی)) (بۆ نموونە یوگسلاڤیای پێشوو و عێراق) و لەم دوایانەشدا شەڕی دژە تیرۆریزم (بۆ نموونە لە ئەفغانستان و عێراق) بووینە.

دەوڵەتانی ئەفریقیا شارەزای خاڵە بەهێز و لاوازەکانی سەروەرییەکەیان لە گۆمەڵگای نێودەوڵەتیدان. زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی ئەفریقیاش لە ئەنجامی دەستتێوەردانی سیستەمی دەرەکی (ئیمپڕیالیزم و دژە کۆلۆنیاڵ) دامەزراون. ئەگەرچی ئەم کیشوەرە، تاڕادەیەك خاوەن رێزی نێودەوڵەتی و دەستتێوەردان (لە کاروبارەکانیدا)یە، لەڕێگەی وەستان دژی کۆلۆنیاڵ سەروەرییەکی بەدەستهێناوە، بەڵام لاوازی سیاسی و ئابوورییەکەی بووەتە هۆی لاوازبوونی لەوەستان دژی دەستتێوەردانی دەرەکی. بە کورتی وڵاتانی ئەفریقیا بە هۆی بارودۆخی لاوازیان لە رووبەڕووبوونەوەی وڵاتانیتری ناو سیستەمی سیاسی نێودەوڵەتی، گرفتیان هەیە. بەم پێیەش هەروەك لە بەشەکانی داهاتوودا روون دەکرێتەوە، ئەگەرچی ئەم کیشوەرە هەمیشە لە پەراوێزی ململانێی زلهێزەکان بووە، بەڵام سیاسەتەکانی جیهانی کاریگەری بەرچاویان بەسەر گەشەی ئەم کیشوەرەدا هەبووە. ئەم بەشە خوێندنەوەی کاریگەرییە دەرەکییەکان لە دوو قۆناغی زەمەنی شەڕی سارد و قۆناغی سیستەمی نوێی جیهانی، دەکات.

## پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی نێوان ئەفریقیا:

رێژەیەکی زۆری ئەم بەشە لەسەر دەستتێوەردانی دەرەکی لەلایەن وڵاتانی دەرەوەی کیشوەری ئەفریقیا ورد بووەتەوە، بەڵام ئەمەش بەو مانایە نییە کە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی نێوان ئەفریقیا گرنگی نییە، مێژووی دوای کۆڵۆنیالی ئەم کیشوەرە، نیشاندەری ئەوەیە کە ئەم مێژووە لە ئەنجامی هەڵسوکەوتی چ پۆزەتیڤ و چ نیگەتیڤی تەنیا کارەکتەرەکانی گیرۆدە لە ئەفریقیادا، دروست بووە. لە روانگەی پۆزەتیڤەوە بەهۆی هاوکارییەکانی خودی ئەفریقیا وەفاداری بە بیرۆکەی یان ئەفریقیای ئەم کیشوەرە لە هەوڵدا بووە تا یەکبوونێکی بەرفراوان لە رێگەی نەهێشتنی بازرگانی لەنێوان وڵاتانی ئەفریقیادا دروست بکات. بۆ نموونە رێکخراوی ئەفریقا، لە ساڵی ١٩٦٣دا دامەزرا، لە ئەنجامی ئەندامگیریدا ئەم رێکخراوە بە ئەندام بوونی هەر وڵاتێکی تازە سەربەخۆ بەرفراوان بوو و ئەم رێکخراوە بە بڕاوی هێمای بەهێزی هاوکاری سیاسی لەم کیشوەرەدا بوو. بەڵام ئەم رێکخراوە بەخێرایی بۆ کلوپێکی گفتوگۆ کردن گۆڕدرا و نەبوونی سەرچاوە و ململانێ لەپێناو بەرژەوەندییەکان لەنێوان وڵاتاندا کاریگەری ئەم رێکخراوەی کەم کردەوە. هەروەها لە ئەنجامی هەوڵدان بۆ زیندووکردنەوەی هاوکارییە بەهێزەنی یان ئەفریقیایی، چالاکی رێکخراوی یەکگرتووی ئەفریقیا لە ساڵی ٢٠٠٢دا بە کۆتاهات و رێکخراوی یەکێتی ئەفریقیای لە بڕی ئەم رێکخراوە دامەزرا.

لە هەمان کاتدا، پلانی گەشەی یەکێتی ئەفریقیا، بەشداری نوێ بۆ گەشەکردنی ئەفریقیا لەلایەن وڵاتە سەرەکییەکانی ئەم کیشوەرە راگەیندرا. ئامانجەکانی (نیپاد) کۆکردنەوەی هاوکارانی (شریك) دەرەکی و وڵاتانی ئەفریقیایی بە مەبەستی بەرێوەبردنی ستراتیژییەکانی گەشەکردن بوو، نیپاد رایگەیاند کە بۆ دامەزراندنی ((حکومەتی ویستراو)) بۆ بەدەستهێنانی یارمەتی و سەرمایەگوزاری دەرەکی هەوڵ دەدات.

ئێستا زووە بۆ ئەوەی کە بزانین ئایا یەکێتی ئەفریقیایی و نیپاد سەرکەوتوو دەبن یاخود وەك رێکخراوی یەکگرتووی ئەفریقیا شکست دێنن؟ یان ئایا ئەوان دەتوانن سەرمایەگوزارییەکی ئابووری نوێ لەم کیشوەرەدا دروست بکەن یاخود بەرژەوەندییە بێ سوودەکان لەم کیشوەرەدا ببڕنەوە (تەنانەت ئەو بەرژەوەندییانەی کە لەنێوان ئەندامانی وڵاتەکەیان بوونی هەیە) تا بتوانین پێشکەوتنی ئابووری و سیاسی لەم کیشوەرەدا ببینین؟ یاخود یەکێتی ئەفریقیا و نیپاد هەروەك رێکخراوی یەکگرتووی ئەفریقیا تەنیا دەبنە سیمبولی بەهێزی هاوکارییەکانی بان ئەفریقیایی؟



هاوکارییە سیاسییەکانی دوای کۆڵۆنیالی پاش سەربەخۆیی لە ئاستی ناوچەییدا سەریهەڵدا. دەکرێ ئەم هاوکارییە فرە لایەنە لە رێکخراوەگەلی وەك کۆمەڵگای گەشەکردنی باشووری ئەفریقیا (SADC) و کۆمەڵگای ئابووری وڵاتانی رۆژئاوای ئەفریقیا (ECOWAS) ببینرێ کە ئەم دواییەیان (ECOWAS) توانای بەهێزەکەی بە ئاراستەی لێك نزیك بوونەوەی سیاسی نیشان داوە. ئەم پرسەش بەتایبەت لە هێزەکانی بەرپەرچدەری خێرا (تدخل السریع) لە سیرالیون و لیبریا دەبینرێت. بەڵام گشت پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی ناو ئەفریقیادا پۆزەتیڤ نەبووە، هەروەك لە بەشەکانی پێشتردا ئاماژە پێکرا فاکتەرگەلی وەك بە خۆوە گرێدانگەرایی (الحاق) سومالی، دەستتێوەردانی لیبیا و ئاپارتایدی وڵاتی ئەفریقیای باشوور بوو بە هۆی ناسەقامگیری و ململانێ لەم کیشوەرەدا گرنگترین ئەم ململانێیانە بریتین لە دەستتێوەردانی ئەفریقیای باشوور و زەئیر (کنگوی — کینشازا) لە شەڕی ناوخۆیی ئەنگولا لە ساڵانی حەفتادا، داگیرکردنی ئوگاندا لەلایەن تانزانیاوە لە ساڵی ١٩٧٩دا و بوونی سەربازانی رواندا، ئوگاندا، ئانگولا نامیبیا، سودان، چاد و زیمبابوی لە شەڕی کۆماری دیموکراتیکی گونگۆ لە کۆتایی نەوەدەکاندا و شەڕی سنووری نێوان ئەسوپیا و ئەریتریا لە ساڵانی ٢٠٠٠ — ١٩٩٨دا.

سەرەڕای ئەم نموونانە، نابێ وێنای ئەفریقیا بکەین وەك کیشوەرێك کە هەمیشە گیرۆدەی شەڕی نێودەوڵەتان بووە. ئەم جۆرە ململانێیانە وەك رێژەیەرێك و نە وەك نۆرمێك لە قۆناغی دوا کۆڵۆنیالدایە هەروەك لە بەشی سێیەمدا روونکرایەوە، وڵاتانی ئەفریقیا لە پاراستنی سنوورەکانی کیشوەردا (هەڵقولاو لە نیشاندانانی کۆڵۆنیال) سەرکەوتوو بوونە و ئەم پرسەش بووە هۆی دروستکردنی هەماهەنگی لە پەیوەندی دەرەکی ناو ئەفریقیادا، ئەو شتەی کە ئێمە هەوڵ بۆ خستنەڕووی دەدەین ئەوەیە کە بۆچی ئاشتی لە رێگەی دەستتێوەردانی دەرەکی و نە لە رێگەی وڵاتانی ئەفریقیایەوە

## زلهێزەکان، شەڕی سارد و ئەفریقیا لە بەین چووە؟

زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا، سەربەخۆییەکەیان لە سەردەمێکی ٢٠ ساڵانەدا لەنێوان ساڵانی ١٩٥٥ تا ١٩٧٥ بەدەستهێناوە و ئەمەش سەردەمێك بوو کە شەڕی سارد بەسەر سیاسەتەکانی جیهاندا زاڵبوو و سەروەرییە نوێیەکانی ئەفریقیایی چوونە ناوەوەی سیستەمی سیاسی نێودەوڵەتییەوە کە (لەم کاتەدا) سەرمایەداری رۆژئاوایی لەگەڵ کۆمۆنیزمی رۆژهەڵات لە ململانێیەکی ئایدلۆژیکیدا بوون.

له یەکەمین دیددا، وەها دێتە بەرچاو کە ئەفریقیا هیچ بەڵگەیەکی بۆ گیرۆدەبوون لەم ململانێییەدا نەبووە کیشوەر زۆر هەژار (بەسەرچاوەیەکی کەم بۆ پشتگیری کردن) و تەواو پەراوێز کراوتر (لە پانتای دەستڕۆیی راستەوخۆی زلهێزەکان) لەوانەبوو کە گرفت بۆ هێرش بەرەکانی شەڕی سارد دروست بکات ئەگەرچی شەڕی تەواو جیهانی بوو، ولایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت بە بن بەست گەشتن لە هێزی ناوەکی لە ئەوروپادا بەم ئەنجامە گەیشتن کە دەبێ بە دوای سوودی ستراتژیك لە جێگە یەکیتردا بگەڕێن. بەم پێیەش ململانێ لە ئەفریقیادا پەرەی سەند، ئەگەرچی سیاسەتەکانی ستراتیژیکی پەراوێزکراو بۆ کاربەدەستی واشنتگتۆن و مۆسکۆ گرنگی کەمتریان هەبوو، بەڵام ئەنجامەکانی کاریگەری سەرسوڕهێنەری لە ئەفریقیادا بەجێهێشت.

## هێزە کۆمۆنیستییەکان:

یەکێتی گەلی سۆڤیەت خۆی بە هاوپەیمانێکی سەرەکی بۆ دەوڵەتە تازە دامەزراوەکانی ئەفریقیا راگەیاند ئەمەش بەو هۆیە بوو کە تزاری رووسیا لە کۆلۆنیالکردنی ئەم کیشوەرەدا دەستی نەبوو. لە بڕی ئەمەشدا یەکێتی گەلی سۆڤیەت خۆی لە ناسیۆنالیزمی ئەفریقیایی و هەستە دژی ئیمپریالیستییەکانی هاوبەش کرد و هەندێ لە سەرکردەکانی ئەفریقیای رایانگەیاند کە وڵاتەکەیان دوای سەربەخۆیی شێوازی سۆسیالیستی دەگرێتەبەر، بە هۆی لێك نزیکی ئایدیۆلۆژیکی، سروشتی بوو کە کاربەدەستانی موسکۆ رێڕەوی یەك ئاراستەی هەمبەر بە ئەفریقیا بگرنەبەر. موسکۆ پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ حکومەتەکانی وەك غانا، گینە، مالی و وڵاتانی مارکسیست لنینیستی وەك ئەنگولا، موزامبیك و ئەسوپیا دامەزراند. سۆڤیەت هەر لە بنەڕەتدا هەوڵی بۆ بەهێزکردنی سۆسیالیزم لە ئەفریقیادا دەدا. جێی گومان، نەبوو کە سۆڤیەت هەوڵی دەدا بۆ زاڵبوون و دەستڕۆیی پەیدا کردن بەسەر حکومەتەکانی ئەفریقیا لە رێگەی دامەزراندنی ناوچەی حایل لەم کیشوەرەدا (وەك ئەو شتەی کە لە ئەوروپای رۆژهەڵاتدا هەبوو) ، هەروەها مۆسکۆ رایگەیاند کە وڵاتانی ئەفریقیا کاتێك دەتوانن یارمەتییەکانی سۆڤیەت بەدەست بێنن کە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ رۆژئاوادا ببڕن.

دەکرێ سیاسەتەکانی سۆڤیەت لە ئەفریقیا لە ٥٠ و ٦٠ ەکاندا کارکرگەرایانە وەسف بکەین. ئەگەرچی کیشوەری ئەفریقیا هیچ کات لە ترۆپێکی ئەولەوییەتەکانی سۆڤیەتدا نەبوو، بەڵام مۆسکۆ هەر بە بەدەستهێنانی هەل، خوازیاری دەستتێوەردان لەم کیشوەرەدا بوو بۆ نموونە



یەکەمین تەنگژە لە شەڕی سارد لە ئەفریقیادا کاتێك روویدا کە سۆڤیەت یارمەتی میسری لە دروستکردنی بەنداوی ئیسوان کرد. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە کێشە کەوتبووە نێوان پەیوەندییەکانی میسر و رۆژئاوا. دوای ئەوە کە حکومەتی جەمال عەبدولناسر پاپۆرێکی جەنگی لە چکسلواکیای وەرگرت، ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا، خۆیان لە پرۆژەی بەنداوی ئیسوان دوورخستەوە ئەم پرسەش بۆ مۆسکۆ دەرفەتی رەخساند کە لە ئەفریقیادا دۆست بەدەست بهێنێت و لە ساڵی ١٩٥٦دا پرۆژەی ئیسوانی لە ئەستۆ گرت، هەروەها یەکێتی سۆڤیەت پەیوەندی نزیکی لەگەڵ گینە دامەزراند. دوای پەیڕەوی نەکردنی گینە لە داواکارییەکانی فەڕەنسا و مەیلی ئەم وڵاتە بۆ سەربەخۆیی لە ساڵی ١٩٥٨دا، مۆسکۆ پشتگیری لەم وڵاتەی کرد. دەوڵەتی سکوتۆرێ دوای جیابوونەوە لە رۆژئاوا بۆ قایم کردنی و پاراستنی دەوڵەتەکەی پشت بەستراو بە یارمەتییە دەرەکییەکان بوو.

دواتر لە حەفتاکاندا یەکێتی سۆڤیەت رۆڵی کاراتری لە ئەفریقیادا گێڕا، کاربەدەستانی مۆسکۆ هەوڵیان دەدا تا لە نائەمنیی سیاسی بە هۆی چوونە دەرەوەی پۆرتۆگال لە ئەفریقیادا و لەکارلادانی ئیمپراتۆر هایلە سیلاسی لە ئەسوپیادا بەرژەوەندیگەلێك بەدەست بهێنێت. هەروەها سۆڤیەت تامەزرۆ بوو کە لە ململانێی ئازادیخوازی دژی کەمینەی سپی پێستی وڵاتانی باشووری ئەفریقیا شوێن پەنجەی هەبێ، لە ئەنجامدا ئەنگولا، موزامبیك و ئەسوپیا رێژەیەکی زۆری یارمەتییان وەرگرت تا توانایی رژێمە مارکیست لینستییەکان لە بەرگریکردن لە خۆیان دژی هێزە دژە شۆڕشگێڕییەکان پەرەبدەن. هەروەها پێداویستی سەربازی بۆ بزاڤە رزگاریخوازەکانی باشوور (بۆ نموونە پارتی کۆنگرەی ئەمریکا لە ئەفریقیای باشوور، سواپۆ لە نامبیا و زاپۆ لە زیمبابوێ) فەراهەم کرا. ئەمەش بەو هیوایە کە کاتێك لەم وڵاتانەدا شۆڕشگێڕە ناسیۆنالیستەکان حکومەتگەلی کەمینەی سپی پێستیان لە هەڵبژاردنەکاندا شکستدا وەك هاوپەیمانانی سۆڤیەت بمێننەوە ئەگەرچی لە کورتماوەدا مۆسکۆ هەوڵی دەدا بۆ بەرفراوانکردنی پێگەی ستراتیژیکی خۆی لە ئەفریقیادا، بەڵام بەرفراوانبوونی سۆشیالیزم ئامانجی درێژخایەنی سیاسەتی دەرەکی یەکێتی سۆڤیەت بوو. پاش ماوەیەك یەکێتی سۆڤیەت هەندێ لە فڕۆکەخانە و بەندەرەکانی ئەم کیشوەرەی خستە سژێر دەستی خۆیەوە و ئەمەش تواناییەکانی شەڕی ساردی سۆڤیەتی زۆر زیاد کرد، بۆ نموونە فڕین لە (فڕۆکەخانەی) کۆناکرێ لە رۆژئاوای ئەفریقیادا، ئەو تواناییەی بە مۆسکۆ بەخشی تا چاودێری پاپۆڕەکانی رۆژئاوا لە زەریای ئەتلانتیکدا بکات و توانایی بەرگری لە سۆمالی و ئەسوپیا پرۆسەی بەرگری دەریایی

سۆڤیەتی لە زەریای هیندا بەرزکردەوە هەروەك لەم بەشەدا دەبینین، دەستتێوەردانی دەرەکی، وڵاتانی ئەفریقیای لە رانتێك سوودمەند دەکرد کە لە بریدا ئەو وڵاتانە دەیانتوانی ئەم سەرچاوانە بپارێزن. شێوازی سەرەتایی یەکێتی سۆڤیەت لە بەخشینی ئەم رانتە، لە رێگەی دابینکردنی چەکی سەربازیی بوو. ملیۆنەها تەن لە چەکی سەربازیی بۆ ئەفریقیا رێژران و ئەم چەکانە بەنرخی زۆر کەم (و تەنانەت بەخۆڕاییش) فرۆشران. لەبڕی ئەمەشدا رۆژئاوا، چەکی پێشکەوتوو و بەنرخێکی گرانی فرۆشت و تانك و فڕۆکەی MIG و موشەکی SAM وەك پاداشت بە لایەنگرانی خۆی بەخشی (ئەنگۆلا و ئەسوپیا). مۆسکۆ هەوڵی دەدا کە لە گشت ئەو وڵاتانەی کە دەیتوانی کاریگەری بنوێنێ چەکەکانی پێ بفرۆشێ، نزیك لە نیوەی وڵاتانی ئەم کیشوەرە سوودیان لە هەلی دوای کۆلۆنیال وەرگرت، لە ئەنجامدا فرۆشی پێداویستییە سەربازییەکانی یەکێتی سۆڤیەت بۆ ئەفریقیا لە ١٥٠ ملیۆن دۆلار لە شەستەکاندا بۆ ٢\٥ ملیار دۆلار لە حەفتاکاندا بەرز بووە. یەکێتی سۆڤیەت تەنیا وڵاتی کۆمۆنیستی سەرقاڵ لە ئەفریقیادا نەبوو، کوباش بەڵێنیدابوو کە پشتگیری لە سۆشیالیزم لەم کیشوەرەدا بکات، کوبا وەك وڵاتێکی جیهانی سێیەم هاوکاری ئەفریقییەکانی دەکرد، بۆیەش وڵاتانی ئەفریقیا کەمتر گومانیان لە پێشکەشکردنی یارمەتییەکانی هاوانا بوو بە بەراورد لەگەڵ پێشنیارەکانی مۆسکۆ و ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی کە هەزاران دوکتۆر و ئەندازیار و مامۆستا و راوێژکار و تکنسیەنەکانی کوبایی لە وڵاتانی ئەفریقیاییدا کاربکەن. حەقیقەتی سەرەکی ئەوەیە کە هاوانا هەوڵی دەدا بۆ ناردنی سەرباز بۆ ئەم کیشوەرە نزیکەی ٥٠٠٠٠ سەربازی کوبایی لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا رەوانەی ئەسوپیا و ئەنگولا کران. بۆ نموونە لە ئەنگۆلادا کە سەربازە کوباییەکان لە تەك هێزە دەوڵەتییەکانی (ئەنگۆلا) شەڕیان دەکرد. خزمەتێکی چالاکانەیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێرشی دەوڵەتانی ئەفریقیای باشوور پێشکەش کرد، ئەم هێرشبەرانە بۆ پشتیوانی کردن لە شۆڕشگێڕانی یونتیا هاتبوونە ئەم وڵاتەدا بە بێ دەستتێوەردانی کوبا، ئەگەری ئەوە هەبوو حکومەت لە لواندا بڕووخێت.

کۆماری گەلی چینیش لە کاروبارەکانی ئەفریقیادا گیرۆدە بوو. دوای درزتێکەوتنی ئایدیۆلۆژیکی لەنێوان پیکەن و مۆسکۆ، پیکەن هەوڵیدا کە سۆشیالیستی تایبەت بە خۆی ناردەی ئەم کیشوەرە بکات، ئەم دەستتێوەردانە سەرەڕای یارمەتیدانی بە رژێمە ئەفریقییەکان لە کەمکردنەوی پەرەسەندی ململانێی سۆڤیەتیش یارمەتی ئەم وڵاتانەیدا، جارێکیتر پیکەن جەخت لەسەر خۆ بە جیهانی سێیەم ناساندنی کردەوە (ئەو شتەی کە مۆسکۆ لە ئەنجامدانیدا



ناتوانا بوو) و دوکتۆر و ئەندازیار و مامۆستا لە کاتی گونجاودا رەوانەی ئەم کیشوەرەکران. ترۆپکی سیاسەتی ئەفریقیایی چین بە دروستکردنی هێلی شەمەندەفەڕی تانزار لە ساڵی ١٩٧٥دا تەواوکرا ئاشکرا بوو. ئەمە پرۆژەیەك بوو کە وڵاتانی رۆژئاوا بە هۆی تێچوونی زۆری ئەم پرۆژەیە لە ئەنجامدانیدا خۆیان دوورخستەوە. ئەم کارە ئەندازیارییە قورسە، ١٦٨٠ کیلۆمەتری هێلی شەمەندەفەر لە ناوەڕاستی ئەفریقیا بوو کە زامبیای بە بەندەری داروالئیسلامی تانزانیا گرێ دەدا (و زامبیا دەیتوانی بە دەریای ئازاد بگات و ئەم وڵاتە بێ نیاز بوو لە گواستنەوەی کاڵاکانی لە رێگەی زیمبابویەوە کە لە ژێر حوکمی سپی پێستەکان و ئەفریقیای باشووردا بوو. چین نەیدەویست کە ئەم رێژەیە لە هاوکاریکردن لە شوێنەکانیتری ئەم کیشوەرە دووبارە بکاتەوە. هەڵبەت پێویستە ئاماژە بکرێت کە سیاسەتی ئەفریقیایی پیکەن بە بەراورد لەگەڵ سۆڤیەت و کوبا بە وریایی بوو.

### هێزە رۆژئاواییەکان:

بە درێژایی شەڕی سارد ئامانجی سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی ولایەتە یەکگرتووەکان، سنووردارکردنی جیهانی کۆمۆنیزم بوو. ئەم کارەش نەتەنیا بوو بە هۆی ئەوەی کە ولایەتە یەکگرتووەکان، دیموکراسییەکانی رۆژئاوای ئەوروپا (لە رێگەی پلانی یارمەتییەکانی مارشال و ناردنی سەربازەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان) قایم بکات، بەڵکو واشنگتونی هاندا بۆ بەدەستهێنانی هاوپەیمان لە کیشوەرەکانیتردا، بەتایبەتیش حکومەتە دۆستەکان لە ناوچە دووردەستەکان. هۆکاری ئەم کارەش ئەوە بوو کە ئەم وڵاتانە دەیانتوانی ببنە لەمپەر لە بەردەم پەرەسەندنی دەسترۆیی یەکێتی سۆڤیەت، ئەگەرچی وڵاتانی ئەفریقیا، لە ستراتیژییەکانی جەنگی ساردی واشنگتوندا گرنگی کەمیان هەبوو، بەڵام لە قۆناغی جەنگی سارددا نەدەبوایا هیچ بەشێك لە جیهان پشتگوێ خرابا، چونکە ئەم مەترسییە لە ئارادا بوو کە هەر دەوڵەتێك تووشی کۆمۆنیست ببێتەوە، ببێتە خاوەن (هێزێکی) شاراوە بۆ لاسەنگکردن هاوسەنگی جیهانی لە رووبەڕووی یەکتر بوونەوەی جیهانیدا (لەنێوان کۆمۆنیزم و سەرمایەداری). سەرەڕای بەرژەوەندییە سنووردارەکانی ئابووری ستراتیژیکی ولایەتە یەکگرتووەکان، ئەم کیشوەرە سەرنجی ولایەتە یەکگرتووەکانی بۆ خۆی راکێش کرد. واشنگتون ئەمەی بە چارەنووسسازدانا کە رژێمە ناسیۆنالیست و دژە ئیمپریالیستی نابێ ببن بەلایەنگرانی یەکێتی سۆڤیەت. ئەم کارە بۆ واشنگتون ژیاریی بوو کە رژێمە ناسیۆنالیستی و دژە ئیمپریالیستییەکان بەرەو یەکێتی

سۆڤیەت مەیلدار نەبنەوە. حکومەتەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان هەندێ لە ولاتانی (ئەفریقیای) وەك دوایین وێستگە هەڵبژارد. ئەم ولاتانە خاوەن گرنگی ناوچەیی بوون، بۆ نموونە لە هەلومەرجی جۆراوجۆردا کۆنگۆی کینشازا (زەئیر)، ئەسوپیا، مەغریب، سۆمالی و کینیا وەك لایەنگرنی ولایەتە یەکگرتووەکان هەژمارکران. ئەمەش بوو بە هۆی رەوانەکردنی یارمەتی ئابووری بۆ ئەم ولاتانە، هەروەها لە کاتی پێویستیشدا پشتگیری دیپلۆماتیکیش لەم ولاتانە کرا، بۆ نموونە مەغریب سەبارەت بە داواکارییەکانی لە بیاوانی رۆژئاوا و زەئیر لە تەنگژە سنوورییەکانی لەگەڵ ئەنگولادا پشتگیریکردنی ئەمریکیان بەدەستهێنا.

هەروەها ولایەتە یەکگرتووەکان هەوڵی دەدا کە پشتگیری لە هێزە میانڕەوەکان لە ناوچە شەڕاوییەکانی ئەم کیشوەرەدا بکات و لە هەمان کاتدا هێزە رادیکالییەکان لە دەسەلات دوور بخاتەوە. بۆ نموونە ولایەتە یەکگرتووەکان لە قەیرانی ساڵی ١٩٦٠ ی.کونگۆ کە لەلایەن شۆڕشگێڕەکانی کاتانگا سەریهەڵدابوو، لە دژی سەرۆك وەزیران لۆمۆمبا دەست بەکار بوو. سەرۆکی سیا (لەم هەرێمەدا) رایگەیاند کە نازانێ ئایا لۆمۆمبا کۆمۆنیستە یاخود رۆڵی کۆمۆنیست دەگێڕێ؟ بەلام کاتێکی کەم بۆ رێگرتن لە (سەرهەڵدانی) کوبایەکیتر لە بەردەستدایە لە ئەنجامدا هێزەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان هەم لە تیرۆر کردنی لۆمۆمبا و هەمیش لە بەدەسەلات گەیاندنی حکومەتی مۆبۆتۆ سێ سێ کۆ رۆڵیان هەبوو، ئەم جۆرە چالاکییانە هەر جۆرە هێزێکی شاراوەی یەکێتی سۆڤیەتی لەم بەشە لە جیهاندا لە ناوبرد.

قەیرانی کونگۆ و قەیرانەکانیتری وەك ئەنگۆلا لە سالانی حەفتا و هەشتاکاندا نموونەگەلن لە دەستتێوەردانی ولایەتە یەکگرتووەکان لە ئەفریقیادا لە ماوەی شەڕی سارد، ئەگەرچی رێژەیەکی بەرچاوی سیاسەتی واشنگتۆن زۆرتر لە چوارچێوەی تەرخانکردنی یارمەتی ئابوور بوو، بەلام زۆربەی دەوڵەتە لاواز و لایەنگرانی رۆژئاوا دەیانتوانی ئەم یارمەتییانە وەربگرن. هەڵبەت وەها دێتە بەرچاو کە واشنگتۆن مەیلدارە بۆ یارمەتیدانی هەندێ لەم رژێمانە لە نموونەگەلی بەرچاو، ولایەتە یەکگرتووەکان تاوانبارە بە یارمەتیدانی هەندێ ولات کە توندوتیژییان دژی هاولاتییەکانیان بەکارهێناوە و یاخود مافی مرۆڤیان رەچاو نەگرتووە لەم رووەوە. بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان لە سەرووی پرسە مرۆڤایەتییەکان دایە، ئەگەرچی یارمەتییەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان بە مۆبۆتۆ بە ئاشکرایی هەلەکانی یەکێتی سۆڤیەتی لە ناوبرد ((یارمەتی سەربازیی و دارایی بۆ ژنراڵ (مۆبۆتۆ) دەرفەتی بۆ رەخساند کە بۆ چەندین دەیە درێژە بە دیکتاتۆری گەندەڵ و دەمارگرژانەکەی بدات، هەروەها



ئەگەرچی ولایەتە یەکگرتووەکان دانی بە حکومەتی کەمینەی سپی پێست نەنا، بەلام هیچ حکومەتێك لە واشنگتۆن بە بەردەوامی هەوڵی بەرەنگار بوونەوەی سیاسەتی ئاپارتایدی لە (ولاتی) ئەفریقیای باشوور، نەدا)). بە درێژایی شەڕی سارد کاربەدەستانی ولایەتە یەکگرتووەکان (پرسی) رەچاوکردنی مافی مرۆڤی پەراوێز خست و خۆی لە پشت بیرۆکەی سەروەری دەوڵەت و دەستێوەرنەدان لە کاروباری یاسایی ناوخۆیی لەپێناو بەدەستهێنانی بەرژەوەندی و سنووردارکردنی جیهانیی کۆمۆنیزم شاردەوە.

بەڕوانین لە هێزەکانیتری رۆژئاوا وەك فەڕەنسا و بەریتانیا (ئەم ولاتانە) میتۆدی زۆر جیاوازیان بۆ ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال گرتەبەر. بەریتانیا کە بەرێژەیەکی زۆر (بەبەراورد لەگەڵ) فەڕەنسا کەمتر مەیلی بۆ دەستتێوەردان هەبوو، بەلام لە کارکردی سەرەکییەکەی خۆی، ئەگەرچیش کەم، لە سیاسەتی ئەفریقیادا رەزامەند بوو و یارمەتی حکومەتە تازە سەربەخۆکانی کینیا، تانگانیکا و ئۆگاندای کرد تا شۆڕشگێڕە چەکدارەکان لە ساڵی ١٩٦٤دا سەرکوت بکەن، ئەم رووداوانە هێمان لە دوورێتی بەریتانیا لە رووداوەکان کاتێك کە بەریتانیا لەلایەن ولاتانی هاوبەرژەوەندی کەوتە ژێر گوشارەوە تا حکومەتی سپی پێستی (یان سمیت) سزا بدات و زیمبابوێ بە نایاساییانە لە ساڵی ١٩٦٥دا سەربەخۆیی راگەیاندبوو، لە هەناردنی هێز (بۆ ئەم ولاتانە) رووی هەڵگەڕاند لە بڕی ئەمەشدا لەندەن زۆرتر سەرقاڵی بەدواداچوونی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال بوو، پێویستە ئەم ناکارایییە، بە هاوئاستی لەگەڵ فەڕەنسا بەراورد نەکرێ. پاریس دوای نەهێشتنی کۆلۆنیال پەیوەندی نزیکی لەگەڵ زۆرێك لە ولاتانی ئەفریقیادا دامەزراند، ئەم پەیوەندییانە زۆر نزیکتر بوون بە بەراورد لەگەڵ هێزە کۆلۆنیالکارەکانی پێشوو یان هاوپەیمانە نوێیەکانی شەڕی سارد، بەلام فەڕەنسا هیچ کاتێك هەوڵی نەدا بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگای فەڕەنسی — ئەفریقی، لە کاتێك کە سەربەخۆیی ولاتانی ئەفریقیا لە قۆناغی سەرۆك کۆماری شارل دۆگۆل رووبەڕووی گرفت ببوونەوە. (ناسیۆنالیزمی ئەفریقیا زۆر بەهێزتر لەم هەولدانە بوو) .

فەڕەنسا کاریگەرترین ولاتی دەرەکی لەم کیشوەرەدا بوو ئەمەش هەلقۆلاوی ئەوە بوو، کە فەڕەنسا خۆی بە هێزێکی خاوەن شارستانییەتێکی دەوڵەمەند هەژمار دەکرد کە ئەرکەکەی برەودان بەم کولتوورە (راسپێردراو بۆ شارستانییەت سازی) لە دەرەوەی سنوورەکانی بوو. ئەم پرسەش لە ترۆپکی دەستتێوەردانە کۆلۆنیالییەکان لە ئەفریقیادا وەك شتێکی گیرودە لە پەیوەندی ئەفریقیا فەڕەنسا لە سەرتاسەری سەردەمی شەڕی ساردا، مایەوە. هەڵبەت

دەسترۆیی فەرەنسا لە کیشوەری ئەفریقیادا لەسەردەمی شەڕی ساردا سەرکەوتوانە بوو، بە چەشنێك کە چەندین ولاتی بەجێماو لە کۆلۆنیالەکانیتر وەك زەئیر (بەلژیکیا) رواندا و بروندی کرد بە ئەندامی (فرانکوفۆن)، واتە کومەلگای فەرەنسی زمان. زۆربەی ولاتان بە جەختکردنە سەر ئەم خالە (فرانکوفۆن) لە کۆنفرانسی هاوبەشی فەرەنسا — ئەفریقیا کە لە سالی ١٩٨٢دا لە کینشازا بەسترا بەشدارییان کرد و لە هەمانکاتدا لەو کۆبوونەوەیەی کە بۆ رێکخراوی یەکگرتووی ئەفریقیا لە تریپۆلی بەسترا بەشدار نەبوون. کریستوفر کلافهام سەرکەوتنەکانی فەرەنسا بە هۆی سێ فاکتەر دەزانێ: ١- خەلك ٢- پارە ٣- هێزی زۆر لێکردن (اجباری). پەیوەندی نێوان خەلك، پەیوەندی دیپلۆماتیك و دارایی لەنێوان پاریس و سەرمایەی ئەفریقیا پتەوتر لە بەریتانیا، ولایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت (لەم کیشوەرەدا) بوو و لەسەر بنەمای متمانە پێکردن و دۆستایەتی دوو لایەنە دامەزرا. لەم رووەوە، زۆرێك لە ئەفریقیاناسان کۆمەلگای نێودەولەتی فەرەنسەوی- ئەفریقیای وەك خێزانێکیان هەژمار دەکرد کە پاریس تیایدا رۆلی باوك سالارانەی (کە منالەکانی خۆش دەویست بەتایبەت کاتێك کە سەرپێچییان دەکرد) هەبوو. ئەم پەیوەندییە کەسییانە بۆ سەردەمی سەربەخۆیی دەگەڕایەوە. زۆربەی ولاتانی کۆلۆنی فەرەنسا بە ژەنەرال شارل دۆگۆل و فەرەنسای ئازاد لە درێژایی جەنگی جیهانی دووەمدا وەفادار مانەوە، لە کاتێکدا کە چەندین سەرکردەی ناسیۆنالیستی ئەفریقیایی وەك فیلیکس هویفیت، بۆینگی لە کەناری عاجدا پێش ئەوەی کە لە ولاتەکەیاندا دەسەلات بگرنە دەست وەك جێگیرێك لە پەرلەمانی فەرەنسا و وەزیر لە دەولەتی نیشتمانیدا پۆستیان هەبوو. دواتر، لە قۆناغی شەڕی ساردا، پاریس درێژەی بە پەیوەندییەکانی لەگەل کۆلۆنە پێشوویەکانیدا. سیاسەتی ئەفریقیا تەواو جیاواز بوو لە بڕیارەکانی کۆشکی ئەلیزە، کۆبوونەوە بەردەوامەکانی فەرەنسی- ئەفریقی درێژەی هەبوو. چاوپێکەوتنە دوو لایەنەکانی وەزیر و سەرۆکەکان ئەنجام دەدران و چەندین هاولاتی فەرەنسی وەك فەرمانبەری پلەبەرز. لە دەولەتانی ئەفریقیادا خزمەتیان دەکرد. هیچ ولاتێکیتر چ رۆژئاوایی چ کۆمۆنیستی وەکو فەرەنسا پەیوەندییەکی نزیکیان لەگەل بارودۆخ و پێگەی ئەفریقیایان نەبوو و پەیوەندییە تایبەتییەکانی (شخص) بەپێی سیاسەتە ئەفریقیاییەکەی رێك نەخست بوو. فەرەنساش ئاسانکاری دارایی بە لایەنگرە ئەفریقییەکانی خۆی دەبەخشی. فەرەنسا لە سەرتاسەری شەڕی ساردا دووبەرابەر زۆرتر لە ولاتانیتر کۆمەکی بە ئەفریقیا دەبەخشی. بۆ نموونە لە سالی ١٩٨٥دا پشکی فەرەنسا لە گشت گەشەی ئەفریقیای ژێر بیاوان ٧٥٪ بوو. خەزینەی فەرەنساش قەرزی بە کۆمەلگای دارایی



ئەفریقیادا. بەم قەرزدانەش بە ولاتی ئەندام لەم ناوچەیەدا، دراوییەکی هاوبەش بە ئیعتباری گۆڕانکاری (لەم دراوەدا) کردن بۆ (یەکسان بوونی) بەهای لەگەل فرانکی فەرەنسا بەخشرا. لە راستیدا ئەندامەکان، سەروەری نەتەوەییان خستە دەست (فەرەنسا) و لە بری ئەمەشدا تارادەیەك سەقامگیری دراڤی کە لە هیچ شوێنێکیتری ئەم ناوچەیە بوونی نەبوو بەدەستیان هێنا.

دوای ئەمەش بەشداریکردنی فەرەنسا لە کاروبارەکاندا (بەشدارییەکی) سەربازیی بوو. پاریس بە درێژایی جەنگی سارد لەگەل زۆربەی ولاتانی فرانکوفۆن، هاوکاری سەربازی دامەزراند. ئەم گرێبەستانە ئارامی رێژەیی و ئاسایش (ئەمن) بۆ ولاتانی ئەفریقیا بە دیاری هێنا فەرەنسا بە هەبوونی ١٣/٠٠٠ سەربازی جێگیرکراو لە ئەفریقیادا (سەربازگە لە کەناری عاج، گابون، سنگال، تۆگۆ، کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست و جیبوتی) لە چەندین بابەتدا دەستتێوەردانی سەربازی ئەنجامدا.

بۆ نموونە لە سالی ١٩٦٤دا سەربازانی فەرەنسا لە رێگەی کودەتای سەربازییەوە یارمەتیاندا بە گەڕانەوەی لیون مێبا بۆ سەرۆك کۆماری گابۆن لژیۆنی دەرەکی ٢٤ کاتژمێر پێش داواکاریکردنی فەرمییانەی مێبا چوونە ناو لیبرویل پایتەختی گابۆن. نموونەگەلێتر لە دەستتێوەردانی سیستەمی سەربازی فەرەنسا بریتین لە: زەئیر کە هێرشەکانی ئەنگۆلا پووچەل کرایەوە و چاد کە کەوتە بەر هێرشەکانی لیبیا، ئەم ولاتە لە بیاوانی رۆژئاوا بۆ یارمەتیدانی دەولەتی موریتانیا دژی شۆڕشگێڕەکانی پۆلیساریۆو، کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست پشتگیری لە رژێمی جان بیدل بوکاسای کرد لە نموونەی دواییدا (واتە کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست) سەربازانی فەرەنسا بەشدارییان لە لەکار لابردنی بۆکاسا لە سالی ١٩٧٩دا کرد. بانگەشەکانی کەسیی (شخصی) رژێمی ستەمکاری ئیمپراتۆر لەلایەن کاربەدەستانی پاریسییەوە پشتگیری لێکرا. پشتگیری فەرەنسا رەگەزی سەرەکی لە سیاسەتەکانی فرانکوفۆندا بوو پشتگیری تاکەکەسی (فردی) ، ئابووری و سەربازی زۆرێك لەم رژێمانەی خستەژێر پشتیوانی خۆیدا. هەلبەت لژیونی دەرەکی فەرەنسا باشترین نموونە لە دەسترۆیی بەرژەوەندییە دەرەکییەکانی کاریگەر بەسەر سیاسەتی ئەفریقیادایە. لە کاتێکدا کە گشت رکابەران و پشتیوانانی شەڕی سارد هەلەکانیان لە شاخ (باکووری ئەفریقیا) و باشووری ئەفریقیادا چڕ کردبووە، پاریس لە ناوچەیەکی تایبەت بە خۆی (نێچیری تایبەتی) سوودمەند بوو.

## بەرژەوەندییە دەرەکییەکانی وڵاتانیتر:

ئەو وڵاتانەی کە لە سەرەوە خوێندنەوەیان بۆ کرا، لە رووی دەستتێوەردانی وڵاتانی دەرەکی، بە بڕوای زۆرترین کاریگەرییان لە قۆناغی شەڕی سارددا هەبوو، هەرچەند ئەمە بەو مانایە نییە، کە تەنیا ئەوان کاریگەرییان هەبووە بەڵکو هێزە کۆڵۆنیالکارانی پێشوو هێشتاش پەیوەندییەکەیان لەگەڵ قەڵەمڕەوە پێشترەکانیان پاراستووە، بازرگانی دوو لایەنە بوو بە هۆی بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ شوێنەکانیتردا (وەك ئەڵمانیا و ژاپۆن). وڵاتانی ئەسکاندیناڤیا دوای فەرەنسا یارمەتی مرۆڤی و کۆمەکی گەشەپێدانیان بەم کیشوەرە بەخشی. وڵاتانی عەرەب، یارمەتی داراییان بۆ وڵاتە ئیسلامییەکانی ئەم کیشوەرە هەنارد، هەروەك لە بەشی داهاتوودا باسی دەکەین دامەزراوە نێودەوڵەتییەکانیش رۆڵی گرنگیان لە مێژووی سیاسی ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیالدا هەبووە.

بەم پێیەش، ئەم بەشە لەسەر سیاسەتی هێزە دەرەکییەکان لە ئەفریقیادا وردبووتەوە و لە بەشی داهاتوودا باس لە چۆنیەتی بەدواداچوونی بەرژەوەندییەکان لەلایەن وڵاتانی ئەفریقیاوە لە ژینگەی دوای جەنگی ساردا، دەکەین.

## کاریگەری شەڕی سارد بەسەر سیاسەتی ئەفریقیادا:

دیپلۆماسی ئاراستەکراو لەلایەن رژێمەکانی ئەفریقیا و شەڕی سەربازی لە دەرەوەی کیشوەرە بە دەگمەن، زۆرتر لە بیرۆکەیەکی کاتی لە مێژووی جەنگی ساردا بووە. ململانێ لە کوریا و ڤیەتنام و قەیرانی مۆشەکی کوبا سەرنجی زۆری بەلای خۆیەوە راکێش کرد. ئەو شتەی کە کەمتر سەرنجی ئەوروپییەکان و ئەمریکای باکووری بەدەستهێنا، بۆ خودی کیشوەری ئەفریقیا بەدواهاتی زیانبەخشی لێکەوتەوە. شەڕی سارد تەحدای نیگەتیڤی و پۆزەتیڤی بۆ رژێمەکانی ئەم کیشوەری بە بوون هێنا، پشتیوانانی نێودەوڵەتی بە شێوازگەلی شارەزایانە سەرچاوەگەلی دەرەکی پێویست و ئاسایشی بۆ وڵاتانی ئەفریقیای دابینکرد. ئەم خاڵە شایەنی ئاماژە پێکردنە کە مومکین بوو وڵاتانی ئەفریقیا لە رێگەی ئۆپراسیۆنی سەربازی شاراوەوە بە کارەساتاوی بەرەو ململانێی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، بەتایبەتیش شەڕی نوێنەرایەتییەکان (Proxy war) راکێش بکرێن.

هەلە رەخساوەکان بۆ رژێمەکانی ئەفریقیا ئەوە بوو، کە هێزە کۆڵۆنیالکارەکانی پێشوو هیوادار بوون تا دووبارە بەرژەوەندییە ستراتیژییە ئابوورییەکانیان لەم کیشوەرەدا بەدەست



بهێنن، بەڵام چونکە نەیاندەتوانی ئەم بەرژەوەندییانە بۆ ماوەیەکی درێژ و لە رێگەی دەستبەسەرداگرتنی راستەوخۆی سیاسی بەدەست بێنن، بە ناچار زلهێزە رۆژئاواییەکان لە رێگەی حکومەتە بەرقەرارەکان دەست بەکار بوون، لە ئەنجامدا پەیوەندییەکی دەرەبەگایەتی سەریهەڵدا. حکومەتەکانی ئەفریقیا لە بەرامبەر دەست گەیشتن بە بازاڕی ئابووری یان ناوچە بازرگانییەکان دەبوایا داوای هەندێ ئیمتیازتیان بکردبا. ئەگەر سەرچاوە سەربازی و دیپلۆماتیك و ماددییە بەخشراوەکان بەڕادەی پێویست نەزانرابا رژێمەکان بە ناچار هێزی سەروەری دەسەڵاتێکی لە دژی ئەوەیتردا بەکار دێنا، سەرەڕای ئەمەش لایەنگرانی شەڕی سارد هەنوکەش هەوڵ بۆ دەست گەیشتن بەم کیشوەرە دەدەن (بەڵام) ناچارن ئیمتیازە گەورەترەکان بپارێزن، بۆ نموونە سەرۆك کۆماری زەئیر مۆبۆتۆ سێ سێ کۆ لە فریودانی لایەنگران و وەفادارە نێودەوڵەتییەکان شارەزا بوو. مۆبۆتۆ بەدرێژایی دەسەڵاتدارێتی سی ساڵانەکەی سەرەتا لەگەڵ سیا و دواتر لەگەڵ بەلجیکا، فەرەنسا ئەکانیای رۆژئاواو عەرەبستانی سعودی و چین پەیوەندی دامەزراند.

بە رێزپەڕکردنی دانوساندن لەگەڵ دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکان و بەرەچاوکردنی ئەم بابەتە و بابەتەکانیتر لەنێوان سەرکردەکانی ئەفریقیادا، سەرۆك کۆماری تانزانیا، جولیۆس نایرێرێ، ئەم قۆناغەی بە ((هەوڵدانی دووبارە بۆ ئەفریقیا)) لە سەردەمی شەڕی ساردا ناو دەبات.

وڵاتانی ئەفریقیا پێشوازییان لە یارمەتییەکانی گەشەپێدان، قەرزە کەم سوودەکان، هاوکاری تەکنیکی و قەرزە بەخشراوەکانیتر لەلایەن رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە، کرد. ئەم پشتگرییە ماددییانە لە کاتێکدا پێشکەش بەم وڵاتانە کران کە ئەم وڵاتانە لە کۆمەڵگاکانیاندا رووبەڕووی کەمی سەرچاوەکان ببوونەوە، زیاد لە پشتگیری دارایی پشتگیری سەربازیش لە ئارادا بوو دەستتێوەردانی راستەوخۆی فەرەنسا و کوبا لە سەرەوە ئاماژە پێکران زیاد لەمەش زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا لە درێژایی جەنگدا پێداویستییە سەربازییەکانیان لە (وڵاتانی) ئاغاکەیان بەدەستهێنا، بۆ نموونە تەنیا یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵانی نێوان ١٩٦٧ تا ١٩٨٧دا، ٢/٧ ملیار دۆلار چەکی بۆ ئەفریقیا هەنارد، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ولایەتە یەکگرتووەکان لەم قۆناغەدا ١/٦ ملیار دۆلار (چەکی بۆ ئەفریقیا) هەنارد. هەروەها بەکاربەرانیتریش چەکی قورسیان لە فەرەنسا، ئەڵمانیای رۆژئاوا، ئیسرائیل و چیکوسلواکی بەدەستیان دێنا، لە حەقیقەتدا بەرژەوەندییە دەرەکییەکان لە رێگەی ئەم چەکانەوە لە وڵاتانی ئەفریقیادا گەرەنتی کرابوون و تەحداکانی سەروەری لە ئەفریقیادا لەو کاتەوە لە رێگەی

دامەزراوەکانی سەرکوتکەری پرچەککراو بە چەکی پێشکەوتوو کۆنترۆڵ دەکرا، ئەگەرچیش زلهێزەکان هیچ کاتێك بۆ وڵاتانی ئەفریقیا سوودمەند نەبوونە. مەترسی لەوەدا بوو کە ئەگەر بەشێك لە جیهان بەرژەوەندییەکانی لە وڵاتێکی تایبەتدا چەق بەستوو بکات، لەوانە بوو کە وڵاتانیتریش ئەم کارە ئەنجام بدەن، لە چەندین بابەتدا باڵە سیاسی و ناوخۆییە بەرهەڵستکارەکانی دەوڵەت، بە دەستپێکردنی شەڕی سارد پشتگیرییان لێکرا، بۆ نموونە دەکرێ ئەم پرسە لە ئەنگولادا ببینرێ. وڵاتێك کە (تیایدا) حکومەتی ئەمپلا لە ژێر پشتیوانی یەکێتی سۆڤیەت و شۆڕشگێڕەکانی یونیتا لە ژێر پشتیوانی ولایەتە یەکگرتووەکاندا بوو. لە ژێر ئەم چەشنە بارودۆخەدا ململانێی ناوخۆیی شێوازی (ململانێی) نێودەوڵەتی لەخۆ دەگرێ و ئەگەری دروستبوونی شەڕی نوێنەرایەتی لە ئارادایە، بە واتایەکیتر شەڕی سارد بۆ شەڕێکی گەرم گۆڕدرا و ژیانی ئەفریقییەکان کەوتە مەترسییەوە.

سەرکەوتن بەسەر ململانێگەلێك لە ئەفریقیادا کە بە هۆی شەڕی ساردەوە ببوو بە نێودەوڵەتی زۆر سەخت بوو. لە کاتێکدا کە پێشتر پارتە خۆمالییەکان دەیانتوانی لە ڕێگەی ناوبژە خۆجێییەکانەوە بگەن بە ڕێککەوتنێك هەنوکە پێویستە لە تەسریحی شەڕدا بەرژەوەندی زلهێزەکان ڕەچاو بکرێ، لە هەمانکاتدا شەڕ وەها درێژ دەبوویەوە کە سەرچاوە خوجێییەکان توانای بەرهەم هێنانیان نەبوو، بە دەست گەیشتنی زۆرتر بە کارگە چەك دروستکەرەکانی ڕۆژئاوا یاخود یەکێتی سۆڤیەت، وێرانکاری زۆرتر و لە ئەنجامدا مردنی زۆرتر بەدی دەهات. هەڵبەت بەرژەوەندییە دەرەکییەکان برەوەی بە تێچوونەکانی ئەم شەڕە دەدا و ئاراستەی دەکرد. بە بێ دەستتێوەردانی دەرەکی. سەرچاوە ناوخۆییەکان بە خێرایی بە کۆتا دەهاتن و هەموو بەدوای ئاشتی دەگەڕان. ئەم بابەتە ڕاستە کە شەڕی سارد بوو بە هۆکاری ململانێ لە ئەفریقیادا، بەڵام توندی و کاتی ئەم بەگژیەکدا چوونانەی درێژتر کردووە. سەرۆك کۆماری نێجریا بەم چەشنە وەسفی ئەم بارودۆخە دەکات ((تەنانەت نامەترسیدارترین ململانێیەکان لە ئەفریقیادا بۆ شەڕێکی درێژخایەن و کونترۆڵ نەکراو گۆڕدرا و بە گشتی ئەنجامی ئەم ململانێیانە شەڕی ماندووکەر بوو)).

**ئەفریقیا و سیستەمی نوێ جیهانی:**

لە سەرەتای نەوەدەکاندا یەکێتی سۆڤیەت لایەنگرەکانی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا لە دەستدا، هەر لە دوای ئەمەش یەکێتی سۆڤیەت لێك هەڵوەشا، سۆشیالیزم لەناوچوو و ئەم کیشوەرە بەسەر چەندین وڵات بەسەروەری تایبەت بە خۆیان دابەشکرا. شەڕی سارد بە کۆتا



هات و سەرۆك کۆمار جۆرج بوش (باوك) بەرپرسیارێتی وڵاتەکەی وەك تاکە زلهێز لە ئەستوگرت و ڕایگەیاند کە سیستەمی نوێی جیهانی لە دایك بووە. لە قۆناغی گوزاردا، وێنەی تەلەفزیۆنی لە ئەلمانییەکان کە سەرقاڵی ڕووخاندنی دیواری بەرلین بوون نمایشکرا، شەڕی سارد تەنیا نەبووە هۆکاری پۆلینکردنی ئەورووپی و ئەمریکییەکانی باکوور، بەڵکو کاریگەری زۆر قووڵی لە ئەفریقیادا بەجێهێشت. ئەمەش دروست لە کاتێکدا بوو کە سەرکردەکانی ئەفریقیا خۆیان لەگەڵ داواکارییەکانی سیستەمی باڵادەستی نێودەوڵەتی شەڕی سارد گونجاندبوو، بەڵام ئێستا ناچاربوون کە لەگەڵ سیستەمی نوێی جیهانی خۆیان بگونجێنن.

**وەستان لە شەڕە نوێنەرایەتییەکاندا. (proxy war)**

یەکێك لە کاریگەرییە سەرەتاییەکانی ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت، کۆتایی هاتنی شەڕە نوێنەرایەتییەکان بوو، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٩٠دا مۆسکۆ فرۆشتنی چەك بە ئەسیوپیای ڕاگرت. ئەم کارە بەرژەوەندییە دەرەکی و ناوخۆییەکانی لەم شەڕەدا وەدەرنا. ساڵێك دواتر کاربەدەستانی ڕژێمی منگیستۆ، پشتگیری لە یەکێتییە شۆڕشگێڕەکان کرد، ئەمەش لە کاتێکدا بوو، کە ئەگەر پشتگیری سۆڤیەت درێژەی کێشابا، لەوانە بوو ئەم کارە ماوەیەکی درێژ بخایێنی یاخود هەر لە بنەڕەتدا ڕوونەدات.

نموونەگەلی هاوچەشنی ئەم ڕووداوە دەکرێ لە باشووری کیشوەری ئەفریقیادا ببینرێ مەیلدار نەبوونی پشتیوانە دەرەکییەکان بۆ بەردەوامی نەدان بە تێچوونی شەڕە نوێنەرایەتییەکان بوو بە هۆی گرێدانی دانوساندنگەلێك لەم ناوچەیەدا، بۆ نموونە بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی جیهانی لە ئەنگۆلادا بەرەو دابەزین ڕۆیشت و چارەسەرکردنی ململانێیەکان پشت بەستن بە واقیعییەتەکانی ناوچەی لێکەوتەوە. پێشتر حکومەتی ئەمپلا لە ئەنگۆلا پشتی بە یەکێتی سۆڤیەت و کوبا بەستبوو لە کاتێکدا کە شۆڕشگێڕانی یونیتا لەلایەن ئەفریقیای باشوور و ولایەتە یەکگرتووەکانەوە یارمەتی دەدران. ئەفریقیای باشوور بە ناوبژیوانی ئەمریکا و هاوکاری یەکێتی سۆڤیەت ڕەزامەندی نیشاندا کە سەربازەکانی هەم لە ئەنگۆلا و هەمیش لە نامبیا بکێشێتەوە و لە بڕی ئەمەشدا کوبا ڕازی بوو لە هەمانکاتدا سەربازەکانی لە ئەنگۆلا بکێشێتەوە، بەمجۆرە هەم ئەمپلا و هەمیش شۆڕشگێڕانی یونیتا پشتگیرە دەرەکییەکانیان لە دەست دابوو و هەوڵیان دەدا بۆ (بەستنی) دانوسانی ئاشتیخوازانە، ئەگەرچی ئاشتی نیشتمانی لە ساڵی ١٩٩٢دا لە ئەنگولا شکستی هێنا، بەڵام ململانێیە

بەردەوامەکانی ئەم دوو هێزە، خاوەنی ئەو رادەیە لە توندوتیژی هەشتاکان نەبوو، چونکە هیچ جۆرە دەست پێگەیشتنی درێژخایەنیان بۆ چەکی قورسی زلهێزەکان لە بەردەست نەبوو.

لە ولآتی ئەفریقیای باشووردا کۆتایی هاتنی شەڕی سارد خێرایی بە دانوسانی نێوان کاربەدەستانی پارتی نەتەوەیی و گرووپی رکابەر، واتە کۆنگرەی گەلی ئەفریقیا بەخشی، پارتی کۆنگرەی گەلی ئەفریقیا بە لەدەستدانی پێداویستی سەربازی لەلایەن مۆسکۆوە و بە بناغەی لەرزۆك و هەرەشەلێکراو سەبارەت بە پەرەپێدانی پەیوەندی لەگەڵ ولآتانی پێشڕەو پرۆتوریا ناچار بوو کە دانوسانەکانی زووتر بە ئەنجام بگەیێنێت، حکومەتی ئەفریقیای باشووریش نەیدەتوانی چاوەڕوانی پشتیوانی شاراوەی (ضمنی) رۆژئاوا بکات، پرۆتوریا بۆ پشتبەستن بە پشتیوانی سەرمایەی رۆژئاوا رۆژ هەژماری دەکرد، چونکە ئەفریقیای باشوور پشتێنەك بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی پێشڕەویی کومۆنیزم. ئێستا هەڕەشەکردن بە بایکوت، زۆرتر واقیعی دەهاتە بەرچاو بە لەناوچوونی پێشڕەوی دەرەکی دانوساندن داواکاری هەر دوو لایەن بوو، لە ئەنجامدا دانوساندنەکانی حکومەتی یەکێتی نەتەوەیی بە سەرکردایەتی پارتی کۆنگرە لە ساڵی ١٩٩٤دا، پێکهێنرا و کۆتایی بە حکومەتی ٣٥٠ ساڵەی کەمینەی سپی پێست لەم ولآتەدا هێنا.

## دابەزینی ستراتیژیکی ئەفریقیا:

کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، کۆتایی بە هەندێ لە شەڕە نوێنەرایەتییەکان هێنا و کاریگەری سەرسوڕهێنەری بەسەر ڕێڕەوی سەرچاوەی دەوڵەتانی ئەم کیشوەرە دانا، بە کەمبوونەوەی ستراتیژیکی ئەم کیشوەرە ئامادەکارییەکانی هێزە دەرەکییەکان بۆ دابینکردنی یارمەتییە ئابووری و سەربازی و دیپلۆماتیك بۆ ئەفریقیا کەم بووە، جێفری لێفێری ئاماژەی داوە کە لە سیستەمی نوێی جیهانیدا، رۆژگەلی رژێمە دیکتاتۆرییەکانی باڵی راست و چەپ کە پڕ لە یارمەتی ببوون و لە خەرجییە زیادەکان بەخشرا بوون بە کۆتا هاتووە.

بۆ دەستپێکردنی سەرەتایەکی نوێ، سەردەمی ئەوە نەبوو کە یەکێتی سۆڤیەت وەك ئاغایەك بۆ ئەو ولآتانەی کە وەفاداربوونیان بە سۆشیالیزم رایانگەیاندبوو کار بکات، هەڕەشەی یەکێتی سۆڤیەت کەم ببووە و ولآیەتە یەکگرتووەکانیش بەرژەوەندی کەمی لە ئەفریقیادا هەبوو، بۆ نموونە سەرمایەگوزاری ئەمریکا لە گشت ئەم کیشوەرەدا بۆ کەمتر لە ١/٣ سەرمایەگوزاری لە بەرازیل گەیشت. جیا لە داواکاری گشتی بۆ پەرەدان بە دیموکراسی لیبراڵ و سەرمایەداری لە گشت جیهاندا، کاروباری ئەفریقیا لە بازنەی سیاسەتی دەرەوەی واشنگتۆن



رووبەڕووی هەندێ گرفت بووەوە، لە ئەنجامدا کونسولگەرییەکان داخران و بەرنامەکانی یارمەتیدان بڕان و فەرمانبەرانی دەزگای سیا جانتاکانیان داخست و بەدوای نێچیری زۆرتر لە شوێنیتردا گەڕان.

شایانی ئاماژە پێدانە کە هەندێ لە وەفادارانی ولآیەتە یەکگرتووەکان، لە نەوەدەکاندا دەسەڵاتیان لە دەستدا. بۆ نموونە سامویل دیو لە لیبریا، حەسن هابرێ لە چاد زیاد بارە لە سۆمالی و مۆبۆتۆ سێ سێ کۆ لە زەئیر، گشتیان لە دەسەڵات لادران. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ئەگەر رێژەی یارمەتییە دەرەکییەکان بەردەوام بوایا گشت ئەم سەرکردانە چانسی زۆرتریان بۆ راگرتنی دەسەڵات هەبوو، واشنگتۆن روونی کردەوە کە ولآتە پشتگیری لێکراوەکانی (پەیڕەو) پێشوو لە ئەفریقیادا، هەنوکە ناچارن کە خۆیان لەگەڵ واقیعییەتە گەورەکان بگونجێنن و چیتر ناتوانن بۆ قایم کردنی رژێمەکانیان پشت بە پشتیوانی زلهێزەکان ببەستن. هەروەها ئاراستەکانی ئابووری جیهانی پانتای چالاکی ولآتانی ئەفریقیای لە فریودانی پشتیوانکارەکانیان سنووردار کرد. بۆ نموونە بەرفراوانکردنی یەکێتی ئەوروپا بۆ هێزە کۆلۆنیالکارەکانی پێشوو گرنگتر بوو لە پاراستنی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کۆلۆنە پێشووییەکانیان لە ئەفریقیادا ئەگەرچی بەریتانیا و فەرەنسا بەڵێنیاندا کە یەکێتی ئەوروپا بە کۆلۆنە پێشووکانی لە رێگەی کۆنوانسیۆنی لومەوە هەلی بازرگانیکردنی خستنە پێشەوەی (ترجیحی) ببەخشێت. ئەم گرێبەستە کە لە ئەنجامی ئامادەیی یەکێتی دراوی ئەوروپا بەدی هاتبوو، لە نەوەدەکاندا، لەلایەن ولآتانی ئەفریقیاوە کەمتر گرنگی پێیدرا. فەرەنسا لە ساڵی ١٩٩٥دا نرخی (CFA)ی بۆ نیوە دابەزاند و لە ئەنجامدا سوبسید (پشتگیری دارای) کەم بووە. بۆنەی بە خاك سپاردنی سەرۆك کۆماری کەناری عاج فیلیپ هۆیفیت بوینگی نیشاندەری گۆڕانی پەیوەندی نێوان فەرەنسا و کۆلۆنی پێشوو بوو. ئەگەرچی خودی بوینگی لە بۆنەی بە خاك سپاردنی سێ سەرۆك کۆماری فەرەنساو شەش سەرۆك وەزیر بەشداری کردبوو، بەڵام چیتر مومکین نەبووە کە دوای جەنگی سارد پەیوەندی نێوان سەرکردەکانی ئەفریقیا و پاریس بە گەرم و گۆڕی بەردەوام بێت.

## بارودۆخی سیاسی پەیوەست بە یارمەتی دەرەکی:

یارمەتییەکانی گەشەپێدان لەلایەن ولآتانی رۆژئاوا بە تەواوی نەبڕدران. چونکە ئەفریقیا لە رادەبەدەر بە یارمەتییە دەرەکییەکان وابەستەیە ئەگەر ئەم یارمەتییانە ببڕدرێن کارەساتی مرۆڤی روودەدات، ئەگەرچی بە کۆتا هاتنی شەڕی سارد، ئەفریقیا گرنگی ستراتیژییەکەی لە

دەستدا، بەڵام هەنوکە یارمەتییە دەرەکییەکان لەگەڵ بارودۆخی سیاسییەوە پەیوەستە. لە کاتێکدا کە لە رابردوو حکومەتەکانی ئەفریقیا بارودۆخی ناوخۆییان رەچاو نەدەکرد، بەڵام هەنوکە ناچارن کە لەسەر کاروباری ناوخۆییدا سەرمایەگوزاری بکەن. لە جوەنی ساڵی ١٩٩٠دا دوکلاس هارد وەزیری کاروباری دەرەوەی بەریتانیا باس لە پێویستی بە دەوڵەتی ویستراو لە ئەفریقیادا کرد، هەروەها سەرۆك کۆماری فەڕەنسا، فرانسوا میتران رایگەیاند کە یارمەتییەکانی فەڕەنسا پێشکەش بەو وڵاتانە ناکرێ کە خاوەن تێڕوانینێکی دەسەڵاتخوازن و پەسەندی کاملبوون بە ئاراستەی دیموکراسین. رۆژئاوا لە هەمبەر ئەم مەرجانەدا جیددی بوو. یارمەتییەکانی گەشەپێدانی پاریس بۆ زەئیر لە ساڵی ١٩٩١دا و تۆگۆ لە ساڵی ١٩٩٣دا هەڵپسێردران، نوخبەکانی دەسەڵاتدار لە هەر دوو وڵاتدا لە سەرکردە نێودەوڵەتییەکانیان بێزار ببوون، چونکە بۆ چاکسازی دیموکراتیك لە ژێر گوشاردا بوون. لەم میانەیەدا کێنیا بۆ بەدەستهێنانی یارمەتی مەرجدار دەخرێتە ژێر خوێندنەوەیەکی ورد لە سەردەمی نوێدا. کێنیا بە درێژای شەڕی سارد پشتگیری لە سیستەمی سەرمایەگوزاری کرد و لە بڕی ئەمەشدا رۆژئاوا یارمەتی بەرفراوانی لە ژێر ناوی پشتگیری سەربازی و گەشەپێدان بەم وڵاتەی بەخشی. گۆڕینی ژینگەی سیستەمی نوێی جیهانی داواکاری زۆرتری بۆ چاکسازی رژێمی ئاراب مویی بە دواوە بوو. بەرهەڵستکارانی کێنیایی تا ساڵی ١٩٩٠ زۆر چالاك و خاوەن رێکخستنی بەهێز لە سەرتاسەری وڵاتدا بوون، حکومەتی مویی نەیارانی دژی دیموکراسی بە توندی سەرکوتکرد و بە ((ئاژاوەگێڕ و تووش بوو بە ماددە بێهۆشکەرەکان)) ناویان برد کە پێویستی وەك جورج (جۆرە مشکێك) راو بکرێن. ئەم جۆرە رەفتارە کاتێك کە سیاسەتی لەمپەرنانەوە لە بەردەم دەستڕۆیی کۆمۆنیزم لە ئارادا بوو، مافی مرۆڤ ئامانج نەبوو، ئەگەری رەچاوکردنی مافی مرۆڤ لە ئارادا نەبوو، لە نەوەدەکاندا یارمەتی ماددی بە راستەوخۆیانە بۆ وڵاتانی ویسترا ئاراستەکراو و لە ئەنجامدا مویی بۆ جێبەجێکردنی چاکسازی کەوتە ژێر گوشاردا و دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکان ولایەتە یەکگرتووەکان، یەکێتی ئەوروپا، وڵاتانی ئەسکاندیناوی و گشت ئەو وڵاتانەی کە پێشتر یارمەتی مانەوەی حکومەتی موییان دەدا، یارمەتییەکانیان هەڵپسێردراو راگرت. سەرەنجام مویی ملکەچی گوشاری پشتیوانانی دارایی (وڵاتانی یارمەتیدەر) بوو و یاسای بنەڕەتی بە مەبەستی دانپێدان بە پارتە سیاسییەکان، چاکسازی تێدا کرد و گوشاری نێودەوڵەتی و ناوخۆیی بوو بە هۆی ئەنجامدانی هەڵبژاردنی فرە پارتی لە ساڵی ١٩٩٢دا (کە تیایدا ئاراپ مویی دووبارە لە دەسەڵاتدا مایەوە). کێنیا مەرجە سیاسییە نوێیەکانی بە مەبەستی بەدەستهێنانی یارمەتی پەسەند کرد، لە سیستەمی نوێی جیهانیدا کەمتر رەچاوی بیرۆکەی دەستتێوەرنەدان لە قەڵەمڕەوی ناوخۆیی (وڵاتاندا) دەکرێ.



**بەردەوامبوونی چالاکییەکانی فەڕەنسا و شکستی دەستتێوەردانی مرۆڤی ولایەتە یەکگرتووەکان:**

سەرەڕای گوشاری زیاد لەلایەن هاوتا ئەوروپییەکانییەوە، فەڕەنسا بە تەواوی وازی لە بیرۆکەکەی نەهێنا (پانتای راوی تایبەتی). پاریس مافی دەستتێوەردان بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی، بۆ خۆی پاراست. مومکین بوو گوشارەکان بە مەبەستی ئەنجامدانی هەڵبژاردنی فرە پارتی لە وڵاتدا، بەکاربهێنرێ، بەڵام ئەم گوشارانە رێگر نەبوونە لە یارمەتیدانی فەڕەنسا بۆ پاڵێوڕاوە دەستنیشانکراوەکانی بۆ سەرکەوتن (لە هەڵبژاردنەکاندا). بۆ نموونە یارمەتییەکانی فەڕەنسا بۆ کامرون لە ١٥٩ ملیۆن دۆلار لە ساڵی ١٩٩٠دا بە ٤٣٦ ملیۆن دۆلار لە ساڵی ١٩٩٢دا گەیشت. ئەم زیادبوونەی یارمەتیدانە تا رادەیەکی زۆر بەو گریمانەیە پشتبەستراوە کە پاوڵ بیا لە ساڵی ١٩٩٢دا لە هەڵمەتەکانی سەرۆك کۆماریدا بەشداری دەکرد، یارمەتی بەرفراوان بە حکومەتی (بیا)دا تا تێچوونە گشتییەکانی وەك بەشێك لە ململانێی هەڵبژاردنەکەی فراوان بکات. پاریس بۆ رەخنەگرتن لە هەڵسوکەوتی دەسەڵاتخوازانەی لایەنگرانی پێشووی فەڕەنسا لە چاد لە ساڵی ١٩٩٠دا و لە مالی لە ساڵی ١٩٩٢دا کاتەك کە ئەم وڵاتانە رووبەڕووی بەرەنگاری بەرهەڵستکارەکان ببوونەوە وازیان لێ هێنا بەڵام ئەم رەخنە گرتنانە پاژەیی (جزئی) بوون، چونکە لایەنگرانی فەڕەنسا لە کەناری عاج و ماداگاسکاردا بزاڤە سیاسییەکانی سەرکۆتکرد. هەروەها ئەلجەزایەریش مەیلی هەبوو بۆ گرێدانی رێککەتنامەی تەعرفەی پێشەوە خستن (تعرفه ترجیحیه) لەگەڵ سیاسەتمدارانی فەڕەنسیدا. (هەروەك چۆن ئەم کارەی لەگەڵ گشت حکومەتەکانی رۆژئاواییی ئەنجامدا). ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە هەڵبژاردنی گشتی لە ساڵی ١٩٩١دا لەلایەن سوپاوە هەڵوەشێندرایەوە و رۆژئاواش حەزی لە هەڵوەشاندنەوەی ئەم هەڵبژاردنە دەکرد، چونکە بەرەی رزگارکردنی ئیسلامی، پارتێکی ئیسلامگەرا، سەرکەوتووی هەڵبژاردنەکان بوو. بەرژەوەندییە دەرەکییەکان لەم بابەتەدا بە رواڵەت خوازیاری گەشەپێدانی رکابەرێتی فرە پارتی بوو، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ئەنجامی ئەم هەڵبژاردنە بەرژەوەندییەکانیان رووبەڕووی مەترسی نەکاتەوە.

هەروەها فەڕەنسا ناوەڕاستی ئەفریقیای وەك ناوچەیەك بۆ دەستتێوەردانی ئاشکرا لە سیستەمی نوێی جیهانیدا پاراست، پاریس نیگەرانی لەدەستدانی دەستڕۆییەکەی لە کۆلۆنەکانی پێشووی بەلجیکا بوو. زنجیرەیەك لە بەرپەرچدانەوەکانی بەرەی نیشتمانپەروەرەکانی رواندا بوو بە هۆی شکست هێنانی حکومەتی کیگالی (کۆلۆنی پێشووی فەڕەنسا) لە ساڵی

١٩٩٤دا. سەرەڕای ئەمەش پارتی نیشتمان پەروەرانی رواندا لە ساڵی ١٩٩٧دا بۆ شکستدانی مۆبۆتۆ سێ سێ کۆ پشتگیری لە شۆڕشگێڕانی کۆنگۆی (لایەنگرێکیتری فەڕەنسا) کرد. ئەم رووداوانە وەك هێرشکردنە سەر بەرژەوەندییەکانی فەڕەنسا هەژمارکران. لە ئەنجامدا سەربازە فەڕەنسییەکانی هێزی دەستتێوەردانی خێرا (تدخل سريع) لە رواندا زیادیان کرد، ئەم پرسەش بوو بە هۆی ناردنی هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ژێر ناوی ئۆپراسیۆنی مرۆڤدۆستانە بۆ رێگەگرتن لە رەشەکوژی رواندابییەکان، ئەگەرچی ئاشکرا کرا کە ئەم هێزە پەناگایەکی ئەمین بۆ هێزی حکومەتێك کە شکستی هێناوە، بووە و وەك بارەگایەك بۆ دووبارە رێکخستنەوەیان کاری کردووە. هەروەها فەڕەنسا لە رێکخستنی ناردنی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بۆ زەئیر، شوێنێك کە مومکین بوو ئەم کارە سەرکەوتوو بێت، سەرنەکەوت، ئەمە لە کاتێکدایە کە هێزە سەربازییەکان لە توانایاندا بوو، کە شۆڕشگێڕەکانی کۆنگۆیی کۆنترۆڵ بکەن و بە رۆیشتن بۆ کینشازا ئەم ئەگەرە لە ئارادا بوو کە دەرفەتی زۆرتر بە مۆبۆتۆ بۆ دانوساندن سەبارەت بە داهاتووی رژێمەکەی بدات.

بە ئەنجامدانی ئەم کارانە مومکینە پاریس لە گەڕاندنەوەی لایەنگرەکانی لە ناوەڕاستی ئەفریقیادا شکستی هێنا بێ، بەڵام ١٠٠٠٠ سەربازی فەڕەنسی لە خاکی ئەفریقیادا جێگرکران و ٨٠٠ راوێژکاری سەربازیش لە حکومەتەکانی ئەم کیشوەرەدا کار دەکەن، هەنوکەش فەڕەنسا قەبارەی دەستتێوەردان لەم بەشە لە جیهاندا بۆ خۆی پاراستووە.

دەستتێوەردانی ئەمریکا لە قۆناغی سیستەمی نوێ جیهانیدا کەم و ئەویش لە سەرەتای نەوەدەکاندا لە سومالی چەق گرتبوو، رووداوەکانی پەیوەست بە دەستتێوەردانی مرۆڤی لە کۆتایی ئەم بەشدا بە وردی دەخرێتەڕوو، ئاماژەکردن بەو خاڵە بەسە کە گرووپی رەوانەکراو سەرەڕای ناردنی یارمەتی ئیمرجنسی بۆ خەڵکی سۆمالی لە کوتاییدا بوو بە هۆی هاتنەناوەوەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە شەڕی ناوخۆیی (ئەم وڵاتەدا). کاتێك کە ژمارەیەك لە هێزەکانی ئەمریکا لە هێرشدا بۆ دەستگیرکردنی سەرکردەی گرووپی شەڕڤان گوژران، واشنگتۆن گشت هێزەکانی لە خاکی ئەم وڵاتەدا هێنایە دەرەوە و نەتەوە یەکگرتووەکانیش هێزەکانی کەم کردەوە، بەم بەڵگانە نەتەوە یەکگرتووەکان رەوانەکردنی یارمەتی مرۆڤی بە تەواوی پچڕاند. تەنانەت رەشەکوژی لە رواندا نەیتوانی ئەمریکای بۆ رەوانەکردنی هێزەکانی بۆ ئەم وڵاتە رازی بکات. هەڵبەت دەستتێوەردانی ولایەتە یەکگرتووەکان لە سالآنیتری دەیەی نەود دا تەنیا لە بۆردوومانی کارگەیەکی گومانلێکراو بە



بەرهەمهێنانی چەکی کیمیاوی لە سودان کورت بووە، ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ هێرشە تیرۆریستییەکانی گرووپە ئیسلامییەکان بۆ سەر سەفارەتخانەکانی ئەمریکا لە تانزانیا و کێنیا لە ساڵی ١٩٩٨دا.

ئۆپراسیۆنە نهێنییەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان دژی ئیسلامییە ((تیرۆرستییەکان)) لە شاخی ئەفریقیادا (وڵاتانی باکوور) لە ئارادا بوو، بەڵام ئەم جۆرە ئۆپراسیۆنانە لە ساڵی ٢٠٠٣دا کاتێك کە پاپۆری ولایەتە یەکگرتووەکان پشتیوانی لوجستیکی بۆ سەربازانی نێجریایی پاسەوانانی ئاشتی لە لیبریا دابین دەکرد، ئاشکرا بوو. لە گشت ئەم هێزانە لەوانەیە بەریتانیا کە بە ئاشکرا خۆی سەرقاڵی پرسگەلی ئەفریقیای دوای شەڕی سارد کردووە، رۆڵی کاریگەری گێڕابێت و لە دۆخی رۆڵی بازرگانی لەم کیشوەرەدا بۆ دەنگی دیپلۆماتیك بۆ گۆڕانکاری لە ئەفریقیادا گۆڕدرابێ، وەزیرانی کابینەی جان میجر بوون کە بۆ یەکەمجار بەخشینی لە قەرزەکانی ئەفریقیای، لە گرووپی ٨ وڵاتی پیشەسازییدا لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا گەڵاڵە کرد، بەڵام دوای سەرکەوتنی تونی بلێر لە ساڵی ١٩٩٧ەوە ئەم چالاکییانە لە کیشوەری ئەفریقیادا پەرەیان سەند. سەرەڕای ئەمەش لە کۆنگرەی ئەم پارتەدا لە ساڵی ٢٠٠١، ئەفریقیا بە ((برینێکی قووڵ لەسەر جەستەی جیهاندا)) ناونرا و تۆنی بلێر پلانێکی وەك پلانی مارشال بۆ ئەفریقیای خستەڕوو. وەزیری دەرەوەی ئەم وڵاتە جەك ستراو لە درێژەی ئەم کۆنفرانسەدا رایگەیاند کە ((ئەگەر بمانهەوێت بە سەقامگیری بگەین پرسەکانی ئەفریقیا گرنگن، ئێوە ناتوانن چوار کیشوەر لە دۆخی گەشەکردندا هەتان بێ و کیشوەرێك لە دۆخی لەناوچوون و دواکەوتن)). بەرچاوترین ئەنجامی ئەم سیاسەتە، دەستتێوەردانی سەربازانی ئەم وڵاتە لە سیرالیون لە ساڵی ٢٠٠١دا وەك هێزی ئاشتی پارێز بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی ناوخۆیی بوو، یارمەتییە داراییەکانیش درێژەی هەبوو، بەڵام وڵاتانیتری گرووپی هەشت مەیلیان هەبوو بۆ جێبەجێ کردنی ئەم چاکسازییانە. لە ئەنجامدا لەم ساڵانەی دواییدا بەتایبەت کاتێك کە دوای راگەیاندنی شەڕی دژە تیرۆریزم لە ساڵی ٢٠٠١دا لەلایەن ئەمریکاوە، حکومەتی بلێر سەرنجی دایە ئەفغانستان و عێراق، ئەفریقیا بووبە بابەتێکی بێ دەنگ لە سیاسەتی دەرەوەی بەریتانیادا.

ئەگەرچی ئەم بابەتە بە تەواوی لەلایەن زلهێزەکانەوە قەدەغە نەکراوە، بەڵام بەڵگەکانی سەرەوە نیشاندەری ئەم (راستییەن) کە ئەفریقیا، بە هەمان تواناییەکانییەوە لە جیهانی نوێدا زۆرتر لە سەردەمی شەڕی سارد، وازی لێ هێنراوە.

## دەوڵەت، کۆمەڵگای مەدەنی و بەرژەوەندی دەرەکی:

بەپێی بابەتە باسکراوەکانی ئەم بەشە و پەیوەندییەکەی لەگەڵ بابەتی سەرەکی پەرتووکە، واتە پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، دەگەینە ئەم ئامانجە کە سەرچاوە دەرەکییەکان کاریگەری زۆریان بەسەر سیاسەت لە دوای کۆلۆنیالکردنی ئەم کیشوەرەدا هەبوو. هەروەها شایانی ئاماژەپێدانە کە زۆربەی ئەم پشتگیری کردنانە لە ڕێگەی سەروەری دەوڵەتانەوە ئەنجامدراوە، ئەم کارەش ئۆتۆماتیکانە ئەم هەلە بۆ نوخبەی ئەم وڵاتانە دەرەخسێنێ کە بەسەر کۆمەڵگای مەدەنیدا زاڵ بن.

ئەگەر سەروەری وەك بەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسی باڵا لە ناو هەرێمێکدا پێناسە بکرێ بەم پێیەش لە ڕووی تیۆرییەوە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا پێویستیان بە دەوڵەت هەیە ئەوان بەڕادەی پێویست بەهێزنین، ئەمەش نەتەنیا لەپێناو بەرژەوەندی دەرەکیدایە کە سەروەری وڵاتان پێشل دەکەن بەڵکو بەو هۆیەوەیە کە هەندێ لە ڕژێمەکانی ئەفریقیا لە هەوڵدانن تا لەم ڕێگەیەوە سەروەرییەکەیان لە ناوەوە پشتگیری لێ بکرێت (بە هۆی نەبوونی مەشروعییەت لە کۆمەڵگای مەدەنیدا)  لەم ڕەهەندەوە، دەوڵەتی ئەفریقیایی سەرچاوە یاخود هێزی کاریگەری نەبووە، بۆ (بە جێ هێنانی) بەڵێنەکانی لە کاملکردنی کونترۆڵی سیاسی وڵاتەکەی. رابرت جەکسون بە هۆی سەرنەکەوتنی لە دابین کردنی پێداویستییەکانی ئیمپراتۆری ئەم وڵاتانەی بە نیمچە وڵات ناو دەبات. ئەگەرچی بەرژەوەندییە دەرەکییەکان — بیرۆکەیەك کە سیاسەتی نێودەڵەتی بە تۆڕێك لە سەروەری دەوڵەتان پێناسە دەکات — مەیلیان بۆ پێناسەکردنیان وەك نیمچە دەوڵەت نییە. ئەوان ئەم قەڵەمڕەوانە بە ئاستێك لە سەروەری ڕاستەقینەی ئەزموونکراو دەزانن، ئەم پرسە ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی وڵاتانی بچووکی وەك گامیبیا و سوتۆ کە نەیان دەتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن، لە ململانێی جیهانی پارێزران و بۆچی ڕژێمەکانی وەك ئەمپلا لە ئەنگۆلا لە ساڵانی ٩٠-١٩٧٠ سەرەڕای دان پێنانی سیستەمی نێودەوڵەتی، زۆربەی خاکی ئەم وڵاتە لە ژێر چەپۆکی هێزە ڕکابەرەکاندا بوو.

سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەیەك لە وڵاتانی ئەفریقیا لە پۆلین بەندی وڵاتانی نیمچە دەوڵەت گونجێنراون ئەم جۆرە دانپێدانە لە ئاستی نێودەوڵەتیدا سەلماندی کە ئامرازێکی بێ بەها بووە بۆ نوخبەکانی دەوڵەت، لە دوای قۆناغی کۆلۆنیالکاریدا گوشارەکانی سەروەری نێودەوڵەتی بوو بە هۆی ئەوەی کە وڵاتانی ئەفریقیا ڕێگەیەکی دور و درێژ بۆ درێژەدان بە ژیانی بگرێنەبەر، زیاد لەمەش بەرژەوەندی دەرەکی بە ئاراستەی وڵاتگەلێکی تایبەت شۆڕکراوەتەوە، کە



دەوڵەتێکی دیارکراو کە لە ناوخۆدا لاوازە و بەگەیشتن بەم سەرچاوانە هێزی فراوان بەدەست دێنێت ((نوێنەرایەتی دەکات)) دوای ئەوەی کە نوخبەکان شۆڕشگێڕە بەرهەڵستکارەکانی سەرکوتکرد ئەوان سەرچاوە جێماوەکانیان بۆ بەهێزکردنی خزمەتگوزاری گشتی بەکارهێنا (تا مەشروعییەت لە کۆمەڵگا بەدەست بهێنن)  یاخود قەبارەی (هێزی) سەرکوتکردنی دەوڵەت (بە مەبەستی گوشار خستنە سەر بەرهەڵستکاران)  فراوان بکەن، ڕژێمەکانی درێژخایەن لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال وەك مۆبۆتۆ سێ سێ کۆ لە زەئیر و هویفیت بونیگی لە کەناری عاج توانییان بۆ سوود وەرگرتن لە پشتیوانە نێودەوڵەتییەکانیان زۆرترین فریۆدان (بەکاربێنن)، هەڵبەت لە چەندین بابەتدا وڵاتان هەوڵیان دا کە ژیانی سیاسییان بە پشتگیری دەرەکی ببەستنەوە تا مەشروعییەتی ناوخۆیی.

بە کۆتاهاتنی شەڕی سارد گۆڕانکارییەك لە نموونەی (نموذج) هاوکارییە نێودەوڵەتییەکاندا ڕوویدا کە دەمێك بوو لە ململانێی ئایدیۆلۆژیکی هەڵقولابوو، هەنوکە سەرچاوە دەرەکییەکان لە چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم سەرچاوانە زۆر وریابوونەتەوە. لە کاتێکدا کە پێشتر کاروباری ستراتیژیکی جۆر و ڕادەی یارمەتی دەرەکی دیار دەکرد و چاوپۆشی لە نادادپەروەری و زیادەڕۆی ناوخۆیی دەکرد، ئێستا نوخبەکان بەم ئەنجامە گەیشتن کە پێویستە وەڵامدەری چۆنیەتی حکومەتکردن بەسەر کاروباری ناوخۆ دابن. لە ئەنجامدا مەرجە سیاسییەکانی پلانی یارمەتییەکانی ساڵانی نەوەد گوشار خستنەسەر وڵاتان لەپێناو ئەنجامدانی چاکسازی سیاسی بروکە بە دوایدا هەڵبژاردنی فرە پارتی ئەنجامدرا.

لە ڕاستیدا بە سیستەمی نوێی جیهانی، کۆمەڵگای مەدەنی و نوخبە سیاسییەکان لە سوودەکان هەڵقولاو لە سەرچاوە دەرەکییەکان هەماهەنگ بوون زیاد لەمەش هەندێ لە پرۆژەکانی یارمەتیدان بۆ چالاکییە سیاسییەکانی ژێر دەوڵەت (Substate) تەرخانکرا. یارمەتیدەرانی دەرەکی، تەنگیان بە نوخبەکانی دەوڵەت هێنا و خۆیان ڕاستەوخۆ گیرودەی چالاکییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بوونەوە. بۆ نموونە ولایەتە یەکگرتووەکان پلانێکی بەرفراوانی بۆ ((دەنگدەران)) و ((بەڕێوەبردنی خۆبەشانە)) لە ساڵانی نەوەددا لە غانا جێبەجێکرد. بەم پێیەش بارودۆخی سیاسی، ناوەڕۆکی گەمەی سیاسی لە ئەفریقیادا گۆڕی و گشت وڵاتانی ئەفریقیا پشتبەستراو بە یارمەتی دەرەکی مانەوە، بەڵام ئەوان ناچار بوون کە ئەم یارمەتییانە پێشکەش بە هاوڵاتیاکانیان بکەن نەك بە خۆیان. حکومەتی ویسترا (حکومە مطلوبة) داواکارییەك بوو بە براوی کارگەلی فریودەرانەی زۆر لەلایەن نوخبەکانەوە ئەنجامدراوە

تا نوخبە لە دابەشکردنی ئەم یارمەتییانە سوودمەند بێت، بەڵام ئەوان ناتوانن چیتر لە پشت لێکدانەوەکانی شەڕی سارد بۆ سەروەری و دەستێوەرنەدان لە پانتای دادوەری ناوخۆیدا خۆیان حەشار بدەن.

یارمەتیدەرانیش بە ئاسانی دەستی نوخبەی لە سەرچاوە ناوخۆییەکانی دەوڵەتانی ئەفریقیا بڕی، چونکە ئەوان نوێنەرانی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بوون. ئەنجامگیری بەم رستەیەی کریستوفر کلافهام بە کۆتا دێنین:

((بە بڕوای وڵاتانی ئەفریقیا لە زۆر بابەتدا درێژە بە ژیانیان دەدەن و زۆربەیان توانای زۆریان بۆ سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی خۆیان لە بارودۆخێکی تەواو لاواز (بۆ وڵاتێکی بەهێز) هەیە، ئەگەر ئەوان مەیلیان بۆ پاراستنی خۆیان و جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان لە کاروباری وڵات بەڕێوەبردندا هەبێت، لەبری ئەوەی کە پشتبەستراو بن بە پشتیوانی کۆنوانسیۆنە نێودەوڵەتییەکان پێویستە بناغەی پەیوەندی لەگەڵ هاوڵاتییەکانیاندا بەهێز بکەن)).

**پوختەی بەشی هەشتەم: هێماکانی (مؤشرات) پەیوەندییە دەرەکییەکان لە سەردەمی سەربەخۆییەوە.**

| | |
|---|---|
| | **أ) قۆناغی شەڕی سارد** |
| ١. یەکێتی سۆڤیەت | * بەرژەوەندی سنوورداری ستراتیژیکی لە کیشوەری  ئەفریقیا<br>* وەفاداری بە ئایدیۆلۆژی سۆشیالیستی رزگاریخوازە نەتەوەییەکان<br>* دامەزراندنی بنکەی سەربازی لە کیشوەردا<br>* ئامادە و دابینکردنی رێژەیەکی کەمی یارمەتی<br>* فرۆش و دابینکردنی رێژەیەکی زۆری چەك بە هاوپەیمانەکانی<br>* یارمەتیدانی بزاڤە رزگاریخوازەکانی باشووری (کیشوەری) ئەفریقیا (پارتی کۆنگرەی گەلی ئەفریقیا، سواپۆ، زانۆ)<br>* دەستتێوەردانی کورت ماوە لە کیشوەردا |
| ٢. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا | * بەرژەوەندی سنوورداری ستراتیژیکی لە کیشوەردا<br>* هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی هاوپەیمان لە ئەفریقیا تا یارمەتی ئەمریکا بدات لە ڕێگە گرتن لە دەسترۆیی کۆمۆنیزم<br>* چاوپۆشین لە دەسەڵاتخوازی رژێمە هاوپەیمانەکانی دژی کۆمۆنیست (وەك کۆنگۆ و وڵاتی ئەفریقیای باشوور) |
| | * ئامادە و دابینکردنی یارمەتی بۆ هاوپەیمانان<br>* یارمەتی کەم بۆ گرووپی رکابەرە وەفادارەکان |
| ٣. بەریتانیا | * پەیوەندی لە ئاستی باڵا و بەرفراوان بە مەبەستی پەرەپێدانی سەرچاوەی ئابووری |
| ٤. فەرەنسا | * پەیوەندی نزیك و بەردەوام لەگەڵ نوخبەی دەسەڵاتدارا<br>* دامەزراندنی سیستەمی دارایی لە وڵاتە کۆلۆنەکانی پێشوو<br>* دەستتێوەردانی سەربازی بە مەبەستی پشتگیری کردن لە هاوپەیمانانی<br>* پەیوەندی ئابووری فراوان و بەهێز<br>*فراوانکردنی دەسترۆیی لە وڵاتی کۆلۆنەکانی پێشوو |
| | **ب: دوای شەڕی سارد** |
| ئەنجامەکانی سیستەمی نوێی جیهانی | * کۆتایی هاتنی شەڕە نوێنەراتییەکان و کەمبوونەوەی گرنگی ستراتیژیکی ئەفریقیا<br>* کەمبوونەوەی یارمەتیدان بە ئەفریقیا<br>* پەیوەست بوونی بەخشینی یارمەتی سەربازی بە هەلومەرجی سیاسی<br>* رەعیەتەکانی شەڕی سارد یارمەتییەکانیان لەدەستدا.<br>* هەوڵەکانی دەستتێوەردانی ولایەتە یەکگرتووەکان لە پرسە مرۆڤایەتییەکاندا کە دوای رووخانی سوماڵی هەڵپسێردرا.<br>* فەرەنسا درێژەی بە دەسترۆیی لەم کیشوەرەدا.<br>* بەریتانیا تا رادەیەك دەستتێوەردانی مرۆڤی لە سیرالیون ئەنجامدا<br>* کاروبارە نێودەوڵەتییەکانی ئەفریقیا زۆرتر بەرەو ئەفریقیایی بوون ئاراستە کرا. |

## بابەتی توێژینەوە: پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی سوماڵی:

ئەم وڵاتە نزیك ٣,٠٠٠ کیلۆمەترە و لە ناوچە کەنارییەکان و لە هەڵکەوتەیەك کە دەریای سوور بە زەریای هیند گرێ دەدات و شاخی ئەفریقیا پێك دێنێت دامەزراوە. ئەم وڵاتە لە زەوی بەیار پێك هاتووە کە بەرەو چیاکانی باشوور درێژ دەبێتەوە لە رووی سوننەتەوە سوماڵی پەناگای مرۆڤە خێمەنشینەکان بووە کە گا، بزن، مەڕ و ماڵات و وشتریان بەخێو کردووە. زەوییەکانی بە پیت (بۆ

کشتوکاڵ) لە ناوچەی نێوان دوو رووباری بەردەوامی جیوبا و شیبل هەڵکەوتووە. لە رووی نەژادییەوە، سومالی یەکێك لە وڵاتە یەك دەستەکانی ئەفریقیایە. پێشینەی خەڵکی سومالی بۆ سەدەی پانزەی زایینی دەگەڕێتەوە، کاتێك کە ئەم وڵاتە لەلایەن کۆلۆنکارەکانەوە داگیر کرا، دەوڵەت — نەتەوەی هاوچەرخ تیایدا کۆ بوونەوە. بەریتانیا لە ساڵی ١٨٨٧دا باشووری ئەم وڵاتەی وەك ناوچەی پشتگیری لێکراو، راگەیاند و ئیتاڵیاش بە بیانووی (پاراستنی) ئاسایشی خەڵکی باشووری سومالی لە ساڵی ١٩٢٧دا دەستڕۆیی تەواوی بەدەستهێنا. هەروەها سنوورەکانی کۆلۆنیال، سۆمالییەکانیتری لە دەرەوەی دووی کۆلۆنی سەرەکی بەجێهێشت، هەندێ لە سومالییەکان کەوتنە ژێر پانتای دادوەری فەرەنسا (کە ئەمڕۆکە بووە بە جیبوتی). هەنوکەش گرووپێك لە ناوچەیەك لە باکووری کێنیا ماونەتەوە و هەندێکیشان لە ناوچەی ئۆگادن لە هزری جیابوونەوە لە ئیمپراتۆری ئەسوپیادان. ئەم گرفتەش (هەڵقولاو لە خەڵك — پارچە پارچە بوون) لە رێگەی نەهێشتنی کۆلۆنیالکاری تارادەیەك چارەسەرکرا. لە ساڵی ١٩٦٠دا ناوچەکانی ژێر کونترۆڵی بەریتانیا و ئیتاڵیا تیکەڵ بە یەکترکران و لە کاتی سەربەخۆییدا کۆماری دیموکراتیکی سومالییان پێکهێنا، نەتەوەگەراگەلێك هەم لە باکوور و هەمیش لە باشوور بە سەرکردایەتی کۆمەڵگای گەنجانی سومالی بوون بە هاوپەیمان، ئەگەرچی زۆربەی گەلی سومالی ئەم بابەتەیان وەك خاڵی دەستپێك دەزانی و هیوادار بوون کە سومالی گەورە بە گشت گەلەکەیەوە پێك بێنن لە ئەنجامدا دەوڵەتی نویێ پشتیوانی لە بزاڤی شۆڕشگێڕ لە باکووری کینیا و ناوچەی ئۆگادن لە ئەسوپیا کرد و هەروەها دەوڵەت جارنامەی ساڵی ١٩٦٣ی رێکخراوی یەکێتی ئەفریقیای کە تیایدا سومالی بە دەوڵەتێکی لکێندەر (الحاق) وەسفکردبوو، رەتکردەوە (بگەڕێوە بۆ بەشی دووەم).

کۆماری سومالی لە سەردەمی سەربەخۆییەوە پشتبەستراو بە فاکتەری دەرەکی بووە و ئەم پرسەش لە گشت قۆناغی دوای کۆلۆنیال درێژەی کێشا. مومکین بوو نەهێشتنی کۆلۆنیالکاری سومالی رووبەڕووی تەنگ و چەلەمەی دەوڵەتی مۆدێرن بکاتەوە و دەستکەوتەکانی لە ئابووری مودێرندا کەم بێتەوە بە رەچاوکردنی بارودۆخی ئابووری وڵات بەسەرقاڵ بوونی بەشی زۆرینەی دانیشتوان لە بەخێوکردنی ئاژەڵ لەبری سەرقاڵ بوون لە کاروباری پیشەسازی و کان (معدن)دا، حکومەت ناچار بوو بە راکێشانی سەرمایە لە دەرەوەی وڵات هەم لەپێناو یارمەتیدان بە ئابوور و هەمیش بۆ بەرزکردنەوەی تواناییەکانی (ظرفیت) خودی دەوڵەت و سەرکردەکانی سۆماڵیش لەپێناو ئەم بابەتەدا هەوڵیان دەدا.



لە رەهەندی چالاکی سەربازییەوە ئەم وڵاتە بەرەو یارمەتی وەرگرتن لە سەرچاوە دەرەکییەکان هەنگاوی نا، هەرچەندە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی کلێندەرەکانی لە شاخی ئەفریقیا رووبەڕووی گوشاری زلهێزەکان بوویەوە. هێزە رۆژئاواییەکان بۆ پلانی سەربازیی سومالی نزیکەی ١٠ ملیۆن دۆلاریان پێشنیار کرد، بەڵام لەبری ئەمەدا یەکێتی سۆڤیەت بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم پلانە نرخێکی ٣٠ ملیۆن دۆلاری پێش بینی کرد. سەرسوڕهێنەر ئەوە بۆ کە رکابەرێتی شەڕی سارد بوو بە هۆی ئەوەی کە سۆڤیەت بە درێژایی شەستەکان لە دامەزراندنی سوپا و پڕچەك کردن یارمەتی ئەم وڵاتەی دا، لە کاتێکدا کە هاوکات رۆژئاوا یارمەتی دامەزراندنی هێزی پۆلیسی ئەم وڵاتەی دەدا.

یارمەتی ئابووریش لەم سەرچاوەیە دابین دەکرا ئەم وڵاتە سەرمایەی کەمی بۆ سەرمایەگوزاری هەبوو و زۆربەی تێچوونی پرۆژەکانی گەشەسەندن لەلایەن یارمەتی وڵاتانی دەرەوە دابین دەکرا. ئیتاڵیا لەنێوان ساڵانی ١٩٥٣ تا ١٩٧٥، ١٩٠ ملیۆن دۆلار یارمەتی ئەم وڵاتەی دا. هەر لە هەمان کاتدا یەکێتی سۆڤیەت ١٥٢ ملیۆن دۆلار ولایەتە یەکگرتووەکان ٧٥ ملیۆن، چین ١٤٣ ملیۆن و وڵاتانیتری رۆژئاوا ٦٤ ملیۆن دۆلار، یارمەتی ئەم وڵاتەیان کرد. دوای ساڵی ١٩٦٩ جۆراوجۆری یارمەتییە دەرەکییەکان بەرەبەرە کەم بووە، کە ئەمەش لە ئەنجامی کودەتای زیاد باریێ بۆ گەمارودان و کۆنترۆڵ کردنی دەسەڵات لەلایەن سوپاوە هێمای لاوازی سیاسەت لەم وڵاتەدا بوو. سومالی لە رووی نەژادەوە وڵاتێکی یەك دەستە و دانیشتوانی بەسەر پێنج خێڵ و هۆز و وردە هۆزیتر دابەشکراون. بەڵام لەنێوان ساڵانی ١٩٦٠ تا ١٩٦٩ سومالی وەك گشت وڵاتانی ئەفریقیا حکومەتێکی تاك پارتی دامەزراند و دواتر رکابەرێتی چەند لایەنی (بە هۆی) درزتێکەوتنە (ناو) خێڵەکان سەریهەڵدا، بۆ نموونە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٦٩دا، ١٠٠٢ پاڵێوراو بە نوێنەرایەتی ٦٢ پارت بۆ بەدەستهێنانی ١٢٣ کورسی پەرلەمان لەگەڵ یەکتردا رکابەرێتییان کرد.

زیاد باریێ ئەم کودەتایەی بە هۆی ئەوەی کە لەو بڕوایەدا بوو رکابەرێتی لەنێوان خێڵ و خێڵە لاوەکییەکان (Sab Clan) سەرچاوە کەمەکان بەفیرۆ دەدات و گەندەڵی زۆر دەکات، ئەنجامدا. هەڵبەت سوپا لە رێکخستنەوەی هێز لە وڵاتی لاوازی سومالیدا سوودمەند بوو.

(یارمەتییە دەرەکییەکان ئەم وڵاتەی کردە چوارەمین زلهێزی سەربازی لە ئەفریقیادا بەدوای ئەسوپیا، نیجیریا و غانا).

رادەی یارمەتییە دەرەکییەکان دوای کودەتای سەربازی کەم بووە. رژێمی زیاد باریێ سۆشیالیزمی زانستی (ئاکادیمیك) وەك رێنماییکاری ئایدیۆلۆژیکییەکەی لە بەرنامەی کارەکەیدا گونجاند و کۆمپانیا بازرگانییەکانی بیانی و ناوخۆیی، بە نیشتمانی کران و زەوییەکان لەلایەن دەوڵەتەوە کونترۆڵ کران و

پلۆرالیزمی سیاسی سەرکوتکراو تەنیا پارتی سۆشیالیستی شۆڕشگێڕی سۆماڵی دامەزرا. چاندنی مۆز (گەورەترین بەرهەم) لە دەست کەرتی تایبەتدا مایەوە، ئەزموونەکانی زیاد باریّ لە مارکسیزم، لێنینزم، پشتیوانی یەکێتی سۆڤیەتی بەدەستهێنا. ئەم هاوپەیمانییە بە گرێدانی گرێبەستی دۆستایەتی و هاوکاری لە ساڵی ١٩٧٤دا و دەست پێگەیشتنی یەکێتی سۆڤیەت بە بەندەری بێربێرا لە زەریای هیند و چەندین فڕۆکەخانەی سۆماڵی، دەستی پێکرد. مۆسکۆ ئامادە بووینی لە شاخی ئەفریقیادا، ململانێیەك لە دژی ئامادەیی هێزەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان لە پشتگیری کردن لە ئیمپراتۆری هایلە سلاسی لە ولاّتی جیراندا، واتە ئاسوپیا دەزانی و سوپای سۆماڵی زۆرترین سوودی لە پشتیوانی یەکێتی سۆڤیەت بەدەستهێنا و سۆڤیەت یارمەتی سەربازی فراوانی بەم ولاّتە بەخشی. بۆ نموونە ژمارەی سەربازانی سوپا لە ١٢٠٠٠ سەرباز لە ساڵی ١٩٧٠ دا بە ٣٠٠٠٠ سەرباز لە ساڵی ١٩٧٧ دا گەیشت و ئەم کادیرە بە تانکی دژە گوللە بەرهەمی سۆڤیەت و موشەکی زەوی بۆ ئاسمان و پاپۆڕی دەریاوانی و فڕۆکەی مێگی بەدەستهێنا. هەروەها هەزار راوێژکاری سوپای یەکێتی سۆڤیەت لەم قۆناغەدا رەوانەی سۆماڵی کراون و ٢,٤٠٠ سۆماڵیش لە بەشە جۆراوجۆرەکانی ولاّت بۆ خولی راهێنان بەرەو سۆڤیەت رەوانەکران هەروەك باسکرا، زۆربەی یارمەتی ئابوورییەکان بە لایەنگرانی ئەفریقیایی درێژەیان هەبووە و یەکێتی سۆڤیەت لە دامەزراندنی ساردخانە و کۆنسرڤی گۆشت، سیستەمی ئاودێری و راوە ماسی یارمەتی ئەم ولاّتەیدا.

ئەگەرچی سۆماڵی لەم قۆناغەدا پشتی بە سۆڤیەت وەك یەکەم هاوپەیمان بەستبوو، بەڵام دەوڵەتی مۆگادیشۆ بە توندی ئاگاداری راگرتنی پەیوەندییەکان لەگەڵ ولاّتانیتریشدا بوو. چونکە سەرچاوە دەرەکییەکان بەهایەکی زۆریان هەبوو و مەیلە ئایدیۆلۆژیکییەکان لە پلەی دواتر دابوون. هەر بۆیەش ئەم ولاّتە هەوڵی فراوانیدا بۆ خۆگرێدان بە ولاّتانی ئیسلامییەوە و لە ساڵی ١٩٧٤دا بوو بە (ئەندام) لە کۆمکاری عەرەبیدا و پەیوەندی باشی لەگەڵ چین و کوریای باکوور دامەزراند.

هەلێکی باش بوو کە پەیوەندییە دیپلۆماتیکییەکان و کەناڵەکانی یارمەتیدانی دەرەکی بە کراوەیی بمێنێتەوە، چونکە یارمەتییەکانی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٧٨دا راگیردرا و ئەم وەستانەش بەرپەرچدانەوەیەك بوو بۆ هێرشی سۆماڵی بۆ سەر ئەسوپیا. خاکی نێوان ئەم دوو ولاّتە هیچ کاتێك پێش ئەم مێژووە بە دروستی دەستنیشان نەکرابوون و لەژێر یاسای حکومەتی کۆلۆنیالی، سۆماڵییەکان مافی لەوەڕاندنی مەڕ و ماڵاتیان بە درێژای سنوور بەدەستهێنا. حکومەتی لکیندەرکاری فەرمانڕەوا لە مۆگادیشو، گشت کاتێك ناوچەی ئوگادنی بە بەشێکی جیانەکراوی ولاّتی گەورەی سۆماڵی دەزانی و لە ئەنجامی ئەم هزرە و دوای سەرهەڵدان ناسەقامگیری لە ئەسوپیا لە ساڵی



١٩٧٧دا، زیاد باریّ بڕیاری هێرش کردنە سەر ئەسوپیای دەرکرد و سوپای سۆماڵی کە لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە راهێنرابوو و پڕچەك کرابوو، سنوورەکانی بەزاند تا لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری هێزی بەرەی رزگاریخوازی رۆژئاوای سۆماڵی شەڕی ئەسوپیا بکات. ئەم رووداوانە لوغزێکیان بۆ حکومەتی مۆسکۆ ئاشکرا کرد.

لە کار لادانی هایلە سلاسی لەلایەن رژێمی لایەنگری مارکسیزم، لێنینیزم کە لەلایەن ماریام منگیستیۆ سەرکردایەتی دەکرا، ئەسوپیای بە بەهێزی کردە لایەنگری یەکێتی سۆڤیەت. لە بەرامبەردا، مۆسکۆ پاش ئەم رووداوە ناچار بوو کە لەنێوان زیاد باریّ لە سۆماڵی (ولاّتێك کە یەکێتی سۆڤیەت لە شەستەکانەوە تیایدا سەرمایەگوزاری کردبوو) منگیستیۆ لە ئەسوپیا (دەوڵەتی لایەنگری سۆڤیەت بە پتانیسلێکی تەواو شۆڕشگێڕانە) یەکیان هەڵبژێرێت، یەکێتی سۆڤیەت هەوڵیدا تا بە رازی کردنی گشت پارتەکان بۆ واز هێنان لە بانگەشەی ناسیۆنالیستییەکانیان، لە فی پەرەسەندی ململانێدا رێگربێت و بۆ ئەم مەبەستەش فدراسیۆنی سۆشیالیستی لە شاخی ئەفریقیادا دامەزراند. زیاد باریّ هاوکاری کردن لەگەڵ سۆڤیەتی راگرت و رێککەوتننامەی دۆستایەتی و هاوکاری بە یەك لایەنە هەڵوەشاندەوە و لەبری ئەمەشدا گشت یارمەتییەکانی یەکێتی سۆڤیەت بۆ ئەم ولاّتە بڕدرا و گشت راوێژکارانی یەکێتی سۆڤیەت لە سۆماڵی هاتنەدەرەوە. لە یەکەم دیددا، بڕیاری زیاد باریّ بۆ بڕینی هاوکاری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا سەرسوڕهێنەرە، چۆن سۆماڵی دەتوانیّ لەهەمبەر بڕینی سەرچاوەکانی سۆڤیەت لە سەرپێ بوەستیّ. پرسی لکێندەری و جەخت لێکردنەوە لەڕێگەی یارمەتییەکانی مۆسکۆ بە موگادیشو ئەنجام دەدرا و ئەم پرسەش وەك ستراتیژییەکی شاراوە بۆ گوشار خستنە سەر سۆڤیەت لەلایەن زیاد بارێوە بەکار هات، سۆماڵی هەوڵی دەدا تا فاکتەرەکانی جەنگی سارد بگۆڕێت. لە ئەبریلی ١٩٧٧دا ولایەتە یەکگرتووەکان یارمەتی سەربازی بۆ ئەسوپیای راگرت. ولاّیەتە یەکگرتووەکان دوای شۆڕش، بانگەشەی نزیك بوونەوە لە رژێمی ئەسوپیای دەکرد، بەڵام کاربەدەستە پلەبەرزەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان دژی ئەم ئایدیۆلۆژیا ناسازگارە وەستانەوە و ئەم پرسەش بوو بە هۆی ئەوەی کە ولایەتە یەکگرتووەکان لەم ناوچە گرنگە ستراتیژیکییەدا هیچ هاوڕێی (شریك) ستراتیژیکی نەبیّ و پلانی زیاد بارێش لە ئەستۆ گرتنی ئەم رۆڵە لە شاخی ئەفریقیادا بوو. چونکە هەم دەبوایا یارمەتی دەرەکی وەرگرتبا (ئێستا ولایەتە یەکگرتووەکان) هەمیش دەبوایا لە توانای دابێت، کە شەڕی لکێندەرانەی لە ئەسوپیادا درێژە پێبدات. ئەم پرسە مەترسی زۆری هەبوو.

زیاد باریّ لە گەمەی دیپلۆماتیکییەکەیدا سەرکەوت و رێککەوتننامەیەکی بە بەهای ٤٦٠ ملیۆن دۆلار لە جوەنی ١٩٧٧دا بۆ کڕینی چەك و پێداویستییەکان لەگەڵ ولایەتە یەکگرتووەکاندا (بە

ناوبژیوانی عەرەبستانی سعودی) واژووکرد، ئەمەش سەرکەوتنێك بوو و هۆکارێك بوو بۆ خێرا دەرچوونی یەکێتی سۆڤیەت لە سۆماڵی، ئەم پەیوەندییەش تا سەردەمی دەستبەکاربوونی کارتر کە جەختی لەسەر مافی مرۆڤ لە سیاسەتی دەرەکیدا دەکردەوە، لە ئاستێکی بەرزدا درێژەی هەبوو. لە بەشێك لەم رێککەوتننامەیەدا هاتبوو، کە پێویستە سۆماڵی هێزەکانی لە ئۆگادن بکێشێتەوە.

زیاد باریٚ ئەم کارەی جێبەجیٚ نەکرد. هەنوکە زۆربەی سەرکەوتنەکانی کە لە ئەنجامی دەستکاری لە رووداوە مێژووییەکان و رکابەری لە شەڕی سارد بەدەست هێنابوو، لە دەستی دابوو. لە ئەنجامدا ئەگەرچی سوپای سۆماڵی جەختی لەسەر دەستتێوەردان لە ناوچەی ئۆگادن دەکردەوە، بەڵام لەلایەکیترەوە بە کەمبوونەوەی پشتگیری یەکێتی سۆڤیەت لە هێزەکانی ئەسیوپا، هێزەکانی کۆبا شوێنی گرتەوە. بەڵام هەروەهاش هێزەکانی سومالی پڕ چەکتر و ژمارەیان زۆرتر بوو، بەڵام سەرەنجام لە مارسی ١٩٧٨دا لە ناوچەی ئۆگادن کێشرانەوە.

شکست لە ئەسیوپیا، هەڕەشەی لە داهاتووی رژێمی زیاد باریٚ دەکرد. دەوڵەتی باریٚ لەم پرسە بە هۆی پێویستی بە پاراستنی پشتگیری دەرەکی رزگاربوو و پشتگیری دەرەکیش بۆ رژێمی زیاد باریٚ پرستیژ و مەشروعییەتی بەدیاری هێنا. موگادینو لە وڵاتانی عەرەبستان، ئێران، میسر، چین، فەڕەنسا، بەریتانیا، ئەڵمانیای رۆژئاوا و ولایەتە یەکگرتووەکان یارمەتی زۆری وەرگرت و تەنانەت ئاشتبوونەوەی زیاد باریٚ لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت بوو بە هۆی درێژبوونەوەی یارمەتییەکانی یەکێتی سۆڤیەت. ئەگەرچی پشتگیری و بودجەی ئابووری لەم وڵاتانەوە رەوانە دەکران بەڵام هیچ یەك لەم وڵاتانە، هەوڵیان نەدا بۆ دووبارە رێکخستنەوەی سوپای ئەم وڵاتە. بۆ زیاد باریٚ یارمەتی سەربازی زۆر بە پێویست دەزانرا، چونکە ئەو هەم بۆ زیندوو راگرتنی بیرۆکەی سۆماڵی گەورە و هەمیش بۆ پاراستنی دیسپلینی ناوخۆ، پێویستی بە سوپا هەبوو.

سەرەنجام زیاد باریٚ دوای دوو ساڵ لە گۆشەگیری سیاسی ئامانجە سەرەکییەکەی تاڕادەیەك لەگەڵ واقیعییەت گونجاند و لە ساڵی ١٩٨٠ مۆگادیشو رێککەوتنامەیەکی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکاندا گرێدا، کە تیایدا هێزەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان لەهەمبەر یارمەتیدانی سەربازی بەرژێمی زیاد باریٚ دەستیان بە توانا سەربازییەکانی سۆماڵی دەگەیشت. واشنگتۆنیش رەزامەندی نیشاندابوو کە پەرە بەم یارمەتییانە بە ئاڕاستەی شەڕی سارد بدات (کاتێك کە واشنگتۆن یەکێك لە لایەنگرانی واتە ئێرانی لەدەست دابوو و سۆڤیەتیش ئەفغانستانی داگیرکردبوو). بانگەشەی زیاد باریٚ ئارامتر بوو، ئەو باسی لە سۆماڵییەکی گەورە بە ئامرازی ئاشتیخوازانە دەکرد و پێشوازی لەم رێککەوتننامەیە کرد و جارێکیتر ولایەتە یەکگرتووەکان گەڕایەوە سۆماڵی و لایەنگرەکانیتریشی ئەم کارەیان ئەنجامدا. زیاد



لەمەش، ولایەتە یەکگرتووەکان ٥١ ملیۆن دۆلار یارمەتی سەربازی و ٥٣ ملیۆن دۆلار یارمەتی گەشەکردنی بەم وڵاتە بەخشی و ٩ ملیۆن دۆلاریشی بۆ پڕۆژەکانی ئاودێری و کارەبا تەرخان کرد. دامەزراوەکانی کۆمەڵگای ئەوروپییش لەم سەردەمەدا ٥٣ ملیۆن دۆلار یارمەتی ئەم وڵاتەیاندا کە سەرلەنویٚ سەرچاوە دەرەکییەکانی دەوڵەتی سۆماڵی وروژانەوە.

ڕژێمی زیاد باریٚ وەك شێوازی حەفتاکان نەیدەتوانی فەرمانڕەوایی بکات، هاورێیە (شریك) بیانییەکانیش ئاگاداری پرسی رێزنەگرتن لە مافی مرۆڤ لەم وڵاتە دەبوونەوە و هەڕەشەی بەردەوامی لکاندن لەم وڵاتەدا لە ئارادابوو. لە ئەنجامدا، بە ئاوابوونی شەڕی سارد ولایەتە یەکگرتووەکان یارمەتییەکانی بۆ مۆگادیشو لە ساڵی ١٩٨٨دا راگرت و بەم کارەش، لە ساڵی ١٩٩١دا دەوڵەتی سۆماڵی شکستی هێنا و ولایەتە یەکگرتووەکان بۆ بارگۆکردن و هەڵگرتنی هاوڵاتی و دیپلۆماتکارەکانی، پاپۆڕەکانی رەوانەی ئەم وڵاتە کرد. فرانك کریگلر، سەفیری پێشووی ئەمریکا لە سۆماڵی دەڵێت: ((ولایەتە یەکگرتووەکان گڵۆپەکانی کوژاندەوە، دەرگاکانی داخست و پێگەی ئەم وڵاتەی لە بیرکرد. بە گۆڕینی پێداویستییەکانی جیهان، سیاسەتی حکومەتەکانی دەرەوەی ئەفریقیا، ئێستا پێویستیمان بە چارەنووسی سۆماڵی نییە)).

بە بیٚ یارمەتییە دەرەکییەکان، رژێمی مۆگادیشو نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی درێژ دەسەڵاتەکەی بەسەر گشت خاکی سۆماڵیدا جێبەجیٚ بکات. لە سەردەمی شکستی سۆماڵی لە ئوگادنەوە، زیاد باریٚ هەوڵی دا کە لە ناو (خێڵە بچووکەکان SUBCLEN) نی وڵات دەسەڵاتەکەی بەدەست بێنێتەوە، سەرچاوەی دژایەتیکردن لە خێڵەکانیتردا بەرە بەرە لەناوچوون و لە بەرامبەردا، سەرکوتکردن، هەڕەشە، و بەندکردن و تاوانبارکردن و بۆردوومانی گوندەکان، لە کۆتایی دەسەڵاتەکەیدا، باڵی بەسەر ئەم وڵاتەدا کێشا. هێزەکانی زیاد باریٚ دژی بزاڤی نەتەوەیی جیاخوازانی سۆماڵی لە باکوور و بەرەی رزگاریخوازی دیموکراتی ماجیتین لە باکووری رۆژهەڵات و بزاڤی نیشتیمانپەروەرانی سۆماڵی لە باشوور و رۆژئاوادا و کۆنگرەی یەکبوونی رۆژهەڵاتی دەوروبەری مۆگادیشۆ، وەستانەوە. کاتێك کە دەسەڵات لە ناوەندا شکستی هێنا، سۆماڵی لەلایەن باڵە خۆجێیەکانی پشتبەستراو بە وەفاداری خێڵەکی بەسەر چەند بەش دابەشکرا و شەڕی ناوخۆیی هەڵگیرسا و زیاد باریٚ شکستی خوارد و لە ساڵی ١٩٩١دا وڵاتی بەجێهێشت.

هەنوکە لایەنگرانی پێشووی سۆماڵی سەرچاوەی کەمیان لە دەوڵەتی زیادباریٚدا هەبووە و هیچ مەیلیان بۆ گیرۆدە بوون لە شەڕی ناوخۆییدا نەبوو، فاکتەرە ستراتیژیکە جیهانییەکان کە پێشتر

پشتگیرییان لە شەڕی نوێنەرایەتی دەکرد. هەنوکە لەبەین چووبوون و لە ئەنجامدا شەڕی نێوان خێڵەکان هەڵگیرسا.

ئەم بارودۆخە لەساڵی ١٩٩٢دا کە بەپێی ئاماری ڕێکخراوە ناحکومییەکان نزیك ٥٠٠٠٠ کوژراو ٤,٥ ملیۆن کەس لە برسێتیدا دەژیان، بە ترۆپك گەیشت و لە ئەنجامی ئەمەشدا نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری دەستتێوەردانی دەرکرد و یارمەتی نەتەوە یەکگرتووەکان و سەرباز بۆ پارێزگاری کردن (لە هاوڵاتیان) بەرە بەرە بۆ ئەم وڵاتە ڕەوانەکران. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوە بوو کە ئەم ڕەوانەکردنە هاوکات بوو لەگەڵ ڕاگەیاندنی سیستەمی نوێی جیهانی کە لەلایەن سەرۆك کۆماری ولایەتە یەکگرتووەکان، جۆرج بۆش ڕاگەیندرا و نیشاندەری توانایی ئەم وڵاتە بوو لە چارەسەرکردنی ململانێیەکاندا کە لەڕێگەی سیستەمی نوێی جیهانییەوە ڕاگەیندرا. بۆش ڕەزامەندی نیشاندا بۆ ڕەوانەکردنی ٣٠٠٠٠ سەربازی ئەمریکا بۆ یارمەتیدان و بەهێزکردنی هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و هێزەکانی ئاشتی لە دیسمبری ١٩٩٢دا سەرلەنوێ زیندووکرایەوە.

ئەم دەستتێوەردانە مرۆڤییانە بە باشی بەروپێشەوە چوو و یارمەتییە پێویستەکان گەیشتن و ئاشتی لەنێوان خێڵەکاندا بەرفراوان و تەنانەت پێشکەوتنگەلێکیش سەبارەت بە کۆنفرانسی ئاشتی نیشتیمانی بەدی هات. نەتەوە یەکگرتووەکان و بەتایبەتیش ولایەتە یەکگرتووەکان خۆیان بۆ بەهێزکردنی ئاشتی بەرپرسیار دانا، تا دواجار لەنێوان خێڵ و گرووپە دەستڕۆیەکان و ناوبژیوان سەبارەت بە قەبوولاندنی بڕیارەکان بە سەر پارتە گیرۆدەکان لەشەڕدا، ململانێ ڕوویدا. ولایەتە یەکگرتووەکان هەوڵی دەدا تا هێزە سەربازییەکانی سەر بە ژەنەڕاڵ محەممەد فەرەح عیدید کە وەك لەمپەرێکی سەرەکی لە بەردەم دانوساندنەکانی ئاشتی هەژمارکرا، لە دانوساندنەکاندا دووربخات و پەراوێزی بکات. کاتێك کە ٢٣ کەس لە هێزەکانی ئاشتی پارێزی پاکستانی بۆ چەك داماڵینی شۆڕشگێڕانی وەفادار بە عیدید کوژران، نەتەوە یەکگرتووەکان هەوڵی دا عیدید دەستگیر بکات. چەندین مانگ ئۆپڕاسیۆنی گورزوەشێن و خۆکوژانە دژی هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەنجامدرا و هێزی تایبەتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە فڕۆکە بەسەر ئاسمانی مۆگادیشۆدا دەسوڕانەوە و ڕۆڵی گەورەیان لە مردنی خەڵکی ئەم شارەدا هەبووە. لە ئەنجامدا نەتەوە یەکگرتووەکان ڕۆڵی بێلایەنەیی لەم شەڕەدا، لە دەستدا لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٩٣دا کاتێك کە هێزە ئاشتیپارێزەکان بەدوای سەربازانی لایەنگری عیدید دەگەڕان فڕۆکەیەکی ولایەتە یەکگرتووەکان کەوتە خوارەوە، (بۆیە) گشت پرسەکان گۆڕدران. لەم ڕووداوەدا ١٨ کۆماندۆسی ولایەتە یەکگرتووەکان کوژران (لەگەڵ ٣٠٠



سۆماڵی). وێنەکانی جەنازەی سەربازانی ولایەتە یەکگرتووەکان لە شەقامەکانی مۆگادیشودا، لە تەلەفزیۆن نمایشکران کە بۆ رای گشتی ولایەتە یەکگرتووەکان زۆر قورس بوو.

لە ئەنجامدا مەیلی ولایەتە یەکگرتووەکان بۆ ((بەهێزکردنی هێزە ئاشتیپارێزەکان و یارمەتییە مرۆڤییەکان)) کەم بووە و هێزەکانی ئەم وڵاتە هەر وەك زۆربەی نێردراوەکان و هێزەکانی ئاشتیپارێزی نەتەوە یەکگرتووەکان تا مارسی ١٩٩٤ لەم وڵاتە کشانەوە.

پاش دەیە یەك، هەنوکەش سۆماڵی خاوەن حکومەتێکی ناوەندی نییە و حکومەتی ناوەندی شکستی هێناوە و هیچ حکومەتێك لە توانایدا نییە سەرلەنوێ مەشروعییەتی ناوخۆ (لەنێوان گشت سۆماڵییەکان) و مەشروعییەتی دەرەکی (بەدەستهێنانی پشتگیری نێودەوڵەتی) بنیات بنێتەوە. چاوەڕوان دەکرا کە حکومەت لە ژێر کۆنترۆڵی شەرڤانان و فەرماندە سوپاییەکانی خێڵەکاندا بێ، بەم پێیەش وڵات بەبێ دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بەڕێوە دەبرێ. سەرەڕای ئەمەش لە باکووردا یەکێتی خێڵەکان هەوڵ دەدات بۆ زیندووکردنەوەی دەوڵەت، بە ناوی دەوڵەتی جیاخوازانی کۆماری سۆماڵی (سۆماڵی لەند ناوچەیەکە لە ژێر کۆلۆنیالکاری بەریتانیادا بوو). ئەگەرچی پێویستە ئاماژە بدرێ کە ئەم دەوڵەتەش پشتیوانی دەرەکی نییە و کۆمەڵگای نێودەوڵەتیش هەوڵ دەدات کە ئەو ناوچەیە کە بە سۆماڵی ناودەبرێ، و تەنانەت خاوەن سەرۆك و دامەزراوەی جێبەجێکردنش نەبێ، بەفەرمی بناسێنێت. (لە ئەنجامی ڕێککەوتنەکانی کێنیا لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٤ دا، زەمینەی دامەزراندنی دەوڵەتی کاتی (موقت) ناوەندی لەم وڵاتەدا فەراهەم کراوە، بەڵام بە هۆی گرفتەکانی نەتوانرا ئەم وڵاتە سەقامگیربێت. لە سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٦ گرووپی مەحاکمی ئیسلامی زۆربەی خاکی ئەم وڵاتەیان کونترۆڵ کرد. بەڵام لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٦ دەوڵەتی کاتی بە هاوکاری هێزەکانی سوپای ئەسوپیا، هێزەکانی مەحاکمی ئیسلامی بەرەو سنوورەکانی باشوور کشانەوە و ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش بەبیانووی شەڕ دژی تیرۆریزم و ڕێکخراوی ئەلقاعیدە پێگەی ئەم گرووپەی لە باشووری وڵاتدا (لە ناوچەکانی نزیك سنووری کێنیا) بۆردوومان کرد و دوای ماوەیەك دەوڵەت لە مۆگادیشۆ سەقامگیر کرا، ئەگەرچی ئاسۆی ئەم وڵاتە تارماوییە).

**سۆماڵی:**

| | |
|---|---|
| رووبەر | ٦٣٧/٦٣٥ کیلۆمەتری چوار گۆشە |
| دانیشتوان | ٩/٥ ملیۆن کەس |
| هێزی کۆلۆنیالکار | بەریتانیا و ئیتاڵیا |
| ساڵی سەربەخۆیی | ١٩٦٠ |
| شارە گەورەکان | مۆگادیشۆ (پایتەخت) . هاوجیبیا، کیسمایۆ |
| نەژاد | سۆماڵی |
| رێژەی مردن | ١١٧ لە دایکبوون لە هەر ١٠٠٠ کەس |
| ئایین | ئیسلام |
| زمان | سۆماڵی، ئنگلیزی، ئیتاڵی |
| دانیشتوانی شار | ٢٦/٨ |
| ناوەندی ژیان | ٤٨/٥ ساڵ |
| رێژەی خوێندەواری | ٢٤/١ |
| دراو | شلینگی سۆماڵی |
| هەناردەکان | مۆز، ئاژەڵی زیندوو، گوشت |

## زاراوە سەرەکییەکان:

**ناوچەی پـارێزراو:** زاراوەیـەکی بـەکارهێنراو کـە بـە مەبەسـتی رەوانـەکردنی بـەرفراوانی دیپلۆماتکارە فەرەنسییەکان بۆ چالاکی ئابووری و سەربازی لە وڵاتانی فرانکوفۆندا لە ئەفریقیا بەکاردەهێنرێت.

**لەمپەرنانەوە دژی دەستڕۆیی کۆمۆنیزم:** ئامـانجی سـەرەکی سیاسـەتی دەرەوەی ویلایەتـە یەکگرتووەکان بە درێژایی شەڕی سارد، کە بە مەبەستی بەرتەسك کردنی دەرفەتەکان لەبەردەم پەرەسەندنی جیهانی کۆمۆنیزم ئەنجامدرا.

**دەستتێوەردانی مرۆیی:** چالاکی دیپلۆماتیکی و سەربازی باو لە نەوەدەکاندا کـە مـومکین بوو ببێتە هۆی بەزاندنی سەروەری دەوڵەت بە بیانووی پشتگیری کردن لە مافی مرۆڤـ.

فرانکۆفۆن: وڵاتە فەرەنسی زمانەکان.

**دەستتێوەرنەدان لە یاسـاکانی نـاوخۆیی:** رێزگـرتن لـە سـەروەری دەوڵـەتی یاسـایی کـە ئەنجامیدا هیچ دەوڵەتێك مافی دەستتێوەردان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتێکیتری نییە.



**بارودۆخی سیاسی مەرجدار:** داواکاری بۆ حکومـەتی ویـستراو (حکومـەت مطلـوب) کـە تیایدا پێویستە حکومەتەکان بۆ بەدەستهێنانی یارمەتی، ئەم مەرجانە جێبەجێ بکەن.

**شـەڕی نوێنەرایـەتی:** ململانێیـەکی نـاوخۆیی کـە بـووە بـە نێودەوڵـەتی و تیایـدا بەرژەوەندییەکانی وڵات بـە هـۆی ململانێـی زلهێزەکـان لـەناو دەچـێت و جێگـەی بەرژەوەنـد زلهێزەکان دەگرێتەوە.

**نیمچە دەوڵەت:** دەوڵەتێکی تەواو لاواز کە نەتوانی سـەروەری وڵاتەکـەی بپـارێزێ، بـەڵام هێشتاش لە رێگەی سیستەمی نێودەوڵەتییەوە سەروەری وڵاتان، دانیپێدا دەنرێت.

## پرسیارەکان: سەروەری باڵای سیاسی لە وڵاتێکدا

١- ئایا وڵاتانی ئەفریقیا سوودیان لە بارودۆخی سیاسی شەڕی سارد بینی؟

٢- هاوپەیمانە دەرەکییەکان تا چ ئاستێك سیاسەتەکانیان هەمبەر ئەفریقیا گۆڕی؟

٣- ئایا دەتوانرێ سیستەمی نوێی جیهانی وەك پێشکەوتنێك بۆ ئەفریقیا وەسف بکرێ؟

٤- ئایا دەستتێوەردانی بەرژەوەندییە دەرەکییەکان، گەرەنتیکـەری دەسـەڵانی دەوڵـەتانی ئەفریقیای لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالە؟

٥- ئایا بەرژەوەندی دەرەکی دەبێتە هۆی شکاندنی سەروەری دەوڵەت ؟

**بۆ خوێندنی زۆرتر:**

بۆ هەڵسەنگاندنی پێگەی ئەفریقیا لە سیستەمی سیاسـیدا بڕواننـە پـەرتووکی کریـستۆفر کلافهام. وردبوونەوە و روانینە بێ لایەنەکەی بۆ پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان لـە ئـەفریقیادا بەهای پەرتووکی لە رووی ئەدەبییەوە زۆرتر کردووە.

بابەتەکانی گروم ئۆلسۆن سەبارەت بە فاکتەر و رۆڵی ئەفریقییەکان، گـی مـاترین و تـۆنی شافر سەبارەت بە رۆڵی فەرەنـسا و ئێـف ئۆگبواجـا ئۆهـایی ئـەگبلام سـەبارەت بـە ولایەتـە یەکگرتووەکان سەرنجڕاکێشن.

لە زاراوە ئابوورییەکاندا ئەم راستییە بوونی هەیە کە هیچ رێگەیەك بۆ ئەم واقیعییەتە کە ئەفریقیا هەژارە بوونی نییە. لە دوو دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم بەشێك لەم کیشوەرە بەتایبەتیش ئەفریقیای باشووری بیابان (صحرا) بە خاڵی شکستی ئابووری نزیك بووەتەوە، بۆ نموونە، ئەم کیشوەرە سەبارەت بە بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی بە ئاشکرا سامانێکی کەمتری بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانیتری جیهاندا بەرهەم هێناوە (بڕواننە خشتەی ژمارە ١- ٩). لە ساڵی ١٩٩٥دا سالآنەی بەرهەمهێنانی ناپوختەی نیشتمانی ئەفریقیای باشووری بیاوان، ٥٠ بەرامبەر کەمتر لە ولاتانی رۆژئاوایی بوو، ئەمەش بەو مانایەیە کە بۆ نموونە، لە کاتێکدا کە تێکڕای ئابووری ولاتانی ئەفریقیای وەك موریتانی تەنیا ٤٦٠ دۆلار بۆ هەر تاکێکە لە ولایەتە یەکگرتووەکان ٢٦\٩٨٠ بۆ هەر تاکەکەسێکە. لە موزامبیك هەژارترین ولاتی ئەفریقیا بارودۆخ خراپتر بوو. ئەم ولاتە ناچار بوو کە بە بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی کەمتر لە هەشتا دۆلار بگوزەرێنێت.

هێماکانی (مۆشرات) مایکرو ئابووری وەك بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی لە روونکردنەوەی هەژاری لە ئەفریقیادا سەرکەوتوو نەبوون کاتێك کە لە ولاتێکدا گەشەی ئابووری کەمتر لە گەشەی دانیشتوان بێ، هەژاری شتێکی حاشا هەڵنەگرە توێژینەوەیەکی ورد لە ئاماری کۆمەلایەتی ئەم بارودۆخە روون دەکاتەوە بۆ نموونە لە دەیەی ١٩٩٠دا ئەفریقیاییەکانی خوارووی بیاوان، بە تێکڕا (معدل) لە سەرەتای دەیەی چوارەمی ژیانیان دەمردن لە لایەکیترەوە ئەوروپییەکانی و باکووری ئەفریقیا ئومێدیان بۆ ژیان تا ٧٠ ساڵی بەرز بووە و ئومێد بە ژیان لە ناو منالآنی ئەوروپا و رۆژئاوا دە جار زۆرتر لە ولاتانی ئەفریقیاییە تەنانەت لە روایەتەی سەرکەوتووەکانی ئەفریقیادا دوای کۆڵۆنیال بەراوردی تەندروستی و پەروەردە، جێی بووە لە ساڵی ١٩٩٥دا زۆرتر لە ٤٠٪ی ئەفریقییەکان نەخوێندەوار بوون (ژنان بەشی زۆرینەی ئەم توێژەیان پێك دێنا). ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لە رۆژئاوا خوێندەواری شتێکی بەڵگە نەویست بوو. هەروەها بارودۆخ بەرەو باشی نەڕویشت. لە هەندێ بەش لەم کیشوەرە ئومێد بە ژیان زۆر دابەزی کە بەگشتی دەرهاوێشتەی ئەپیدمی ئایدز بوو بۆ نموونە لە ساڵی ٢٠٠٢دا تێکڕای ئومێد بە ژیان لە بوستوان بۆ خوارووی ٤٠ ساڵ دابەزی کە ئەم بارودۆخە بۆ یەکەم جار پاش دەیەی ١٩٥٠دا روویدا و تێبینی دەکرێ کە ٤٠ ٪ی بە ساڵآچوانی ئەم ولاتە تووشی نەخۆشی (HAV) پۆزەتیف بوو بن. لە ئەفریقیای خوارووی بیاوان بە گشتی بەدرێژایی ساڵی ٢٠٠١، ٤\٣ ملیۆن کەس تووشی (HAV) ببوون و ٢\٣



ملیۆن کەس بە هۆی ئایدز گیانیان لە دەستدا، ئەفریقیا توانایی و سەرچاوەی پێویست بۆ چارەسەری ئەم جۆرە نەخۆشییەی نییە کاتێك کە پێویستە زۆربەی ئەو کەسانەی لە گەشەکردندا بەشدار بن تەمەنیان کورت دەبێتەوە گەشەی ئابووری زۆر خراپتر دەبێتەوە.

پێویستە وەبیر بهێنرێتەوە کە تەنیا ئایدز و (HAV) فاکتەری هەژاریی لە ئەفریقیادا نین، ئەم نەخۆشییە دەبێتە هۆی بە دواخستنی پێگەی ئابووری زیاد لەمەش ئەگەر ولاتانی ئەفریقیا خوازیاری دەوڵەمەند بوونن، پێویستە سەرچاوەی چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە ئەپیدمییە (گوازراو) دابین بکەن ئەم درزە بە خێرایی دوای سەربەخۆیی قووڵتر بووە و ئەفریقیا هەنوکەش خۆی بە هەژار دەزانێ ئەم ئامارانە پێویستە شیبکرێنەوە. چونکە چەندین دەیە لە سەربەخۆیی هێشتاش ئەفریقیا لە هەژاری ئابووریدا دەژیت؟ وەلآمدانەوەی ئەم پرسیارە، فاکتەرە ناوخۆیی — دەرەکییەکان لەخۆ دەگرێت. قوتابخانەی هزریی نیولیبڕاڵ مەیلی بۆ بە ناوخۆیی کردنی پرسەکان هەیە و بە گشتی گەندەڵی و نالێهاتوویی سیاسەتی گشتی ئەفریقیا لەم پرسەدا تاوانبار دەزانێت. گرووپێکیتر ئەم بیرۆکەیە رەت دەکەنەوە و بانگەشە دەکەن کە دەکرێ کێشەکانی ئەفریقیا بەووردی لە رێگەی ناوەرۆکی ئابووری نێودەولەتی روون بکرێتەوە ئەم پسپۆرانە گەشەنەسەندن کە لە سەردەمی پاش کۆڵۆنیال بەردەوامی هەبوو، هاوئاراستە لەگەڵ کۆڵۆنیال کردنی ئەفریقیا لەلایەن رۆژئاواوە لە رێگەی میکانیزمگەلی وەك ((مەرجگەلی بازرگانی)) و ((ئاڵوگۆڕی نایەکسان)) دەزانن.

هەردوو قوتابخانە روانگەی بە بەهایان سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی هەژاری لە ئەفریقیادا خستیانەڕوو بەم پێیەش پێویستە هەردوو لایەنی ئەم ململانێیە خوێندنەوەیان بۆ بکرێت ئەم بەشە تەنیا جەخت لەسەر فاکتەری دەرەکی گەشە نەسەندنی ئەفریقیا دەکاتەوە. (سنووردارێتییە ناوخۆییەکان لە بەشی داهاتوودا باس دەکرێت).

لەم رووەوە ئەم بەشە لە رووی پێکهاتەوە سەرەتا سەبارەت بەوەی کە چۆن هەندێ ولآتانی کەمتر گەشە سەندوو، خۆیان لەگەڵ سەردەمی دوای کۆڵۆنیال گونجاند؟ روون دەکرێتەوە هەروەهاش روون دەکرێتەوە کە چۆن هەندێ ولآت دوای سەربەخۆیی، وای بۆ دەچن کە رۆژئاوا حکومەتگەلی ئیمپریالیستی لەبری کۆڵۆنیالی سەرمایەداری نوێی جێگیر کردووە، دواتر لەم بەشەدا روانینێکی وردتر دەخەینە سەر پرسی قەیرانی قەرزەکان و بۆچی ولآتانی ئەفریقیا ئەم رێژە قورسە لە قەرزیان هەیە؟ باسی کۆتایی ئەم بەشە مێژووی نوێی ئابووری دوای کۆڵۆنیالی لەم کیشوەرەدا لە رێگەی چەمکی هەموار کردنی ستراکتۆری روون دەکاتەوە.

هەمواركردنی ستراكتۆری لە هەشتاكاندا لەلایەن ڕێكخراوە داراییە نێودەوڵەتییەكان وەك بانكی جیهانی و سەندوقی دراوی نێودەوڵەتی كاریگەری زۆری لەسەر پێكهاتنی سیاسەتی گشتی قەرزدارەكان هەبوو. لەبری ئەمەشدا وڵاتانی ئەفریقیا ناچار بوون فەرمانە قورسەكانی قەرزدەرەكان سەبارەت بە چونیەتی حكومەت پەیڕەوی بكەن، سەرپێچی لە فەرمانی دەرەكی دەبێتە هۆی ئیفلاس بوون و پرسی قەرزی مەرجدار (ئەم) پەرتووكە دەگەڕێنێتەوە بۆ پرسی سەروەری كە لە بەشی پێشتردا روونكرایەوە، ئەم جارە پرسەكە كەمێك جیاوازە چونكە لەم بەشەدا ورد بوونەوە لەسەر ئابوورە تا سەروەری سیاسی. بەڵام جارێكیتریش دەستتێوەردانی دەرەكی یارمەتی بە دیاركردنی رێڕەوی گەشەسەندن لە ئەفریقیادا كرد.

## بەرپرسیارێتی ئابووری نێودەوڵەتی:

هەروەك لە بەشی دووەمدا روون كرایەوە، میراتی كۆڵۆنیالی، ئەفریقیای بە گەشەنەسەندوویی لە ئابووری مودێڕنی نێودەوڵەتیدا بە جێ هێشت بە درێژایی ساڵانی كۆڵۆنیال پێشكەوتنی كەم لە هەندێ كەرتی تایبەت (كشتوكاڵ و كان) جێبەجێ كرا و بناغە و پایە سەرەكییەكان بنیاتنران و پشتگیری پێویستیان لێكرا. ئاستی گەشە بۆ ئەم چەشنە چالاكیگەلی ئابووری زۆر لە خوارەوە بوو بەڵام بە گشتی بەرژەوەندییە بەدەستكەوتووەكانی بۆ رۆژئاوا هەنارده دەكران لەبری ئەوەی كە لە كەرتە خۆجێییەكان سەرمایەگوزاری بكرێت. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی كە ئەفریقیا لە كاتی سەربەخۆییدا رووبەڕووی ئابوورێكی تەواو هەناردەیی (كاڵای خاو)، بناغەی پیشەسازی لاواز، دەست نەگەیشتن بە تەكنۆلۆژیا و دانیشتوانی خاوەن مەشق پێكراوی كەم لە بازرگانی مودێڕن، خزمەتگوزاری كۆمەڵایەتی و گشتی، ببێتەوە.

بە كورتی ئەوروپا، ئەفریقیای كەمتر گەشە سەندوو راگرت. هەروەك والتر رادنی ئاماژە دەكات: ((رێژەیەكی زۆری ئەفریقییەكان (بە هۆی) كێشەیەك بوون بە كۆڵۆن و بە كێشەیەكتر لێی هاتنە دەرەوەی بە هێنانە خوارەوەی ئاڵای وڵاتانی كۆڵۆنیالكار لە بۆنەی سەربەخۆییەكەیاندا، چەوسانەوەی ئابوورەكانی ئەفریقیا بە كۆتا نەهاتووە بڕیارە دەركراوەكان لە رۆژئاوا هێشتاش لە گەشەی ئەفریقیادا دەستڕۆیی فراوانی هەبوو، هەڵبەت قەوام نیكرومە یەكەمین سەرۆك كۆماری غەنا دەریدەبڕێ كە كۆڵۆنیال تەنیا بۆ شێوازی نوێی كۆڵۆنیالی نوێ گۆڕدراوە ئەو روونی دەكاتەوە كە ناوەڕۆكی كۆڵۆنیال ئەوە بوو كە دەوڵەت لە رووكەشدا خاوەن



سەربەخۆیی بێت و گشت هێماكانی سەروەری نێودەوڵەتی هەبێت بەڵام لە راستیدا سیستەمی ئابووری و سیاسی ئەم وڵاتە لە دەرەوە بەڕێوە دەبردرێ سەرەڕای ئەوەی كە هەنوكە كونترۆڵی فەرمی بە كۆتا هاتووە، ئەفریقیا ئێستاش بە دابەشكردنی كاری كۆڵۆنیال دەست بە یەغەیە.

یەكێك لە گرفتە ستراكتۆرییەكانی ئەم ئابوورە نێودەوڵەتییە، لەروانگەی ئەفریقییەكانەوە ((ئاڵوگۆڕی نایەكسان)) بوو حكومەتی كۆڵۆنیالی، زۆربەی دەوڵەتانی ئەفریقیای بە تایبەتمەندییەكانی تایبەت بە ئابووری ((تاك بەرهەمی)) بە جێ هێشت، كە زۆرتر یەك، دوو یان سێ بەرهەم، بەرهەم دێنن. بۆ نموونە ئابووری رواندا لە كاكاودا كورت دەكرایەوە و مالاویش زۆرتر تووتن و چای بەرهەم دێنا. (خشتەی ٢-٩) ئەم وڵاتانە هیچ سەرچاوەیەكیتریان لە چالاكی ئابووردا نەبوو كە لە رێگەیەوە داهاتی زیادەیان هەبێ یاخود ببێت بە شوێنگری (ئەم كاڵایە) كە لەكاتی دابەزینی بەرهەمهێناندا یان دابەزینی نرخی كاڵا لە بازاڕەكاندا، شوێنی بگرێتەوە. بابەتیتر ئەوەیەكە داواكارییەكی كەمی ناوخۆیی بۆ بازرگانی وەك چا و قاوە لەم كیشوەردا هەیە و گشت ئەم بەرهەمە دەبوایا هەنارده بكرابا بەم پێیەش، ئەفریقیا بۆ فرۆشتنی بەرهەمەكانی پشتبەستراو بە رۆژئاوایە.

ئەم بابەتەش فرۆشەرە رۆژئاواییەكان لە بارودۆخێكی باشدا جێگیر دەكات ئەوان لە بارودۆخێكی ((بازاڕی داخراودا)) كاردەكەن و لەم بارودۆخە بۆ داشكاندنی نرخەكان سوود وەردەگرن، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٨٨دا كۆمپانیای فرەڕەگەزی (ساك دن)ی فەڕەنسی گشت بەرهەمی كاكاوی كەناری عاجی كڕیی سەرەڕای ئەمەش گشت بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی كەناری عاج پشتبەستراو بە فرۆشتنی ئەم بەرهەمە بوو و كومپانیاگەلی جێگرەوەی كەم بۆ فرۆشتنی ئەم كاڵایە بوونیان هەبوو و كومپانیای ساك دن هەوڵی دەدا كە ئەم بەرهەمە بە كەمترین نرخ بكرێت، ئەم نموونەیە بە تێگەیشتنی ئەم بابەتە كە بۆ چی رێژەی هەناردەی ئەفریقیا تا ٢٠٪ لەنێوان ساڵانی ٩٨٥و١٩٩٠دا دابەزی، یارمەتی دەدات، (خشتەی ٣-٩) و ئەمەش راستییەك بوو كە گرفتی دەست پێنەگەیشتن بە سەرمایەی تایبەتی لەم وڵاتەدا قورستر دەكات.

ئەم ستراكتۆرە نایەكسانە بەو مانایە بوو كە كیشوەری ئەفریقیا ناچار بوو كە كاڵا پیشەسازییە نرخ بەرزەكانی رۆژئاوا بە دەرامەتی بەدەست هاتوو لە هەناردەكردنی كاڵا سەرەتایی و خاوە ئەرزان نرخەكان، بكرێت لە راستیدا ئەفریقییەكان ناچار بوون بە دووبارە كڕینەوەی كەرەستە خاوەكانیان كە بە پیشەیی كرا بوون بە نرخێكی گران بكڕن. بەپێی راپۆرتی

نەتەوە یەکگرتووەکان ٨٥ ٪ بەهای کالاّ پیشەسازییەکان لە رۆژئاوادا دەماوە و تەنیا ١٥٪ لەم سەرمایەیە بۆ وڵاتانی خاوەن کەرەستەی خاو دەگەڕایەوە، زیاد لەمەش بە تێپەڕ بوونی کات نرخی کالاّ سەرەتاییەکان دادەبەزی لە کاتێکدا کە نرخی هاوەردەکردنی بەرهەمە پیشەسازییەکان بەرز دەبووە لە ئەنجامدا بازرگانی رۆژئاوا پەرەدەسێنی و بەمەش بازرگاینی وڵاتانی لە دۆخی گەشە کردندا کەم دەبێتەوە.

هەنوکەش ئەفریقیا دەتوانیٚ ئابوور و پرۆسەی بەرهەمهێنانی کەرەستەی خاو هەمەجۆر بکات، ئەگەرچی ئەمەش کارێکی سەختە بەڵام نامومکین نییە. وڵاتانی پلنگەکانی ئاسیا لە سەردەمی سەربەخۆییەوە، پێشکەوتنی زۆریان لە ئابووردا هەبووە فرە جۆری (تنوع) ئابوور لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالدا دەستی پێکردووە و سامان زۆر بووە (بۆ بەراورد کردنی هێلکارییانەی ئەفریقیای خوارووی بیاوان و رۆژهەلاّتی ئاسیا بڕواننە خشتەی ٣-٩). کاتێك کە کارکردنی لاوازی ئابوور لە ئەفریقیادا روون دەکەینەوە وەها دێتە بەرچاو کە فاکتەرگەلی جۆراوجۆر (ناوخۆیی و دەرەکی)، ئاڵوگۆڕی نایەکسان کاریگەرییان بەسەر گەشەکردن یان گەشەنەکردندا هەیە.

## قەیرانی قەرزەکانی ئەفریقیا:

وڵاتانی ئەفریقیا قوربانی بیٚ ئیرادەی، ئاڵوگۆڕی نایەکسان نەبوونە. سەربەخۆیی تا رادەیەك بەم وڵاتانە دەسەلاّتی سیاسی بەخشی و هەوڵیاندا کە جۆراوجۆری بە ئابوورەکەیان بدەن و وابەستەی (التبعیە) کێشە خولقێنەری ئەم کیشوەرە لە سەر هەناردەکردنی کالاّ سەرەتاییەکان کۆتایی پیٚ بهێنن، هەر دەوڵەتێك پلانی گەشەکردنەکەی دارێشت و هەوڵی دا بە پێی توانا لە دەست میراتی کۆلۆنیال رزگار بیٚ، بۆ نموونە زۆربەری وڵاتەکان سیاسەتی جێگرەوەی هاوردەکانی گرتەبەر ئەوان هەوڵیان دەدا کە پلانەپیشەسازییەکان بۆ بەرهەمهێنانی کالاّگەلێك کە پێشتر لە رۆژئاوا هاوردە دەکرا جێبەجیٚ بکەن. وڵاتانی ئەفریقیا بەرێژەیەکی بەرفراوان لە کەرتە ژێر خانەکاندا (رێگاوبان و وێستگەکانی وزە) و سەرچاوەی مرۆیی (تەندروستی و پەروەردە) سەرمایەگوزارییان کرد گەشەکردن پێویستی بە سەرمایەی تایبەتی هەیە و چونکە زیادە ئابوورییەکی کەم لە ئەفریقیادا بەرهەم دەهێنرێت حکومەتەکان بە مەبەستی بەهێزکردنی ئابوورەکەیان بڕیاریان دا قەرز لە رۆژئاوا وەربگرن، تا دەیەی نەوەد ئەفریقیا بە هۆی قەرزداری، بەرەو رووخان چوو، لە بیست ساڵە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٤ کۆی گشتی قەرزی وڵاتانی ئەفریقیا لە ١٥٪ بۆ ٩٠٪ بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی زیادی کرد و سوودی



ئەم قەرزانە کاریگەری وێرانکەری بەسەر ئابووری ئەفریقیادا هەبووە. گەڕاندنەوەی (سوودی) ٢٢١ ملیار دۆلار قەرزی گشت ئەم کیشوەرە، ٢١ ٪ کۆی هەناردەی ئەم کیشوەرە لە ساڵێکدایە و ئەمەش لە کاتێکدایە کە رێژەیەکی زۆری سەرمایە لەم کیشوەرەدا دەچێتە دەرەوە و ئەمەش کاریگەری (نێگەتیڤی) بۆ گەشەکردن هەیە.

بەڵام چۆن ئەم کیشوەرە بەرەو بارودۆخی ئابوورێکی زیان پێکەوتووە کێشراوە؟ بۆ چی تا ئەم رادەیە قەرزاری رۆژئاوا بوو؟ وەلاّمی ئەم پرسیارانە پەیوەستە بە چەندین فاکتەرەوە لە رووی دەرەکییەوە، بەرهەمهێنانی بەرهەمی بازرگانی ئەم کیشوەرە دابەزی و نرخی نەوت لە حەفتاکان و نرخی سووی قەرزەکان لە سەرەتای هەشتاکاندا هەڵ بەزی لە رووی ناوخۆییەوە حکومەتەکانی ئەفریقیا سەرمایەی تایبەت (خصوصی)یان قەرز کرد و وەها بۆچوون کە دەتوانن بە فرۆشتنی کالاّی سەرەتایی، لە داهاتوودا ئەم قەرزە بدەنەوە لە ئەنجامدا بەرهەم و دەستکەوتەکانی کانەکان (معادن)یان بۆ هێنانەدی پرۆسەی گەشەپێدانی ئەفریقیا، وەك بارمتەیان دانا. ئەگەرچی هیچ ئومێدێك بە رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بۆ کەمکردنەوەی نرخەکان نەبوو (بڕواننە خشتەی ٣-٩). غەنا لەم بارەوە نموونەیەکی باشە، داهاتی ئەم وڵاتە لە هەناردەکردنی کاکاو لە ساڵی ١٩٨١دا تەنیا بە ١/٤ رێژەی ساڵی ٧٤- ١٩٧٣ دابەزی، دوای یەك دەیە نرخی کاکاو بۆ نیوە دابەزی بەمجۆرەش ئابووری تاك بەرهەمی هیچ سەرچاوەیەکیتری جێگرەوەی نییە. دابەزینی نرخی کالاّکان گەڕاندنەوەی سوودی (قەرزەکانی) سەخت کرد. وڵاتانی ئەفریقیا کە بەرهەمهێنەری نەوت نین کێشەی زورتریان هەیە.

لە ساڵی ١٩٧٣دا و دواتر لە حەفتاکان رێکخراوی وڵاتانی هەناردەکردنی نەوت (ئوپێك) نرخی نەوتی تا ئاستێکی بەرز زۆرکرد و شۆکی ئابووری گشت جیهانی گرتەوە، رۆژئاوا تووشی هەڵئاوسان بووە بەڵام ئەفریقیا زۆرتر نزیك لێواری هەرەس هێنان بووە، ئەفریقیا تەنیا ١٪ بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی بۆ هاوردەکردنی نەوت لە ساڵی ١٩٧٠دا تەرخان کردبوو. دوای دە ساڵ ئەم ژمارەیە بە ٦٪ گەیشت بە واتایەکتر کاتێك کە لە شێستەکاندا ئەفریقیا بە یەك تەن شەکر دەیتوانی ٦/٣ تەن نەوت بکڕیٚ، لە ساڵی ١٩٨٢دا ئەم رێژە شەکرە تەنیا بە ٧٪ تەن نەوت ئاڵوگۆڕدەکرا. ئەنجامی ئەم پەیوەندییە بازرگانییەدا وڵاتانی ئەفریقیا زۆرتر گێرودە کێشەکان بوونەوە، هەڵبەزودابەزینی نرخی نەوتی ئۆپێك رەنگدانەوەی زۆرتری هەبوو، وڵاتانی دەوڵەمەندو بەرهەمهێنەر رێژەیەکی زۆری سامانەکەیان لە سیستەمی بانکی رۆژئاوادا سەرمایەگوزاری کرد و بەمجۆرەش سەرمایەکی زۆری دۆلاری نەوتیان بەدەست هێنا و دواتر

قەرز بە سوودی کەمیان بە وڵاتانی ئەفریقیا بەخشی بە بەرزبوونەوەی نرخی نەوت وڵاتانی ئەفریقیای بەخۆشییەوە ئەم قەرزانەیان پەسەند کرد، دووەمین شۆکی نەوتی لە ساڵی ١٩٧٩دا هاوکات بە کەم هاتنەوەی بودجەی وڵایەتە یەکگرتووەکان بوو کە لە ئەنجامیدا سوودی (قەرزەکان) بەرز بووە، ئەو شتەی کە بوو بە هۆی راکیش کردنی قەرزەکان هەنوکە بووە بە بەرپرسیارێتییەکی قورس بۆ وڵاتانی ئەفریقیا، فاکتەری دەرەکی، نەتەنیا لە پێکهاتەی ئەفریقیادا بەشدار نەبووە بەڵکو بوو بە هۆی راکێشانی ئەم کیشوەرە بەرەو قەیرانی قەرزداری هەڵقولاو لە قەرزەکانی حەفتاکان و هەشتاکان و تا دواتریش. زامبیا یەکێك لەو وڵاتانەیە کە رووبەڕووی قەیرانی ئابووری بووتەوە دوای نەهێشتنی کۆلۆنیال لە ساڵی ١٩٦٤دا، ئابووری وڵات تارادەیەك باش بوو لە هەشت ساڵی یەکەم بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی بە تێکڕا ٢/٤ گەشەی هەبوو، دەوڵەت ئەم داهاتەی بۆ سەرمایەگوزای لە کەرتە مرۆییەکان و دەوڵەتی خۆشگوزرانی بەکار هێنا، پەروەردە و تەندروستی بەخێرایی پەرەی سەند و هەژاری لە ڕێگەی سوبسیدی دەوڵەتە و کونترۆڵ کرا. ستراتیژی جێگرتنەوەی هاوردەکان بە سەرکەوتوانە جێبەجێ کرا و کەرتی پیشەسازی هەر ساڵ ٩/٨ گەشەی کرد.

لە ساڵی ١٩٧٣دا، زامبیا وەك یەکێك لە هاوردەکارانی بەرهەمی سوتەمەنی رووبەڕووی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت لەلایەن ئۆپێك بووە و ئەم پرسەش هاوکات بوو بە دابەزینی نرخی مس لە بازارەکانی نێودەوڵەتیدا و مس بەرهەمی زامبیا بوو، لە رابردوودا مس و کباڵت نزیکەی ٩٧٪ هەناردەی زامبیای پێك دێنا و ٥٨٪ لە داهاتی حکومەت لە هەناردەکردنی ئەم کەرەستانەدا بوو و ئەم وڵاتە هیچ جۆرە چالاکییەکی ئابووری جێگرەوەی کە پیشیوانی ئابوورەکەی بێت نەیبوو، زامبیا ناچار بوو لە رۆژئاوا داوای قەرز بکات، قەرزی وڵات زۆرتر لە هەر کاتێکیتر زۆری کرد و لە ساڵی ٩٩٤دا زامبیا ٥/٢٠٧ ملیۆن دۆلار قەرزی وەرگرت کە نزیکەی ١٦١٪ بەرهەمی ناپوختەی وڵات بوو. دەرچوونی سەرمایە بە هۆی دانەوەی ئەم قەرزانە بەرزبووە و خزمەتگوزاری خۆشگوزەرانی تا ئاستێکی زۆر دابەزی.

سوزان جۆرج دەپرسێ چ لۆژیکێك بۆ لە ناو چوونی گشت ئەم کیشوەرە هەیە؟ ئەفریقیا بە گشت ئەگەرەکانییەوە هیچ کاتێك ناتوانێ قەرزە کەڵەکە بووەکانی بداتەوە و لە ئەنجامدا رێژەیەکی فراوانی سەرمایەی ئەم کیشوەرە بە هۆی قەیرانی قەرزداری چووە دەرەوە و کاریگەری کەمی لەسەر کەمکردنەوەی گشت قەرزەکانی هەبوو. هەرچی زۆرتر رۆژئاوا داوای قەرزەکانی دەکرد بە هەمان ئەندازە ئەفریقیا چانسی کەمتری بۆ گەشەکردن و بووژانەوەی



داهات بۆ دانەوەی قەرزەکانی هەبوو لەم کاتەدا گەلیشی گیانیان لە دەست دەدا. بۆ نموونە سەندوقی نێودەوڵەتی منالان (یونیسف) رایگەیاند قەیرانی قەرزداری دبێتە هۆی ئەوەی کە نیو ملیۆن منال لە هەر ساڵ بمرن، پێویستە ئەفریقیا سەرەتایەکی نوێتر دەست پێ بکات ئەمەش دەکرێ بە زیانی کەم یاخود بە هیچ زیانێك بۆ ئابووری رۆژئاوا ئەنجام بدرێت، رێژەی راستەقینەی قەرزەکانی ئەفریقیا لە ئابووری جیهاندا کەمە زیاد لەمەش زۆرتر لە ٨٠٪ی ئەم قەرزانە هی دامەزراوە گشتییەکانن (دەوڵەتانی رۆژئاوای بانکی جیهانی و سەندوقی نێودەوڵەتی دراو) بەمجۆرەش نەدانەوەی ئەم قەرزانە بە زیانی هیچ کۆمپانیایەکی نییە. هەروەك جۆرج کۆمنتس ئاماژەی بۆ دەکات ((قەرزەکانی ئەفریقیا هێندە کەمن کە تەنیا ئەفریقییەکان نەبێ هەرەشە لە هیچ کەس ناکات. تەنانەت لە کردارێکی چاوەڕوان نەکراودا، ٤٣ وڵاتی ئەفریقیای خوارووی بیاوان لە ناکاو دانەوەی قەرزەکانیان وەستاند. لە ئەنجامدا سیستەمی دارایی جیهان گۆڕانی بە سەر هات. لە کاتێکدا کە شاشەکانی کۆمپیوتەر بە دەگمەن وەستانی (ئابوورییان) تۆمار کرد)) بە خستنەڕووی ئەم راستییە وڵاتانی رۆژئاوا لە نەوەدەکاندا سەبارەت بە نەهێشتنی قەرزەکانی ئەفریقیا بە جیددی گفتوگۆیان کرد، بەڵام ئەم رێککەوتنە نێودەوڵەتییە تارماویی بوو لەم میانەیدا هەر کەسێك دەیتوانی گۆی بیست بێ کە ئەفریقیا لە نەخشەی (جیهاندا) رەش دەبێتەوە.

## سەردەمی هەموارکردنی ستراکتۆری:

بە رووخان و شکستی ئابووری ئەفریقیا بە هۆی قەرزدارییەوە دەبوایا کارێك بکرێت وڵاتانی ئەم کیشوەرە هاتنەسەری سوود بۆ دانەوەی قەرزە پێشوویەکانی بە گرفت دەزانی. لە زۆرێك لە بابەتەکاندا سەندوقی نێودەوڵەتی دراو و بانکی جیهانی تەنیا سەرچاوەی قەرزدان بوون بەم هۆیەشەوە دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکان، بەرنامەی هەموار کردنی ستراکتۆریان پێشکەش کرد، پلانەکانی هەموارکردنی ستراکتۆری، پلانی مەرجدار بوو کە لەبری وەرگرتنی قەرزی زۆرتر قەرزوەرگرەکان دەبوایا سیاسەتی ئابوورەکەیان بگۆڕن و دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکانیش پێویستیان بە ئازادی ئابووری وڵاتانی ئەفریقیایی بوو تا ڕێگەی ئەم وڵاتانە بۆ سەرمایەی تایبەتی (خصوصی) نێودەوڵەتی و ناوخۆیی بکەنەوە لە کاتێکدا کە رۆڵی دەوڵەتیش کەم دەبێتەوە حکومەتەکانی ئەفریقیا بژاردنی (خیار) بەرتەسکیان هەبوو و ناچار بوون پلانی هەموارکردنی ستراکتۆری جێبەجێ بکەن چونکە هیچ سەرچاوەیەکی جێگرەوەیان بۆ سەرمایەی بە دەست هێنانی سەرمایەیان نەبوو.

کێنیا، مالاوی و موریس یەکەمین وڵات بوون کە چاکسازی هەموارکردنی ستراکتۆریان لە سەرەتاکانی هەشتاکاندا جێبەجێ کرد و تا ناوەڕاستی نەوەدەکان گشت وڵاتانیتر ئەم ڕێڕەوەیان پەیڕەوی کرد. تەنانەت وڵاتە بەرهەڵست و دژەکانی ئەم پلانە وەك زامبیا و تانزانیا کە خودی خۆیان هەوڵیاندا ستراتیژییەکانی گەشەی کۆمەڵایەتی درێژە بدەن، لەم ڕێککەوتنەدا ناچار بوون ئەم پلانە جێبەجێ بکەن سەرەڕای نەبوونی بارودۆخی گشتی لە ئەفریقیادا بۆ هەموارکردنی ستراکتۆری، دامەزراوە داراییەکانی ڕۆژئاوا بناغەی سیاسەتە گشتییەکانی ئەم کیشوەرەیان سەرکردایەتی دەکرد. دوای سەربەخۆیی حکومەتەکانی ئەفریقیا ستراتیژییەکانی گەشەی بەردەوامیان بە کار هێنا، حکومەتەکان لەگەڵ بەشە بچووکەکانی کەرتی تایبەت بڕیاریاندا کە بۆ بەرەو پێشەوە بردنی پرۆسەی گەشەکردنی پێویستە دامەزراوەی گشتی بنیات بنرێن، ئەگەرچی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆری سەرقاڵی لەناوبردنی پلانی گەشەپێدانی ئەم وڵاتانە بوو، کاربەدەستانی دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکان هەوڵیان دەدا بۆ ناساندنی بازاڕی ئازاد لە ئەفریقیادا (لەم کاتەدا پەیڕەویان لە چاکسازییەکانی نیو لیبڕاڵ لە ڕۆژئاوادا دەکرد) ئەم کاربەدەستانە بە تۆمەتبار کردنی کارکردی لاوازی حکومەتەکانی پێشووی ئەفریقیا بە هۆی ناکارامەی ستراتیژییەکانی گەشەی دەوڵەتی بڕیاریاندا کە پێویستە ئەفریقیا ڕێبازەکەی بگۆڕێت و بازاڕ نەك دەوڵەت دیارکەری نموونەی پلانی ئابووری ئەفریقیا بێت هەر پلانێکی هەموارکردنی ستراکتۆری، بەپێی (ستراکتۆری) وڵاتێکی تایبەت داڕێژرا بوو. بەڵام سێ تەوەری جیهانی لە چەقی گشت پلانەکاندا بوون ئەم تەوەرانە بریتی بوون لە:

١- پێویستە ستراتیژییەکانی گەشەپێدان لە سەر بنەمای بەرهەمهێنانی بەرهەمی کشتوکاڵی بێت.

٢- پێویستە بازرگانی و سیاسەتەکانی نرخی ڕاستەقینە جێبەجێ بکرێت.

٣- پێویستە کەرتی زۆرتر چالاك بێت.

چونکە پلانەکان کاریگەرییان بەسەر سیاسەتەکانی ئەفریقیا لە هەشتاکان و نەوەدەکاندا هەبوو، خوێندنەوەی ئەم سێ مەرجە بە وردەکارییە و شایانی گرنگی پێدانە وردبوونەوەی (ترکیز) سەرەکی دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکان ئەوە بوو کە سیاسەتەکانی گەشەپێدانی ئەم کیشوەرە پێش هەشتاکان بوو بە هۆی مەیل پەیدا کردنێکی بەرچاوی بناغەکانی شار (لەم کیشوەرەدا) سەرەڕای ئەوەی کە ناوچە گوندییەکان سەرەکیترین کەرتی بەرهەمهێنەری ئابوور بوون و ڕێژەیەکی زۆری ئەفریقییەکان بۆ گوزەرانی ژیانیان پشتیان بەم کەرتە دەبەست بەڵام



کەرتی شار بوو کە لە زۆرترین سوودی بەدەست هاتوو لە تەرخان کردنی سەرچاوەی گشتی بەهەرەمەند بوو بە جیددییانە لەلایەن وڵاتەوە سەرمایە ڕاکێش دەکرا تا لە چالاکییەکانی شار و ژیانی شارنشینی دا وەك سلفە خەرج بکرێت، بۆ نموونە دەوڵەت بەسەر بازاڕی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان زاڵ بوو و بە هۆشیارییەوە بەرهەمی جووتیارانی بە نرخێکی کەم دەکڕییەوە، بەم پێیەش ئەوان (دەوڵەتەکان) لە جیاوازی نێوان نرخی کەم و داهاتی بەدەستکەوتوو لە بەرهەمەکانیان پاش فرۆشیان لە بازاڕی جیهانیدا، بۆ بەهێزکردنی سەرمایەی شار، بەکاریان دێنا.

بە هاوردەکردنی پیشەسازییە جێگرەکان، مۆلکەکانیتری دەوڵەتی (بە کۆمپانیا دەوڵەتییەکان ناو دەبردرێن) و بۆروکراسی هەڵئاوساو، لەم سەرمایەگوزارییەی دەوڵەت سوودمەند دەبوون. بۆروکراتەکان، کرێکارە پیشەسازییەکان، بازرگان و سیاسەتمەداران (لە ڕاستیدا بەهێزترین گرووپی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای ئەفریقیا) هەوڵ دەدەن تا لەم بارودۆخە قۆرغ کراوە بۆ گەرەنتی کردنی مانەوەیان سوود وەرگرن.

لە ئەنجامدا ناوچە گوندییەکان لەم میتۆدە زیانمەند بوون ئەگەرچی کارکردی بەرهەمهێنانی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالدا خراپ بوو بەرهەمی جووتیاران بە نرخی کەم دەکڕدرا، بەم جۆرەش ئەوان پاڵنەری کەمیان بۆ بەرزکردنەوەی بەرهەمهێنانیان هەیە لە کۆتادا ئەم بارودۆخە بوو بە هۆی هاوردەکردنی خۆراك، لەبری ئەوەی کە ببێتە هۆکاری گەشەی ئەم (کەرتە) ئەمەش بوو بە هۆی ئاوڕنەدانەوە لە بەرهەمە کشتوکاڵییەکان، سەرمایەگوزاری کەم لە ناوچە شارییەکاندا کە دەبوایا هەموارکردنی ستراکتۆری زۆر جەختی لە سەر کردبا پلانەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی هەوڵیان دەدا تا نرخی تەواوی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان بە جووتیاران بدەن ئەم زیاد کردنەی نرخە بوو بە هۆی هاندانی جووتیاران بە زیاد کردنی بەرهەمەکانیان و بەمجۆرەش هەناردەکردنی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان بەرزدەبووە و زیادە سەرمایەی بەرەو ئابوور شۆڕ دەکردەوە، لە ژێر کاریگەری ئەم دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییانەدا وڵاتانی ئەفریقیا بەرەو وەستاندنی چەق گرتنی هەناردەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان و وەستاندنی سەرمایەگوزارییەکانیان لە مولکەی دەوڵەتی و هاوەردە کردنی بەرهەمە جێگرەوەکان، ڕێنمایی دەکرد.

دووەمین تەوەر لە هەموارکردنی ستراکتۆری، چاکسازیی کردن لە سیاسەتە بازرگانییەکان و نرخی ئاڵوگۆڕی بوو. بۆ نموونە ڕوانینی نیو لیبڕاڵ نیازمەندە کە لەمپەرە دەوڵەتییەکان بۆ

هەنارده و هاوردەکردنی لە بەین ببرێت، دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتیەکان جەختیان دەکردەوە کە بەڕێوەبردنی جێبەجێ کاری لە بازرگانی نێودەوڵەتی ئەفریقیا خەرجی هەڵگرە سیستەمی مۆڵەت پێدانی هەنارده و هاوردەکردن بۆرۆکراتیك و گەندەڵ بوو، هەروەهاش پلانی هەموارکردن ستراکتۆریی وڵاتانی ناچار دەکرد کە تەعرفەی پشتگیری کردن لە هاوردەی پیشەسازییە جێگرەوەکان هەڵگرێ. راپۆرتی ساڵی ۱۹۸۱ی بانکی جیهانی گشت پیشەسازییەکانی ئەفریقیا کە پێشتر بۆ مانەوەیان پشتیوانی دەوڵەتیان لە پشت بوو ناکارامە هەژمار کرد. گەندەڵییەکانی دەوڵەتی وەك زاڵو، ئابووری سەرمایەی ئەم کیشوەرەی هەڵدەمژێت تا بتوانن خۆیان بەڕێوەببەن دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکان رایانگەیاند کە ئەگەر ئەم دامەزراوانە کێبەرکێ کار نەبن دەبێ پاکسازی بکرێن، چونکە ئەفریقییەکان لە دەست گەیشتن بە هاوەردەی دەرەکی ئەرزان سوومەند دەبن، سێیەمین و دواین مەرجی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆری، پەیوەست بوو بە کارامەتر کردنی کەرتی گشتی راپۆرتی برگ رادەگەێنێت کە ستراتیژە پێشوویەکانی گەشەسەندنی ئەفریقیا، بوو بە هۆی دەستتێوەردانی زۆرتری دەوڵەت لەبری ئەمەشدا دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکان پێویستیان بە کەمکردنەوەی کاریگەری دەوڵەت هەبوو و لەو بڕوایە دا بوون کە پێویستە ئابوورەکان بە رووی سەرمایەگوزاری کەرتی گشتی شیاو بکرێتەوە، بەم پێیەش یەکەمین ئامانجی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆری، کەمکردنەوەی بەرچاوی خەرجییەکانی دەوڵەت بوو و بودجە دەوڵەتییەکان (جێبەجێ کاری) دەبوایا ببڕدرێت. هەرشوێنەك کە پێویست بوایا خزمەتگورازییەکان بە کەرتی تایبەت رادەسپێردرا. لە ئەنجامدا ئەم جۆرە لە چالاکی ئابوورییەیە کە دیسپلێن بە بازاڕی ئازاد دەدات (بە بەراورد لەگەڵ پلان دارشتنی چەق گرتوو (ناوەندگەرا)). بە کورتی دەوڵەت لە ئەفریقیادا پێشتر لە تاك جەمسەری راستەقینە بەسەر چالاکییە ئابوورییەکاندا سوودمەند بوو ئامانجی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆری گۆڕینی ئەم تاك جەمسەرییە بوو.

## ئەنجامەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی:

هەموارکردنی ستراکتۆری کاریگەری بەرفراوانی بەسەر گشت ئەم کیشوەرەدا هەبوو و ئەمەش تەنیا لە بواری ئابووردا کورت نابێتەوە پێویستی رۆژئاوا لەودەا بوو کە وڵاتانی ئەفریقیا سیاسەتە ئابوورییەکانیان کە کاریگەری فراوان بەسەر پرۆسەی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەم کیشوەرەدا هەبوو بگۆڕن.



## کاریگەری ئابووریی:

لێکۆڵینەوە لەسەر ئەنجامە ئابوورییەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی، بۆچوونگەلی جۆراوجۆری بەدیهێنا. لە ساڵی ١٩٩٤دا بانکی جیهانی پێشنیاری کرد کە وڵاتانی ئەفریقیا هەنگاوی بەرفراوان بۆ سیاسەتەکانی گەشەسەندن و زیندوو کردنەوەی رەوتی گەشەکردن هەڵگرن بانکی جیهانی لە رێگەی شەش وڵاتەوە کە بە تەواوی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریان جێبەجێ کرد، نیشانی دا کە چۆن ئەم وڵاتانە لە گۆڕینی ئابووری نێگەتیڤ بەرەو بووژانەوەی ئابووری پۆزەتیڤ سەرکەوتوو بوونە و ٢٪ گەشەی ئابوورییان لە ساڵانی نێوان ١٩٨٧-٩١ لەخۆگرت لێکۆڵینەوەکانیتر رەشبینانە بوون بۆ نموونە کۆمیسیۆنی ئابووری نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئەنجامەکانی هەموارکردنی ستراکتۆری لە ئەفریقیادا لە ژێر باشترین بارودۆخدا بە گۆمانەوە بۆی دەڕوانی راپۆرتی ساڵی ١٩٨٩ ئاماژەی دا کە ئەو ئابوورە ئەفریقیاییەی کە ئەم پلانەی جێبەجێ نەکردووە باشتر لە هاوتاکانیان پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریان جێبەجێ کردووە.

راستی ئەوەیە کە هەندێ لە وڵاتان گەشە و بووژانەوەی کەمیان لە پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی لە خۆیان نیشاندا، هەندێ وڵاتیش شکستیان هێنا هیچ ئابووریك، گەشەیەکی بەرچاوی لە ژێر ئاڵای پلانی هەموارکردنی ئابووردا نەیانبوو، راپۆرتی ساڵی ١٩٩٤ی بانکی جیهان دەخاتەڕوو کە لە گشت وڵاتانی ئەفریقیا شەش وڵات پێشکەوتنی بەرچاویان هەبووە، نۆ وڵاتیتر گەشەیان نەکردووە و ١١ وڵاتیش (پێشکەوتنیان) دابەزینیان (افول) هەبووە.

تەنانەت لێرەشدا بۆچوونەکان جیاوازە، بۆ نموونە ئایا بەردەوام بوونی دابەزین (افول) لە هەندێ وڵاتدا بە هۆی سروشتی نەخۆشی پلانەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی بوو؟

یاخود ئەم شتە (گەشە نەکردنە) لە ئەنجامی بەکارهێنانی لاوازانەی پلانەکان لەلایەن دەوڵەتەوە روویداوە؟ ئایا مومکینە بە بەردەوام بوونی باری خراپی ئابوور، بەبێ جێبەجێ کردنی هەموارکردنی پلانی ستراکتۆریی بارودۆخی ئابوورەکەیان خراپتر بێت؟ هیچ نموونەیەکی ئاشکرا پێشکەش نەکراوە، ئەو شتەی کە روونە ئەوەیە کە بەداخەوە ئەفریقیا لە لێواری هەرەسی ئابووریدا بە جێ دەمێنێتەوە و داواکارییەکانی ئابووری نیو لیبڕاڵی دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی لە سەدەی بیست و یەکەمیشدا درێژەی دەبێت.

تەنانەت ئەگەر لەم سەردەمەدا پلانەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی ئەنجامی پۆزەتیڤی بەرهەم دێنا، ئەم پلانانە دارێژراون تا ئابوورە گەندەڵەکان بگۆڕن ئەم کارەش لەوانەیە

ستراکتۆرگەلی گرنگ لە گەشەی داهاتوودا بهێنێتە ئاراوە، بەڵام خودی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی بزوێنەری گەشەی بەردەوام نابێتەوە دەبوایا کارگەلی لە رادەبەدەر ئەنجام بدرابا بەتایبەتیش لە بواری رزگار بوون لە قەرزەکاندا، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٩٠دا سلفە و ئیعتبارەکانی ئەفریقیا (پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی) دانەوەی سوودی قەرزەکان لەم ساڵەدا مومکین کرد. زۆرێك لە وڵاتانی ئەفریقیا زۆربەی ئەو پارەیەی کە لە سەرمایەی دەرەکی بەدەستیان هێنابوو بۆ بەرژەوەنییە تایبەتییەکانی خۆیان تەرخان کرد تا هیچ پارەیەك بۆ سەرمایەگوزاری گەشەپێدان نەما، هەروەك ئیدوارد جایکۆکس لە بەرێوەبەرایەتی ئەفریقیایی بانکی جیهانی لە ساڵی ١٩٩٠دا هۆشداریی دا کە قەیرانی دارایی بۆ ١٧ وڵات لە ئەفریقیادا زۆر ناڵەبارە، بەرپرسیارێتی قەرزداری زۆر قورسە، ئەوان ناتوانن ئەم قەرزە بدەنەوە لە راستیدا پلانەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریش هیچ کارێك بەرەو پێشەوە نابات، تەنیا ئەوە نەبێت کە رێڕەوی سەرچاوە دەرەکییەکان خێرایی پێ بدەین.

ستراتیژی هەموارکردنی ستراکتۆریی بۆ زیادکردنی سەرمایەی دەرەکی پرسیار هەڵگرە. راپۆرتی بێرگ بە روونی ئاماژە دەدات کە پێویستە ئەفریقیا هەوڵەکانی لە هەناردەکردنی کاڵا خاوەکان بۆ بەرزکردنەوەی داهات گرد بکاتەوە، لە راپۆرتی ساڵی ١٩٩٥ی بانکی جیهانی جەخت کرایەوە کە پلانی هەموارکردنی ستراکتۆری ئەولەوییەت بە هەناردەکاران دەبەخشێت بەم پێیەش گرفتی بەرفراوانی هەناردەکردن ئەوەیە کە کێشەی زیانی ئاڵوگۆڕی نایەکسانی لە پێشتر تاقیکراو دێنێتە کایەوە. ئەگەر وڵاتانی ئەفریقیا لە بەرزکردنەوەی بەرهەمهێنانیاندا سەرکەوتوو بن، لەوانەیە ئەم کارە لەلایەن وڵاتانیتری جێبەجێکاری پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی جێبەجێ بکرێت زیاد لەمەش دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکان هانی زۆرێك لە وڵاتانیدا بۆ بەرزکردنەوەی (ئاستی) بەرهەمهێنانی کاڵا سەرەتاییەکان کاتێك کە ئەم وڵاتانە رووبەرووی دراوی بێ بەها و بەرهەمهێنانی زۆر دەبنەوە سوودەکی کەم بۆ بەهەرەوەری لە ئارادایە. بازاڕەکانی نێودەوڵەتی بە دابەزینی (بەرهەمهێنانی) کاڵا سەرەتاییەکان زیاد دەکەن لە ئەنجام زیاد کردنی بەرهەمهێنان زۆربەی سامانی بە دواوە نییە ئەفریقیا بۆ مانەوەی خۆی ناچار بە دەرباز بوون لەم بارودۆخەیە. پێرسی بەڕێوەبەری باڵای بانکی جیهانی ئاماژەی داوە: ئەگەر ئەفریقیا بۆ گەشەپێدانی داهاتی هەناردەکانی درێژە بە پشتبەستن بە کاڵا سەرەتاییەکان (کەرەستەی خاو) بدات سەرەتاکانی لە ناو چوونی خۆی فەراهەم دەکات، هەروەك بانکی جیهانی ئاماژە پێدەکات: گەشەی داهاتووی ئەفریقیا لە بەرهەمهێنانی کاڵا ناکلاسیکییەکان و



کاڵا پیشەسازییەکان کە هەم بۆ هەنارده و هەمیش بۆ بازاڕی ناوخۆیی سوودمەندە بەدەست دێت، ئەگەرچی ئەگەری زۆری هەیە ئەم کارە پێویستی بە سەرمایەگوزاری دەرەکی هەیە، لەم رووەوە پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی زۆر پێویستی بە راکێشانی سەرمایەی دەرەکی هەیە، شتێك کە لە ئەفریقیادا رووی نەدا هاوکارییە بان نەتەوەییەکان (دامەزراوە فرە رەگەزەکان) لە ئابوورگەلی لەرزۆك کە حکومەتەکانیان بە هۆی کاریگەری پلانەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی توانایی گەرەنتی کردنی دراوی جێگیر، پاراستنی ژێرخانەکان، دیسپلێنی گشتی و قەڵەمڕەویی جێبەجێ کاری نین سەرمایەگوزاری ناکەن. لەم چەند ساڵەی دواییدا کۆمپانیا فرە رەگەزەکان بەرەو ئەمریکای لاتین و ئاسیا راکێشراون.

سەبارەت بە ستراتیژی گەشەکردن، پلانی هەموارکردنی ستراکتۆری مەلەوەر دێتە بەرچاو، هەروەك بانکی جیهانی ئاماژە پێدەکات کاتێك کە رێژەی هەڵئاوسان لە سەرەوەیە یاخود نرخی دراو تەواو بێ بەهایە، یاخود باجەکان قورسن، یان هاوەردەکردنی کاڵا ژیارییەکان لە نزمترین ئاستدایە، نرخەکان و بەرهەمهێنان زۆر رێسامەندە (دیسپلێن کراوە) و خزمەتگوزاریی گشتی خراپ و خزمەتگوزاریی دارایی ناموەکینە، گەشەسەندن بوونی نابێت. پلانی هەموارکردنی ستراکتۆری لە بەر ئەوە دارێژرا تا لەسەر بەربەستەکانی وەك لەمپەرەکانی شار (نشینی) و دەوڵەتی هەڵئاوساو ناکارامە ورد ببێتەوە و ستراکتۆرێکی بەهێز پێك نەهێنێت گەشەی پشتبەستراو بە هەنارده لەرێگەی بەرهەمهێنانی کاڵا کلاسیکییەکان هەڵە دێتە بەرچاو لە کاتێکدا کە سەرمایەگوزارییەکی کەم بۆ گەشەپێدانی چالاکییە ئابوورییەکانی ناکلاسیکی (بە تایبەتیش بەردەوامی قەرزەکان) لە بەردەست دایە، بەم پێیەش وەها دێتە بەرچاو کە ئەفریقیا سەرمایەیەکی کەمی بەدەست گەیشتووە کە بتوانێ بۆ رێڕەوی گەشەی درێژخایەن، پۆزەتیڤ بێت، حەقیقەتی تاڵ ئەوەیە کە سەروەری ئابوورییەکەی تارادەیەکی زۆر لە دەست دەدات ئەم حەقیقەتە کاتێك ئاشکرا دەبێت کە ئەنجامەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریش رەچاو بکرێت.

## کاریگەریی کۆمەڵایەتی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی:

ئەگەرچی کاریگەری ئابووری پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی لە ئەفریقیادا تارادەیەك دیار نەبوو. بەڵام ئەنجامە ئابوورییەکان بە تەواوی دیار بوون چاکسازیی کەرتی گشتی بوو بە هۆی زیاد بوونی بەرفراوانی بێ کاری و بڕینی خزمەتگوزارییە گشتییەکان، بۆ نموونە لە زامبیا دابەزینی پشتیوانی دەوڵەت لە پیشەسازیی رستن و چنین (جێگرەوەی هاوردە) بوو بە هۆی ئەوەی کە ٨٥٠٠ کرێکار کارەکەیان لە دەست بدەن و ٤٧ کارگەی رستن و چنین بەرهەمهێنان رابگرن، کارگەکانیتر بەرێژەی ٢٠٪ -٢٥٪ی قەبارەکەیان کاردەکرد، هەروەها لە کۆمپانیا و کارگەکانی هێزی ئاسمانی زامبیا، کۆمپانیای ئۆتۆبۆس دروست کردن، کۆمپانیای گەشەپێدانی هۆتێلی نێوەوڵەتی، باتریەکانی مانزوا و کۆمپانیای نیشتمانی هەنارده و هاوەردە نزیکەی ٢٥ هەزار فەرمانبەر لە کار لادران، بە گشتی نزیکەی ٦٠ هەزار پیشە لە (کەرتی) خزمەتگوزارییە گشتییەکاندا لەنێوان ساڵانی ١٩٩١-١٩٩٥ کەم بووە و رێژەی بێکاری بەرەبەرە روو لە زیاد بوونی کرد، هەروەها هەموارکردنی ستراکتۆریی دەوڵەتی پابەندیە کەم کردنەوەی بودجەی کرد، بۆ نموونە زیمبابوا لە ساڵانی ١٩٨٩ تا ١٩٩٥ بودجەکەی تا نیوە کەم کرایەوە، لە ئەنجامی ئەم کارەشدا خزمەتگوزارییە گشتییەکان رووبەڕووی گرفت بوونەوە بۆ نموونە تێچوونی کارمەندانی بواری پزیشکی و دەرمان و بودجەی پەروەردە بەرێژەیەکی بەرچاو کەمی کردەوە مانگانەیەك بۆ گشت ئامادەیی و سەرەتاییەکان دیارکرا لە کاتێکدا کە پێشتر پەروەردە بەخۆڕایی بوو. ئەم دابەزینەی خزمەتگوزارییە گشتییەکان بۆ توێژی کەم دەرامەت نیگەرانی دروست کرد. لەوانەیە گرنگترین ئەنجامی ناکۆکی هەڵگری پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی بڕینی سوبسیدانە دەوڵەتی کاڵا خۆراکییەکان بوو. هەژارە شارنشینەکان بۆ مانەوەیان پشتبەستراو بەم سوبسیدانە بوون (ئەوان بەپێچەوانەی هاوڵاتییەکانی گوندنشین کە خۆیان بەرهەمهێنەر بوون) سەرچاوەی کەمی خۆراکیان لە بەردەست دابوو لە زامبیا لە ساڵی ١٩٧٧دا سوبسیدی گەنمە شامی ٧١٪ نرخی بازاڕی ئەم کاڵا سەرەکییەی پێك دێنا بەڵام لە ساڵی ١٩٨٣دا دەوڵەت چاوەڕوان نەبوو کە خەڵك گشت نرخی بەرهەمەکە بدەن بە نەمانی سوبسیدەکان، پلانەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی لە سەرتاسەری ئەفریقیادا بێزار بوونەوەی لێ کەوتەوە.

تا ناوەڕاستی نەوەدەکان بانکی جیهانیش ناچار بە چاکسازی کردن لەم پلانەدا بووە ((تا ئەو شوێنەی پێمان بکرێ دەبێ هەوڵ بدەین کە کەمکردنەوەی هەژاری لە پێرستی پلانەکانی



هەموارکردنی ستراکتۆریدا بگونجێندرێت)). کاتێك کە ئەنجامەکانی ئەم پلانە لە کوتایی هەشتاکاندا خرانەڕوو دامەزراوە داراییەکای نێودەوڵەتی پلانی کەمکردنەوەی هەژاریان لە پلانی هەموارکردنی ستراکتۆرییدا گونجاند، ئەم پلانانە بەم هۆیە داڕێژرابوون تا بەرەنگاری زیادە خوازی ئابووری نیو لیبراڵ ببنەوە ئەگەرچی تا ئەم کاتە بۆ خەڵکێك زۆر درەنگ بوو (ئەم پلانە جێبەجێ بکرێت) و میلیۆنەها ئەفریقیایی رووبەڕووی سەختی و دژواری فراوان بوونەوە لە ئەنجامدا کاریگەری کۆمەڵایەتی هەموارکردنی ستراکتۆریی رەنگدانەوەی زۆری بەسەر پرۆسەی سیاسی ئەفریقیادا هەبووە.

## کاریگەری سیاسی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی:

مەرجی سەندوقی نێودەوڵەتی دراو بۆ بەخشینی قەرز (سلفە) بە سیرالیون لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا، ئەوە بوو کە دەبوایا دەوڵەت سوبسیدی برنج راگیرێت. سەرۆك کۆمار سیکا ستیڤێنز هۆشدارییی دا سەندوقی دراو داوای لە وڵاتەکەی کردووە خۆکوژی سیاسی ئەنجام بدات ئەو هەستی بەوە کرد کە ئەگەر ناچار بە بەرزکردنەوەی نرخەکان لە کەل و پەلەکاندا بێت مەشروعییەتی روو لە ناو چوونەکەی بە تەواوی لە دەست دەدات، لەم رووەوە داتاکان بۆ ستیڤێنز روونیان کردەوە کە ((ئەو شتەی کە لەوانەی لە رووی ئالۆگۆڕی ئابووری عەقڵانی بێت لە رووی سیاسییەوە عەقڵانی نییە)) زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا گرفتەگەلی زۆریان لە هێنانەدی رەزامەندی هاوتەریب لەگەڵ پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی لەگەڵ گەلەکەیاندا هەبوو تەنانەت زۆرێك لە حکومەتەکانیش لە ئەنجامدانی ئەم (پلانەدا) زۆر بە توندی شکستیان هێنا و بە بەهای دوورخستنەوە لە پۆستەکانیان بە کۆتا هات.

گرفت لێرەدا بوو کە پلانەکانی هەموارکرنی ستراکتۆریی راستەوخۆیانە گورزی لە سیاسەتی ((بارودۆخی بەرقەراری)) ئەفریقیا وەشاند، پرۆسەی سیاسی ئەم کیشوەرە وەك زۆربەی شوێنەکانیتری جیهان بەسەر تەوەری دەوڵەتدا دەسوڕایەوە (ناوەندگەرایی) لە ئەنجامدا دەوڵەتان گەورەترین پاسەوانانی (پارێزگار) هەلی مۆبیلیزە کردنی سیاسی و خۆشگوزەرانی بوون هەر بەم هۆیەشەوە سیستەمی سیاسی دەربەگایەتی لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال دامەزرا (لە بەشی شەشەمدا باسی لێکراوە). رەعیەت پشتگیری لە دەوڵەت دەکەن لەبری ئەمەشدا داوا دەکەن کە لە کەرتی گشتی و پۆستی جێبەجێکاری داواکار بکەن و داوای قوتابخانەی نوێ بۆ ناوچەکانیان، لێدانی بیر بۆ گوندەکان، قیرتاو کردنی رێگاوبانی ناوچەکانیان دەکەن و ئەم

وابەستەییەی ناوخۆییە سیستەمی دەرەبەگایەتی چەسپێکی ((کۆمەڵایەتی)) دروست دەکات کە گشت سیستەمی سیاسی پێکەوە گرێ دەدات و ڕێژیەك لە سەقامگیری بەرهەم دێنێت. پلانی هەمووارکردنی ستراکتۆریی بە ئاگاییەوە مەبەستیان بوو کە پەیوەندی دەرەبەگایەتی لە ناو ببەن بەم پێیەش ئەم پلانە لە ڕووی ئابوورییەوە (نەك سیاسی) ویستراو (مطلوب) نەبوو.

ڕەگەزی سەرەکی پلانی هەمووارکردنی ستراکتۆریی ((پاشەکشەکردنی)) دەوڵەتە و ئەم کارەش بەم هۆیەوە ئەنجامدرا تا دەستتێوەردانی دەوڵەت لە ئابووردا بەکەمترین ئاست بگەیێنێت و لەبری ئەمەشدا چالاکی کۆمەڵگای مەدەنی بەرزبکاتەوە، لە ئەنجامدا بودجەکانی دەوڵەت بڕدران دامەزراوە دەوڵەتییەکان پاکسازی یاخود بە تایبەتی (خصوصی) کران و خزمەتگوزارییە گشتییەکان کەم بوونەوە ئەنجامە سیاسییەکانی ئەم پاشەکشێیە گورزێکە لە بیر ناکرێت. دەوڵەتی پاشەکشەکراو، نەیدەتوانی بەڕێوەبەرایەتی ئەو سەرچاوانە بکات کە پێشتر لێی سوودمەند بوون. لە ئەنجامدا وەفاداران بە دەوڵەت کەم بوونەوە ڕەعیەتەکان بە هۆی چاکسازیکردن و سنووردارکردنی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان، کارەکەیان لە دەست دا هەنوکە چونکە مامەڵەی نێودەوڵەتی کەمتر لەلایەن دەوڵەتەوە کونترۆڵ دەکرا ئیتر هیچ سوودێك بە هاوردە و هەناردەکاران نەدەگەیشت. دەوڵەت ئیتر بوودجەیەکی نەبوو کە بتوانی بۆ ڕاگرتنی وەفادارەکانی قوتابخانە دروست بکات و بیر لێ بدات. بە کورتی چاکسازی پلانی هەمووارکردنی ستراکتۆریی بوو بە هۆی ئەوەی کە نوخبەی دەوڵەت کەمتر پشت بە لایەنگرەکانیان ببەستن و مەیلدار بوونێکی کەمتریان بۆ بەدەستهێنانی لایەنگری نوێیان هەبێت دەرەنجامی ئەمەش دابەزینی مەشروعییەتی دەوڵەت و ناسەقامگیری سیاسی بوو. ئەم ناسەقامگیرییە زۆرتر لە ناوچە شارییەکاندا بەرجەستە بووە چونکە زۆرترین بەرهەڵستکاران دانیشتووی شارەکان بوون، ئەم کەسانە کرێکارە پیشەسازییە بێکار بووەکانی لەخۆدەگرت کە لە ئەنجامی نەهێشتنی کارگەکانی جێگرەوەی هاوردەکردن، بە کاتییانە بێ کار ببوون. کرێکارانی خزمەتگوزاری، فەرمانبەرانی دامەزراوە حکومییەکان، خوێندکاران، دوکتۆر و مامۆستاکان لە ئەنجامی کەم بوونەوەی بوودجەی پەروەردە و کەم بوونەوەی هێنانەدی خزمەتگوزارییە گشتییەکان، نارەزاییان دەربڕی. لەرزۆکترین توێژ، شارنشینە هەژارەکان — ئەوانەی کە سوودیان لە سوبسیدی خۆراك وەرەگرت بوون ئەم گرووپە شارنشینانە لە ناوچەگەلی سنووردار‌دا کاریان دەکرد کە مۆبیلیزە کردنیان ئاسانتر بوو چونکە لە پاڵ دامەزراوە ڕاستەقینەکانی دەوڵەت (پەرلەمان، وەزارتەکان و دامەزراوەکان) نیشتەجێ بوون و ئەم کارەش



بۆ شارنشینەکان ئاسان بوو کە بەرەنگاری لایەنگرە پێشووییەکانیان (نوخبەی دەوڵەت) ببنەوە و داوای گۆڕینی دەوڵەت بکەن. ئەنجامەکانی ناسەقامگیری سیاسی لە هەر یەك لەم وڵاتانەدا جیاواز بوو ئەگەرچی بڕیارنامەی هاوبەش، مانگرتنی بەردەوام و بەرفراوان لەلایەن کرێکارەکانی کەرتی گشتی و بارگرژییەکانی نەژادی، لەو وڵاتانەی کە ئێستا دەستیان بە سەرچاوەکانی ((لێپرسینەوە نەژادی)) دەگات، زۆرتر بوو. توندوتیژترین شۆڕشەکان ((شۆڕشی نان)) لە ناوچە هەژارەکانی شاردا، لە ئەنجامی نیگەرانی لە بڕینی سوبسیدی دەوڵەت، ڕوویدا.

لە زۆربەی بابەتەکاندا پلانی هەمووارکردنی ستراکتۆریی لە ژینگەیەکدا جێبەجێ کرا کە (بە هۆیەوە) گرووپە شۆڕشگێڕە چەکدارەکان یان سیڤل بەرەو لە ناو بردنی کاربەدەستانی حکومەت، مەیدار بوونەوە (بۆ نموونە سودان و لیبریا) یاخود نوخبەکان درێژەیان بە چەوساندنەوە لە دەوڵەتێکی بچووك و شکست خواردوودا (زەئیر و سومالی بەشی دەیەم) ئەم ناسەقامگیرییە لە ئەنجامی گواستنەوە بەرەو دیموکراسی فرە پارتی ڕوویدا (زامبیا و مالاوی، بڕوانە بەشی یازدەیەم). لە هەر دەوڵەتێکدا کە ئەم پلانە جێبەجێ کرا، دەستتێوەردانی دەرەکی بووە هۆی ئەوەی کە مەشروعییەتی نوخبەکان کەم ببێتەوە دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتیش بە جیدییانە بارودۆخی سەقامگیری سیاسی وڵاتانی پشت بەستراو بە سیستەمی دەرەبەگایەتییان.

## دەوڵەت، کۆمەڵگای مەدەنی و بەرژەوەندی دەرەکی:

قەیرانی قەرزداری ئەفریقیا و پلانی هەمووارکردنی ستراکتۆریی کاریگەری بەرچاوی بەسەر پەیوەندی سێ لایەنەی نێوان دەوڵەت کۆمەڵگای مەدەنی و بەرژەوەندی دەرەکی لە ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیالدا هەبووە لە هەشتا و نەوەدەکان بەرژەوەندییە دەرەکییەکان گرنگی زۆرتریان هەبوو کۆمەڵگای مەدەنی بەرفراوان بوو، بەڵام دەوڵەت بەشێکی گرنگ لە دەسەڵاتەکەی لە دەستدا قەیرانی قەرزداری بە ڕۆژئاوا بوو بە هۆی ئەوەی کە بەشێکی زۆری سەروەری ئابووری وڵاتانی ئەفریقیا لە بەین بڕوات چونکە وڵاتانی ئەم کیشوەرە ناچارکران کە مەرجەکانی دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکان بۆ وەرگرتنی سلفە قەبوول بکەن و پێشمەرجەکانی ئابووری نیو لیبڕاڵ تا ئەندازەیەك لە ئەفریقیادا جێبەجێ کرا لە ئەنجامدا سیاسەتمەدارانی ئەفریقیا بە ڕێژەیەکی بەرچاو کونترۆڵ کردنی بارودۆخی ئاڵوگۆڕی نرخ دانان، ڕێکخستنەوەی بوودجە و بارودۆخی خزمەتگوزاری کە دەبوایا پێشکەش بە هاوڵاتیان کرابا، لە دەستیاندا، سیاسەت

دارێژەران لە دەرکردنی بڕیارە گشتییەکاندا ناچار بوون لەگەڵ کاربەدەستانی دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی لە واشنگتۆن راوێژ بکەن کۆمەڵگای مەدەنی یەکێك لە سەرەکیترین سوودمەندان لەم کردەوە دەرەکییانە بوو، سەردەمێك کە دەوڵەت لیۆسانێکی ( زاراوەی هۆبز بۆ دەوڵەت واتە ئەژدیها) راستەقینە بوو، گشت ئەو سەرچاوانەی کە بۆ پاراستنی تەواوی پانتای سیاسی لەبەردەستی بوو بە یەکجار لە دەستیدا ئەم ((ئەم پاشەکشەکردنەوەی زۆرەملانەی دەوڵەت)) بۆ کۆمەڵگای مەدەنی هەلی پەرەسەندنی رەخساند. بۆ نموونە سەرچاوەی رکابەری دەوڵەت لە کەرتی گشتی دا دامەزران و دامەزراوە خۆجێیەکان و رێکخراوە ناحکومییەکانی (کەرتی) خزمەتگوزاری کە پێشتر لە دەست دەوڵەتدا بوون، بەدەستیان گرت و تەنانەت لە بواری سیاسیشدا کە سەردەمێك دەزگاکانی تاك پارتی دەسەڵاتدار بوون کۆمەڵگای مەدەنی تا ئاستێکی بەرز چالاك بووە ململانێی لایەنگرانی دیموکراسی بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی فرە پارتی لە ساڵانی نەوەد لەم کیشوەرەدا ئەنجام بدرێن.

هەروەك نوخبەکانی دەوڵەت پێشبینییان دەکرد ٢٥ ساڵی کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم سەردەمێکی سەختە بۆ رێنمایی کردن و بەڕێوەبردن. نەبوونی گەشەی ئابووری لەم قۆناغەدا بەو مانایەیە کە سەرچاوەی بەرچاو بۆ مشتومڕی سیاسی لە بەر دەستدا نییە هەلومەرجی خولقێنراو بە هۆی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی ئەم رەوتەی بە توندی سنووردار کرد. ئیمپراتورەکان کە سەردەمێك لەلایەن لایەنگرانی ولاتەوە بیمە کرا بوون هەنوکە بە هۆی داواکارییەکانی نیو لیبڕالی دامەزراوە داراییەکان، دامەزراوە گشتییەکان و خزمەتگوزاری حکومی ئەم پشتگیرییە کەم بووە و لە ئەنجامیشدا سەرکەوتنەکانی لایەنگرانیان کەم بووە و هەلیان بۆ مانەوە لە دەسەڵاتدا لە دەستدا و نوخبەکانی ناچار بوون کە ئەم هەلومەرجە نوێیە پەسەند بکەن، لە هەندێ ولاتدا ئەم شێوازە بەرەو هەنگاونان (بە ئاراستەی) رکابەرێتی فرە پارتی، گۆڕدرا. لە کاتێك لە هەندێ ولاتی وەك زەئیر و سومالی کونترۆڵ کردنی دەسەڵات بوونی نەما و ولات بەرەو رووخان رۆیشت.

هەڵەیە ئەگەر هزر بکەینەوە پلانەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی بە تەواوی دەسەڵاتی پشتبەستراو بە نوخبە کۆنەکانی لە ناوبرد، تەنانەت ئەمرۆکەش دامەزراوە دەوڵەتییەکان باشترین دەرفەتیان بۆ پێشکەوتی کۆمەڵایەتی لەم کیشوەردا پاراستوویانە و دەوڵەتی فەرمانڕەواش لە ئەنجامی ململانێی نێوان پارتەکان، خۆی پاراستووە، ئەم پرسەش نیشاندرە کە



ئەوانەی لە دەسەڵاتدا بوون پێگەی قۆرغکراوەکەیان بە تەواوی رادەستیان نەکردووە و هەوڵیان داوە سەرچاوە دەرەکییەکان لە دەستیاندا بمێنێتەوە، باشترین شێوازیش بۆ ئەم کارە ئەوە بوو کە نوخبە سیاسییەکان لە رێگەی دروست جێبەجێ نەکردنی مەرجەکانی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی کار بکەن، لە ئەنجامدا بوودجە بڕدرا، بازرگانی ئازاد کراو نرخە بێ رێساکان بەرز بوونەوە، بەڵام بە تایبەتی کردن (خصعە) بە لە سەر خۆییەوە ئەنجام دەدرا. هەڵبەت دامەزراوە و موڵکەکانی دەوڵەت بەسوودترین سەرچاوەیان بۆ لایەنگرانی دەوڵەت فەراهەم کرد. بەپێی راپۆرتی ساڵی ١٩٩٤ی بانکی جیهانی، هەوڵ بۆ بە تایبەت کردنی دەوڵەت و بەرفراوان کردنی کارکردیان ئەنجامی لاوازی لێ کەوتووتەوە، تەنانەت لەو شوێنانەی کە بە تایبەتی کردن روویدا، نوخبەکان هەوڵیاندا بە فرۆشتنی موڵکەکانی دەوڵەت بۆ خۆیان یاخود بۆ هاوکاریەکانیان بە ئەرزانترین نرخ سوود ببینن.

هەڵبەت دەستتێوەردانی دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی، لە هەندێ شوێندا و تەنانەت لەلایەن نوخبەکانی دەوڵەتەوە بە مەبەستی فراوانکردنی سەرچاوەی کامڵ کردنی مەشروعییەت، ئاراستەکران. حکومەتە تاکەکەسییەکان شکستە سیاسی و ئابوورییەکانیان خستە ئەستۆی سەندوقی نێودەوڵەتی دراو و بانکی جیهانی ئەوان خۆیان لە بەرپرسیارێتی دوور دەخەنەوە چونکە بۆ ئەنجامدانی چاکسازی سیاسی و ئابووری لە ژێر گوشار دا بوون.

هەڵبەت وەها دەهاتە بەرچاو کە دەوڵەتانی ئەفریقیا زۆر لەلایەن دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتییەوە پشتگیری لێکراو بن تا کو لەلایەن هاوڵاتییەکانیانەوە جیا لە بانکی جیهانی (پێویستە) سەندوقی نێودەوڵەتی دراو و حکومەتەکانی رۆژئاواش هاوڵاتیانی (ئەفریقیایی) دڵ خۆش بکەن و گرەنتی بکەن کە قەرزەکانی (سلفە) گەشە پێدانی ئەم کیشوەرە بەردەوام دەبێت. (ئەگەرچی) ئەم قەرزانە بۆ نوخبەکانی دەوڵەت سەرچاوەی دارایی و زێدەری ژیان بوو و لە سەرمایەی دەرەکی بۆ درێژە پێدان بە پەیوەندی بەردەوامی دەرەبەگایەتی کەڵکیان وەرگرت بەم پێیەش دەیەی هەشتەم و نۆیەمی ( سەدەی بیستەم) دەیەی خۆ گونجاندن پازدان و راکردن و هاوکاری بوو بەمجۆرەش تا ئەندازەیەك سەروەری پارێزراو نیشاندرا کە هەندێ لە ولاتان هەوڵ دەدەن بۆ رزگار بوون لە وەڵامدانەوە بۆ پلانەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی، هەم بە دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی و هەمیش بە کۆمەڵگای مەدەنی.

خشتەی ١-٩ هێماکانی (مۆشرات) جێبەجێ کراوی کۆمەڵایەتی و ئابووریی جیهان

| ناوی وڵات | بەرهەمی ساڵانەی ناپوختەی نیشتیمانی: دۆلاری ئەمریکا ٢٠٠٠ | ڕێژەی گەشەی ساڵانە ١٩٨٥-٢٠٠٠ | ئومید بە ژیان لە سەرەتای لە دایکبوون ٢٠٠٠ | ڕێژەی خوێندەواری (سەدەیی تەمەن باڵاکان) أ |
|---|---|---|---|---|
| ئەفریقیای خوارووی بیاوان | ٣٣٤ | -٠/١ | ٥٢ | ٤٣ |
| ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و پاسفیك | ٩٩٥ | ٥/١ | ٦٨ | ١٧ |
| ئابوورییەکان خاوەن بەرزترین داهات | ٢٦/٨٣٠ | ١/٧ | ٧٧ | ٢٥ |
| بریتانیا | ٢٤/٠٢٤ | ٢/٣ | ٧٨ | ٢٥ |
| ولایەتە یەکگرتووەکان | ٣٤/٦٣٧ | ٢/٤ | ٧٧ | ٢٥ |
| ئەلجەزایر | ١/٧٦٠ | -٠/١ | ٧٠ | ٣٢ |
| ئانگۆلا | ٦٧٢ | -١/٨ | ٤٨ | ٥٨٩ |
| بنین | ٣٤٦ | ١/٧ | ٥٤ | ٦١ |
| بۆتسوانا | ٣/٤٢٩ | ٢/٤ | ٤٤ | ٢١ |
| بۆرکینافاسۆ | ١٩٠ | ٢/٤ | ٤٦ | ٧٥ |
| بروندی | ١٠٨ | -٣/٦ | ٤٣ | ٥١ |
| کامیرۆن | ٥٩٧ | -٠/٨ | ٥٤ | ٢٤ |
| کیپ ورد (گەروی سەوز) | ١/٣٠٧ | ٣٠٧ | ٦٨ | ٢٨ |
| کۆماری ئەفریقیای | ٢٥٩ | ٠/٣ | ٤٤ | ٥٢ |



| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ناوەڕاست | | | | |
| چاد | ١٧٨ | ٠/٨ | ٤٨ | ٥٦ |
| کۆمۆر | ٢٨٦ | -٢/٨ | ٥٩ | ٤٤ |
| کۆنگۆی کینشار | B 120 | -٧/٩ | ٥٢ | ٣٧ |
| کۆنگۆی برازاویل | ١/٠٦٥ | -٣/٤ | ٤٩ | ٢٤ |
| کەناری عاج | ٥٨٥ | ١ | ٤٧ | ٥٤ |
| جیبوتی | ٨٧٥ | -٣/٥ | ٥٢ | ٥٤ |
| میسر | ١/٤٥٤ | ٢/٦ | ٦٧ | ٤٤ |
| گینەی ئۆستوایی | ٢/٩٣٦ | ١٨/٩ | ٥١ | ١٦ |
| ئێریترە | ١٦٦ | - | ٥٢ | ٤٣ |
| ئەسوپیا | ١٠٢ | ١/٨ | ٤٣ | ٦٠ |
| گابۆن | ٤/٠٠٩ | ٠/٠ | ٥٢ | ٣٧ |
| گامبیا | ٣٢٤ | -٠/٣ | ٤٨ | ٦٢ |
| غەنا | ٢٦٩ | ١/٨ | ٦١ | ٢٧ |
| گینە | ٣٦٩ | ١/٣ | ٤٨ | ٦٤ |
| گینەی بیسائۆ | ١٨٠ | -١/٢ | ٤٥ | ٧٠ |
| کێنیا | ٣٣٨ | -٠/٦ | ٥٠ | ١٢ |
| لسۆتۆ | ٤٤٢ | ٢/١ | ٥٤ | ١٦ |
| لیبراڵیا | - | - | ٥٢ | ٤٥ |
| لیبی | - | - | ٧١ | ١٩ |
| ماداگاسکار | ٢٤٣ | -٠/٩ | ٥٩ | ٣٣ |
| مالاوی | ١٥٠ | ٢/٠ | ٤٠ | ٣٩ |
| موریتانیا | ٣٥١ | ١/٢ | ٥٥ | ٥٩ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| موریس | ٣/٧٧٣ | ٤/٣ | ٧٢ | ١٥ |
| مەغریب | ١/١١٦ | ٠/٤ | ٦٨ | ٥٠ |
| موزامبیك | ٢٠٥ | ٣/٢ | ٤١ | ٦٥ |
| نامیبیا | ١/٩٨١ | ١/٧ | ٥١ | ١٧ |
| نیجر | /١٦٩ | -٠/١ | ٤١ | ٨٥ |
| نیجریا | ٣٦١ | ٠/٤ | ٥٠ | ٣٥ |
| رواندا | ٢٣٦ | -١/٣ | ٤١ | ٣٢ |
| سائۆتومەو پرینسیپ | ٣٣٨ | -١/٠ | ٦٦ | ١٧ |
| سێنگال | ٤٦٤ | ١/١ | ٥٤ | ٦٢ |
| سیسیل | ٧/٦٣١ | ١/٢ | ٧٢ | ١٢ |
| سیرالیۆن | ١٤٤ | -٤/٩ | ٣٩ | ٦٨ |
| سومالی | - | - | ٤٨ | ٧٦ |
| ئەفریقیای باشوور | ٢/٩٠٧ | -١/١ | ٥١ | ١٤ |
| سودان | ٣٧٠ | ٣/٧ | ٥٦ | ٤١ |
| سوازیلند | ١٥٩٩ | ١/٤ | ٦٢ | ٢٠ |
| تانزانیا | ٢٥٧ | -٠/١ | ٤٨ | ٢٤ |
| تۆگۆ | ٢٦٩ | ٠/٥ | ٤٩ | ٤٢ |
| تونس | ٢/٠٥٨ | ٣/١ | ٧٠ | ١٨ |
| ئۆگاندا | ٢٦٥ | ٣/٩ | ٤٢ | ٣٢ |
| زیمبابۆی | ٥٨٥ | ٠/٤ | ٤٢ | ١١ |
| زامبیا | ٢٧٩ | -٢/١ | ٤١ | ٢١ |
| مالی | ٢٠٢ | ١/٢ | ٥٥ | ٧٤ |



بەراوردی ٢٠٠١-١٩٩٥= ٩ بەراوردی ١٩٩٥ =b

سەرچاوە: کۆنفرانسی گەشەسەن و بازرگانی نەتەوە یەکگرتووەکان

خشتەی ٢-٩ ورد بوونە لەسەر هەناردەکانی ئەفریقیا ٦ - ١٩٨٢ (ئەو وڵاتانەی کە کـاڵا سەرەتاییەکان (کەرەستەی خاو) نزیك ٧٥٪ داهاتی وڵات پێك دێنێت)

خشتەی ژمارە ٢-٩

| وڵات | بەرهەم |
|---|---|
| **تاك بەرهەمی: ١٥ وڵات** | |
| ئەلجەزایر | نەوت و گاز |
| گینە | بۆکسیت |
| بروندی | قاوە |
| نیجریا | نەوت |
| سومالی | ئاژەڵی زیندوو |
| ئەنگۆلا | نەوتژ |
| کۆنگۆ | نەوت |
| لیبی | نەوت |
| رواندا | قاوە |
| ئۆگاندا | قاوە |
| بۆتسوانا | ئەڵماس |
| گابۆن | نەوت |
| نیجر | ئۆرانیوم |
| سائۆتۆمێ و پرنسیپ | کاکاو |
| زامبیا | مس |
| **دوو بەرهەمی: ١٤ وڵات** | |
| گەروی سەوز (کیپ ورد) | ماسی، میوە |
| کۆنگۆی کینشازا | مس، قاوە |
| ئەسیوپیا | قاوە، پێست |
| مالاوی | تووتن، چا |
| دورگەکانی ریۆنیۆن | شەکر، ماسی |

| | |
|---|---|
| چاد | پۆمە، ئاژەڵی زیندوو |
| میسر | نەوت، پۆمە |
| غەنا | کاکاو، بۆکیست |
| مالی | ئاژەڵی زیندوو، پۆمە |
| سیشل | نەوت، ماسی |
| کۆمۆر | ڤانیل، گوڵی مێخەك |
| گینەی ئۆستوایی | کاکاو، دار (گاریتە) |
| لیبراڵیا | بەردی ئاسن، ریس |
| موریتانی | بەردی ئاسن، ماسی |
| **سێ بەرهەمی: هەشت وڵات** | |
| بنین | نەوت، قاوە، کاکاو |
| کامیرۆن | نەوت، قاوە، کاکاو |
| گینە بیسائۆ | باوی ئەرزی، دانەوێلەی رۆنی، رۆنی خورما |
| سێنگال | ماسی، باوی ئەرزی، فوسفات |
| بۆرکینافاسۆ | پۆمە، رۆنی گیایی، ئاژەڵی زیندوو |
| کۆماری ئەفریقیای ناوەراست | قاوە، ئەڵماس، دار |
| کێنیا | نەوتی پالاوکراو، قاوە، چا |
| سودان | پۆمە، رۆن، ئاژەڵی زیندوو |
| **چوار بەرهەمی: چوار وڵات** | |
| کەناری عاج | قاوە، کاکاو، رۆنی پاککراو، دار |
| سیرالیۆن | ئەڵماس، کاکاو، قاوە، بۆکسیت |
| ماداگاسکار | قاوە، کەتان، گوڵی مێخەك، ماسی |
| تۆگۆ | فۆسفات، کاکاو، پۆمە، قاوە |

ئابووری خاوەن هەناردەی جۆراجۆر ١١ وڵات لەخۆدەگرێ:

جیبوتی، گامبیا، لسۆتۆ، موریس، مەغریب، موزامبیك، ئەفریقیای باشووری سوازیلند، تانزانیا، تونس، زامبیا.



خشتەی ٣-٩ هێمای (مۆشر) بازرگانی جیهانی ١٩٦٠ -٢٠٠٠ (١٠٠= ١٩٨٠)

| | ١٩٦٠ | ١٩٧٠ | ١٩٨٠ | ١٩٩٠ | ٢٠٠٠ |
|---|---|---|---|---|---|
| ڕێژەی هەناردەی وڵاتانی گەشەسەندوو | ٢٤ | ٥٤ | ١٠٠ | ١٥٥ | ١٩١ |
| باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا | ٤٦ | ٥١ | ١٠٠ | ٢٧٦ | ٥٢٣ |
| وڵاتانی لە دۆخی گەشەسەندن | ٤٥ | ١٣٢ | ١٠٠ | ١٠٢ | ١٠٥ |
| بەهای یەك یەکە (unit) لە هەناردەکانی وڵاتانی گەشەسەندوو | ٢٨ | ٣٣ | ١٠٠ | ١٢٧ | ١٣٦ |
| بالسۆر و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا | ٢١ | ٢٠ | ١٠٠ | ٩٥ | ٩٤ |
| وڵاتانی لە دۆخی گەشەسەندنی ئاسیا | ١٢ | ١٠ | ١٠٠ | ٨١ | ٨٤ |
| هاوسەنگی (موازنتە بازرگانی وڵاتانی گەشە نەسەندوو | ١١٧ | ١٢٢ | ١٠٠ | ١١٠ | ١١٣ |
| باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا | ٩٢ | ٧٩ | ١٠٠ | ٨٥ | ٧٩ |
| وڵاتانی لە دۆخی گەشەکردنی ئەفریقیا | ٤٩ | ٣٦ | ١٠٠ | ٧٠ | ٦٤ |

سەرچاوە: کۆنفرانسی گەشە و بازرگانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەند بوك، ئاماری بازرگانی و گەشەی نێودەوڵەتی (١٩٩٥) خشتەکانی ٢٠٠١، ٢٠٠٣، ٢٠٠٥.

| | |
|---|---|
| دابەزینی (افول) ئابووری ١. گەشە نەکردن لە ئابووری جیهانیدا | * کۆلۆنیالی نوێ، گەشەنەسەندووی هەڵقولاو لە کۆلۆنیالی ناڵەبارتر کردووە<br>* ئالۆگۆری نایەکسان<br>* ئابووری تاك بەرهەم |
| ٢. قەیرانی قەرزاری | * ولاتانی ئەفریقیا قەرز (سلفە) وەردەگرن تا دەست بە گەشەی ئابووری بکەن.<br>* بە دانی قەرزە (سلفە) سەرەتاییەکان بە سوودی زۆر و دوو شۆکی نەوتی کێشە گەلێکی دروست کردووە.<br>* خزمەتگوزارییە هەڵقولاوەکان لە قەرزی قورس ڕێژەیەکی فراوانی ئیمکاناتی ولاتانی ئەفریقیا بۆ خۆی تەرخان کردووە. |
| ڕێگەچارەسەرییە سەپێنراوەکانی دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکان (هەموارکردنی ستراکتۆری) | * چاکسازیی ئابووری نیولیبڕاڵ لەلایەن دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی بەسەر ولاتانی ئەفریقیادا سەپێنراوە (ولاتانیتری جیهانی سێیەمیش).<br>* دەوڵەتانی ئەفریقیا مەرجەکانی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریان پەسەند کردووە، چونکە پەسەندی ئەم پلانە تەنیا سەرچاوەی ئیعتیباری بە جێماو هزری چەپ بوو.<br>* دەوڵەتەکان ناچارکران بە بەرزکردنەوەی بەرهەمەکانی جوتیاران، نەهێشتنی سوبسید، کەم کردنەوە قەعریفە، بەتایبەتی کردنی هەندێ کەرتی دەوڵەتی و کەم کردنەوە تێچوونە گشتییەکان. |
| کاریگەری ئابوورییانەی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی | * سەقامگیری ئابووری بەڵام گەشەی ئابووری لاواز |
| کاریگەری کۆمەڵایەتی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی | * نەهێشتنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان (پەروەردە و تەندوروستی).<br>* بێکاری بەرفراوان بە هۆی نەهێشتنی کەرتە گشتییەکان.<br>* سەپاندنی باج بەسەر هاولاتیاندا بۆ دابین کردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان. |



| | |
|---|---|
| | * زۆر بوونی هەژاری |
| کاریگەری سیاسی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی | * دەوڵەت نەیتوانی پشتیوانی توێژی شارنشین بپارێزێت (ئەمەش بەهۆی نەهێشتن و کەم کردنەوەی سوبسید بەسەر کاڵ خۆراکییەکان و خزمەتگوزاری گشتی.<br>* دەوڵەت هەڵی کەمی هەبوو بۆ بەخشینی پلە و پایە بەلایەنگرانی لە ناو (سیستەمی) بۆرۆکراسیدا.<br>* پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی بوو بە هۆی (شۆڕشی نان) و مانگرتنی پیشەسازیی کە لە ئەنجامدا مان گرتن بۆ دیموکراسی فرە پارتی لێکەوتەوە. |

خشتەی ٤-٩ : پوختەی بەشەی [نۆیەم] ئابووری سیاسی بەرقەرار لە ئەفریقیادا

### بابەتی توێژینەوە: هەموارکردنی ستراکتۆریی لە غەنا:

حکومەتی کۆلۆنیالکاری بریتانیا، لە ساڵی ١٩٥٧ بە کۆلۆنیالکردنی غەنا و تۆگۆ کۆتایی هێنا و ئەمەش یەکەمین قۆناغی بەخشینی سەربەخۆیی بە حکومەتی ڕەش لە ئەفریقیای خواروی بیاوان بوو. غەنا وەك یەکێك لە دەوڵەمەندترین ولاتان وەها نایێتە بەرچاو کە لە داهاتوودا لە پرسی ئابووردا ڕووبەڕووی کێشە ببێتەوە. ئەم ولاتە گەورەترین بەرهەمهێنەری کاکاو لە جیهاندایە و دەرامەتێکی زۆر لە فرۆشی کەرەستەکان و کاریتە کە لە دارستانە ئۆستواییەکان بەرهەمی دێنێت، دەستی دەکەوێت. هەروەها ئەم ولاتە ژێرخانێکی باشی گواستنەوە و توانایی بەهێزی لە بەرهەمهێنانی کارەبا دا هەیە. ئەگەرچی لە ٢٥ ساڵی دوای سەربەخۆیی ئابووری غەنا بە پراکتیکی شکستی هێنا و بەرهەمهێنانی کەلوپەلی خۆراك بە بەراود لەگەڵ دانیشتوان کەم بووە و داهاتی فرۆشی کاکاو و کاریتە زۆر دابەزی و کەرتی پیشەسازیی تەندروستی، گواستنەوە و خزمەتگوزارییە گشتییەکان ڕووبەڕووی دوخێکی ناڵەباربووتەوە ئەم توێژینەوەیە هەوڵ دەدات تا فاکتەرە شاراوەکانی ئەم دابەزینەی (افول) ئابووری و هەوڵە وەگەڕخراوەکان بۆ باشتر کردنی ئەم دۆخە ناڵەبارە کە لە ڕێگەی هەموارکردنی ستراکتۆریی لە ساڵی ١٩٨٣وە دەستی پێکرد ڕوون بکاتەوە مێژووی سیاسی غەنای دوای کۆلۆنیال وێکچوونی زۆری لەگەڵ ولاتانیتری ئەفریقیایی هەبوو. حکومەتی

ناسیۆنالیست هەر کە بە دەسەڵات گەیشت دەستی بە ناوەنگەرایی دەوڵەتی کرد و پرۆسەی سیاسی لە پانتای سەرۆکایەتی جێبەجێ کردندا شێوازی تاکەکەسی وەرگرت، قەوام نکرۆمە لە ساڵی ١٩٦٦دا بە کۆدەتایەك لە کار لادرا و بە درێژایی ١٥ ساڵی دواتر غەنا کۆدەتا و دژە کۆدەتای زۆری بەخۆوە بینی و لە کۆتاییدا لەم وڵاتە حکومەتی خەڵك سالاری و سیڤیل دامەزرا و تاڕادەیەك سیاسەتی ئەم وڵاتە سەقامگیر بوو. ئەگەرچی ئەفسەری هێزی ئاسمانی جری راولینگ لە ساڵی ١٩٨١دا بە دەسەڵات گەیشت بەڵام پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی لە لایەن ئەم رژێمەوە جێبەجێ کرا و روالنیگ جڵەوی وڵاتی تا ساڵی ٢٠٠٠ لە دەست گرت. ئەو بەسەرکەوتوانە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ و ١٩٩٦ی بردەوە.

فاکتەرە ناوخۆیی و دەرەکییەکان پێکەوە، گەشەی ئابووری غەنای پێش جێبەجێ کردنی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی بە توندی کەم کردەوە سەرەڕای ئەوەی کە ئەم وڵاتە یەکێك لە دەوڵەمەنترین وڵاتانی ئەفریقیایە بەڵام ئابوورێکی وێرانی و تاك بەرهەمە کە پشت بە هەناردەکردنی کاڵا سەرەتاییەکانی بۆی بەمیرات ماوەتەوە. ئابووری وڵات لە فرۆشتنی کاکاو، کاریتە و کاڵای خۆراکی سنووردار دەبووە، کە هەناردەی رۆژئاوا دەکرا لەبری ئەمەشدا کاڵا دروستکراوەکان هاوردەی وڵات کران، قەیرانە ئابوورییەکان کاتێك کە دروینەوە و نرخی ئەم بەرهەمە دابەزی، بەرەو ناڵەباری رۆیشت و تەنانەت لەو ساڵانەی کە دروینەوە و نرخی ئەم بەرهەمە باشتر بوو ئەم پرۆسەیە بەردەوامی هەبوو، چونکە کاڵا بەرهەمهێنراوە سەرەتاییەکان بە شێوازی کاڵا بە کاڵا و ئاڵوگۆڕی نایەکسانی لە بازاڕی نێودەوڵەتیدا دەفرۆشتراو، سوودێکی وەهای بە دەوڵەت نەدەگەیاند، غەنا بە سەرمایەیەکی کەم، بۆ سەرمایەگوزاری، کێشەگەلی زۆری هەبوو و پشتبەستراو بە هەناردنی کەرەستەی سەرەتایی بوو. هەرەسهێنانی ئابووری غەنا، ناتوانرێ لە رێگەی بازاڕی جیهانییەوە روون بکرێتەوە، بەڵکو بەربەستە ناوخۆییەکان لەم رەوتەدا کاریگەرن کە زۆربەی ئەم بەربەستانە هەڵقوڵاوی ((بناغەی شار)) و ستراتیژییە هەڵبژاردراوەکانی دەوڵەت سەبارەت بە سیاسەتی جێگرەوەی هاوردە بوون، غەنا ئاواتمەند بوو کە کەمتر پشتبەستراو بە بازاڕەکانی نێودەوڵەتی بێت و زۆرتر پشتبەستراو بێ بە بناغەی ناوخۆیی کە لەلایەن کاربەدەستانەوە بەڕێوەدەبرا و رێنمایی دەکرا تا بەم شێوەیەش بتوانێ ئەم بەرهەمانە بە زیاد کردنی تەعرفەی هاوردەکان لە هەمبەر بازاڕە دەرەکییەکاندا بپارێزێت. هەروەهاش سەرمایە دەرەکییەکان وەك بەشێك لەم سیناریۆیە (واتە) ((سەرپێچی کردن لە کۆلۆنیالکاریی نوێ)) نیشتیمانی کرا.



گەشەپێدانی دەوڵەتی ناوەندگەرا هەروەك هەڵبژاردەکانیتری گەشەسەندن پێویستی بە سەرمایەگوزاری هەبوو و تەنیا سەرچاوەی غەناش بۆ سەرمایەگوزاری کاکاو و کاڵا سەرەتاییەکان بوو بەڵام لەم کەرتانەشدا سوودەکەیان بە هۆی جێبەجێ کردنی بەرنامەکانی خۆشگوزەرانی، سەرمایەگوزاری لە کاڵاکانی جێگرەوەی هاوردەکان، سوبسید و دامەزراوە جێبەجێکارەکانی گشتی و دامەزراوەکانیتر، زۆر کەم بووە. لە ئەنجامدا بازاڕە بەرفراوانەکانی حکومی کە تاکجەمسەرانە کاریان دەکرد نرخێکی کەمیان بە بەراورد لەگەڵ نرخی بازاڕ لە کاتی دروینەوەی بەرهەم بە جووتیارانی دەدا. بەم پێیەش دەوڵەت ئەو بڕە پارەیەی کە لەنێوان نرخی حکومی و نرخی بەرزی جیهانی لە رێگەی فرۆشتنی ئەم کاڵایانەوە بۆ خۆی هەڵدەگرتەوە و رێژەیەکی زۆر لە داهاتی نەتەوەی بۆ دەوڵەت دابین کرا و بە رێژەیەکی بەرفراوانیش بۆ بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی سوبسید تەرخان کرا. لەم رێگەیەشەوە توانی ستراتیژییەکی گەشەسەندن (لە رێگەی دروست کردنی تۆڕگەلی بەرفراوانی (سیستەمی) دەرەبەگایەتی و خەرجی هەڵگر بۆ نوخبە) دابرێژێت، هێزی کاریش بە دەستتێوەردانەکانی دەوڵەت بە تەواوی ملکەچی ببوو و بازاڕەکانی وڵاتیش لە دانەوەی نرخی راستەقینە کە بزوێنەری سەرەکی گوندنشینەکانی غەنا بوو، سەرپێچییان کرد، لە ئەنجامدا زۆرێك لە جووتیاران فرۆشتنی کاکاو بە تۆڕەکانی بازاڕی دەوڵەتی راگرت و ئەم بەرهەمەیان بە بازاڕی نایاسایی (بازاڕی رەش) فرۆشت و بەم پێیەش کاکاو بە نرخێکی زۆرتر لە سنووری کەناری عاج دەفرۆشترا و جووتیارگەلێکی زۆریش بەرهەمهێنانی کاکاو یان راگرت، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٦٥دا غەنا ٥٦٠ هەزار تەن کاکاوی هەناردە کردبوو لە کاتێکدا کە لە ساڵی ١٩٨١ ئەم ژمارەیە بۆ ١٥٠ تەن دابەزی، هەروەها دابەزینی دەرامەت لە کەرستەی کانی وەك ئەڵماس و بوکسیتیش روویدا، لە راستیدا ئەم پرسە بوو بە هۆی دابەزینی بەرهەمهێنان لەم کەرتەدا لە ئەنجامیشدا ئابوور بە تەواوی دابەزی (افول) و هاندەرێك بۆ بەرهەمهێنان لە ئارادا نەبوو، ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە دەوڵەت زۆرترین سوودی بەدەست هێنابوو سەرەڕای ئەم هەرەسهێنان و دابەزینی (افول) ئابوورییە (بەڵام) لە رووی بۆرۆکراسییەوە دەوڵەت هەوڵی گەشەسەندنی دەدا و پۆستە حکومییەکان بە ٢٣٥ پۆست گەیشت و خزمەتگوزارییە حکومییەکان نزیکەی ١٧٪ گەشەی کرد. ئەم رێژەیە لە بەکارهێنانی سەرمایەی لادێیی ئیفلیج کەر بوو و نوخبەی دەوڵەتیش جەختیان لە سەر دامەزراندنی تۆڕەکانی دەرەبەگایەتی دەکردەوە.

لەم سەروبەندەدا بوو کە جری راولینك (دیسەمبەری ١٩٨١) دەستی (لە کاروبارەکاندا) وەردا: ((هاوڵاتیانی غەنا پێویستە ئاگادار بن کە ئێمە لە حالی حازردا سروتی نەتەوەیی ناخوێنینەوە، بە واتایەکیتر ئەمە کۆدەتا نییە بەڵکو من هیچ ناوێك کەمتر لە شۆڕش بەسەر ئەم بزاڤەدا دانانێم)) ئەمە یەکەمین پەیامی رادیویی راولینگ بوو. بەمجۆرەش ئەنجوومەنی کاتی بەرگری نیشتیمانی بە مەبەستی هێنانەدی دیموکراسی لە غەنا پێکهێنرا. لە چاکسازییەکانی سیاسەتی ئابووریدا، راولینگ هەروەك سیاسەتمەداران، گشت کەم و کوڕییەکانی هەژار بوونی وڵاتی خستە ئەستۆی فاکتەری دەرەکی بەمجۆرەش ئەو بەم شۆڕشە هەوڵی دەدا تا بە پچرانی گشت پەیوەندییەکانی نیو کۆڵۆنیال، بە سەربەخۆیی تەواو بگات.

ئەنجامی جێبەجێ کردنی ئەم بەرنامەیە ئەوە بوو کە ئەنجوومەنی کاتی بەرگری نیشتیمانی ئیعتبارێکی باشی لە رۆژئاوادا بەدەست هێنا و زیاد بوونەوەی سلفە بۆ ئەم وڵاتە پێش بینی دەکرا. پرسیاری سەرەکی ئەوەیە کە ئایا هاوجووت بوونی ستراکتۆریی گەشە بە پێگەی ئابووری غەنا دەدات؟ بۆ نموونە راولینگ هەندێ گفتوگۆی لەگەڵ کۆمپانیا فرە رەگەزەکان (کە لەم وڵاتەدا کاریان دەکرد) بۆ گرێ دانی گرێبەستی باشتر ئەنجامدا و ئەنجوومەنی کاتی بەرگری نیشتیمانی بۆ کونترۆڵی نرخەکان راسپێردرا بەمجۆرەش نرخی گەنمەشامی ٣٧٪ و نرخی رۆن ٦٩٪ دابەزی و جووتیارانی غەنا بۆ بەرهەمێنانی زۆرتر هاندران راولینگ نرخی کاکاویش تا نیوە دابەزاند.

ئەم چالاکییانە بۆ ئابوور کەم بوون سەرەڕای ئەمەش بەرەنگاربوونەوەی وشکەساڵی و گەڕانەوەی هەزاران غەنایی کە بۆ نیجر دوور خرابوونەوە بارودۆخی ئابوورییان ناڵەبار کرد. نرخی کەمی بەرهەمەکان لە سەردەمی راولینگدا، بوو بە هۆی پەیدا بوونی مەیل بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکان لە بازاڕە فەرمییەکاندا و لە ئەنجامدا بەرهەمهێنان زۆرتر دابەزی و بڕی ئەمەشدا بازاڕی رەش و قاچاغ پەرەی سەند. سەرسووڕهێنەر ئەوە بوو کە دابەزینی بەرهەمهێنان بوو بە هۆی بەرزبوونەوەی بێ وێنەی نرخی کاکاو دەوڵەتیش بە هۆی ئەوەی کە نرخی کەمی بەرهەمەکان، جووتیارانی لە فۆرمی فەرمی بەرهەمهێنان وەدەردێنا، نەیتوانی بەرنگاری بەرزبوونەوەی نرخی کاڵاکان بکات بەڵام تا رادەیەك دەوڵەت کونترۆڵی بازاڕی بەدەستەوە بوو تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٢ کۆدەتاگەلێك دژی رژێمی راولینگ روویاندا و سەرمایە گوزارە دەرەکییەکان هەڕەشەی کشانەوەی سەرمایەیان لەم وڵاتە کرد و وڵات بە توندی نیازمەندی یارمەتی دامەزراوە یارمەتیدەرەکانی نێودەوڵەتی بووە بە سەرهەڵدانی ئەم ئاماژانە



ئەنجوومەنی کاتی بەرگری نیشتیمانی رێڕەوەکەی گۆڕی و راولینگ ناچار بە جێبەجێ کردنی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی بووە.

ئەنجوومەنی کاتی بەرگری نیشتیمانی لە ساڵی ١٩٨٣دا گۆڕانکاری بەرفراوانی بۆ ئازادی ئابوور ئەنجامدا و پلانی چاکسازیی وەك گۆڕانێکی لە سەداسەد لەپێناو بەردەوام بوونی شۆڕش هەژمار کرد، راولینگ داوای لە گەلی غەنا کرد کە لەپێناو وڵاتەکەیاندا زۆرتر بەرهەم بهێنن و رایگەیاند کە بەرهەمهێنان تەنیا بە رێگەی رەنج کێشان بەدەست دێت و ئەمەش بابەتێك بوو کە تیایدا ئابووری نیولیبڕاڵ بە وەرچەرخانێکی تەواو پۆپۆلیستی ئەنجام درا. ئەم کارەش بەپێی راسپاردەی بانکی جیهانییەوە ئەنجامدرا و یەکەمین کاریش بۆ جێبەجێ کردنی ئەم پلانە بەرزکردنەوەی ٦٧٪ لە نرخی کاکاو (بۆ جووتیاران) بوو هەروەها پارەدانی کاش بۆ چاندنی داری کاکاو پێشنیار کرا و پەینی لە بەین بردنی ئافەت بە جووتیاران درا و ئەمەش بەو مانایە دێت کە هەنوکە نرخەکانی بازاڕ لە ئابووری فەرمیدا رۆڵیان هەبوو و جووتیاران ئامادەی بەرهەمهێنان بۆ بازاڕی فەرمی (دەوڵەتی) بوونەوە. هەروەها ئازاد سازی لە کەرتی بازرگانی و دراوی نیشتیمانی ئەنجامدرا. بۆ نموونە کونترۆڵی نرخەکان لەلایەن دەوڵەتەوە لە سەر گشت کاڵاکان (تەنیا پێنج کاڵا نەبێ) تا ساڵی ١٩٨٥ بە تەواوی نەما. بەهای دراو لە ساڵانی نێوان ١٩٨٢ تا ١٩٨٨ تەنیا ٢٪ دابەزی.

گۆڕانکاری زۆریش لە کەرتی گشتی وڵاتدا روودرا، ٨٠ پۆستی حکومی بۆ بەتایبەت کردن (خعصە) تەرخان کران و حکومەت هەوڵی دەدا بۆ بەتایبەت کردنی گشت کەرتە حکومییەکان (بە رێزپەر کردنی ١٨ پۆستی گرنگ). تا ساڵی ١٩٩٥، ١٩٥ کۆمپانیای کەرتی گشتی داخران و هەندێ لەم کۆمپانیانەش بە کۆمپانیا فرە رەگەزەکان فرۆشران. هەڵبەت رژێمی راولینگ بە چالاکانە هانی سەرمایەگوزاری کەرتی تایبەتیدەدا. وەزیری ئابوور (بۆتچوی) هەوڵی گەرەنتی کردنی دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی دەدا تا بە بەرژەوەندییەکان لە کاتی گواستنەوە بۆ هاوپشکە دەرەکییەکانی رووبەڕووی کێشە نەبێتەوە.

غەنا بە خێرایی چاکسازیی نیو لیبڕاڵی کە لە ئەنجامی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی سەپێنراو لەلایەن دامەزراوە داراییەکانەوە، جێبەجێ کرد و ئەم وڵاتەی کردە وڵاتێکی سەرکەوتوو و پێشرەو لە جێبەجێ کردنی ئەم پلانەدا. ئەگەرچی رژێمی راولینگ هەوڵی کەمی بۆ پلانی بەتایبەتکردنی (بە هۆی پرس و دامەزراوە ژێر دەسەڵاتەکەی) دا، (بەڵام) بانکی جیهانی و سەندوقی نێودەوڵەتی دراو داوای لە وڵاتانیتری کرد تا درێژە بە رێگەی غەنا بدەن

ئەنجوومەنی کاتی بەرگری نیشتیمانی ئیعتباراتی زۆری لە رۆژئاوا وەرگرت و سلفەی گەشەپێدان بۆ ئەم وڵاتە رێژرا، هەرچەند کە پرسی سەرەکی ئەوە بوو کە بەرنامەی (چاکسازی) لەگەڵ هەمەوارکردنی ستراکتۆریی راستەقینە، بارودۆخی ئابووریی غانا بەهێز بێ گومان چاکسازیی پلانی هەمەوارکردنی ستراکتۆریی بوو بە هۆی سەقامگیری ئابووری وڵات و ئابووری ئیفلاس هاتوویساڵی ١٩٨٢ی نۆژەن کردەوە و تا رادەیەکیش ئابوور بووژایەوە نرخی کاڵا بەرهەم هێنراوەکان بەرز بووە و لە ئەنجامیشدا داهاتی جووتیاران بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەرز بووە بۆ نموونە درووینەوەی کاکاو لە ساڵانی نێوان ١٩٨٣ تا ١٩٩٠، ٦٥٪ بووژایەوە و نرخی گاریتە، بۆکسیت، مەنگەنز و ئەڵماسیش بەرز بوونەوە، لە ئەنجامدا داهاتە بەدەستهاتووەکان لە هەناردەکردن بە درێژایی پلانی هەمەوارکردنی ستراکتۆریی ساڵ لە دوای ساڵ بەرزبووە کەم هاتنی بوودجە لە ٤٣ ٪ بەرهەمی ناپوختەی نیشتیمانی لە ساڵی ١٩٨٥ دا بە ٣٪ لە ساڵی ١٩٨٧ گەیشت و تەنانەت هەندێ رکوردیشی تۆمارکرد).

ئەگەرچی هەنوکەش جێی مشتومڕە کە بۆچی پلانی هەمەوارکردنی ستراکتۆریی کاریگەری کەمی بەسەر سەقامگیری ئابووردا هەبووە بە بڕوای، هیچ خاڵێکی بازدان بۆ گەشەی هەمە لایەنی ئەم وڵاتە (غەنا) بوونی نەبوو ئابووری وڵات بە توندی پشتبەستراو بە نرخی کاکاو و گاریتە و کەرەستەکان بوو، کە نرخی نێودەوڵەتی ئەم کاڵانەش لە هەڵبەز و دابەزیندا بوو بۆ نموونە نرخی کاکاو لە قۆناغی جێبەجێ کردنی پلانی هەمەوارکردنی ستراکتۆریی بە هۆی زیاد بوونی بەرهەمهێنان و بێ بەها بوونی دراوی باو نەتەنیا لە غەنا بەڵکو لە گشت ئەو وڵاتانەی کە ئەم پلانەیان جێبەجێ دەکرد دابەزی لە ئەنجامدا غەنا ناچار بە زیاد کردنی بەرهەمهێنان بەمەبەستی بەدەستهێنانی هەمان دەرامەت بوو ئایا نابێ جووتیاران بە بەرهەمهێنانی بەرهەمەکانیان، سوودی بەدەست هاتوو لەم بەرهەمانە خودی خۆیان خەرج بکەن؟ بە دوای ئەمەش قەرزەکانی غەنا زۆر بووەوە، لە ئەنجامدا بەپێی نرخی هەنوکەیی، دەیان ساڵ دەخایەنی کە غەنا پابەندییەکانی هەڵقۆڵاو لە دانەوەی قەرزەکانی بە ئاستێکی پەسەندکراو بگەیێنێت خاڵی دەستپێك بۆ ئابوور، هێرشی سەرمایەگوزاری دەرەکی بوو، ئەگەرچی سەرمایەی نێودەوڵەتی بە هۆی لاوازی بەردەوام و نەبوونی گەشەی شایانی باس لە درێژخایەندا! بە ناشیاوی لە ئابووری وڵاتدا کاری کردووە تەنانەت چاکسازییەکانی هەمەوارکردنی ستراکتۆریش نەیتوانی ئەفریقیا بە رووی کۆمپانیا فرە رەگەزەکان سەرنجڕاکێش بکات بە کورتی لەوانەیە هەمەوارکردنی ستراکتۆریی ئابووری غەنای گۆڕیی بێ، بەڵام نەیتوانی چارەسەرییەك بۆ



خێراکردنی (گەشەی) بناغە لاوازەکانی ئابوور بدۆزێتەوە. هەروەها هەمەوارکردنی ستراکتۆریی کاریگەری گرنگی بەسەر سیستەمی سیاسی غەنادا هەبووە، چاکسازییەکانی هەمەوارکردنی ستراکتۆریی لەگەڵ سیستەمی دەرەبەگایەتی هەڵقۆڵاو لە ئەنجوومەنی کاتی بەرگری نیشتیمانی، تەواو ناکۆك بوو. بۆ نموونە ٤٠٪ کرێکارانی کەرتی کاکاو کەم بوونەوە و نزیکەی ٣٦٠٠ پیشەی خزمەتگوزاریی شار و رێژەیەکی بەرفراوانی فەرمانبەرە گشتییەکانیش کەمبوونەوە. کرێکارە پیشەسازییەکان لە ئەنجامی کاریگەری پلانی سەرمایەگوزاریی جێگرەوەی فرە بەخشینی (تنوع) بە ئابوور سیستەمی تەعرفەیان بڕدرا یا خۆد گۆڕانی بەسەرداهات، چینی پسپۆر و بەڕێوەبەران (دوکتۆر، پەرەستار، مامۆستا، فەرمانبەر، مامۆستایانی زانکۆ) ناچار بوون بەرەنگاری کەمبوونەوەی خزمەتگوزارییە گشتییەکان ببنەوە. ئەوانەی کە پێشتریش ئەم خزمەتگوزارییەیان بۆ تەرخان کرابوو، رووبەڕووی ئەم گرفتە بوونەوە و بۆ نموونە رێژەیەکی زۆری قوتابیانی زانکۆ نەیاندەتوانی خەرجی خوێندن بدەن. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە رێژەیەکی زۆری خەڵك لە پەروەردە و تەندروستی بێ بەش کران. نەهێشتنی سوبسیدی کاڵا خۆراکییەکان و کاڵاکانیتر ئەم کێشەیان دوو چەندان کرد، پلانی درەنگ وەختی (کار بۆ ئوغرەیی و کەمکردنەوەی تێچوونە کۆمەڵایەتییەکان) (( Adjustment costs of the social Mitigate Action to program of pamsad تا رادەیەك، هەندێ لە خەڵکی غەنای لە شیاویتی چاکسازییەکانی هەمەوارکردن رەزامەندکرد. ئەنجوومەنی کاتی بەرگری نیشتیمانی رووبەڕووی دژایەتی توندی گرووپە نارازییەکان بووە، چونکە پەیڕەوانی پێشووی نوخبەکانی دەوڵەت کە پێشتر پشتبەستراو بە دەوڵەت بوون، هەنوکە دژایەتییەکەیان وەدەر دەخست. ئەگەرچی سەرەتا دەوڵەت توانی نەیارانی لە رێگەی سەرکوتکردنەوە کونترۆڵ بکات بەڵام پاش ماوەیەك گوشار بۆ گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان بە ترۆپك گەیشت و بزاڤگەلی دیسپلین کراو بەرەنگاری ئەم بارودۆخە ناڵەبارە بوونەوە و خوازیاری بەرقەرارکردنی دیموکراسی فرە پارتی بوون (ئەمەش بە دوای بزاڤی بەرفراوانی هێنانەدی پۆلۆرالیزم). لە ئەنجامدا رژێمی راولێك لە هەمبەر ئەم گوشارانەدا ملکەچ بوو لە سەر هەڵبژاردنی ئازاد رەزامەندنی نواند و ئەنجوومەن بەم ئەنجامە گەیشت کە پێویستە پشت بە پشتیوانی گوندەکان ببەستێت تا بتوانی لە هەڵبژاردندا سەرکەوتن بەدەست بێنێت، ئەمەش بە جۆرێك کە هاوکات گوشاری سەر نارەزامەندە شارنشینەکان کەم بکرێتەوە. راولینك لە ساڵی ١٩٩٢دا بە مسۆگەر کردنی ٥٨٪ دەنگەکان سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەهۆی ئەم سەرکەوتنە و مەشروعییەتی

نوێ بۆ رژێم (هەروەها پشتیوانی وڵاتانی رۆژئاوا بە هۆی گەڕانەوەی دیموکراسی بۆ وڵات) ئەم ئەفسەرەی هێزی ئاسمانی هێزەکەی بۆ گونجان لەگەڵ هاوڵاتیان گۆڕانی تێداکرد و لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٦دا راولینگ دووبارە دەسەڵاتی گرتە دەست تا لە ساڵی ٢٠٠٠ دا خانەنشین کرا. بە رویشتنی ئەم ((سوپەرمانە)) لە یاسای بنەڕەتی نوێدا، خولی سەرۆکایەتی بۆ دوو خولی کورت کرایەوە و بەرهەڵستکاران توانییان تاڕادەیەك لە سەرەتای نەوەدەکاندا ئەنجومەنی کاتی بەرگری نیشتیمانی شکست بدەن و دەسەڵات بگرنە دەست.

**غەنا:**

| | |
|---|---|
| رووبەر | ٢٣٣/٣٠٥ کیلۆمەتری چوار گۆشە |
| دانیشتوان | ١٨/٩ ملیۆن کەس |
| هێزی کۆلۆنیالکار | بریتانیا |
| ساڵی سەربەخۆیی | ١٩٥٧ |
| گرنگترین شارەکان | ئاکرا (پایتەخت)، کیوماسی، تا مالی |
| نەژاد | ئاکان، گا، ئێوی، گیان، مۆشی، داگۆمبا |
| زمان | ئەنگلیزی، تویی، فانتی، گا، ئێوی |
| دانیشتوانی شار | ٣٨/٤ |
| ناوەندی ژیان | ٦١ ساڵ |
| رێژەی مردن | ٦١/٧ مردن لە هەر ١٠٠٠ لە دایکبوون |
| رێژەی خوێندەواری | ٦٦/٤ |
| ئایین | سوننەتی، ئیسلام |
| هەناردە | زێڕ، کاکاو، گاریتە، ماسی |
| دراو | سیدی |
| ساڵانەی ناپوختە نیشتیمانی | ٢٦٨/١ دۆلار |

زاراوە سەرەکییەکان

سوود قەرز: بەرژەوەندییەکانی هەڵقوڵاو لە سلفە و دانەوەی سلفە



## ستراتیژی جێگرەوەی:

**هاوردەکا:** ستراتیژییەکی ئابوورییە هەوڵ دەدات تا وابەستەیی (بتیعە) دەوڵەت بە کاڵا هاوردەکانی دەرەوە کەم بکاتەوە و کاڵا بەرهەمهێنراوەکانی ناوخۆ جێگرەوەی ئەم کاڵانە بکات.

**دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی:** دامەزراوە ناحکومییەکان کە رێسامەندانە یارمەتی ئابووری نێودەوڵەتی دەدەن. (سەندوقی نێودەوڵەتی دراو و بانکی جیهانی).

**تۆڕی بەرفراوای بازاڕ:** دامەزراوە حکومییەکانی بەرپرس لە کڕینی بەرهەمی، بەرهەمهێنەران و بەرپرسی فرۆشتنەوەی ئەم بەرهەمانە لە بازارەکانی جیهاندا.

**ئابووری تاك بەرهەمی:** ئابوورگەلی پشتبەستراو بە هەناردەکردنی کاڵا سەرەتاییەکان و بەرهەمەکانیان لەپێناو دابین کردنی داهاتی دەوڵەت.

**کۆلۆنیالی نوێ:** چەوسانەوە و کونترۆڵ کردنی ئابووری وڵاتانی کۆلۆن لەلایەن زلهێزەکانەوە کە هەنوکەش لە کۆلۆنەکانی پێشوودا بوونیان هەیە. دامەزراوە گەورەکانی دەوڵەتی: کۆمپانیا و دامەزراوەکانی کەرتی گشتی دەوڵەت وەك تۆڕەکانی بازاڕ دۆزینەوەی دەوڵەتی و کۆمپانیاکانی گواستنەوە.

کەرتی بەرهەمهێنەری **کاڵا سەرەتاییەکان (کەرەستەی خاو):** چالاکییە ئابوورییەکانی کاڵا سەرەتاییەکان (وەك کشتوکاڵ و کانەکان) نەك کاڵا پیشەسازییەکان و کەرتی خزمەتگوزاری.

نرخی دراوە بە بەرهەمهێنەران: نرخی دراوە بە یەکەمین بەرهەمهێنەرانی کاڵا لەلایەن دامەزراوە حکومییەکانەوە.

پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی (SAP): ستراتیژی ئابووری نیولیبراڵ کە بە درێژای هەشتا و نەوەدەکان لەلایەن دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتییەوە جێبەجێ کرا.

هاوسەنگی (موازنە) بازرگانی: رێژەی داهاتی دەوڵەت لە هەناردەکان بە لێدەرکردنی تێچوونی هاوردەکان.

ئاڵوگۆڕی نایەکسان: جیاوازی نرخی کاڵا سەرەتاییەکان لە ئابووری وڵاتاندا (وڵاتانی پیشەسازیی بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی جیهانی سێیەم) واتە فرۆشکارانی کاڵا سەرەتاییەکان (وڵاتانی جیهانی سێیەم) لە ئابووری جیهاندا بەرهەمەکانیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن و بەڵام کاڵاکانی بەرهەمهێنراوی وڵاتانی رۆژئاواییی لە هەمان بازاڕدا بە نرخێکی بەرز دەکڕنەوە.

ئاوردانەوە لە توێژی شارنشین: ئەنجامی سیاسەتی کۆلۆنیالگەرایانەی دەوڵەت کە تیایدا داهاتی بەدەست هاتوو لە کەرتی لادێیی بۆ سوبسید و چالاکییە ئابوورییەکانی، لە کەرتی شاردا تەرخان دەکرا.

بەرپرسیارێتی بەکاربەر: واتە هاوڵاتیان بە هۆی بەکارهێنانی خزمەتگوزارییە گشتییەکان ناچارن باج بدەن. ئەم پلانە لە ڕێگەی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆرییەوە بەهێز کرا.

پرسیارەکان:

١. ئابووری نێودەوڵەتی تا چ ئاست لەمپەرە لە بەردەم گەشەی ئابووری ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال؟

٢. چۆن وڵاتانی ئەفریقیا قەرزداری وڵاتانی ڕۆژئاوایی بوونەوە؟

٣. چاکسازییە سەرەکییەکانی پەیوەست بە پلانی هەموارکردنی ستراکتۆیی چین؟

٤. ئایا پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی بووە بە هۆی بووژانەوەی ئابووری لە کیشوەری ئەفریقیادا؟

٥. هەموارکردنی ستراکتۆریی چ کاریگەری سیاسی و کۆمەڵایەتی لەم کیشوەرەدا هەبووە.

## بۆخوێندنی زۆرتر:

بۆ زانینی ئەوەی کە بۆچی دامەزراوە داراییە نێوەوڵەتییەکان وای بۆچوون کە جێبەجێ کردنی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی لە ئەفریقیادا پێویستە، باشترین خاڵی دەستپێك بۆ ئەم بابەتە دوو ڕاپۆرتی بانکی جیهانییە کە هەردووکیان سوودمەندن، ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٨١ی (برگ) لەسەر چوارچێوەی سیاسەتەکانی هەموارکردنی ستراکتۆری ئەفریقیادا ورد بووە و ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٩٤ توێژینەوەیەکی سەرەتاییە سەبارەت بە کاریگەرییە سەرەتاییەکانی ئەم سیاسەتە.

به درێژایی ساڵانی هەشتا و نەوەدەکان چەندین وڵاتی ئەفریقیا رووخانی حکومەتیان بەخۆوە بینی و دەکرێ هەندێ وڵاتیتریش بە وڵاتانی لە دۆخی رووخاندا وەسف بکەین. ئاسایش شایانی گەرەنتی کردن نەبوو. دامەزراوە سیاسییەکان بەرەو رووخان بوون و خزمەتگوزارییە گشتییەکان بەخێرایی کەم بوونەوە، بەکورتی حکومەتەکانی ئەفریقیا هەوڵیان دەدا بۆ جێبەجێ کردنی سەرەتاییترین رۆڵی دەوڵەتی مۆدێرن. بەشە رابردووەکان یارمەتیدەرن بۆ روونکردنەوەی ئەوەی کە بۆچی ئەم لایەنەی قەیران سەری هەڵداوە میراتی کۆلۆنیالی، هەر لە سەردەمی سەربەخۆییەوە هەرەسیان پێ هێنابوو. ئەم کیشوەرە لە رووی پێگە لە ئابووری نێودەوڵەتیدا دواکەتوو بوو و کۆتایی هاتنی شەڕی سارد هەڵەکانی راکێش کردنی سەرمایەی دەرەکی سنووردارکرد فاکتەرە دەرەکییەکان تا رادەیەك کاملبوونی قەیرانی دەوڵەتی دوای کۆلۆنیال روون دەکاتەوە لەم بەشدا فاکتەرگەلی زۆرتر لە فاکتەرە ناوخۆییەکانی نارەزامەندی لە ئەفریقیادا روون دەکرێتەوە، هەروەها ئەم بەشە بە سەر فاکتەری وەك چۆن نوخبەکانی دەوڵەت لە چاودێری و گەشەپێدانی ئابوورێکی سەرکەوتوو شکستیان هێنا و هەروەها چۆن دەکرێ دەوڵەتەکان بێن بە نوێنەری شیاو بۆ کۆمەڵگاکانیان، جەختیان لێ دەکاتەوە.

دوو قەیرانی کەڵەکە بوون و حکومەتداری ببوون بە هۆی هێنانەدی قەیرانێکیتر واتە قەیرانی مەشروعییەت لە بابەتی دووەمی ئەم بەشدا کە چوون نەمانی مەشروعییەت هانی رەگەزەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەدات بۆ جیابوونەوە لە دەوڵەت، روون کراوەتەوە ئەفریقییەکان هەوڵیانداوە تا مەوداکەیان لەگەڵ حکومەتە چەوسێنەرەکان بپارێزن و ئەنجامی ئەم جیاکارییەش. کەمبوونەوەی قەبارە (ظرفیت) کونترۆڵی دەوڵەتە، بە هاتنەئاراوەی ئەم بارودۆخە، پێویستە دەسەڵاتی سیاسی وەك گریمانەی ئەم بەشە هەڵبژێرین.

دەسەڵاتی دەوڵەت پەیوەندییەکی دەروونناسانەیە لەنێوان دەوڵەت و تاکەکانی ژێر سەروەریدا و ئەم بۆچوونە بە بوون دێنێت کە پێویستە ملکەچی هێز و دامەزراوەکانی دەوڵەت بن. دەسەڵات هەروەك لە بەشی پێشوودا روون کرایەوە، دەتوانی لە دوو سەرچاوە بەرهەم بهێنرێت مەشروعییەت و سەرکوتکردن دەسەڵاتی مەشروع لە رێگەی دەستەبەرکردنی رەزامەندی گەل لە رێگەی دابین کردنی ئاسایش و خۆشگوزەرانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و حکومەتی ویستراو (مطلوب) بەدەست دێت. حکومەتە مەشروعەکان بە هۆی بڕوای هاوڵاتیان بەوەی کە ئەوان بەرژەوەندی دوو لایەنە لە رێگەی جێبەجێ کردنی یاساکانەوە بە دەست دێنن، پەیڕەوی دەکرێن. بەڵام دەسەڵاتی سەرکوت لە رێگەی هەڕەشەکردن لە (بەکارهێنانی) توندوتیژی



بەدەست دێت و هاوڵاتیان داواکاری و خواستەکانی دەوڵەت بە هۆی ترس لەو شتەی کە لەوانەیە بە هۆی ئەنجام نەدانی ئەم (داواکارییە) روو بدات، ملکەچی (دەوڵەت) دەبن گشت دەوڵەتانی جیهان لە تێکەڵ کردنی ئەم دوو فاکتەرە واتە رەزامەندی و گوشار (مەشروعییەت و سەرکوتکردن) بۆ پاراستنی دەسەڵاتیان بەسەر کۆمەڵگادا سوود وەردەگرن، تێکەڵێك لەم دوو هێزە، سەقامگیری سیاسی گەرەنتی دەکات، ئەگەرچی کاتێك کە مەشروعییەتی سیاسی کەم ببێتەوە و دەوڵەتان نەتوانن سەرکوت بەکاربێنن، دەسەڵات تووشی مەترسی دەبێتەوە و ئەمەش ئەو شتەیە کە لە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا، لە هەشتا و نەوەدەکاندا روویدا.

## قەیرانی لە رادەبەدەری مەشروعییەتی دەوڵەت:

به درێژایی دوو دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم، مەشروعییەت کێشەیەکی گەورە بۆ زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا بوو. هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا، توانایی سەرکوتکردنی دەوڵەت کەم بووە، لە ئەنجامدا دەوڵەتەکان بۆ راگرتنی دەسەڵاتیان بەسەر گەڵ و خاکدا ئەزموونگەلی دژواریان تێپەڕاند، دوو فاکتەری سەرەکی بۆ کێشەکانی دەوڵەت شایانی ئاماژە پێدانە. قەیرانی کەڵەکە بوون و قەیرانی حکومەتداریی ئەفریقییەکان لە سەردەمێکی نەچەندان دووردا سەرکردەکانیان مەیلدار و بە توانا بۆ هێنانەدی خۆشگوزەرانی ئابووری و نوێنەری ئامانجە سیاسییەکانیان نەدەزانی، بەم پێیەش تاك کەمتر مەیلدار بوو بۆ رێزگرتن لە دەسەڵاتی دەوڵەت، یەکەمین بابەتی ئەم بەشە باس لە قەیرانی کەڵەکە بوون و دواتر قەیرانی حکومەتداری دەکات.

## قەیرانی کەڵەکە بوونی سەرمایە:

تەنانەت روانینەکی سەرەتایی بۆ ئامارەکان دەردەخات کە ئەگەرچی ئەفریقیا لە رووی سەرچاوە سروشتییەکانەوە کەم و کوڕی نییە، بەڵام هەژارترین کیشوەر لە جیهاندایە بۆ نموونە ئەم کیشوەرە خاوەن ٤٠٪ پتانسیلی هیدرۆلێکی جیهان بۆ بەرهەم هێنانی کارەبایە هەروەها ١٢٪ گازی سروشتی و ٨٪ نەوتی جیهانی هەیە و ٧٠٪ قاوەی جیهان بەرهەم دێنێت، خاکی ئەم کیشوەرە لە رووی کەرەستەکان دەوڵەمەندە و لە هەندێ ناوچەشدا خاکی بە پیتی هەیە. بەڵام بۆچی بە بوونی ئەم سەرچاوانە، کارکردنی ئابووری ئەفریقیا لە سەردەمی دوای کۆلۆنیال زۆر لاواز بوو. دەکرێ وەڵامی ئەم پرسیارە لە قەیرانی کەڵەکە بووندا بدۆزینەوە.

گشت وڵاتان بۆ گەشەکردن ناچار بە کۆکردنەوەی سەرمایەن و زیادە سەرمایەش دواتر بۆ سەرمایەگوزاری لە ئابووردا بۆ بەرهەمهێنانی زۆرتری سەرچاوەکان، سەرمایەگوزاری دەکرێت بەم پێیەش کلیلی پێناسە کردنی گەشەسەندن کۆکردنەوەی زیادە سەرمایەیە کە لە ڕێگەی سەرمایەگوزاری بەرهەمهێنانەوە وەگەر دەخرێ، ئەگەر ئەم جوڵە لە کەڵەکە بوونی ئابوور و سەرمایەگوزاری بەرهەمهێنان درێژە بکێشێ خۆشگوزەرانی گشتگیر دەبێت.

گرفتە ئابوورییەکانی ئەفریقیا لەم حەقیقەتە هەڵدەقوڵێت کە کەڵەکە کردن کەمە و سەرمایەگوزاری بەرهەمهێنانیش دەگمەنە لە بەشی نۆیەمدا فاکتەرە دەرەکییەکان کە ڕێگەی پرۆسەی کەڵەکە کردنی سەرمایە بوو ڕوونکردیەوە ئابووری پشت بەستراو بە هەناردەی تاك بەرهەمی ئاڵوگۆڕی نایەکسان و دابەزینی نرخی کاڵا، گشتیان لەمپەری سەرەکین لە بەردەم گەشەسەندن لە ئەفریقیادا بۆیەش گەشەنەسەندن لە ئابووری نێودەوڵەتیدا ناتوانێ وەك فاکتەرێکی تەواو (جامع) لە ڕوونکردنەوەی بارودۆخی ئەم کیشوەرە بێت، ئەگەرچی ئەفریقیا پشکێکی دادپەروەرانەی لە پشك و بەرژەوەندی جیهانی بەدەست نەدەهێنا، (بەڵام) بەلانی کەمەوە هەندێ دەرامەت لە ڕێگەی فرۆشی بەرهەمە خاوەکان و کەرستەکان بەدەست دەهاتن و ئەم سەرچاوانەش لەگەڵ سلفەکان لە پرۆژەکانی گەشەسەندندا سەرمایەگوزاری کران. ئەم گرفتانە لە ئەنجامی ئەوەن کە زۆربەی ئەم سەرمایەگوزارییانە نابەرهەمهێنەرن، سەرمایەی نەتەوەیی بە هۆی سەرمایەگوزاری لە کەرتی نابەرهەم هێنەر بە فیرۆ چوو بە ڕوانین بۆ ڕابردوو، دوو ستراتیژی هەڵەی گەشەکردن بە ئاسانی دەبینرێن، یەکەم، هەندێ وڵاتانی ئەفریقیایی جەختی زۆریان لە سەر جێگرتنەوەی هاوردەکان دەکردەوە و دووەمیش ڕێژەیەکی زۆری داهاتیان بۆ پەرەسەندنی دامەزراوە حکومییەکان تەرخان کرد و خراپتر و وێرانکەرتر ئەوەیە کە ستراتیژییەکانی سەرمایەگوزاری لە کەرتی گشتی و پیشەسازییەکاندا بە داهاتی زیاد بوونی بەرهەمهێنانی بەرهەمەکانی کشتوکاڵی ئەنجامدرا، جێگرتنەوەی هاوردەکان بوو بە چەقی پلانی گەشەپێدانی زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا. ئەم بیرۆکەیە پشتبەستراو بوو بە جۆراوجۆر (تنوع) کردنی ئابوور و ڕزگار بوون لە بەرهەمهێنانی بەرهەمە سەرەتاییەکان و پەرەپێدان بە بەرهەمەکانی کەرتی بەرهەمهێنەر. ئەمەش یارمەتیدەر بوو بۆ پشت بە خۆ بەستنی ئابووری و کەم بوونەوەی وابەستەیی ئەم کیشوەرە بە هاوردەکردنی کاڵاگەلی بەرهەمهێنەر سەرەڕای ئەمەش ئایا ڕۆژئاوا لە ڕێگەی جۆراوجۆر کردنی بەرهەمەکانی کشتوکالی بەرەو بەرهەمە پیشەسازییەکان هەنگاوی نەنابوو؟ ئابووریناسان هەم لە وڵاتانی گەشەسەندوودا و هەمیش لە



وڵاتانی لە دۆخی گەشەسەندندا ڕێك بوون (کۆدەنگ بوون) کە ئەمە گونجاوترین ڕێگا بە ئاراستەی مۆدێرنیتەیە گرفت ئەوە بوو کە زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە پرۆژەی جێگرتنەوەی هاوردەیان لە بەردەست دا بوو ناشیاو و ناکارامە بوون.

یەکە بەرهەمهێنەرە گەورە و زەبەلاحەکان زۆرتر وەك پرۆژەگەلی زۆر تێچوون ((فیلە سپیەکان)) و بێ سوود سەریان هەڵدا کە گونجاوی سروشتی گەشەنەسەندوو سەرمایەگوزارانی ئابووری ناوخۆ نەبوون بۆ نموونە ترومپێلە دروستکراوەکان بە دوایین تەکنۆلۆژیا کاتێك کە ئەفریقییەکان توانای کڕینی بەرهەمەکانی بەرهەمهاتووی ئەم ئۆتۆمبێلەیان نەبێ، سوودێکی کەمیان هەیە هەڵبەت سەرسوڕهێنەر ئەوەیە کە زۆربەی تەکنۆلۆژیا و کەرەستەی پێویست بۆ وەگەرخستنی هاوردە جێگرەوەکان دەبوایا لە ڕۆژئاواوە هاوردە بکرێن. ئەنجامیش ئەوە دەبێت کە کارگە خۆجێیەکان ناتوانن ئەم پێداویستییانە دابین بکەن. بە خواستی سنوورداری خۆجێیی و کاڵا بێ ڕکابەر لە بازاڕەکانی جیهاندا، زۆربەی ئەم پیشەسازییانەی جێگرەوەی هاوردەکان لە بری ڕزگارکەر بوون بارێکی قورسیان بە سەر ئابووری ئەفریقیادا سەپاند.

دارایی سەرمایەگوزاریکراو لە جێگرەوەی هاوردەکاندا بە وردی لە کەرتی کشتوکاڵیدا سەرمایەگوزاری دەکرێن، چونکە بە هەرحاڵ ئەم کەرتە، کەرتێکە کە زۆربەی ئەفریقییەکان ژیانیان لەم کەرتەدا دابین دەکرێ، جۆراوجۆر کردنی بەرهەمەکانی کشتوکاڵی بە دوور لە هەناردەکردنی بەرهەمە خاوەکان و گۆڕینیان بۆ کاڵای بەرهەمهێنەری پێویست بۆ خواستی ناوخۆیی (وەك خۆراك) لەوانەیە ببێتە هۆی دابین کردنی سامانێکی زۆرتر بۆ ڕێژەیەکی بەرفراوانی خەڵك، لە بری ئەمەشدا کەرتی کشتوکاڵ باجی قورس دەدات و ڕێژەیەکی گەورە لە گشت پرۆژەی پیشەسازی بوونی لە ئەستۆدایە بۆ نموونە بەرفراوان بوونی بازاڕەکانی دەوڵەتی کە لە ڕێگەی فرۆشتنی بەرهەمەکانی وڵاتەوە بووە بە تاك جەمسەری دەستی بەسەر بەرهەمی جووتیاراندا بە نرخی کەمتر لە نرخی بازاڕ، گرت، ئەوان لە جیاوازی ئەو بڕە پارەیەی کە بە جووتیارانیان دەدا و ئەو داهاتەی کە لە بازاڕەکانی نێودەوڵەتیدا بەدەستیان دێنا، گەرەنتی خەرجییەکانی دەوڵەتی (بەتایبەت جێگرەوەی هاوردەکان) دەکرد سەرەڕای دانی پارەیەکی کەم بۆ بەرهەمەکان لەلایەن بازاڕەکانی دەوڵەتەوە، جووتیاران مەیلی کەمتریان بۆ زیاد کردنی بەرهەمی کشتوکاڵیان هەبوو لە ئەنجامدا لە هەندێ ناوچەی ئەفریقیادا دوای شەڕی سارد دروینەوەی بەرهەم زۆر کەم بووە.

بەڕێوەبەرانی دەوڵەت لە کۆکردنەوەی کەڵەکە بوونی سەرمایە بۆ گەشەپێدان، لە کەرتی کشتوکاڵدا بەرپرسیارێتی زۆریان لەئەستۆدایە، هەر ساڵە ئەوان بە سەرکوتکردنی کەرتگەلی زۆر چالاکی ئابووری ناوخۆ، سوودی لە رادەبەدەر بەهۆی جووتیارانەوە بە دەست دێنن. ئەگەرچی کەرتی کشتوکاڵی بۆ بەرهەمهێنانی سەرمایەی جێگرەوەی هاوردەکان لە گوشار دا بوو، بەڵام سەرمایەی گوندەکانیش لەپێناو پەرەپێدان بە کەرتی گشتی بەکار هێنرا، تا هەشتاکان دامەزراوە حکومییەکانی ئەفریقیا زۆر پەرەیان سەند. بۆرۆکراسی زۆر فراوانتر بوو لەوەی کە لە رێگەی ئابووری ناوخۆییەوە پشتگیری لێ بکرێت. بۆ نموونە لە کۆنگۆی برازاویلدا تا ساڵی ١٩٨٥ داهاتی بە دەست هاتوو لە خزمەتگوزارییەکانی شار نزیك ٥٠٪ لە خەرجییەکانی دەوڵەتیان بە خۆوە تەرخان کردبوو. تەنانەت دەوڵەتی کێنیا کە شانازی بە نوێگەرایی کەرتە تایبەتی و گشتییەکانیەوە دەکات دەسترۆییەکەی بۆ گشت کەرتەکانی چالاکی ئابووری فراوان کرد. بۆ نموونە رێچارد سند برۆك بۆی ئاشکرا بوو کە لەساڵی ١٩٨٠دا دامەزراوە و کۆمپانیا یاساییەکان گشت بەکاربەرە گشتییەکانی سوودهێنەر وەك تەلەفۆن، کارەبا، ئاوی بەندەرەکان، خزمەتگوزاریی گواستنەوە (کۆمپانیای هێلی ئاسنی و ئاسمانی کێنیا)ی دەستیان بەسەر داگرتبوو.

کۆمپانیا گشتییەکانیش گیرۆدەی چالاکیگەلی بەرهەمهێنان وەك کشتوکاڵ (کۆمیسیۆنی گۆشتی کێنیا، یەکێتی بەرهەمەکانی شیری کێنیا، دانەوێلە و خۆراکی نیشتمانی)، دارایی (کۆمپانیاکانی کشتوکاڵی) بازرگانی (هاوکاریی بازرگانی نەتەوەیی کێنیا) و پیشەسازیی (هاوکاریی گەشەی بازرگانی پیشەسازیی) بوون. دامەزراوە گشتییەکانی هاوتەریب بە رێژەیەکی فراوان لە گشت کیشوەردا لە چالاکییە ئابوورییەکاندا چالاکن و بەم کارانەش، رێژەیەکی زۆر لە تێچوونە داراییەکان بەدەست دێنن، مومکین بوو ئەم سەرمایە بە شێوازێکی باشتر لە کەرتەکانیتر بەتایبەتیش لە کەرتە بەرهەمهێنەرەکاندا سەرمایەگوزاری کرابان.

لە روانگەی ئایدیۆلۆژێکی چەپەوە، هیچ شتێکی هەڵە سەبارەت بە خاوەنداریێتی گشتی بوونی نییە گرووپی چەپ وەها دەبەلگێنێت کە ئابووری ژێر کونترۆڵی دەوڵەت، دەتوانێت ببێت بە هۆی هێنانەدی هەلی یەکسانی لە شوێنی کار کردندا و ئەمەش دەبێتە هۆی (هێنانەدی) دادپەروەری کۆمەڵایەتی، لە کاتێکدا کە خزمەتگوزارییە گشتییەکان زۆرتر لە خاوەنداریێتی تایبەت، دەتوانێت پێداویستییەکانی کۆمەڵگا دابین بکات ئەگەرچی ئەم پرسەش بە تەواوەتی سەبارەت بە ئەفریقیا ناگونجێ بەڵام لێرەدا، کەرتی گشتی زۆرتر بە هۆی وەڵامدانەوە بە



خواستە سیاسییەکان گەشە دەکات تا بەپێی ئەولەوییەتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان لەم کیشوەرەدا، ئاغا بوو بە هێزی سەرەکی و سیستەمی دەرەبەگایەتی بوو بە نموونەی **(نمووذج)** زاڵ بەسەر ئەم کیشوەرەدا، هەروەك لە بەشەکانی پێنجەم و شەشەمدا بینیمان دەست گەیشتن بە دامەزراوە حکومییەکان، بوو بە کەناڵی سەرەکی بۆ (بەدەست هێنانی) هێز و سامان لە وڵاتانی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالدا. دامەزراندن لە خزمەتگوزارییە گشتییەکاندا، هێزی سەربازی و کۆمپانیاکان لەلایەن نوخبەی فەرمانڕەواوە بەمەبەستی دروست کردنی تۆڕی لایەنگران ئەنجام دەدرا. لە راستیدا گشت دام و دەزگاکان لەبری ئەوەی کە خزمەتگوزارییە گشتییەکان پێشکەش بە هاوڵاتیان بکەن، تۆڕگەلێك لە خزمەتگوزاری دەرەبەگایەتییان دامەزراند، سەرمایەگوزاریی درێژخایەن کە دەبوایا بە ئاراستەی خزمەتکردن بە هاوڵاتیانەوە جێبەجێ کرابان، بوویە قوربانی سەرمایەگوزاری کورتخایەن و بەرژەوەندی هێزە سیاسییەکان. بە بەخشینی پۆستێك لە دەوڵەتدا، رەعیەتەکان زۆرتر هەوڵیان بۆ دامەزراندنی تۆڕێك لە مشەخۆریی دەدا، داهات لە رێگەی گەرەنتی بەکارهێنانی لە خزمەتگوزارییەکیتردا و بەپێی شارەزایی دووبارە بەرهەم دەهێنرێتەوە رەعیەتەکان حکومەت بۆ کاری تایبەت بە خۆیان بەکاردێنن وەك بەدەست هێنانی مۆڵەتی شوفێری، کارتی بازرگانی، سلفە لە بانکی دەوڵەتی (ئەنجام دەدەن) مشەخۆرەکان دەست گەیشتن بە خزمەتگوزارییە گشتییەکان بۆ سوودی تایبەتی (شخصی) بەکار دێنن بۆ نموونە لە ئامرازەکانی گواستنەوەی حکومی دەتوانن وەك تەکسی و یان کەل و پەلی دەوڵەت لە بازاڕی رەشدا بفرۆشن، هەروەها چۆن رەعیەتەکان دەتوانن سوود لە پێگەی خۆیان لە دەوڵەتدا وەربگرن — ئاغاکانیش هەروەك کەسانێك کە گەرەنتی دەکەن کە رەعیەتەکان بۆیان هەیە لە بەرژەوەندییەکانی پۆستەکانیان سوود وەرگرن، پشتگیری سیاسییان لێ دەکرێ. بەم پێیەش (بە هەبوونی) تێبینی سیاسی یاخود پێداویستییە ئابوورییەکانی زاڵ بەسەر ئەم کاربەدەستە جێبەجێکارانە لە دامەزراوەگەل پاشایەتی نوێدا، کارامەیی زۆر لەرزۆك دەبێتەوە، خزمەتگوزارییە گشتییەکان زۆرتر بەپێی دابین کردنی پێداویستی ئاغاکان یان بەپێی پەیوەندی نەژادی و باڵی (نجاح) و نە بە هۆی ئەزموون یاخود توانایی بۆ ئەنجامدانی ئەم پیشەیە پێناسە دەکرێت.

زیاد لەمەش، پێویستی بە دامەزراندنی هاورێبازەکان بوو بەهۆی پڕ بوونی ئەم دامەزراوانە لە فەرمانبەر. لەم رووەوە، بۆروکراسییەکانی ئەفریقیا جیاوازیی بەرچاویان لەگەڵ دامەزراوە یاسایی — عەقلانییەکانی رۆژئاوادا هەیە.

بۆرۆكراسییەكانی لە رادەبەدەر پێشكەوتوو، لەوانەیە سەرمایەگوزارێكی سیاسی باش بۆ نوخبە دەسەڵاتدارەكان بن، ئەوان لە تۆڕی دەرەبەگایەتیدا داشێكی سەرەكین كە دەوڵەت پتەو قایم دەكاتەوە ئەگەرچی لە چاكسازیی ئابووردا. سەرمایەگوزاری كەم لەم میتۆدەدا نابەرهەمهێنەرە ئەم دام و دەزگایانە بەپێی كۆكردنەوەی خزمەتگوزارییە گشتییەكان هەڵدەسەنگێندرێن هەر بۆیەش هیچ سەرمایەیەك كەڵەكە نابێ و بەم پێیەش هیچ سەرمایەیەكی ماددی بۆ دووبارە سەرمایەگوزاری كردن لە بەردەستدانییە. زیاد لەمەش، بۆروكراسی هاڵئاوسێنراو بوو بە هۆی ئیفلاس هێنانی ئابووریی.

پێویستی ماكس ڤێبر بۆ بۆروكراسییەكی یاسایی — عەقلانی بەم هۆیە بوو كە پارەی گشتی و كەلوپەلەكان لە داراییەكانی تایبەتی كاربەدەستان جیا بكرێنەوە بەڵام لە ئەفریقیا دا باس لەم بابەتە نەدەكرا و گەندەڵی ببوو بە فۆرمێك و لە یەك نموونەدا سنووردار دەبوو.

گەندەڵی زاراوەیەكی رێژەییە. شتێك كە لە گشت جیهاندا روو دەدات و ئەو شتەی كە وەك بەرتیل لە ناو كۆمەڵگایەكدا روودەدات، لەوانەیە شتێكی پەسەندكراو و تەنانەت شتێكی چاوەروانكراو لە رەفتاری سیاسی كۆمەڵگایەكیتردا بێت، گومانێكی كەم لەوەدایە كە گەندەڵی لە ئەفریقیا دا شتێكی سەرتاسەرییە. كاربەدەستان پێش بڕیاردانی گونجاو پێویستیان بە بەرتیل و حەقدەست هەیە و بەرژەوندی گشتی دەخرێتە خزمەت بەرژەوەندیی تایبەتدا و كەسانی دەستنیشانكراو لە هەمبەر كەسی شیاودا، لە سەر بنەمای دەرەبەگایەتی دادەمەزرێن و پلەیان پێ دەبەخشرێت. لە زۆربەی بابەتەكاندا تاكە ئاساییەكان كە سوودیان لە خزمەتگوزارییە گشتییەكان دەبینی، بۆیان دەركەوت كە جیاوازییەكی كەم هەیە لەنێوان بەرتیل و دیاری و مافەكانیتری كاربەدەستان.

چاپل و دالۆز سەبارەت بە بەرتیل لە ئەفریقیادا وەك ((سێوی رزیو)) یان چینی بەرتیل خۆر باسی لێدەكەن و لەو بڕوایەدان كە ئەم بەشە لە ژیانی ئاسایی رۆژانە رەگەزێكی چاوەروانكراوی ئەنجامدانی هەر كارێكی كۆمەڵایەتییە زیاد لەمەش لە نەبوونی سیستەمێكی یاسایی — عەقلانی، بۆ تاكەكان، ناعەقلانییە كە لەو سیستەمەی لە دەوروبەریاندا بوونی هەیە، كارنەكەن.

دەكرێ گەندەڵی لە گشت ئاستەكانی دامەزراوە حكومییەكاندا ببینرێت، بۆ نموونە لە لێكۆڵینەوەیەك لە سەر پرۆژەیەكی سەرمایەگوزاری لە كەرتی كارەبای شاردا لە نیجریا، پانتایەكی بەرفراوانی سەرپێچیكاری ئاشكرا بوو. كاربەدەستەكی زۆر بەنهێنییانە لە كەرتی



تایبەتدا دەستیان بە كارەبا گەیشت و لە رێگەی فرۆشتنی كەلوپەل سوودی زۆریان بەدەست هێنا. ئەوان لە رێگەی تەرخانكردنی جیاكارییانەی كارەبا بۆ كەسی تایبەت كۆمپانیا و كۆمەڵگاگەلی لایەنگریان، سیستەمی دەرەبەگایەتییان دروستكرد و هەندێ كاربەدەستیش سەرچاوەی داهاتیان لە خاوەندارێتی و پیشەكانیان گۆڕی (بۆ سەرچاوەیەكیتر) زیاد لەمەش قایمەقامێك توانی لە رێگەی داهاتی نایاساییەوە، ٢٢ كێڵگە و چەندین كۆمپانیای بازرگانی تاك فرۆشی بكڕێت، دەكرێ لە ترۆپكی تۆڕی دەرەبەگایەتیدا گەندەڵی و بەرتیل ببینرێت، بۆ نموونە سەرۆك كۆماری كێنیا، دانیل ئاراپ مۆیی، دەیویست ١٢ فڕۆكەی جەنگی (جێت) بۆ هێزی دەریاوانی وڵات لە ساڵی ١٩٨٠ دا بكڕێت، یەكەم شوێنی كڕین هێزی ئاسمانی بریتانیا بوو، بەڵام هیچ مامەڵەیەك لەم شوێنەدا ئەنجام نەدرا چونكە هێزی ئاسمانی فڕۆكەوانی بریتانیا لە دانی بەرتیل (داهاتی كەسی) بۆ لایەنی بەرامبەر خۆی پاراست ئەگەرچی بریتانیا ئەم كارەی ئەنجام نەدا، بەڵام یارمەتییەكی ١٠٠٠٠٠ فرانكی بە (تۆڕی چالاكی نایاسایی كێنیا) دا، لەبری ئەمەشدا جێتەكان لە كۆمپانیای فەرەنسی مارسل داسل پڕگ كڕدران. لە ئەنجامی ئەم كارەشدا خەرجییەكی زۆر بۆ باجدەران لە كێنیادا بەدیهات ئەو شتەی كە روویدا ئەوە بوو كە كۆمپانیای داسل فڕۆكەیەكی تایبەت وەك بەشێك لەم مامەڵەیە پێشكەش بە سەرۆك كۆمار مۆیی كرد. لە شوێنەكانیتردا، هەندێ لە سەرۆك كۆمار، ساڵانێك بە یاساییانە پارەی گشتییان (پارەی وڵات) خستە حیسابی بانكییەكەیان لە سویسرا. یەكێك لە گرنگترین نموونەكان ((حیسابی چالاكی (بانكی))) مۆبۆتۆ سێ سێ كۆ بوو (روونكردنەوەی زۆرتر لە بابەتی توێژینەوەدا هاتووە) ئەمەش چالاكییەكی گشتی لە سەرتاسەری كیشوەری ئەفریقیادا بوو، ئەویش لەپێناو زیاد كردنی بەرژەوەندی سەركردەكان تا لە بانكە دەرەكییەكاندا سەرمایەگوزاری بكەن و بتوانن دوای دەرچوون لە دەسەڵات بە كاری بێنن، بۆ نموونە بینای جوانی بانكی نیشتمانی لە هەرارەی زیمبابوا سەرەڕای بەكارهێنانی تایبەت و یاسایی لەم بانكە لەلایەن رابرت مۆگابەوە ئەم بانكە لە رووی نیشتیمانییەوە وەك (بانكی) نەهێشتنی ناسەقامگیری (ئابووری) دەناسرێت. ئەگەرچی ئەم بەرژەوەندییانە هەڵخەڵەتێنەر بوون، بەڵام بە سەرهەڵدانی زیانەكانی جێگرەوەی هەناردەكان لە پیشەسازیدا، هەڵئاوسان لە بۆرۆكراسی و تێچوونەكانی داواكارییەكانی لایەنگر و فەرمانبەرە حكومییەكانی گەندەڵ، گومان لەوەدا نییە كە ئەفریقیا بە روونی گیرۆدەی گرفتە ئابوورییەكانی قۆناغی دوای كۆلۆنیال بووەتەوە. سەرەڕای سنووردارێتی ئابووری نێودەوڵەتی، پرۆسەی كەڵەكە كردنی سەرمایەش شكستی

هێنا. بە هۆی بۆروکراسی ناکارامەوە، زۆربەی ستراتیژییەکانی گەشەکردن لە رۆتینییاتی کارگێڕیدا لە بەین چووە، یاخود کەم رەنگ بووە. گەشەی ئابووری وڵاتانی ئەفریقیا بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت گرنگە بە ئابوورێکی ساغلەم، دابەشکردنی دەسەڵاتی حکومەت پەرە دەستێنی و گەل دەتوانێ لەنێوان ئابووردا پەیوەندی بەرقەرار بکات و دەوڵەتیش سەرچاوە و خزمەتگوزاری زۆرتر پێشکەش بە هاوڵاتیان بکات، لە بری ئەمەشدا بەرهەمهێنانی مەشروعییەت لەلایەن گەلەوە، دەسەڵاتی دەوڵەت بەهێز دەبێت. لەلایەکیترەوە ئابوورێکی لاواز گرفتەگەلێك بۆ ئەوانەی کە لە دەسەڵاتدان ئاشکرا دەکات. دەوڵەتان سەرچاوەی کەمیان بۆ گۆڕین لەپێناو بەدەستهێنانی مەشروعییەتیان هەیە هەروەها ئەوان (دەسەڵاتداران) سەرچاوەی نیشتمانی کەمیان بۆ سەرمایەگوزاری لە چالاکی زۆر لێکردن و هێرشبەرانەیان هەیە و بە کەمبوونەوەی مەشروعییەت و لاوازی سەرکوتکردن، دەسەڵاتی دەوڵەت کەم دەبێتەوە، ئەنجامەکانی نەبوونی دەسەڵاتدارێتی دەوڵەت بەووردەکاری زۆرترەوە لە درێژەی ئەم بەشەدا روون دەکرێتەوە.

**قەیرانی حکومەتداریی:**

((ئێمە رووبەڕووی دوو کێشەین: مشکەکان و حکومەت)). ئەمە رای سەرکردەیەکی کۆمەڵگای شاریی لە لسۆتویە. ئەم وتەیە ئاماژەیەکی گاڵتەجارییە بۆ ئەوەی کە تەنیا لە هەشتا و نەوەدەکاندا قەیرانی کەڵەکە بوون نەبووە، بەڵکو دەسەڵاتی دەوڵەت رووبەڕووی قەیرانی حکومەداریی بوونەوە و حکومەتدارانی ئەفریقیا نوێنەری شیاوی هاوڵاتیان نین.

لە بەشی شەشەمدا ناوەنگەرایی دەوڵەتی ئەفریقیایی لە قۆناغی دوای کۆڵۆنیالدا روون کرایەوە هەروەها روونیش کرایەوە کە چۆن لە دوای سەربەخۆیی، رژێمە باوك ساڵارییەکانی نوێ بوونە هۆی نوشستی دامەزراوە سیاسییە یاسایی — عەقلانییەکان. بە بێ سیستەمی یاسایی — عەقلانی سەرکردەکانی ئەفریقیا بۆ بەدەست هێنانی مەشروعییەت پشتیان بە تۆڕگەلی دەرەبەگایەتی بەست ئەمە باشترین میکانیزم بوو تا لە رێگەیەوە سەرکردەی سیاسی فەرمانڕەوایی گەل بکات.

گرفتی دەیەی هەشتەم و نۆیەم ئەوە بوو کە سەرچاوەی پێویست بۆ پاراستنی ئەم تۆڕەی لە بەردەستدا نەبوو، دابەزینی ئابووریی و گۆڕینی ئاراستەی پشتیوانی دەرەکی (بە هۆی پلانی هەموارکردنی ئابوور و نەمانی پشتگیریکارانی شەڕی سارد). بەو مانایە بوو کە هەنوکە



حکومەتەکان بۆ راکێش کردنی لایەنگرانیان سەرچاوەی کەمیان لە بەردەستدایە. زیاد لەمەش بە هۆی کەمی لە قەبارەی (**ظرفیة**) دابەشکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان زۆربەی ئەم وڵاتانە شکستیان هێنا، بنکەی تەندروستی رووبەڕووی کەمی پەرەستار، دوکتۆر و دەرمان بوونەوە، پەرتووکی وانەکان لە قوتابخانەکاندا دەگمەن بوون. شەمەندەفەرەکان بە هۆی کەمی ئاڵوگۆڕی دەرەکی و کەمی ئامرازی یەدەك لە جوڵە وەستا بوون و رێگاوبان خراپ ببوون و پلانی بەرهەمهێنانی وزەش کەم و کوڕی تێدا بوو. لە ئەنجامدا مەشروعییەت کەم بووە. ئەم قەیرانەی مەشروعییەت، بۆ قەیرانی دەوڵەت گۆڕدرا، چونکە سەرچاوەیتر بۆ جێگرتنەوەی رژێمە شکست خواردووەکان لە بەردەست نەبوو، لە سەرەتاکانی قۆناغی ناوەندگەرایی رێکخراوەکانی فەرمی بەرهەڵستکاران، لە رووی سیستماتیکییەوە بێ لایەن بوون و پارتە سیاسییەکانی دەسەڵاتداریش، نەیارەکانی لە دەوری خۆ کۆکردەوە یاخود ملکەچیان کرد و بێ بەشکران لە زۆربەی بابەتەکاندا، نوێنەرایەتی حکومەتی خۆجێیی و پەرلەمانی سەربەخۆ لە ناو چوون هەنوکە چالاکی فەرمی سیاسی لەلایەن کرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن یاخود دامەزراوەگەلی ژێر کونترۆڵی راستەوخۆی سیستەمی سەرۆکایەتی — ستەمکاریی سنووردار دەکران گشت حکومەتەکان لە سەرتاسەری جیهاندا دەکرێ دواجار پشتیوانی هاوڵاتیان لە دەست بدەن. ئەگەرچی لە دیموکراسی لیبراڵدا ئەم بابەتە بە دەگمەن دەبێتە هۆی قەیرانێکی حکومەتی، هۆکەشی ئەوەیە کە جۆرە مکانیزمگەلێکی جێگیر کراو هەن کە لەکار لادانی هێزی جێبەجێ کاری خراپ (**غیر مطلوب**) لە دام و دەزگاکاندا گەرەنتی دەکات لەم جۆرە رژێمانە دا (لیبراڵ) هەڵبژاردن ئەنجام دەدرێت و پارتی دەسەڵاتداری بێ توانا لەلایەن پارتی بەرهەڵستکارەوە دەگوڕدرێت و مەشروعییەت سەرلەنوێ دروست دەکرێتەوە، گۆڕانکارییە سیاسییەکان بە ئاشتیخوازانە روو دەدەن و دەسەڵاتی دامەزراوەکان بێ دەستکاری دەمێنێتەوە لە ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیالدا ئەم بابەتە لە ئارادا نەبوو ناوەندگەرایی حکومەت بەو مانایەیە کە کاربەدەستانی حکومەت لە رێگەی زۆر یان گوشارەوە دەگۆڕدرێن. تەنانەت ئەگەر شۆڕشیش روبدات هەمان پارت و سەرۆك کۆمار ئەگەر پەسەند کراویش نەبێت، لە دەسەڵاتدا دەمێنێتەوە ئەم لەمپەر و فاکتەرە رێگەرە لە سەنتەری قەیرانەکانی دەوڵەتدایە. بە واتایەکی ئاسانتر هیچ شێوازێك بۆ بەدەست هێنانی مەشروعییەت بۆ حکومەت لە رێگەی لە کار لادانی کاربەدەستانی نەویستراو بوونی نییە.

کارتێکەری دوولایانەی قەیرانی حکومەت و کەڵەکە بوون بەو مانایەیە کە حکومەتگەلی ئەفریقیا بەکارتێکراوانە لەگەڵ دەولەتێکی خوێنمژەوە ژیاون (بە گشتی وەك دەوڵەتانی شێت، دەڵەتانی تالآنچی و دەولەتانی دز ناسراون) سەرچاوەکانی کۆمەڵگا لەلایەن دەولەتەوە تالآن دەکرێن و هیچ کاتێك دەولەت (تەنانەت) بەرژەوەندییەکی کەمیش پێشکەش بە گەل ناکات لە ئەنجامدا نە گەشەسەندنی ئابووری و نە نوێنەرایەتی سیاسی روونادات هەڵبەت لە هەندێ بابەتدا وەها دێتە بەر چاو کە نوخبە سیاسییەکان بە سانایی ئەرکەکانیان لە هەمبەر حکومەت لە بیر دەکەنەوە و هەندێ لە کاربەدەستان خەریکی چاودێری کردنی بەرژەوەندییەکانیان دەبنەوە. سەرمایەی نیشتمانی لە کەرتگەلی نابەرهەمهێنەردا سەرمایەگزاریی دەکرێت کە لە پرۆژەکانی گەشەکردندا بۆ گەڕانەوەی بەرژەوەندی سیاسی نوخبەکان دارێژراوە نەك بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی گشتی (لەپێناو بەرژەوەندیی نیشتمانی گشتگیر و بەرفراوان).

شایانی وەبیرهێنانەوە نییە کە کۆمەڵگای مەدەنی بە بێ گرنگی پێدان، دەولەتی مشەخۆری پەسەند کردووە و زیاد لەمەش ئامرازە دامەزراوەییەکان تاکە کەناڵێك نین کە لە ڕێگەیانەوە هاوڵاتیان بتوانن حکومەتە فەرمانڕەواکان بخەنە ژێر پرسیار یاخود بیانگۆڕن. بە درێژایی دەیەی هەشتەم و نۆیەم هەندێ لە ولآتانی ئەفریقیا نارەزامەندبوونیان لە ڕێگەی رزگار کردنی خۆیان لە حکومەتەکانیان نیشانداوە و بە گێڕانی هەندێ چالاکی لە دەرەوەی کونترۆڵی حکومەت، کۆمەڵگای مەدەنی بە جیددییانە کارێگەرییان بەسەر دەسەلآتی دەولەتدا نواند. هەڵبەت زۆرێك لە دەولەتان، بەم هۆیەوە وەها لاواز بوون کە لە لێواری رووخاندا بوون لەبری ئەمەشدا کۆمەلگای مەدەنی تۆڵەی خۆی لە دەولەتی مشەخۆر سەندەوە.

## نەمانی دەسەڵاتی دەوڵەت:

لە پانتای سیاسیدا کاتێك کە دەولەتان رووبەڕووی کەمی مەشروعییەت دەبنەوە هێزی سەرکوتکردنیان نوشست دێنێ ئەفریقییەکان بەرەنگاری دەسەلآتی دەولەتەکانیان بوونەوە و ئەمەش نیشاندەری ئەوەیە کە کەناڵەکانی بەرهەڵستی کردن لە ڕێگەی دەولەتی ناوندگەراوە وێران کراوە و لەبریدا چالاکیگەلی سیاسی باندامەزراوەیی هاتووتەکایەوە لە هەندێ بابەتدا، ئەنجام شۆڕش زۆر خێرا بووە شۆڕشەکانی شار و رکابەرێتی چریکی بابەتێکی باوی دەیەی هەشتەم و نۆیەم بوو (روونکردنەوەی زۆرتر لەم بەشەدا خراوەتەڕوو) ئەگەرچی راپەرین و شەڕە



شۆڕشگێڕییەکان تەنیا نموونەگەلێکن لە دەستبەسەرداگرتنی دەولەت لەلایەن کۆمەلگای مەدەنییەوەیە، (بەلآم) کەسانی هەل پەرست لە ئەنجام لاوازیی دەسەلآتی رژێمی سیاسی، سەرکەوتنەگەلێکیان بەدەست هێناوە، لەبری ئەوەی کە لە رێگەی چالاکیگەلی وێرانکاریی و توندوتیژانە ئەم سەرکەوتنە بەدەست بێنن و، دەولەتان هێدی هێدی جێگەی ئەم (جۆرە) دامەزراوەگەلی دەسەلآتیان گرتەوە. ئەم بابەتەش کەمتر دەبینرێت بەلآم بەهێزی ماوەتەوە هێزیشە ئەوان سوود لە ناتوانایی دەولەت وەردەگرن لەبری ئەوەی کە بۆ ناتوانا کردنی دەولەت پلان دابرێژن.

### ستراتیژییەکانی تیوەنەگلان خۆ دوورخستنەوە (چوونەدەرەوە):

لە زۆر بابەتدا ئەفریقییەکان لە ڕێگەی چوونەدەرەوە بە هۆی کۆچکردن، خۆیان لە چەوسانەوەی دەولەتی مشەخۆر رزگار کرد ڕێگایەکی باشتر بۆ رزگار بوون لە چنگی حکومەتێکی زەبر و زەنگدار، جیا لە بە جێ هێشتنی ولآت بوونی نییە لە راستیدا گرووپێکی بچووك ئەم ڕێگەیە هەڵدەبژێرن، ئەویش بۆ تاقی کردنەوەی دوایین ڕێگەی رزگار بوون سەرەڕای ئەوەی کە پەیوەندی (دەولەت) بە ناوچەکانی دەوروبەرەوە بە هێزە (واتە شار و گوندەکان) و لەمپەرەکانی کۆچکردن بەرجەستەکراو گرنگن، بەلآم دەبێ ئاماژە بدەین کە کەسانێك هەن کە ستراتیژییەکانی چوونە دەرەوە لە هەمبەر رووبەڕووبوونەوە و چوونە دەرەوە لە دەولەتیان، دانەڕێشتووە.

ئەفریقییەکان پێکەوە گرێدانی گیرۆدە بوون و رزگار بوون بەکار دێنن. ئەوان مەیلدارن تا ئەوکاتەی کە بەرژەوەندییەکانیان دەخوازێ ئەم پێکەوە گرێدانە ئەنجام بدەن و لەگەڵ دەولەتدا کار بکەن، بەلآم کاتێك کە ئەم کارە (بۆیان) فەراهەم نەبێ لە ئەنجامدانی ئەم داوکارییە خۆ دوور دەخەنەوە، ئەمە وتەیەکی تایبەتی (ئێریك هابز بام)ە کە ((سیستەم لەپێناو لانیکەمی پێشکەوتنەکانی کار دەکات)). بە پڕاوی دەرفەتەکان لە ئەنجامی هەڵسوکەوتی نێوان دەولەت و دامەزراوەکانەوە دێنە ئاراوە بەلآم ئەم پەیوەندییە زۆرتر بە مەبەستی چەوسانەوەیە، بەم پێیەش فاکتەری سەرەکی، کونترۆڵ کردنی ئاستەکانی تێوەگلانە (دەست بە یەخە بوون). بۆ نموونە ئەگەر دەولەت بەسەر داهاتەکانی تووتن ورد بێتەوە دەبێ جووتیاران بەرهەمهێنانیان بۆ بەرهەمی کەم باجتر وەك گەنمە شامی بگۆڕن ئەگەر دەولەت بڕیار بدات کە سەرمایەگوزاری لە داهاتەکانی بەدەست هاتوو لە کۆمپانیاکانی پاسەکانی شاردا بکات، سەرمایەگوزارییەکان بە

ئاراستەی کاروباری تەکسی گێڕان دەگۆڕدرێت، لەم بابەتانەدا گشت چالاکییە بازرگانییەکان بە سەرسوڕهێنەرانە ئامانجی چەوساندنەوەی هاوڵاتیان هەیە. ستراتیژی چوونە دەرەوە هەوڵ دەدات بژێوی جووتیاران بۆ دۆخی بەرایی بگەڕێنێتەوە. (بەرهەمهێنان تەنیا بۆ پێداویستییە سەرەکییەکانی خێزان) ئەمەش سووکایەتی کردنە بە دەستەبەرکردنی سیاسەتی گشتی و گۆڕینی چالاکیگەلی ئابووری و پەراوێزکردنی کونترۆڵی دەوڵەت هەروەها کەمبوونەوەی قەبارەی **(ظرفیه)** دەوڵەت پێویستی بە کۆمەڵگای مەدەنییە بۆ پشت بە خۆ بەستن. تەنانەت گەل دەتوانی کەمتر لە رابردوو سوود لە خزمەتگوزاریی گشتی و کاروباری خۆشگوزەرانی وەربگرێ. پێویستە ئەم پشت بە خۆ بەستنەش بە بەشێك لەم پرۆسەیە هەژماربکرێ ئەفریقییەکان لە پەیوەندییە پیشەییەکانیاندا هەوڵ دەدەن پشت بە خێزان و خزمانی کۆمەڵگای لادێی ببەستن لەبری پشت بەستن بە خزمەتگوزارییە پسپۆڕێتییەکانی دەوڵەت.

هەروەك نایومی چازان گەلاڵەی کردووە گرنگترین گۆڕانکاریی بەرچاو کە لە ئاستی نەتەوەییدا روویداوە ئەوەیە کە کۆمەڵگاگەلی پەیوەندێتی **(ارتباط)** فرە لایەن لە گشت شوێنەکاندا دەبینرێت (پەیوەندیگەلی خۆشگوزەرانی نوێ کۆبوونەوەکانی یارمەتیدانی دوو لایەنە، ئافراندنەکانی پەروەردە و گرووپگەلی بەرگری رێگە پێدراو (مەشروع). لە جێگەیەك دا کە دامەزراوە فەرمییەکانی دەوڵەت کەم دەبنەوە خودی کۆمەڵگای مەدەنی بە ئاراستەی کەم و کۆڕی شتەکاندا هەنگاو دەنێت، بۆ نموونە خودی کۆمەڵگاکان قوتابخانە دروست دەکەن، کاروبارەکان بەڕێوەدەبەن یاخود رێکی دەخەن و باج کۆدەکەنەوە لە بۆ دانی خەرجییەکانیان ئەوان بە هۆی کەم بوونەوەی توانایی دەوڵەت تەنانەت هێزی سەربازی، بە مەبەستی پاراستنی سیستەم و یاسا پێك دێنن. لە زۆر بابەتدا کە شکستی دەوڵەتانی ستەمکاریی روو دەدات ژیانی کۆمەڵایەتی هەر بەردەوامی هەیە ویرجینیا لولینگ لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا سەبارەت بە سومالی نووسیویەتی: ((لەوانەیە سەنتەری موگادیشو وێران بێ بەڵام لەوێدا رێژەیەکی زۆری دەلال بوونی هەیە. بە گێڕانی رۆڵێکی باش لە خزمەتگوزاریی مانگی دەستگردی تایبەتدا (خصوصی)، بەرقەرارکردنی پەیوەندیی تەلەفۆنی لە سومالی دا زۆر ئاسانتر لە پێش (سەردەمی) شەڕی سارد کردووە)). لە کاتێکدا کە دەوڵەتان گرنگ و براوەترین رێگە بۆ رێکخستن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگان بەڵام کۆمەڵگاکان ئەم کاروبارانە ئەنجام دەدەن و دەتوانن بە بێ دەوڵەت بەردەوامی بە ژیان بدەن نموونەگەلی سەبارەت بە گۆڕینی لە ناکاوی بازاڕەکان و هێنانە دەرەوەیان لە ئابووری فەرمی و هێنانەدی خزمەتگوزاری گشتی جێگیرەوەی کۆمەڵگای



مەدەنی نموونەگەلێك لە دەرچوون لە یاسان هەر یەك لەم ستراتیژیانەی چوونە دەرەوە یان بەرگری، بەرەنگار بوونەوەیەکی راستەوخۆیانەی یاساکانی دەوڵەتە. ئەگەرچی زۆربەی ئەفریقییەکان بەمەبەستی رزگارکردنی ژینگەی ئابووری و سیاسی دوژمنکارانە لە دەیەکانی هەشتەم و نۆیەمدا لە رێگەی یاساییەوە کاریان دەکرد. زیاد لەمەش ئەگەر سەرکردەکانی ئەفریقیا حەزیان لە حکومەتی یاسانییە، بۆ چی دەبێ خەڵك ملکەچیان ببێتەوە. پاراگرافەکانی خوارەوە هەندێ لە گرنگترین ستراتیژییەکانی دەرچوونی نایاساییانە کە لەم کیشوەرەدا روویدا روون دەکاتەوە.

گرنگترین تەحەدای گشتگیر بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت ((بازاڕە تەریبەکان))ن ئەفریقییەکان لە بری کڕین و فرۆشتنی کاڵا لە ئابووری فەرمیدا (ژێر کونترۆڵی دەوڵەت) هەوڵیان بۆ دامەزراندنی کەرتی نافەرمی دەدا (لە ژێر ناوی ئابووری پلە دوو، ئابووری سێبەر، بازاڕە تەریبەکان، بازاڕە بەردەوامەکان کە لە رۆژهەڵاتدا بە ماگند و لە رۆژئاوا بە کاکابیول ناو دەبردران). لە سەرتاسەری قۆناغی دوای کۆڵۆنیال، دەوڵەتان هەوڵیان بۆ دەستکاری کردن لە بەرهەمی کشتوکاڵی دەدا (لەپێناو گەیشتن بە ئامانجەکانیان) بۆیەش کاڵا تایبەتییەکان لە شارەکاندا رووبەڕووی گوشار بوونەوە بەم پێیەش کۆمەڵگای مەدەنی هەوڵی خۆ دوورخستنەوەی لە ئابووری فەرمی دا لەبری ئەمەشدا جووتیاران (بە نایاساییانە) بەرهەمەکانیان لە بازاڕەکانی دەوڵەتدا نەدەفرۆشت، دەستفرۆشە سەر شەقامەکان، کاڵاکانیان بە بێ مۆڵەت یان بە بێ یاسا دەیانفرۆشت خاوەندارانی کێڵگە بە بێ مۆڵەتی دەوڵەت کێڵگەکانیان بە کرێ دەداوە و بازرگانەکانیش، کاڵاکانیان لە کەرتی نافەرمیدا دەفرۆشت (زۆرتر مەشروب فرۆشە نایاساییەکان).

تا دەیەی هەشتەم، زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا خاوەن ئابووری نافەرمی بوون، بۆ نموونە ئابووری سێبەر، ٣/٢ بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی ئۆگاندای پێك دێنا، یاخود پتر لە ٩٠٪ بەرهەمی دانەوێڵەی تانزانیا لە رێگەی بازاڕە تەریبەکانەوە دەفرۆشرا و هاوکاری نەکردن لە ئابووری دەوڵەتی دا بە رێژەیەکی فراوان لە گشت بەشەکانی ئەم کیشوەرەدا بوونی هەبوو قاچاق تەوەری سەرەکی ئابووری سێبەر بوو.

سنوورەکانی ئەفریقیا سروشتی ساختەییان لەخۆ گرت و سنوورەکان دەبەزێندران. هات و چوی نایاسایی مرۆڤ و کاڵا کە لە سنوورەکانی دەوڵەتدا دەرباز دەبوون گەشەیەکی بەرچاوی لە وەڵامدانە بۆ قەیرانی کەڵەکە بوون و حکومەتداری پەیداکرد کاتێك کە نرخی بەرهەمەکانی

کشتوکاڵی کە لە دەست دەوڵەتدا بوون زۆر دابەزی جووتیاران لە هەوڵی دۆزینەوەی دەرفەت بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکانیان بە وڵاتانی دراوسێ بوون، بەم پێیەش ئەم بابەتە لە هێلکارییەکاندا روون و ئاشکرایە. ٣/٢ بەرهەمی کاکاوی غەنا لە ساڵی ١٩٨٢دا لە وڵات بەقاچاق دەبردرا. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە لە راپرسییەکدا ٣/١ قاوەی کێنیا لە بازاڕی تەریبدا دەفرۆشرا.

فرۆشی نایاساییانەی ئاڵوگۆڕی دەرەکی. نموونەیەکیتری خستنە ژێر کاریگەری قۆرغکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتە، زۆربەی حکومەتەکانی ئەفریقیا بە مەبەستی بەرز راگرتنی ناسروشتییانەی بەهای دراوی نیشتمانی سیاسەتە داراییەکانیان جێبەجێ کرد. ئەمە شێوازێکە بۆ کەم کردنەوەی بەهای هەناردەکان، ئەگەرچیش بازاڕە دراوییە تەریبە گەشەسەندووەکان بەرپرسی ئەم بەها ساختەیە (ناسروشتی) بوون ئەفریقییەکان (و هەندێ توریستیش) لە بری ئاڵوگۆڕی دراوی، لە ئاڵوگۆڕی فەرمی دەوڵەتیدا، مامەڵەکانیان لەگەڵ بازرگانەکانی سەرشەقام ئەنجام دەدا لە چەندین بابەتدا بەهای دراوی فەرمی بە سروشتییانە کەم بووە هەر کە دەوڵەتان نەتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ دەسەڵاتەکەیان بپارێزن دۆلاری ئەمریکیا وەك گرنگترین ئامرازی مامەڵەکردن جێگەی دراوی فەرمی دەگرێتەوە. لە شەڕی ئەنگۆلادا مەشروبات بە دۆلاری ئەمریکی دەفرۆشرا. (بەهای ئەم شیشانە رەنگدەرەوەی بەهای دۆلاری ئەمریکی بوو).

ستراتیژییەکانیتری ویاری وەك (دۆزینەوەی) رێگە چارە بۆ تاوان کەم بوو، بە کەم بوونەوەی هێزی سەرکوتکەرانەی دەوڵەت چالاکی نهێنی پەرەی سەند ئەم پرسەش هاوکات بوو لەگەڵ دابەزینی (افول) گەشەی ئابوور و دابەزینی داهاتی دەوڵەت، تەنانەت لە خراپترین بارودۆخدا ناوچەکانی دەوروبەری شار و هەندێ بەش لە ناوچە قەدەغەکراوەکان بوون بە شوێنی گردبوونەوەی ئەم جۆرە چالاکییانە و تاوانکاری رێکخراو لەم ناوچانەدا برەوی سەند. لە ئەنجامدا ئەمرۆکە لە لیبریا کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ و سومالی بۆ چوون لە بەشێك لە وڵات بۆ بەشێکیتری گاردی چەکدار بەکار دەهێنرێت.

**هۆی شکستهێنانی دەوڵەت:**

دەوڵەتانی ئەفریقیا لە قۆناغی پاش کۆلۆنیالدا رزگار بوون ئەمەش بەو هۆیەوە بوو کە ئەوان توانییان سەرچاوەگەلێك هەم لە رووی ناوخۆییەوە (کان و کەرەستەی خاو) و هەمیش لە رووی نێودەوڵەتییەوە (بازرگانی و یارمەتی دەرەکی) بەدەست بێنن، ئەم سەرچاوانە بۆ پاراستنی دامەزراوەکانی دەوڵەت، زیاد بوونی کاربەدەستانی دەوڵەتی و داهاتی تایبەتی و



بەدەستهێنانی مەشروعییەت لە رێگەی دابین کردنی خزمەتگوزاری گشتی و پشتیوانی سوودمەند بوون. تا دەیەی هەشتەم قەیرانەکانی کەڵەکە بوون و حکومەتدارییی توانایی نوخبەکانی ئەفریقیای بۆ فەراهەم کردنی ئەم سەرچاوانە، خستە ژێر گوشارێکی زۆردا، لە ئەنجامدا زۆرێك لە ناوچەکانی ئەفریقیا هەوڵی شکست هێنانی دەوڵەتیان دەدا.

هەندێ لە حکومەتەکانی دوای کۆلۆنیالی لە کونترۆڵ کردنی خاکەکەیان پێش دەیەی هەشتەم گرفتگەلی زۆریان بینیوە، ئەنگولا لە ساڵی ١٩٧٥ سەربەخۆیی لە پورتەگال بەدەست هێنا ئەگەرچی لە یەکەم رۆژی دەرچوونی یونیتا (unita) دەوڵەتی (ئێم پلا) نیشانی دا ناتوانی گشت دەسەڵاتەکەی لە چوارچێوەی سنووری وڵاتەکەیدا بەکار بێنێت. نموونەیەکیتر ئەوەیە کە دەسەڵاتی جێبەجێ کردن لە باکووری سودان (موسلمان) گشت کات لە بەدەستهێنانی دەسەڵاتی تەواو لە ناوچە باشوورییەکاندا (مەسیحی) شکستی هێنا. ئەگەرچی لە دەیەی هەشتەمدا کەمبوونەوەی زۆرتر لە توانایی لە سەرتاسەری ئەم کیشوەرەدا دەبینین حکومەتی موزامبیك بە هۆی شۆڕشەکانەوە (کە لەلایەن ئاپارتایدی وڵاتی ئەفریقیای باشوورەوە پشتگیری دەکرا) کونترۆڵ کردنی ناوچە شارییەکانی لە دەستدا سەرکردەکانی ئەسوپیا لە چەندین شوێنی ئەریتریاو تیگرای دەسەڵاتیان نەما. لە ئوگاندا و چاد، حکومەت بە تەواوی شکستی هێنا هەروەها لە دەیەی نۆیەمدا چەندین دەوڵەت لە ناو چوون و هەروەها دەسەڵاتی ناوەندی لە لیبریا، لیرالیون، سومالی، رواندا و زەئیر لە بەین چوو.

دیاردەی شکست هێنانی دەوڵەت لە شوێنێك روودەدات کە دامەزراوە نیشتیمانی نییە سەرکوتکارەکان. جێبەجێ کردن و بڕیاردەر شکست بێنن و بەم پێیەش فاکتەرە سەرەکییەکانی دەوڵەت بۆ ماوەیەکی درێژ گرەنتی نەکرێن و حکومەتی یاسا و هیچ ئاسایشێك (أمن) لە هەمبەر هێرش کردنی دەرەکی لە ئارادا نەبێت و خزمەتگوزارییە گشتییەکانیش بەوپەڕی کەمی بگات، گرنگ ئەوەیە کە حکومەتی ناوەندی ناتوانێ فەرمانڕەوایەتی بە سەر گشت وڵاتدا بسەپێنێت و شکستیش کاتێك روودەدات کە هێزە بەرهەڵستکارەکان لە لابردنی نوخبەکانی حکومەت سەرکەوتووبن و دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی لە ناو ببەن بەڵام دواتر خودی خۆیان لە دووبارە بەرهەمهێنانەوەی دەسەڵاتی پێویست بۆ نۆژەن کردنەوەی دەوڵەت شکست دێنن سەرۆك کۆماری ئۆگاندا لەم دەستەیەدا جێ ناگرێتەوە چونکە ئەو توانی ئەم بزاڤە شۆڕشییە بگۆڕێت بۆ حکومەتێکی ناوەندی کە دەسەڵاتی ناوەندی بەسەر گشت جوگرافیای ئۆگاندا دا پەرە بدات، سومالی نموونەیەکی باشی شکست هێنانی دەوڵەتە.

خێڵەکان بە مەبەستی رووخاندنی رژێمی گەندەڵی زیاد بارە لە ساڵی ١٩٩١دا بوون بەهاوپەیمانی یەکتر، بەڵام دوای ئەمە گرووپە وێك نەچووەکان (غير متجانس) نەیانتوانی حکومەتێکی نەتەوەیی و یەکگرتوو، شوێنگری حکومەتی پێشوو بکەن سومالی و زۆرێك لە دەوڵەتانی شکست خواردووی ئەفریقیا نموونەگەلێکن لە شکست هێنانی بزاڤە شۆڕشگێڕییەکان لە دەیەی نویەمدا لە پرۆسەی دامەزراندنی دەوڵەت، ئەم بابەتەش هۆشداری دایە ئەم بزاڤانە کە لەسەر ئەنجامەکانی شکستی هەڵقولاو لە قەیرانی مەشروعییەت و حکومەتداری هزر بکەنەوە.

زۆربەی ئەم دەوڵەتە شکست خواردوانە لەنێوان سوپاییەکان و شەرڤانانی کارێزماتیك دابەش دەبێ. ئەم حکومەتە تایبەتییانە (اختصاصی) لە رێگەی هێزی سەربازی و دەست گەیشتن بە سەرچاوەکان بەڕێوەدەبردرێت. لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال سێ دەوڵەت لە لیبریا، ئەنگۆلا و کۆماری دیموکراتیك شکستیان هێنا کە لەم ولاتانەدا سوپا و گرووپە شۆڕشگێڕەکان هەوڵی دەست گەیشتن بە سەرچاوەکانی دەدا: (واتە) ئەڵماس کە باشترین هاوڕیی چریکە چەکدارەکانە ئەم جۆرە سەرچاوانە مولەتی بە ئەندامانی ئەم حکومەتانە دا تا خۆیان بەهێز و دەوڵەمەند بکەن و دەسەلاتەکەیان لەم رێگەیەوە بپارێزن و چەکی زۆرتر بەدەست بێنن و ئەگەر پێویست بێت مەشروعییەتی ناوخۆیی و خۆجێی (لە رێگەی پارەدان بە لایەنگرانیان) بکڕن. ئەم پرسەش گومانی تێدا نییە کە ئەم توانایيە بە سوپاییەکان بدات تا هەوڵی نوێکردنەوەی دەوڵەت بدەن بە تایبەتیش کاتێك کە رەچاوی ئەم نموونەیە بکەین کە ئەفسەرەکی سوپا لە کۆماری دیموکراتیکدا بە تەنیایی لە ساڵی ٢٠٠٠دا ١٢ ملیۆن دۆلار کولتان (کەرەستەیەکی کانە کە لە دروستکردنی مۆبایلدا بەکار دەهێنرێت) و ٣٠ ملیۆن دۆلار زێڕ و ئەڵماسی هەناردە کردووە، بەمجۆرە داهاتە ئایا سوپاییەکان مەیلیان هەیە بۆ ئاشتی نیشتمانی و نوێکردنەوەی حکومەتی ناوەندی کە دەبێتە هۆی لە ناو بردنی بەرژەوەندییەکانیان.

ئەگەرچی بزاڤە شۆڕشییەکان توانییان کاربەدەستان لە سەر کار لابدەن، بەڵام دووبارە نوێکردنەوە و جێگرتنەوەی دەسەلاتی ناوەندی تووشی شکست بوونەوە و رووبەڕووی بەرەنگارییەکانی جیابوونەوە خوازی و سوپایەکی زۆرتر و تاوانکاری لە کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ، لیبریا و هەندێ ولاتیتری ئەفریقیا بوونەوە و ئەمەش نموونەیەکە کە سەبارەت بە قەیرانەکانی مەشروعییەت و حکومەتداری هۆشداریی بە ولاتانی ئەفریقیا دەدات.



**شەپۆلی نوێی شۆڕش:**

بە نەبوونی بەڕێوەبردن چ لە بەشی بەشداریکردن و چ لە بەشی هاوکاریکردن، کەمبوونەوەی (حکومەت) لە دەیەی هەشتەم و نۆیەمدا سەری هەڵدا و ئەم پرسەش دەسەلاتی ناوەندی دەوڵەتی لە هەندێ بەشی ئەم کیشوەرە، لاوازکرد. هەندێ جار کۆمەڵگای مەدەنی و بازاڕە تەریبەکان ئەم بۆشاییەی دامەزراوەییان پڕ کردەوە و، تاڕادەیەك دیسپلینی سیاسی و ئابوورییان بەدی هێنا، لە بابەتەکانیتردا، ئەفریقییەکان ناچار بوون لە ناوچەکانی پڕ ئاژاوە ژیان بەسەربەرن. سیناریۆی سییەم بە درێژایی دەیەی نۆیەم کە رێژەیەکی کەمتر لە گرنگی پێدانی هەبوو پەرەی سەند لە هەندێ بابەتدا شەپۆلێکی نوێی نائارامی سەری هەڵدا شۆڕش یان بزاڤی چریکی جیاوازە لە گرووپە رێگرەکان ئەگەرچی هەردووکیان بەپێچەوانەی یاسا کار دەکەن، بەڵام ئەوان (شۆڕشگێڕان و شەرڤانانی چریکی) پابەندیی ئایدیۆلۆژیکیان هەیە و هەوڵ دەدەن تا لە دەوڵەتی بەرقەرار رزگار بن و لە بریدا سیستەمێکی سیاسی نوێ دابمەزرێنن، لەم رووەوە ئەگەرچی شۆڕشگێڕان لە دەوڵەت جیا بوونەوە بەڵام هەوڵ دەدەن سیستەمێکی سیاسی نوێ لە بریدا دابمەزرێنن سوپا چریکییەکان یارمەتی چەندین ولاتیان (کێنیا، ئەلجزایر گینە، بیسائۆ، ولاتانی باشووری ئەفریقیا وەك، ئەنگۆلا، موزامبیك، زیمبابوی، نامیبیا، و ئەفریقیای باشوور) داوە بۆ شکستی کۆلۆنیالکار گرووپە شۆڕشگێڕییەکان لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال بەرەنگاری چەندین نوخبەی سیاسی بوونەتەوە (بۆ نموونە حکومەتەکانی ئەنگۆلا، موزامبیك چاد، سودان، ئۆگاندا، و ئەریترە). ئەمانە ولاتانێکن کە حکومەتەکانیان لەم قۆناغەدا کەوتووە دەست گرووپە شۆڕشگێڕەکانەوە ئەگەرچی لە دەیەی نۆیەمدا سیاستەکانی شۆڕشگێڕی لەم کیشوەرە بەرفراوانەدا رووبەڕووی گوشاری زۆرتر بوونەوە باراکترافیکی نوێیە لە ئۆگاندا سوپای بەرگری نیشتیمانی (یوروی مۆسوینی) لە ساڵی ١٩٨٦دا کامپالای داگیر کرد. بەرەی دیموکراتیکی شۆڕشگێڕی گەلی ئەسیوپیا و بەرەی رزگاری گەلی ئەریتریا لە ساڵی ١٩٩١دا ئەم کارەی (داگیر کردن) ئەنجامدا و سەرهەڵدانی دەوڵەت لە ئادیس ئابابا و ئەلسمەرە بە سەرسوڕمانی ئەنجامدرا. دوای سێ ساڵ بەرەی نیشتمانی رواندا کیگالی داگیر کرد و دوای سێ ساڵ (لەم رێککەوتە) هێزەکانی یەکێتی دیموکراتیك بۆ ئازادکردنی کۆنگۆ (مۆبۆتۆ) یان لە کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ دەرکرد. هەروەها، گواستنەوەی رژێمەکان لە رێگەی ئامرازە شۆڕشییەکانەوە، لە کار لابردنی کاربەدەستانی حکومی لە سومالی، لیبریا و سیرالیون رووبەڕووی شکست بوونەوە لەم قۆناغەدا شۆڕشە چەکدارییەکان لە ئەفریقیادا کارێکی باو بوو.

هۆیەکی سەرهەڵدانی ئەم جۆرە شۆڕشانە، قەیرنی کەڵەکە بوون و حکومەتداریی بوون. شەرڤانە چریکەکان لەو شوێنانەی کە کاربەدەستانی سیاسی دەسەڵاتەکەیان لە دەست داوە. دەتوانن کاریگەربن و ئەمەش نیشاندەری ئەوەیە کە ناوەندگەرایی لە دەوڵەتانی ئەفریقیادا کە نالگەلێکی کەم بۆ دووبارە بەرهەمهێنانەوەی سیاسی پێشکەش دەکات بەم پێیەش، شۆڕشەکانی چەکداری دەبووژێنەوە. پێویستە ئەو بزاڤانەی کە بۆ سەربەخۆیی ناوچەیەك هەوڵ دەدەن لەو شۆڕشانەی کە هەوڵی بەدەست هێنانی گشت دەوڵەت دەدەن لێك جیا بکەنەوە. لێکجیاکردنەوەی بزاڤە شۆڕشگێڕییەکان لە دەیەی نۆیەم دا بە بەراورد لەگەڵ دەیەکانی پێشووتردا شانسی زۆرتریان هەبوو.

## ستراتیژییەکانی رزگارکردنی دەوڵەت:

کۆتایی سەدەی بیستەم شکست هێنانی رێژەیی لە دەسەڵاتی دەوڵەت لە ئەفریقیای خستەڕوو. لە هەندێ بابەتدا دەسەڵاتی ناوەندی بە تەواوی شکستی خوارد، ئەم بابەتەش بەو مانایە دێت کە کاربەدەستانی دەوڵەت رووبەڕووی لیستێکی دوورودرێژی گرفتەکانن، ئەگەرچیش لێکدانەوە و بۆچوونەکانی مارك تواین وەها نیشان دەدات کە مەرگی (نەمانی) دەوڵەتی ئەفریقیا (وتەیەکی) زیادەڕۆیانەیە.

بۆ نموونە لە رووی جوگرافیاییەوە، تا هەنوکەش سنوورەکانی ئەم کیشوەرە هەر هەمان ژمارەی ولاّتان لە هەمان هەلکەوتەی جوگرافیدا نیشان دەدەن کە لە ساڵی ١٩٨٠دا بوونیان هەبووە (جیا لە ئەریتریا) لە رووی بەردەوامی خاکەوە، گشت ئەم ولاّتانە ژیانیان بەردەوام بووە و، هیچ جۆرە خراپ بەکارهێنانی (دراوسێتی) لەلایەن دراوسێیەکانەوە بۆ شکست دان و هێرش کردنە سەر ولاّتی (دراوسێ) لە ئارادا نەبووە بۆ نموونە کەشی سیاسی سومالی هەر لە هەمان کەشدا (کەشی رابردوو)یە. چەندین ولاّت کە لە دەیەی هەشتەم و نۆیەم شکستیان هێناوە، ژمارەیەکی زۆریان تەمەنی دوورودرێژیان هەبووە و دامەزراوە ناوەندییەکان لە رێگەی شۆڕشەوە لە ناو چوونە، بۆ نموونەی هێزەکانی هێرشبەر لە رواندا و ئوگاندا شوێنی دەوڵەتیان گرتەوە، لە ئەنجامدا، شۆڕشگێڕەکان جێگرەوەی دەوڵەتانی پێشوو بوونەتەوە و دەسەڵات لەم دەوڵەتە بۆیان بە میرات ماوە ئەمەش لە کاتێکدایە کە ئوگاندا لە ژێر دەسەڵاتی یووری مۆسۆینی لە دەیەی نۆیەمدا لەلایەن ولاّتانی رۆژئاواوە وەك یەکێك لە سەرکەوتووترین ولاّتانی ئەفریقیا هەژمار دەکرا.



لەوانە دەسەڵاتی ناوەندی لە ناوچەکانیتردا لاواز بووبێ بەڵام سەرکردەکانی ئەفریقیا شارەزاییەکی باشیان لە پاراستنی دەسەڵات نیشانیانداوە نوخبەکانی دەوڵەت هەروەك کۆمەڵگای مەدەنی، لەم قۆناغەدا ستراتیژگەلی بەردەوامی مانەوەیان گرتەبەر و سەرکەوتنی ئەم ستراتیژییانەش نیشان دەدات کە مشتومڕی باش بۆ بەردەوامی سیاسی بەدرێژایی ئەم سالانە بوونی هەبووە لەوانەیە دەوڵەتان خۆیان لەگەڵ باردۆخی نوێدا بگونجێنن. بەڵام هەندێکیان بە تەواوی چارەنووسی سومالیان لە بیر کردووە، لە درێژەی (ئەم باسەدا) گرنگترین ستراتیژییەکانی ژیاری دەرکراو لەلایەن نوخبەی سیاسییەوە خراونەتەڕوو.

## بەدەستهێنانی سەرلەنوێی مەشروعییەتی دەوڵەت:

لە قۆناغێکی دورودرێژدا، کاریگەرترین رێگە بۆ گەرەنتی کردنی ژیانی دەوڵەتێك، سەرلەنوێ بەدەستهێنانی مەشروعییەتی دامەزراوەکانیەتی ئەگەر متمانە پارێزراوبێت و یاخود سەرلەنوێ بەدەست بهێنرێتەوە، دەسەڵاتیش دەکرێ دووبارە بەدەست بێتەوە. ئەنجامدانی هەڵبژاردنی فرە پارتی (لە بەشی یازدەیەمدا روون دەکرێتەوە) باشترین رێگە بۆ گەیشتن بەم ئامانجەیە تا کۆتایی سەدەی بیستەم، زۆربەی نوخبەکانی ئەفریقیا ئەم بیرۆکەیەیان (هەڵبژاردنی فرە پارتی) رەچاو دەکرد.

هەڵبژاردنی فرە پارتی دەبێتە هۆی هێنانە ئاراوەی گرفتگەلێکی زۆر و نیشاندەری ئەوەیە کە قەیرانی کەڵەکە بوون حکومەتداریی بووە هۆی ئەوەی کە زۆرێك لە نوخبەکانی حکومەت لە رێگەی سەندووقەکانی دەنگدانەوە شکست بهێنن، رکابەرێتی ئازادانە سیاسی دەبێتە هۆی کۆتایی هێنان بە ئیمتیازاتی تاکەکەسی کە لە رێگەی دەست گەیشتن بە دامەزراوەکانی دەوڵەتەوە بەدەست هاتووە. ئەنجام ئەوەیە کە دیموکراسی، ستراتیژییەکی ژیانی (حیویی) بۆ گەرەنتی کردن و بەردەوام بوونی یاسا نییە، بە واتایەکیتر هەڵسوکەوتی چەوساندنەوە زۆرتر درێژە دەخایەنێت.

## رووخاندنی دەوڵەت:

یەکەمین بەرپەرچدانەوەی نوخبەکانی دەوڵەت لەهەمبەر باردۆخی ناڵەبار کەمبوونەوەی ئەرکەکانیانە (دروست جێبەجێ نەکردنی ئەرکەکانیان) سەرکردە سیاسییەکان وەك کولارەیەك کە بەرزاییەکەی کەم بووتەوە، بۆ پاراستنی ستراکتۆری (با) هێنەرەکەی، هەندێ (کاروباری)

دەوڵەتیان وەلانا و ئەم کارەش بە مەبەستی ئەولەوییەتدان بە کەرتی گرنگ و ستراتیژییەکان و قەدەغەکردنی هەندێ کەرتیتر ئەنجامدرا بەم پێیەش، پێویست بوو سەرچاوە کەمەکانی (بەردەست) لە گرنگترین و سەرەکیترین کەرتەکاندا سەرمایەگوزاری بکرێت چالاکییە بە بەهاکانی ئابووری، کەسایەتییە گرنگەکان، دام و دەزگای سەرکوتکردن، کەرتە دژەکانی حکومەت و کەرتە نابەرهەمهێنرەکان (وەك رەعیەتە لاوازەکان و ناوچە هەژارەکان) فرامۆش دەکرێن، بەڕێوەبەرانی حکومی ناتوانن وەها نیشان بدەن کە کونترۆڵی گشت وڵاتیان لە دەستدایە، و ناتوانن خزمەتگوزاری پێشکەش بە گشت هاوڵاتیان بکەن دابەزینی دەسەڵاتی دەوڵەت دەبێتە هۆی پەرەسەندنی کۆمەڵگای مەدەنی، بۆ نموونە هەندێ لە خزمەتگوزارییە گشتییەکان لە بەین دەچن و پرۆژەکانی گەشەی ئابووری جەختیان لێ دەکرێتەوە پێداویستییەکانی پەروەردە، خۆشگوزەرانی و چاودێری تەندروستی کەم دەبنەوە و هەروەك ئازاریا و کازان ئاماژەی بۆ دەکەن: ئامانج کەمکردنەوەی بەرپرسیارێتی (ئەرك) دەوڵەتە بە بێ رەچاو نەکردنی بەرژەوەندییەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت لەم بارەیەوە یوسا فۆرست لەم بڕوایەدایە کە: ((دەوڵەت رووخێنراوە)). دامەزراوەکان لەو ناوچانەی کە بەرژەوەندی نوخبەی دابین دەکرد پشتگوێ خران، بۆ نموونە پلانی بەرهەمهێنانی گاز پێویستە بەردەوامی هەبێت (چونکە ئەم سەرچاوەیە داهاتەکی زۆر بۆ نوخبەکانی هەیە) بەڵام پێویستە داواکاریی خەرجی نەخۆشخانەکان فرامۆش بکرێن چونکە ئەم جۆرە سەرمایەگوزارییە هیچ جۆرە بەرژەوەندییەکی کورتماوە بۆ نوخبەکان بە دیاری نایێنێت.

### مەیلدار بوون (گەڕانەوە) بۆ پشتیوانە دەرەکییەکان:

بۆ کەمکردنەوەی داواکارییە ناوخۆییەکان نوخبەکانی سیاسی پێویستیان بە سەرچاوە و مەشروعییەت هەیە، کە دەکرێ لەلایەنی دەرەکییەوە دابین بکرێن، ئەم رەهەندە ئەگەرچی دوای شەڕی سارد کەم بووە بەڵام بارودۆخی نێودەوڵەتی ناسراوی (متعارف) سەروەری دەوڵەت، بەردەوامی هەیە بەڕێوەبەرانی حکومی هەوڵ دەدەن نوێنەرایەتی گەڵەکەیان بکەن و ئەم پروسەش یارمەتییان دەدات تا یارمەتییە دەرەکییەکان و رێککەوتنەکانی وەپێش خستنەوە (ترجیحی)ی بازرگانی دەرەکی بۆ خۆیان راکێش بکەن، دەکرێ دواتر بۆ پاراستنی دامەزراوەی دەوڵەت ئەم سەرچاوانە بەکار بهێنرێن بە نەمان یاخود کەمبوونەوەی سەرچاوەکانی ناوخۆیی ئەم سەرچاوە نێودەوڵەتییانە بۆ بەردەوامبوونی ژیانی نوخبەکان و دەوڵەت بەسوودن.



### بەکار هێنانی بازاڕە تەرییەکان:

ئەگەر نوخبەکان بتوانن هاوبەندیی لەگەڵ دەوڵەت و کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەرقەرار بکەن، لە هەردوو لایەنەوە دەرفەتەکەیان کەم دەبێتەوە و کاربەدەستانی سیاسی بۆ بە دەست گرتنی سەرچاوەکانی جێگرەوەی دەسەڵات و سامان لە ژێر گوشاردا دەبن (ئەگەر ئەوان بتوانن ئیمتیازە تایبەتەکەیان بپارێزن) گرنگترین ئامانجە ئاشکراکەیان گەیشتن بە ئامرازێکی بزوێنەر (حراك) و سەرچاوەی زۆر لە ناو وڵاتیاندایە، واتە لە سەرتاسەری ئەفریقیادا، فەرمانبەرانی دەوڵەت بەرەو کارکردن لە بازاڕی رەشدا مەیلدار بوون، هەڵبەت گومان لە بەردەوام بوونی بازاڕی رەش دەکرێت، بەڵام ئەم راستییەش بوونی هەیە کە بەبێ تەبانی کردنی دەوڵەت بازاڕی رەش ناتوانێ بەردەوامی بە ژیانەکەی بدات و بەردەوام بوونی ئابووری سێبەر بەبێ هاوکاری کردنی لەگەڵ دەوڵەتدا جێی گومانە. چونکە سەرهەڵدانی کەرتی نافەرمی پشت بەستراوە بە بەرتیل، بردنیماڵی دەوڵەت دزین و فێڵ کردن. بەم پێیەش بەڕێوەبەرانی حکومی، لەڕێگەی فەراهەم کردنی بازاڕە تەریبەکان، پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانیان دەکەن کاتێك کە ئەوان نەتوانن ئەم قوناغانە جێبەجێ بکەن بۆ قاچاغی کاڵا گشتییەکان (یارمەتیی خۆراکی) و بازرگانی بەرەو بازاڕە تەریبەکان دەڕۆن و دەتوانن دۆسیە فەرمییەکان لە رێگەی کاری نایاساییەوە بەکاربێنن. ئەمانە کاربەدەستە باڵاکانی دەوڵەتن کە دەتوانن پۆست و پلەکانیان لە دەوڵەتدا بە خراپی بەکار بهێنن هەڵبەت لە زۆر بابەتدا کاربەدەستانی حکومی پرۆژە سەرمایەیییە نایاساییەکان بەڕێوەدەبەن، هەروەك هەندێ نوێنەری (کا. گ. ب) کە دوای رووخانی یەکێتی سۆڤیەت کاری تاوانکارییان ئەنجام دا. هەروەها کاربەدەستانی ئەفریقیا پەناگەیان لە باشترین ناوچەکانی تاوانکاری لە جیهاندا بەدەست هێنا لە ناکاوەوە نییە کە لە دەیەی نۆیەمدا وڵاتانی وەك نیجریا شوێنی سەرەکی هەناردەکردن و قاچاغی مادده بێهوشکەرەکان بۆ ئەوروپای رۆژئاوا و باکووری ئەفریقیا بێت. بایارت، ئەلیس و هیبو، هەندێ ئاماژەیان بە پەرەسەندنی تاوانکاری وڵاتانی ئەفریقیا کردووە.

### دەوڵەتی جەنگ سالار (شەڕکەر):

لە هەندێ بابەتدا، ستراتیژی بەردەوام بوونی ژیانی دەوڵەت بوو بە چەقی وردبوونەوەی (تمرکز) رژێم. لە زۆربەی کار و بارەکاندا دەسەڵاتە بۆرۆکراتیکەکان بە تەواوی دەسەڵاتەکەیان لەدەستدا و سەرکردەکانیش هەوڵیان دەدا دەسترۆیی لە پرەنسیپگەلێکدا بەدەست بێنن تا لەم

ڕێگەیەوە چالاکی بازرگانییەکەیان بپارێزن ویلیام رینۆ ئەم نموونەیە توندڕەوانەیەی بە ((دەوڵەتی جەنگ سالار (شەڕکەر))) ناونراوە.

سیاسەتی دەوڵەتی شەڕکەر دەبێتە هۆی قەدەغەکردنی گشت بیرۆکەیەکی جێبەجێکاری دەوڵەتێك (لەپێناو) بەرژەوەندی گشتی دا. لە بری ئەمەشدا، دامەزراوەکان بە تەواویی لە خزمەت بەرژەوەندییە کەسییەکانی نوخبەکاندایە، لێرەدا هەل پەرستی جێی ئایدیۆلۆژیا دەگرێتەوە، دەست گەیشتن بە پاڵنەرەکانی عەقلانی – سیاسی زۆر سەختترە و حکومەتەکان زیاد لەمەش هەوڵ نادەن بۆ بەرهەمهێنانی مەشروعییەت لەم دەوڵەتانەدا تەنانەت تۆڕەکانی دەرەبەگەیاتیش کەم دەبنەوە. دەوڵەتی شەڕکەر دەوڵەتی مشەخۆر، تالانکەر و فریودەرە.

بەم پێیەش، ئەرکەکان کەم دبنەوە و حکومەتی شەڕکەر و سەندیکا تایبەتەکان (خصوصی) مەیلیان بۆ جێگر بوونەوەی سیستەمی دەرەبەگایەتی هەیە. سەرکردە سیاسییەکانیش پەیوەندی زۆریان لەگەڵ بارودۆخی بازاڕدا هەیە و تەنیا پشت بە رانت مشەخۆری لە کاربەدەستە سیاسییەکان نابەستن. بۆ نموونە حکومەتە شەڕکەرەکان پشت بە بەشدارییە شەفافەکان دەبەستن و گشت هزریان بەسەر دەسەڵاتی هەڵقولاو لە سەرچاوە سروشتییەکان چەق دەگرێت، وەفاداری (لایەنە) بە جێ ماوەکان لە سوپادا دەتوانێ گەرەنتی ئەم کەرتە بکات. بۆیە ئەوان ئیمتیازاتێك بە کۆمپانیا فرە رەگەزەکان بۆ سەرمایەگوزاری لە بەرهەمهێنانی کەرستەی کانی و کشتوکاڵی، دەبەخشن و سوودەکانیش لەنێوان سەرکردە سیاسی و سوپا و کۆمپانیا فرە رەگەزەکاندا دابەش دەکرێت و پشکێکی زۆر کەم بۆ کۆمەڵگای مەدەنی تەرخان دەکرێت.

سروشییە کە دەوڵەتانی شەڕکەر مەشروعییەتێکی کەمتر بەرهەم دێنن و هاوڵاتیان پاڵنەرێکی کەمتریان بۆ پشتگیری کردن لە حکومەتیان هەیە، لە ئەنجامیدا، ناسەقەمگیری خەسڵەتی تایبەت و بەرجەستەیی ئەم جۆرە دەوڵەتانەیە. گرووپە شۆڕشگێڕ و ڕێگرەکان ناوچەیەکی بەرفراوانی وڵات لە کونترۆڵی دەوڵەتی ناوەندییەوە وەدەر دێنن و، ئەگەرچیش دەوڵەتی فەرمانڕەوا گشت کاتێك چاودێری ئەو ناوچانەی (وڵات) دەکات کە بەرژەوەندی ستراتیژی تێدایە و هەوڵ دەدات ئەم ناوچانە لە دەست دەوڵەتدا بمێننەوە، لە زۆرێك بابەتدا، نوخبەکانی سیاسی بۆ پاراستنی ئەم ناوچانە سەرباز بەکار دێنن (ئەویش لە کاتێکدا کە کاربەدەستە سیاسییەکان نەتوانن پشت بە سوپا ببەستن). بۆ نموونە کۆمپانیایەکی تایبەتی یارمەتی بە حکومەتی گەمارۆدراوی سیرالیونیدا تا حکومەت لەم ڕێگەیەوە بتوانێ درێژە بە



بەرهەمهێنانی ئەڵماس بدات. هەروەك ویلیام رینو ئاماژەی پێدایە ئەم کۆمپانیایە و لایەنگرانی بڕوایان بە سیاسەتی خۆ دوورخستنە لە سەرچاوە کۆنەکان نییە، و زۆرتر لایەنگری تۆڕە کاریگەرەکان و تۆڕگەلی بازرگانی سوودمەندن و هەوڵ دەدەن تا دەسەڵاتە کەسییەکەیان پەرە پێدەن. نوخبەکان بە هۆی ناتواناییان لە، فەرمانڕوایی کردن بە سەر ناوچەکانیتری وڵاتدا، لە فریودانی خەڵك لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی بۆ هاوڵاتیان خۆیان دەپارێزن. لە نەوەدەکاندا زەئیر لیبریا و سیرالیون دەوڵەتی شەڕکەریان بە خۆوەبینی و دەسەڵاتی ناوەندی لەم وڵاتەدا بوونی نەما و گرووپە شۆڕشگێڕەکان دەسەڵاتی سیاسی جێگرەوەیان (لەم وڵاتانەدا) جێبەجێ کرد و لە ناوچەگەلی لە دەرەوەی کونترۆڵی حکومەت، ئەم دەوڵەتانە وەها بەهێز بوون کە (دەیانتوانی) چاودێری بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی نوخبەکان بکەن شارەگرنگەکان لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندی مانەوە و خەرجییە بەرقەرارەکانی دەوڵەتیش هەر وەك خۆی مایەوە تەنانەت ئەگەر سەربازە بە کرێ گیراوەکانیش دەردەکران، نوخبەکان بەڕادەی پێویست توانایان هەبوو کە بۆ بەردەوام بوونی دەسەڵاتی سیاسییەکەیان درێژە بە ستراتیژییەکانیان بدەن (لەم بارەشەوە دەوڵەت لە ململانێ کردن لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنیدا خۆی دوور دەخاتەوە). هەروەك لە سەرەوە ئاماژە پێکرا کۆمەڵگەی مەدەنی لە دەوڵەت جیا ببووە.

### دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی:

ئەم بەشە ئاماژە بەوە دەکات کە چۆن دەوڵەتانی ئەفریقیای دوا کۆتۆنیال رووبەڕووی قەیرانەکانی کەڵەکە بوون و حکومەتداری (لە سەرەتای هەشتاکانەوە) بوونەوە و لە ئەنجامیشدا توانایيەکانی دامەزراوە ناوەندییەکان بۆ فەرمانڕەوایی کردن بە سەر کۆمەڵگادا بەرتەسك بوونەوە. مەشروعییەت کەم بووە و بەو هۆیەوە کە بەکارهێنانی توندوتیژی لەلایەن دەوڵەتەوە لەپێناو پاراستنی دەسەڵات سەختە، کەشی سیاسی بۆ گۆڕانکارییە خێراکان ئامادە بوو. گرفت لێرەدایە کە هیچ جۆرە جێگرەوەیەك بۆ (جێگرتنەوە) ئەم جۆرە رژێمە لاوازانە لە ئارادا نییە. چونکە تۆڕەکانی دەرەبەگایەتی کەم بوونەتەوە و پانتایی سۆڕانەوە (مانوردان)ی نوخبەکان بەرتەسکە و هەروەهاش هەندێ لە وڵاتان بەرهەڵستکارەکانیان پەنادا و کە لە توانایاندا بوو کاربەدەستانی حکومەت سەرکوت بکەن. بەمجۆرەش، دەسەڵاتی نوخبەکان کەم بووە و ئەم رەوتەش بوو بە هۆی گۆڕینی حکومەت، لە ئەنجامی ئەم رەوتەش هەندێ لە هاوڵاتیان وڵاتیان بەجێهێشت. وەڵام و بەرپەرچدانەوەی کۆمەڵگای مەدەنی بەمجۆرە رووداوانە، بەجێهێشتن و (خۆ)

رزگار کردن بوو بە پەراوێز خستنی چالاکی کۆمەڵگای مەدەنی، چەلاکیگەلێك لەپێناو رزگار بوون لە کونترۆڵی دەوڵەت و خۆ دوورخستنەوە لە خراپتر بوونی گوشارەکانی نوخبەی بۆرۆکراتیك ئەنجام دران بازاڕە تەریبەکان چالاکی نایاسایی و قاچاغ لە دەیەی هەشتەم و نۆیەمدا پەرەیانسەند. هەندێ لە گەندەڵکاران لێك جیا بوونەوەی (دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی)یان بە پۆزەتیڤانە لێکدایەوە. بۆ نموونە نایۆمی چازان وەها بۆی دەچێت کە ((سەنتەری راکێشی سیاسی)) بەرەو ئەم کیشوەرە هاتووە. ئەو لەو بڕوایەدایە کە ئەگەر ((لە سەرەوە بڕوانین)) مکانیزمە جێگیر بووەکان تووشی پرۆسەی راکێشان و پاڵ پێوەنان بوونەتەوە، بەڵام ئەگەر لە خوارەوە بڕوانینە ئەم پرسەیە، جۆرە شیرازەیەکی سیاسی و ئابووریی لەم کیشوەرەدا بوونی هەیە کە پێویستی بە مامەڵەکردن، پەیوەندی و رێگاگەلی نوێی هەیە... لەم روانگەیەوە مامەلەیەکی سیاسی کەم لە ئارادایە ئەگەرچی ئەم رێژەیەش توانایی وەڵامدانەوەی نییە. کاتێك کە رێسا خۆجێیەکان دێنە ناو گەمەدا، پانتای سیاسی رێك دەخرێتەوە و جۆراوجۆری پەیوەندییەکان لەنێوان ستراکتۆرەکانی دەوڵەت، گرووپە کۆمەڵایەتییە تایبەتەکان و سەرچاوەی دایك دادەمەزرێت و سەرچاوەی پەرت و جۆراوجۆر لە ژێر یەکگرتنێکی سیاسیدا، بەرەبەرە پێك دێت. بە واتایەکیتر کۆمەڵگای مەدەنی فێر بووە کە پارێزگاری لە خۆی بکات و بە بەهێزییەوە سیستەمێکی سیاسی نوێ دەتوانێت بەپێی ئەم بنیاتانە دابمەزرێت.

ئەگەرچی بە جێ هێشتن و رزگار بوون لە دەوڵەت تاڕادەیەك پۆزەتیڤانەیە و لەوانەیە چەوسانەوەی هاوڵاتیان کەم بکاتەوە، بەڵام بۆ گەیشتن بەم شتە، دەبێ کۆمەڵگای مەدەنی چاوپۆشی لە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی مۆدێڕن بکات. مێژوو نیشانی داوە کە لە شوێنەکدا مەشروعییەتی دەوڵەت ببێتە هۆی هاتنەدی ئاسایش، ئابوور و خۆشگوزەرانی بە تەواوی گەشە دەکەن. هەروەك روبرت خاتون دەڵێت: ((دیاردەی چوونە دەرەوە نابێت ببێتە هۆی وێناکردنی جیهانێکی ئایدیال کە تیایدا گوندنشینەکانی پەرت و بڵاوی ئەفریقیا بە موعجیزەیەك دەگەن، کە تیایدا هەژاری، چەوسانەوە و ستەمکاری لەناو دەچێت)) ژیان لەم ژینگەیەکدا لەوانەیە باشتر بێ لە ژیان لە دەوڵەتێکی تالانچی و مشەخۆر بەڵام بە بڕاوی ناتوانێ ببێت بە جێگرێکی باش بۆ کۆمەڵگا رێکخراوەکانی پشت بەستراو بە حکومەتی یاسا کە تیایدا دامەزراوە یاسایی و عەقڵانییەکان و دیموکراسی و بەشداریکردن بوونی هەیە. تەنیا کۆمەڵگای سیاسی سەربەخۆ لە توانایاندایە کە وێکچوونی ئەندامانیان بکەن (ئەویش لە رێگەی) بەکارهێنانی بەرژەوەندی سیاسی نافەرمی.



لێرەدا راستییەك سەبارەت بە دەوڵەتی دوای کۆلۆنیالی بوونی هەیە. کۆمەڵگای مەدەنی لە تۆڵە سەندنەوە لە دەوڵەت مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە و دەتوانی یارمەتیدەری لە ناو بردنی توانایی و مەشروعییەتی دەوڵەت بێ، بەڵام کۆمەڵگەی مەدەنی لە جێگرتنەوەی دەسەڵاتی ناوەندی ناتوانایە. لە کاتیکدا ئەگەربێتو کۆمەڵگای مەدەنی بالاّ دەست بێ، دەوڵەت زۆرتر بەرەو هەرەس هێنان و رووخانی تەواو هەنگاو دەنێت، کەمینەیەکی بچووك لە بە بن بەست گەیشتنی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی سوودمەند دەبن و ئەم نموونەیانەش ئەزموونگەلی بەهادارن هەم بۆ چاکسازی لە بەرهەمهێنانی ئابووری و هەمیش لە دابین کردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکاندا. لەم جۆرە بابەتانەدا لە دوو دەیەی (کۆتایی) سەدەی بیستەم سەلمێنراوە کە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا بۆ بەردەوام بوونی ژیانیان، سەختی زۆریان بینیووە.

ئەم هیوایە هەیە کە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی فرە پارتی لە دەیەی نۆیەمدا، بناغەیەك بێت بۆ باشتر بوونی پەیوەندی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، بەتایبەت کاتێك کە دەوڵەت لە هەمبەر گەلەکەیدا وەڵامدەر بێت لە رێگەی ئەم هەڵبژاردنەیەوە دەکرێ هاوڵاتیان بە پۆزەتیڤانەتر لەگەڵ دەوڵەت لە پەیوەندی دا بن. ئەم وەڵامدانەوەیە دەبێتە هۆی بووژانەوەی مەشروعییەتی دەوڵەت و دەسەڵاتی لە دەست چوو زیندوو دەبێتەوە تا هەنوکە هەندێ لەو ستراتیژییانە کە لە سەرەوە باس کران، لەلایەن نوخبەکانی سیاسییەوە بەکار هێنراون.

هێشتا زوویە کە کولتوورێکی سیاسی پێگەیشتووی دیموکراتیك سەر هەڵ بدات، بەم پێیەش، ئایا هەڵبژاردنەکانی دەیەی نۆیەم، سەرلەنوێ مەشروعییەتی دەوڵەت بەدەست دێنێتەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە بەشی داهاتوودا، کاتێك کە باس لە دیموکراسی لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال دەکەین، روون دەبێتەوە.

خشتەی ژمارە ١-١٠: پوختەی بەشی قەیرانی دەسەڵاتی سیاسی لە ئەفریقیادا

| | |
|---|---|
| قەیرانی مەشروعییەت:<br>أ قـەیرانی کەڵەکـە بـوونی سەرمایە | - ستراتیژییەکانی جێگرەوەی هاوردەکان ناکارامەیە.<br>- کەرتی کشتوکاڵ بە هۆی دابین کردنی خەرجییەکانی دەوڵەت ناچارە باجی زۆر بدات.<br>- هیچ سەرمایەیەکی زیادە بۆ دووبارە سەرمایەگوزاری کردن بەرهەم ناهێنرێت. |
| ب) قەیرانی حکومەتداری | - ئافراندنگەلی سیاسی کورتخایەن، سەرمایەگوزاریی ئابووری درێژخایەن دەخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە.<br>- بۆرۆکراسی هەڵئاوسێوراوە.<br>- بەرتیل و گەندەڵی لە ژینگەی دەربەگایەتیدا بەخێرایی دەوژێتەوە.<br>- ناوەندگەرایی هیچ دەسترۆییەك (ڕێگەیەك) بۆ گۆڕینی یاسای ڕژێم ناهێڵێتەوە. |
| نەبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت:<br>أ. دەستتێوەرنەدانی کۆمەڵگای مەدەنی | - هاوڵاتیان لە ڕێگەی کۆچکردن، ئابووری سێبەر، نەدانی باج و سەرپێچی کردن لە یاساکانی دەوڵەتی تاڵانچی خۆیان دەپارێزن. |
| ب. نارەزامەندیی | - پەرەسەندنی بزاڤە شۆڕشگێڕییەکان کە لە دەیەی هەشتەمەوە بەرەنگاری دەوڵەت بووەتەوە. (وەك ئەسوپیا، ئۆگاندا، ڕواندا و کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ. |
| ج. ڕووخانی دەوڵەت | - دامەزراوەکانی دەوڵەت بۆ ماوەیەکی درێژ توانایی سەپاندنی دەسەڵات بەسەر گشت پارچەکانی وڵاتدا، نییە.<br>- نەبوونی حکومەتی یاسا، نەبوونی خزمەتگوزارییە گشتییەکان.<br>- دەوڵەت بۆ ماوەیەکی درێژ توانایی کۆنتڕۆڵ کردنی دامەزراوە سەرکوتکارەکانی نییە.<br>- سوپاییەکان بەرەبەرە، بەرەو بۆشایی سیاسی هەنگاو دەنێن. |
| ستراتیژییەکانی مانەوەی دەوڵەت، دووبارە بەدەستهێنانەوەی مەشروعییەتی دەوڵەت | - نوێکردنەوەی دەوڵەت لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە |
| هەرەسهێنانی دەوڵەت (ئاوەژووکردن) | - چالاکییەکانی دەوڵەت سنووردارە و بە گشتی چاودێری بەرژەوەندییەکانی نوخبەی دەسەڵاتدار دەکات.<br>- بەرژەوەندییە ستراتیژییەکان دەپارێزرێن، بەڵام خزمەتگوزارییە گشتییەکان و نوێنەرایەتیکردنی گەل نامێنێت.<br>- چالاکییەکانی تۆڕگەلی دەربەگایەتی کەم دەبێتەوە |
| سوودوەرگرتن لە بازارە تەریبەکان | - کاربەدەستانی دەوڵەت بۆ دابین کردنی بەرژەوەندیی تایبەتییەکانی خۆیان، هاوکاری ئەکتەرەکانی ئابووری سێبەر دەکەن. |
| دەوڵەتی شەڕکەر | - هیچ بانگەشەیەك بۆ (دابین کردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان لە ئارادا نییە.<br>- سەرچاوەکانی سەرکوتکردن و زۆر لێکردن بۆ پاراستنی سەرچاوە ستراتیژییەکانی نوخبەی دەسەڵاتدار بەکار دەهێنرێن. |

**بابەتی توێژینەوە: دەوڵەتی مشەخۆری (تاڵانچی) مۆبۆتۆ لە زەئیر:**

زائیر لە سەردەمی حکومەتی مۆبۆتۆ ببوو بە کاریکاتێرێکی دیکتاتۆری لە ئەفریقیادا، کریس سیمپسون لە ساڵی ١٩٩٠ لە وەسفی ئەم حکومەتەدا نووسیویەتی: ((حکومەتی ستەمکاریی کە پێویستە بڕووخێنرێت یاخود وڵاتێك کە بە بێ شەرمانە سەرچاوەکانی لە بەین دەچێت)) بە درێژایی ٣٢ ساڵ حکومەتی مۆبۆتۆ ٩٧-١٩٦٥ ئەم وڵاتە بەرزترین ڕێژە لە حکومەتێکی تاڵانچی بە خۆوە بینی کاتێك کە نوخبەی دەسەڵاتدار و هاوپەیمانانی کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان دەستیان لە سامانەکانی زەئیر بڕدرا بەرژەوەندییەکانی ئەم وڵاتە بۆ کۆمەڵگای

مەدەنی گەڕانەوە لە دەوڵەتی تالانچی مۆبۆتۆدا، بەکارهێنانی کەسیی لە سەرچاوەکان هەم بە هەنەر و هەمیش بە ئامانج هەژمار دەکرا.

ئەمەش لە کاتێکدایە کە پێشتر، ئەم پرسە بوونی نەبوو زەئیر کە پێشتر کۆنگۆی بەلجیکیا ناوی بوو و لە ساڵی ١٩٩٧دا بە کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ ناونرا خاوەن سەرچاوەی سروشتی بێ ژمارە، ئەم وڵاتە کە لە هێڵی ئەستوا و ڕۆژئاوا و ناوەندی ئەفریقیا دایە، خاوەن خاکی بەرفراوان و بەپیت و پڕ باران و ژینگەیەکی لێهاتوو بۆ کشتوکاڵە، هەروەها ئەم وڵاتە خاوەنی سەرچاوەی دەوڵەمەندی کان و سەرچاوەی کارەبای ئاوییە. بەڵام سەدەی بیستەم لەگەڵ دانیشتوانی ئەم بەشە لە ئەفریقیادا زۆر میهرەبان نەبووە، گەشەی ئابووری ئەم وڵاتە نەتەنیا بە هۆی وێناکانی هەڵەی بازاڕی نێودەوڵەتی بەڵکو بە هۆی چالاکییە خراپەکانی سەرکردە سیاسییەکانی ناوخۆ سست بووە. ئەم وڵاتە لە ساڵی ١٩٦٠دا دەستپێکەکی ناپیرۆزی هەبووە، چونکە دوای پێنج ڕۆژ لە سەربەخۆیی ئەم وڵاتە، سوپا بە سەرکردایەتی سەرهەنگ (مولازم) جۆزف دیزایری مۆبۆتۆ شۆڕشیان کرد و دوای چەند مانگێك دەسەڵاتیان گرتە دەست. لەم بارودۆخە شپرزەیەدا، ویلایەتی دەوڵەمەندی کاتانگا لە وڵات جیا بووە و شەڕێکی خەرجی هەڵگری بەسەر دەوڵەتدا سەپاند و بوو بە هۆی دەستتێوەردانی هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان تا لەم ڕێگەیەوە بتوانێ یەکێتی یەکپارچەی خاکەکەی بپارێزرێت، ئەگەرچی ئەم یەکێتییە سیاسییە هیچ کات بە بوون نەهات. بن بەستی سیاسی وڵات پاش هەڵبژاردنی پەرلەمانی ساڵی ١٩٦٥ ئاشکرا بوو کاتێك کە سەرۆك حکومەت نەیتوانی زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمان بەدەست بێنێت، مۆبۆتۆ ئەم هەڵەی قۆستەوە تا بۆ جاری دووەم دەست لە پرۆسەی سیاسی وڵاتدا وەربدات. سەرەتا سیستەمی مۆبۆتۆ سەرکەوتوو بوو بە یەکگرتنەوەی گشت خاکی وڵات و جێگرکردنی ((سۆپەرمان))ی سوپا، لەبری سیاسەتمەداران، کۆنگۆ و کینشازا توانی گەشەی ئابووری بەخۆوە ببینێ، پەیوەندی باش لەگەڵ زلهێزەکان و نرخی بەرزی مس لە بازاڕەکانی نێودەوڵەتیدا، یارمەتیدەری ئەم پرسە بوون بەڵام لە ماوەی ١٠ ساڵ دا، زەئیر (کە دووبارە لە ساڵی ١٩٧١دا ناو نرابوو) ڕێگەی رووخانی گرتەبەر وەك زۆرێك لە سەرکردەکانی ئەفریقیا بڕیارەکانی مۆبۆتۆ خێرایی بە قەیرانەکانی کەڵەکە بوون و حکومەتداریی بەخشی.

لە روانگەی کلاسیکییەوە قەیرانی کەڵەکە بوون لە ئەنجامی تێکەل بە یەکترکردنی سیاسەتە هەڵەکان لەگەڵ گەندەڵی ئاشکرای دەوڵەت دروست دەبێت. بۆ نموونە لە زاراوەکانی سیاسەتی گشتی دا، ستراتیژی جێگرەوەی هاوردەکان (تێکەڵ بە) تێچوونی بەرهەمهێنانی کاڵا



کشتوکاڵییەکان دەبێتەوە، یەکێك لەم نموونانە لە زەئیردا دامەزراندنی کارگەی پۆڵای مالیکیۆ بوو کە لەلایەن بەڵێندەرانی ئەڵمانی و ئیتاڵی لە ساڵی ١٩٧٥دا تەواو بوو.

ناتوانایی دەوڵەت لە ڕاکێشانی سەرمایەی دەرەکی بۆ ئەم پرۆژەیە بوو بە هۆی ئەوەی کە بەهای (ئیعتبار) ٢٥٠ ملیۆن دۆلاریی ئەم کارگە مۆدێرنە، لەلایەن ئیعتباری دەوڵەتییەوە کاملبوو. زەئیر سەرمایەی پێویستی بۆ پەرەپێدان بە سەرچاوەکانی ئاسنی بۆ بەکار هێنانی لە کارگەدا نەبوو، بۆیەش ئەم کارگەیە پشتبەستراو بە ئاسن سوواو بوو کە ئەم پرسەش تێچوونەکانی بەرهەمهێنانی زیاد دەکرد و بەم پێیەش بەرهەمەکانی ئەم کاڵایە لە بازاڕی جیهانیدا بێ ڕکابەر دەمایەوە، هەڵبەت تێچوونی ناوخۆیی ئەم کارگەیە هەشت جار زۆرتر لە هاوردەکردنی ئاسن لە دەرەوە بوو، بۆیەش هیچ کاتێك بەرهەمهێنانی ئەم کارگەیە لە ١٠٪ تێپەڕی نەکرد و بە گشتی ئەم پرۆژانە تێچوونیان زۆر و نائابوورییانە بوون.

هەڵەکانی گەشەسەندن بە درێژایی ساڵانی دەسەڵاتدارێتی مۆبۆتۆ روویدا پرسی کارەبای (ئینگا شابا) بێنە بەرچاو، ئامانج گواستنەوەی کارەبا بوو بۆ شابا لە ڕێستگەی کارەبای ئاویی ئینگا کە ١٨٠٠ کیلۆمەتر لە پارێزەگای شابا، جێگەیەك کە زۆرترین کانیی تێدا بوو، دوور بوو سەرەڕای دەست بەکار بوونی ئەم ویستگەیە گواستنەوەی (کارەبا) ئەنجام نەدرا، چونکە بۆ شابا باشتر بوو کە کارەبای بەکار هێنراوەکەی بەرهەم بێنێت و بفرۆشێت. پرۆژەکانیتریش ڕووبەڕووی شکست بوونەوە. بۆ نموونە نرخی، ریس و لاستیك، ئۆتۆمۆبیل ٢٠٪ تا ٤٠٪ زۆرتر لە کەل و پەلی هاوردە بوو. لەم ڕووەوە کە ئەم پرۆژانە کەڵەکە بوونی کەمی سەرمایەیان بەدواوە بوو بۆیە سەرمایەگوزاری لە (کەرتی) خزمەتگوزارییە گشتییەکانی نابەرهەمهێنەر پەرەی سەند.

کشتوکاڵ کەرتێکی بەهێز و دەوڵەمەند لە وڵاتدا بوو. سیاسەتەکانی حکومەت بە بەردەوامی تواناییەکانی کەرتی لادێیی کەم کردەوە. تۆڕی بەرفراوانی بازاڕی دەوڵەتی ساڵ لە دوای ساڵ بەرهەمی جووتیارانی بە نرخێکی کەمتر لە بازاڕ دەیکڕییەوە. ئەمەش بوو بە هۆی کەم بوونەوەی بەرهەمهێنانی جووتیاران. بۆ نموونە دروینەوەی کەتان لە ٦٠/٠٠٠ تەن ریس لە سەردەمی سەربەخۆییەوە بۆ ٨/٥٠٠ تەن لە ساڵی ١٩٧٦دا کەم بووە. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ناچار بە هاوردە کردنی کاڵا سەرەکییەکان بوو. کەش و هەوای کۆنگۆ بو کشتوکاڵ زۆر گونجاو بوو سەرمایەگوزاری نابەرهەمهێنەر لە پروژەکاندا خەرجییەکی زوری هەڵدەگرت و سوودی کەمی دەدایەوە و پتانسیێلی (کەرتی) کشتوکاڵی وڵات بێ بەرهەم هێنان مابووە و ئەم

پرسەش بووە هۆی پەرەسەندنی گەندەڵیی لە دەوڵەتی مۆبۆتۆدا. لەم سەردەمەدا ئاشکرا بوو کە چاوچنۆکی فەرمانبەرانی کەرتی گشتی بێ سنوورە و لە ترۆپکی ئەم دەوڵەتە و گەندەڵییەکەی خودی مۆبۆتۆ دێت. ئەو نموونەیەکی هەرە بەرزی گەندەڵی لە وڵاتدا بوو.

ئەو ٥ تا ٨ ملیار دۆلاری، کە بە درێژایی ژیانی خرانە سەر حیسابی بانکەکەی لە سویسرا، بە تالانی برد. جێگەی سەرسوڕمان و پرسیارە کە ئەو چۆن توانیویەتی بە مەشروعییەتێکی کەم ئەم بڕە پارەیە کۆ بکات؟ هەڵەی بەردەوامی نێوان کەرتی گشتی و تایبەتی روونکردنەوەی گەندەڵی ئاسان دەکات. پلەیەك خوارتر، لە پلەبەندیدا ژەنەراڵ ئەلیوکی، وەزیری بەرگری نیشتمانی دەهات کەلوپەلی هاوسەرەکەی لە پشکنینەکدا خرانە ژێر چاودێرییەوە، لە هاوسەرەکەی ١٧ جانتا پارە دۆزرایەوە لە پشکنینێکی خانووەکەیدا ٢ ملیار دۆلار لە کۆگادا دۆزرایەوە ئەو بە گەندەڵی تاوانبار کرا بەڵام بە هۆی هەبوونی ٢٠ ساڵ خزمەت بەر لێبوردن کەوت و بڕیاری دادگا هەڵوەشێنرایەوە و وەك ئەفسەرەکی سەربازی لە پارێزگای شابا دەست بەکار بووە، ئەگەرچی مۆبۆتۆ و ئەلیوکی دوو کەس، لە سەدان کەسی تاوانبار بە گەندەڵیی و خراپ بەکارهێنانی پلەی سەرۆك کۆماری تا نزمترین پلەی دەوڵەتی و هەروەها کەرتی تایبەتیشن، (بەڵام) گەندەڵیی لەم وڵاتەدا وەها تەشەنەی کردبوو کە هاوڵاتیان بۆ دەستەبەر کردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان ناچار بە دانوساندن و بەرتیل دان بوون، هەروەك قەشەی کابانگا لە پارێزگای لۆبۆمباش لە دەستنووسەکەیدا هاتووە ((ئێمە هەموو رۆژێك شایەتی ئازارمەندترین بارودۆخین. وەبێ چەند مرۆڤی بچووك و گەورە بە هۆی نەبوونی چاودێری تەندروستی و نەبوونی توانایی لە بەرتیل دان بۆ پزیشکەکان کە دەبێ چاودێری (ئەم مرۆڤانە) بکەن بمرن؟ بۆچی هیچ جۆرە کەل و پەلی پزیشکی لە نەخۆشخانەکاندا بوونی نییە، لە کاتێکدا کە ئێوە دەتوانن ئەم جۆرە پێداویستییانە لە بازاڕی ئازاددا بدۆزنەوە؟ بۆچی ئەوان ئەم کارە دەکەن؟ بۆچی لە دادگاکاندا دۆسیەی ئەو کەسانەی کە توانایی دانی بەرتیلیان بە دادوەرەکان نییە، لێپێچینەوە دەکرێ؟ بۆچی کاربەدەستانی حکومەت کاروباری خەڵك بە سبەی دەسپێرن لە کاتێکدا کە مافی خەڵکە ئەم خزمەتگوزارییانە بەدەست بێنن. ئەگەر بەرتیل بە فەرمانبەران نەدرێت ئەوان هیچ کارێك ئەنجام نادەن بۆچی لە کاتی کرانەوەی قوتابخانەکان، دایك و باوکان بۆ دانی بەرتیل بە بەڕێوەبەرانی قوتابخانە، قەرزدار ببنەوە؟ ئەو منالانەی کە نەتوانن بەرتیل بدەن، لە قوتابخانە بێ بەش دەبن. هەر کەسێك یەك گەردیلە لە دەسەڵات یان ئامرازەکانی دەسەڵاتی بەدەستەوە بێت لە سوودەکانی هەڵقوڵاو لە



چەوساندنەوەی خەڵك بەهرەمەند دەبێت)). هەروەك چۆن دەوڵەتی زەئیر لە کەڵەکەکردنی ساماندا شکستی هێنا، ئەم وڵاتە لە قەیرانی حکومەتداریش ئازاری دەبینی.

زەئیر رێگە ناسراوەکەی وڵاتانیتری ئەفریقیای بە دیارکردنی ناوەندگەرایی دەوڵەت و تایبەتکردنی (تاکەکەسی) دەسەڵات لەلایەن مۆبۆتۆوە لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال، پەیڕەو کرد. لە ئەنجامی شکستی پارتە سیاسییەکان لە وڵاتدا و لە یەکەمین کۆمار، (یەکەمین خولی سەروکایەتی)، سەرۆك کۆمار، سیستەمی فرە پارتی لە وڵاتدا قەدەغە کرد. سیستەمی تاك پارتی جێگەی ئەم دۆخەی گرتەوە و خودی مۆبۆتۆ هەر سێ دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادپەروەری لە ئەستۆ گرت و سەرچاوە نەیارەکان بە سیستماتیکانە، لە رێگەی بەندکردن، دوور خستنەوە، کوشتن و تیرۆر و ئازاردانی بەرهەڵستکاران لەناو بردران. ئەم بارودۆخە رێگەی بۆ ئەندامانی پارتی دەسەڵاتدار کە پێگەیان بە هۆی وەفاداری بۆ مۆبۆتۆ بەدەستهێنابوو، خۆش کرد. هەروەك یەکێك لە راپۆرتێرەکان ژمارەی ئەکتەرە سەرەکییەکانی زەئیری ٨٠ (ئەکتەر) هەژمار کردووە کە لەم رێژەیە ٢٠ کەس لە دوورخستنەوە (تبعید)، ٢٠ کەس لە بەندیخانە، ٢٠ کەس وەزیر و ٢٠ کەسیش سەفیرن. هەر سێ مانگ جارێك ئەم رەوتە دەگۆڕدرێت و هێزەکان لەلایەن مۆبۆتۆوە دەگۆڕدرێن، هیچ کەسێك دۆست یان دوژمن نازانی کێ باڵاترین دەسەڵاتی راپەراندنی وڵاتی بە دەستەوەیە و بۆ بەرەنگاربوونەوەی مۆبۆتۆ لەوانەیە کەسێك گشت دارایی و بەتایبەتیش ژیانی لە دەست بدات.

چونکە نوخبەی سیاسی خاوەنی سامان بوو ئەم پرسە دەبووە هۆی دەست پێگەیشتنی بە دامەزراوە سیاسییەکانیش زۆربەی کاربەدەستانی زەئیر لە رێگەی حکومەتەوە، سامانێکی زۆریان بەدەستهێنا، ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنی قوربانی رووخان و هەرەسهێنانی ئابوور بوون، چونکە خزمەتگوزارییە گشتییەکان کەم ببووە و لە ئەنجامیشدا گشت کاربەدەستان پشتیان بە وەرگرتنی بەرتیل بەست و خەڵکیش بۆ بەدەستهێنانی خزمەتگوزارییە گشتییەکان ناچار بەدانی بەرتیل بەکاربەدەستان بوون و هیچ رێگەیەك بۆ رزگار بوون لە دەست ئەم نوخبە تالانچییە بوونی نەبوو و هیچ پارتێکی سیاسی بەرهەڵستکاریش مافی چالاکی نواندنی نەبوو و هەر جۆرە بەرەنگارییەکی سیاسی کە رژێمی مۆبۆتۆی رووبەڕووی مەترسی کردبا، بە بێ رەحمانە لە ناو دەبردرا. مۆبۆتۆ تا دوایین رۆژی حکومەتەکەی دامەزراوە سەرکوتکەرەکانی کە بۆ سەرکوتکردنی کۆمەڵگای مەدەنی بەکاری دێنا، پاراست. ناتوانایی لە گۆڕینی کاربەدەستان بە راستەوخۆیانە و یاساییانە بوو بە هۆی ئەوەی کە گەلی زەئیر بە دوای هەلی باشتردا

بگەڕێن، ئەوان هەوڵیان دەدا مەوداکەیان لەگەڵ دەوڵەت بپارێزن. پێوەری پابەند نەبوون، لە دەیەی هەشتەم و نۆیەمدا باشترین فاکتەری روونکردنەوەی بووژانەوەی ئابووری تەریب لە زەئیردایە. ئامارە فەرمییەکان نیشان دەدەن کە ئابوور لە سەردەمی مۆبۆتۆدا لە دۆخی خراپتر بووندا بوو. بەرهەمهێنانی کالآ بازرگانییەکان لە گشت کەرتەکاندا کەم بووە و هەڵئاوسان گەیشتە رێژەی ١٠٠٪. بودجە زیادی کرد و داهاتەکان لە پلەیەکی زۆر کەم دابوون بە کورتی لە ئابووردا هیچ کارەك وەك پێویست ئەنجام نەدەدرا بۆیەش ٣٥ ملیۆن زەئیری لە پێناو ژیان هەوڵیان دەدا و ئەم راستییەش لە ئارادا بوو کە ئابووری فەرمی ناتوانێ وەڵامدەرەوەی پێداویستییە سەرەکییەکانی گەل بێت، بەڵام ئابووری فەرمی بە تەنیا لە وەڵاتدا بوونی نەبوو تا کۆتایی هەشتاکان پێشبینی دەکرا کە ئابووری دووەم (ئابووری سێبەر) سێ جار زۆرتر لە گەشەی بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی، گەشە بکات.

ئامارگەلێکی زۆر نیشان دەدەن کە ئابووری سێبەر لە ساڵی ١٩٧٠وە زۆر تەشەنەی کرد. زۆرتر لە ٦٠٪ بەرهەمی قاوەی زەئیر ساڵانە لە رێگەی قاچاغ و لە دەرەوەی بازاڕی دەوڵەتی بۆ وڵاتانی دراوسێی دەگوازرایەوە. لە ساڵی ١٩٨٥دا جووتیاران بەرهەمی قاوەیان بە نرخی ٤٢ سەنت بۆ هەر کیلویەك، دەیانفرۆشت، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە دەوڵەت بە ٧ سەنت ئەم بەرهەمەی دەکڕییەوە هەروەها ئابووری سێبەر دەیتوانی بەرهەمگەلێك بفرۆشێت (ئالوگۆڕی بکات) کە ئابووری فەرمی لە توانایدا نەبوو ئەم کارە ئەنجام بدات. نرخە دانراوەکان و کونترۆڵی دەوڵەت وگرفتەکانی گواستنەوە بە هۆی خراپی سیستەمی گواستنەوە فرۆشتنی کاڵای لە بازاڕی فەرمیدا، دژوارکردبوو. ئەگەرچی ئەم پرسە بوو بە هۆی خێراکردنی رووخانی دەوڵەتی مۆبۆتۆ، بەڵام ئەم رژێمە تا ناوەڕاستی نەوەدەکان بە نیمچە مانەوەیی، درێژەی هێنا، هەڵبەت هەندێ لە نوخبەکان کە توانیبوویان خۆیان لەگەڵ دەوڵەتی لە دۆخی رووخاندندا بگونجێنێت، تارادەیەك سەرکەوتوو بوون و ئەم پرسەش مەودای نێوان کۆمەڵگای مەدەنی فراوانتر کرد. بەواتایەکتری مەودای نێوان هاوڵاتیان و کاربەدەستان ئێجگار زۆر بووە و ئەم درز تێکەوتنەش دەرفەتی بۆ کاربەدەستان رەخساند تا پۆستەکانیان لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتدا بەکاربێنن و لە ئەنجامی ئەم ستراتیژییەشدا ژیانی (بەرژەوەندی) تۆڕەکانی دەرەبەگایەتی لاوازبووە و ئەمەش بوو بەهۆی بەهێزبوونی سەرچاوە دەرەکییەکان بەبەراورد لەگەڵ سەرچاوەی ناوەخۆیی و ئەمەش بەرزبوونەوەی چالاکی بازاڕی رەوشی بەدواداهات.



قەیرانی کەڵەکە بوون کە لە کۆتایی حەفتاکاندا دەستی پێکردبوو لە هەشتاکاندا بە توندی پەرەی سەند و دواتریش لەسەرەتای نەوەدەکاندا بوو بەقەیرانێکی گەورە. لە بەرپەرچدانەوەی ئەم قەیرانە تەشەنەکراوەدا، نوخبەی دەوڵەت، تۆڕەکانی دەرەبەگایەتییان (لایەنگرانەکەی) کەم کردەوە و سروشتییە کە بەرێوەبەران ئیمتیازاتی هەڵقولاو لە پێگەکەیان بپارێزن، بەڵام بەرێوەبەران نەیانتوانی بۆ ماوەیەکی درێژ پارێزگاری لە سەرچاوەکان بکەن کە بۆ دابەش کردن لەنێوان هاوڵاتیاندا پێویست بوو. لەئەنجامدا خزمەتگوزارییە گشتییەکان وەك تەندروستی و پەروەردە و ئاسایش کەم بوونەوە. بۆ نموونە بودجەی پەروەردە لە ١٧,٥ بودجەی وڵات لە ساڵی ١٩٧٢دا بۆ ٢,١ لە ساڵی ١٩٩٠دا گەیشت. هەروەها هەرەوەزییەکانیش(کۆمەڵگای لادێی) لەناو چوون و پشکی کشتوکاڵ لە بودجەی نیشتیمانی لە٢٩,٣ بۆ ٤٪ کەمی کردەوە. لەم ماوەیەدا سەرمایەگوزاری لە پلانەکانی ژێرخاندا کەم بووە. لە هەشتاکاندا تەنیا ١٥٪ رێگاوبانی بەجێ ماو لە قۆناغی کۆلۆنیالی شایانی کەڵك لێ وەرگرتن بوون. تەنانەت لە شارەکانیشدا، رژێمی مۆبۆتۆ، خزمەتگوزاری دەوڵەتی لە ئاستێکی زۆر نزمدا پێشکەش دەکرد. لە شاری کینشازادا (پایتەختی وڵات) کارەبا و ئاو بەبەردەوامی دەپچڕا و بەهۆی نەبوونی پێداویستییەکان نەخۆشەکان رەوانەی نەخۆشخانە نەدەکرا. گشت ئەمانە نیشاندەر بوون بۆ ئەوەی وەفاداری و پشتگیری لە دەوڵەت و تواناکانی (امکانات) دەوڵەت کەم بوونەوە.

رزگاربوون لە تۆڕگەلی دەرەبەگایەتی بۆ سیستەمی دەوڵەت هەندێ مەترسی بەدواوە بوو، هەندێ جیابوونەوەش لێ کەوتەوە. هەنوکە دەوڵەت رێژەیەکی کەمتری دەخستە ژێرچاودێری (پۆشش) خۆیەوە، ئەوانەی کە پێشتر دەستیان بەپێداویستییەکان دەگەیشت، هەنوکە لە ژێرچاودێریدا نین و لە حکومەت دڵگران ببوون. بەڵام مۆبۆتۆ و هاوکارانی بە توندی کونترۆڵی بارودۆخیان لە پێناو پاراستنی ژیانی حکومەتەکەیان دەکرد.

بۆ نموونە ئەگەرچی تا ساڵی ١٩٩٠ زۆربەی سوپاییەکان لە پێداویستییەکان (امکانات) بێبەشکران، بەڵام گاردی سەرۆك کۆماری لە ٥٠٠٠ ئەفسەر پێك هاتبوو کە بە بەردەوامی مووچەیان پێ دەدرا. سەرۆکایەتی کۆمار لەلایەن گەلەوە مەشروعییەتی نەمابوو. بەڵام مەشروعییەتەکەی لە رێگەی دامەزراوە سەرکوتکارەکانەوە کە فاکتەرێکی متمانە پێکراو بوون بۆ (پاراستنی) حکومەت، پاراست.

رژێم نەیتوانی خۆشگوزەرانی و پێداویستییە ژێرخانەکان بۆ ناوچە لادێیەکان دابین بکات و ئەمەش بوو بە هۆی کونترۆڵ کردنی گشت ناوچەکانی وڵات لەلایەن جووتیارە نارازییەکانەوە

رژێم هەوڵیدا کە دەسەڵاتەکەی لە ناوچە بازرگانی و شارە گەورەکان و ناوچە گرنگەکان کە خاوەنی کان و ناوچە گرنگەکانی کشتوکاڵی بوون، بپارێزێت. گشت ئەم ناوچانە توانای بەرهەمهێنانی زیادەیان هەبوو کە بەڕێوەبەرانی دەوڵەتی سوودمەند بوو و بۆ دەوڵەتیش گرنگ نەبوو کە لە ناوچە کەم بایەخەکان لە رووی ئابوورەوە دەسەڵاتەکەی لە دەستدا بێت. بە گشتی رژێمی مۆبۆتۆ نەیتوانی بیرۆکەی مارکس لە سەپاندنی دەسەڵات بە سەر گشت وڵاتدا، جێبەجێ بکات.

یەکێك لە سەرکەوتووترین ستراتیژییەکانی رژێم، پشت بەستن بە ناوەرۆکی مەشروعییەتی هەڵقوڵاو لە بیرۆکەی ڤێبر بوو. هۆیەکەش ئەوە بوو کە حکومەت و کۆمپانیا فرە رەگەزەکانیتر، مۆبۆتۆیان بە سەرۆك دەوڵەتی زەئیر و نوێنەری گەلی ئەم وڵاتەیان ناساند. ئەو یەکێك لە سەرکردە سەرکەوتووەکان بوو کە توانی پشتگیری و سەرچاوەی نێودەوڵەتی بەدەست بێنێت و ئەمەش بە پراکتیکی روویدا، چونکە خواستی دەرەکی بۆ قاوە و سەرچاوەکانەکانی ئەم وڵاتە لە ئارادا بوو و مۆبۆتۆ توانی لە رێگەی ئیمتیازاتی کۆمپانیا فرە رەگەزەکانەوە بەرژەوەندیگەلێك بەدەست بێنێت. تەنانەت لە ساڵی ١٩٩١دا، کە هەرەس هێنانی دەوڵەت نزیك ببووە، حکومەتی مۆبۆتۆ دەسەڵاتەکەی تەنیا بەسەر ناوچە ستراتیژییەکاندا پیادە دەکرد و ٢/١ ملیار دۆلاری لە رێگەی هەناردەکانەوە بەدەستهێنا و ٤/٤ ملیار دۆلاریشی لە کۆمەکی دەرەکی دەستەبەرکرد، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە خزمەتگوزارییە گشتییەکان بە کەمی دابین دەکران و رێژەیەکی زۆری ئەم پارەیە بۆ نوخبەی دەوڵەت و پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان تەرخانکرا تا بتوانێت لایەنگرەکان لەم بەرژەوەندییانە سوودمەند بکات و دامەزراوەکانی سەرکوتکردنیش (ئەگەرچی کەم ببوونەوە) بەڕێوە ببات. خەرجییەکی زۆریش بۆ دامەزراندنی بەکرێ گیراوەکانی بیانی بۆ بەهێزکردنی گاردی کۆماری تەرخانکرا.

کۆمەڵگای نێودەوڵەتی تەنیا سەرچاوەی دابین کردنی سامان بۆ نوخبەی دەوڵەتی و بەهێزکردنیان نەبوو. بە کەمبوونەوەی داهاتی کەرتی گشتی و هەڵئاوسان و نەدانی مووچە هەندێ لە فەرمانبەرانی حکومەت داهاتێکی کەمیان لە ئابووری فەرمیدا، بەدەست دێنا و بەناچارانە روویان لە ئابووری رەش کرد. بۆ نموونە فەرمانبەرانی حکومەت بۆ بەدەستهێنانی رانت لەبازاڕە تەریبەکاندا، سوودیان لە پێگەکەیان وەردەگرن و گرنگترین سەرچاوەی داهاتیان وەرگرتنی بەرتیل لەچالاکگێڕە نایاساییەکان بوو. بۆ نموونە ئەفسەرانی گومرك لە سنووری زەئیر و زامبیا لەگەڵ شۆفێری بارهەڵگرەکان بۆ وەرگرتنی بەشێکی باج رێك دەکەوتن. دواتر



ئەم ئەفسەر و شۆفێرانە، پشکە نەدراوەکەی دەوڵەتیان لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکرد. هەروەها کاتێك کە شۆفێرەکان بە پاسپۆرتی ساختە هاتووچۆیان دەکرد، شۆفێرەکان پارەیان بەسەربازەکان دەدا تا بتوانن هاتووچۆ بکەن.

سوودە دەستکەوتووەکان تەنیا لە چالاکیگەلی ناڕاستەوخۆی بازاڕی رەشدا کورت نەدەکرایەوە، هەندێ لە نوخبەکان لە بواری ئابووریدا چالاك بوون و ئەوان بەخۆ جیاکردنەوە لە نوخبە و بەڕێوەبەرە دەسەڵاتدارەکان لە دوای چالاکییە لاوەکییەکان و پرۆژەی دەرفەتی کار رەخساندن بۆ پاراستنی پێگەیان بوون. جان فرانسیس بایارت سەبارەت بەوەی کە چۆن کاربەدەستە دەوڵەتییەکانی هێزی ئاسمانی زەئیر، خۆیان لەگەڵ هەڵومەرجی دەوڵەتی لە دۆخی رووخاندا گونجاندبوو روون دەکاتەوە کە ((لە هەشتاکاندا دوای نەدانی مووچەی فەرمانبەرانی هێزی ئاسمانی لە کاتی خۆیدا، فڕۆکەوانان دەستیانکرد بە هاوکاریکردنی کۆمپانیا نایاساییەکان و ئەم کارەیان نیگەرانی تۆڕی گواستنەوەی زەمینی لێکەوتەوە، ئەوان توانییان کاڵا هاوردەی وڵات بکەن و لە ئەنجامی ئەم هاوردەکردنەشدا، لە سوودەکەیان بەهرەمەند دەبوون. کارمەندان و خزمەتکارانی هێزی ئاسمانی چونکە لە سوودەکانی ئەم فرۆشتنەدا پشکدار نەبوون نیگەران بوون بۆیە ئەوان چاودێری کەمتریان لە چۆنێتی فڕینی (فڕۆکەکان) دەکرد، کە ئەمەش کەوتنە خوارەوەی چەندین فڕۆکەی لێکەوتەوە بۆیەش فڕۆکەوانان ناچار بوون کە پشکی فەرمانبەرانی کەرتی خزمەتگوزاریی ئاسمانی بدەن، لە ئەنجامیشدا ئەوان ژمارەیەکی زۆرتر لە رێبوار و باری زیادەیان بارگو دەکرد. ئەمەش خزمەتکارەکانی رازی کرد و ئەوان توانییان سەرەڕای مووچەی دەوڵەت، سوود لەم مووچەیەش وەربگرن، ئەوان پارچەکانی فڕۆکەیان لە بازاڕی تەریبدا (رەش) دەیانفرۆشت. بەمجۆرەش گشت پارچە یەدەك و سووتەمەنی زیادەیان دەفرۆشت تا دەیەی نۆیەم هێزی ئاسمانی زەئیر تەنیا بە ناو مابووە)) لە ناچوونی هێزی ئاسمانی زەئیر نیشانەی رووخانی دەوڵەت لە ئاستی خوارەوەدا بوو، رژێمی مۆبۆتۆ لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا رووخا و دەوڵەت دەسەڵاتەکەی لە دەستدا و ئابوور بوونی نەما و بۆرۆکراسیش لە ناوچوو، بەمجۆرەش کۆمپانیا فرە رەگەزەکان مەیلی چەندانیان بۆ سەرمایەگوزاری لە زەئیردا نەبوو. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی و سەرمایەگوزارە بیانییەکان (بەتایبەتیش دوای شەڕی سارد) تواناییان نەبوو کە وەلامدەری داواکارییە لە رادەبەدەرەکانی مۆبۆتۆ و قەرزە زۆررەکانی دەرەکی وڵات بن.

مۆبۆتۆ هەوڵی دا سەرەڕای گەشەی گرووپە نەیارەکان لە دەسەڵاتدا بمێنێتەوە. ئەو ناچارکرا تا بە ئازادانە یاسای بنەڕەتی دابڕێژێتەوە و لە هەندێ بابەتیشدا مافی مانوردان بە بەرهەڵستکاران بدات (بەتایبەتیش چەندین پارتی بەرهەڵستکاری ساختە). ئەمەش بووە هۆی بە بن بەست گەیشتنی دەوڵەت هەروەك ٣٢ ساڵ پێشتر. سەرۆك کۆماریش وازی لە دەسەڵاتە ماوەکەی نەهێنا و بەمجۆرەش سەرکردەکانی بەرهەڵستکار لە پەرلەماندا، ناچار بە هاوکاریکردنی یەکتر بۆ گۆڕین و لە ناو بردنی مۆبۆتۆ بوونەوە.

لە کۆتاشدا مۆبۆتۆ بە هۆی سوپاوە لە دەسەڵات لادرا و ئەم کارەش لە ڕێگەی یەکێتی هێزە کۆماریخواز و ڕزگاریکارانی کۆنگۆ بە سەرۆکایەتی لورانت دیزار کابیلا ئەنجامدرا. ئەم شۆڕشە دوای هێرشکردنی دوو ملیۆن ڕواندایی بۆ ڕۆژهەڵاتی زەئیر بە هۆی ڕەشەکوژی ساڵی ١٩٩٤دا خێرایی وەرگرتبوو. حکومەتی پێشووی ڕواندا ئەم کۆمەڵگایانەی وەك بنکەیەك لە دژی گرووپی توتسی لە زەئیردا بەکار هێنا. دواتریش توتسییەکان تۆڵەیان سەندەوە و ئەوان بە هاوکاری حکومەتی نوێی ڕواندا چوونە ناو کینشازادا و مۆبۆتۆیان لە کار لادا. یەکێتی هێزەکانی کۆماریخواز و ڕزگارکەری زەئیر لە مایسی ١٩٩٧ گەیشتنە کینشازا و کابیلا بوو بە سەرۆك کۆمار و ناوی وڵاتی گۆڕی بۆ کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ و مۆبۆتۆش دوای چەند مانگ بە هۆی شێرپەنجەوە کۆچی دوایی کرد، مردنیشی وەك سیمبولێك مەرگی یەکێك لە درندەترین ڕژێمەکان بوو کە ئەفریقیا بەخۆوە بینی بوو.

بە مردنی مۆبۆتۆ هاوڵاتیانی ئەم وڵاتە ئارامییان بەخۆوە نەبینی و ئەم وڵاتە بووە بە نموویەك لە ململانێی گرووپە ڕکابەرەکان بۆ لەناوبردنی کاربەدەستانی حکوومی، بەڵام هیچ یەك لەمانە توانای دامەزراندنی حکومەتێکی جێگرەوەیان نەبوو. ئەمڕۆکە وڵاتی کۆنگۆ لە بارودۆخێکی قەیراناویدایە. ڕژێمی فەرمانڕەوایی کینشازا ناتوانێ دەسەڵاتەکەی بەسەر گشت وڵاتدا پیادە بکات و زۆربەی وڵات لەلایەن هێزی سەربازیی (لایەنی) ڕکابەر کونترۆڵ دەکرێت کە لە دەرەوە پشتگیرییان لێدەکرێت، سامانی زۆری ئەم وڵاتە و بۆشایی دەسەڵات بووتە هۆی داگیرسانی شەڕ لە زۆربەی ناوچەکانی ئەم وڵاتە (ئەویش) لەلایەن دراوسێیەکانیەوە، ئەمەش بەو هۆیەوە کە هێزی سەربازی و لایەنگرانی بۆ کونترۆڵ کردنی سەرچاوە فراوانەکان کە دەتوانێ گرنگترین سەرچاوەی هەناردەکردن بێت بۆیان، لەگەڵ حکومەتی ناوەندیدا شەڕدەکەن، کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکانی ڕۆژئاوا لە سوودەکانی ئەم سەرچاوانە تەواو ڕازین، سەرەڕای ئاگادار بوونیان لەم بابەتە کە توندوتیژی لەم وڵاتەدا بووەتە هۆی بەردەوامبوونی ئەم سامانە. (دوای کوشتنی



کابیلا لە ساڵی ٢٠٠١دا. کوڕەکەی حکومەتی گرتە دەست و بە دانوسان لەگەڵ گرووپە بەرهەڵستکارەکان و بەشداریکردنیان لە حکومەتدا توانی ئارامی ڕێژەیی بۆ ئەم وڵاتە بگەڕێنێتەوە و لە ساڵی ٢٠٠٦دا یەکەمین هەڵبژاردنی پەرلەمانی و سەرۆك کۆماری ئەنجامدرا.

### کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ:

| | |
|---|---|
| ڕووبەر | ٢,٣٤٤,٨٥٥ کیلومەتری چوارگۆشە |
| دانیشتوان | ٥١,٢ میلۆن کەس |
| هێزی کۆلۆنیالکار | بەلجیکا |
| ساڵی سەربەخۆیی | ١٩٦٠ |
| گرنگترین شارەکان | کینشازا (پایتەخت) لۆبۆمباشی، ئێم بیوجی – مایی |
| نەژاد | نزیکەی ٢٠٠ نەژاد |
| زمان | فەرەنسی، سواحیلی، تشیلیوبا |
| دانیشتوانی شار | ٣٠,٣ |
| ئومید بە ژیان | ٥٢ ساڵ |
| ڕێژەی مردن | ٩١,٦ مردن لە هەر ١٠٠٠ لە دایکبوون |
| ڕێژەی خوێندەواری | ٪٧٧ |
| ئایین | سوونەتی، مەسیحی |
| هەناردەکان | ئەلماس، زێڕ و مس |
| دراو | کۆنگۆیی نوێی |
| بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی | ٩٣ دۆلار (١٩٩٥) |

### زاراوە سەرەکییەکان:

**دەسەڵات:** جۆرە پەیوەندییەکی دەروونناسانەی نێوان فەرمانڕەواکان و هاوڵاتیان کە تیایدا، ئەم بیرۆکەیە کە پێویستە ملکەچی دەوڵەت و دامەزراوەکانی بن دێتە کایەوە.

**گەندەڵی و بەرتیل:** راسپاردنی (گواستنەوەی) چالاکییە یاسای- عەقلانییەکان لەلایەن کاربەدەستانەوە لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندی کەسی.

**قەیرانی کەڵەکەبوون:** شکست هێنان لە هێنانەدی و بەرهەمهێنانی سامان لە رێگەی سەرمایەگوزاری بەرهەمهێنەری سەرمایەی زیادەوە.

**قەیرانی حکومەتداری:** شکست هێنانی دەوڵەت لە هێنانەدی ستراکتۆرە سیاسییەکان کە لە توانایدا نەبێت نوێنەرایەتی کۆمەڵگای مەدەنی بکات.

**ستراتیژییەکانی چوونەدەرەوە، دەستتێوەردان و ژیان:** کرداری مەودا خستنە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی و کەناڵە لاوەکییەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت (بۆ نموونە بەکارهێنانی بازاڕە تەریبەکان).

**شۆڕش:** ئایدۆلۆژیایەك کە تێدا دەسەڵاتی دەوڵەت لە ناو کۆمەڵگای مەدەنیدا لە رێگەی هێزەوە (زۆر) رووبەڕووی بەرەنگاری دەبێتەوە.

**بۆرۆکراسی هەڵئاوساودا:** بۆرۆکراسی یاخود دامەزراوە حکومییەکان کە زۆر گەورەن کە لەلایەن ئابووری دەوڵەت و گرووپێك لە وەفادارانی حکومەت پشتگیری دەکرێن.

**بازاڕە تەریبەکان:** بازاڕە ئابوورییە نایاساییەکان کە هەوڵ دەدەن لەڕێگەی ئیستیغلال کردنی یاسا فەرمییەکانەوە تووشی مەترسی نەبنەوە (بە ئابووری دووەم یاخود ئابووری سێبەریش ناو دەبرێت) .

**دامەزراوە دەوڵەتییەکان:** دامەزراوە یاخود کۆمپانیا گشتییەکان وەك تۆڕەکانی بازاڕی دەوڵەتی، پیشەسازیی، کۆمپانیاکانی گواستنەوە...کە لەسەر بودجەی دەوڵەت بەڕێوەدەبرێن.

**رووخانی دەوڵەت:** کاتێك کە دامەزراوە ناوەندی و فەرمییەکانی دەوڵەت نەتوانن دەسەڵاتیان پیادە بکەن.

**دەستتێوەردانی دەوڵەت:** کاتێك کاربەدەستانی دەوڵەت بەهۆی نەبوونی سەرچاوەکان، هەندێ لە چالاکییەکانی دەوڵەت و چالاکییە تایبەتییەکان (خاص) بە مەبەستی بەردەوام بوونی چالاکییە بەرفراوانە گشتییەکان، دەربڕنەوە.

**سەرمایەگوزاری نابەرهەمهێنەر:** چالاکی گەلی ئابووری کە لە دروست کردنی کالایەکی بەرهەمهێنراوی سوودمەند یاخود زیادکردنی سەرمایە رووبەڕووی شکست دەبێتەوە.



**دەوڵەتی شەڕکەر:** دەوڵەتی ناسەقامگیر کە هەوڵ دەدات داواکارییە تایبەتییەکانی سەرکردەکان دابین بکات و هەوڵ نادات لە رێگەی دابینکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان بۆ هاوڵاتیان، مەشروعییەت بەدەست بێنێت.

## پرسیارەکان:

١. بۆچی لە هەشتاکاندا دەوڵەتانی ئەفریقیا رووبەڕووی قەیران بوونەوە؟

٢. تا چ ئاستێك لە رووبەڕووبوونەوەی دەوڵەتانی تالانچی، کۆمەڵگای مەدەنی سەرکەوتوو بووە؟

٣. شکست هێنانی دەوڵەتانی ئەفریقیا لە دوو دەیەی کوتایی (سەدەی بیستەم) چۆن بوو؟

٤. لە دەیەی هەشتەم و نۆیەمدا چ گرووپگەلێك لە ئەفریقیادا دەسەڵاتدار بوونە نوخبەی دەوڵەتی یاخود ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنی؟

٥. دەوڵەتان چ جۆرە ستراتیژییەکیان بۆ بەردەوام بوونیان بەکار دێنا؟

## بۆ خوێندنی زۆرتر:

چەندین پەرتووك بۆ لەخۆگرتنی پرسە وروژێنراوەکانی ئەم بەشە هەن، پەرتووکی رابرت بارت، سەبارەت بە چۆنیەتی شکست هێنانی سیاسەتەکانی دەوڵەت لە کەرتی کشتوکاڵدا گرنگە، پەرتووکی ساهار کپ یوندە جەخت دەکاتە سەر گەندەڵی و بەرتیل، پەرتووکی ویلیام زارتمەن سەبارەت بە رووخانی دەوڵەت، سوودمەندە.

دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم گۆڕانکاری سیاسی ناپیرۆزی بۆ ئەفریقیا بە دیاری هێنا و شەپۆلی دیموکراسی گشت ئەفریقیای تەنیوە، لە تونس تا موزامبیك، لە موریتانی تا ماداگاسکار دەوڵەت لە دوای دەوڵەت ناچاربوو بۆ بەرپەرچدانەوەی بزاڤە بەرهەڵستکارەکانی تازە سەرهەڵداو لەگەڵ سیستەمی فرە پارتی خۆی بگونجێنێت. سەرۆك کۆماری ئەفریقیای باشوور ئەم بزاڤەی بە ئەزموونی ((رنیسانسی ئەفریقیا)) ناوبرد.

پێش ١٩٩٠، پارتە بەرهەڵستکارەکانی دەوڵەت لە پێشینەی (سیاسی) ئەم وڵاتانەدا مۆڵەتی چالاکیگێڕانیان نەبوو و نایاسایی بوون. هەر وەك لە بەشی شەشەمدا باسمان کرد، نۆرمی سیاسی لەم کیشوەرەدا بریتی بوو لە حکومەتێکی تەواو دیارکراو (شخصی) کە لەرێگەی ستراکتۆری تاك پارتییەوە بارودۆخ کونترۆڵ دەکات پانتایەکی زۆرکەم بوو، دژایەتی کردن و بەرەنگار بوونەوەی نوخبەکانی حکومەتی لە ئارادا بوو، و چالاکی سیستەمی فرە پارتی بە میراتماو لە قۆناغی کۆلۆنیالیدا دوای سەربەخۆیی قەدەغەکرا و تەنیا لە بوتسوانا (لە ساڵی ١٩٦٦) و لە زیمبابوا (لە ساڵی ١٩٨٠ وە سەرەڕای بوونی ترساندن و هەڕەشەکردن لەم دە ساڵەی دواییدا) (چالاکی فرە پارتی) مایەوە، لە گامبیا، سێنگال و موریس بۆ سەردەمێك، رکابەری فرە پارتی بوونی هەبوو، لە شوێنەکانیتردا وێنەی دیموکراسی، وێنەیەکی بێ رۆح و بێ جەستە بوو کە تیایدا ئەفریقیا ببوو بە کیشوەرێك کە حکومەتەکان لە رێگەی هێزەوە نە لە رێگەی هەڵبژاردنەوە دەگۆڕدران.

بە پێچەوانەوە، بووژانەوەی دیموکراسی رکابەرێتی لە دەیەی نۆیەمدا روویدا. تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٨ دەوڵەتی تاك پارتی و حکومەتی سەربازی نموونەی باڵادەست بوون. (بڕواننە خشتەی ١-١١) هێشتاش ئەفریقیا لە سەردەمی ((تاك سەرکردەیی، تاك ئایدیۆلۆژی و تاك پارتی))دا دەژیا. هەندێجار هەڵبژاردنی ئازاد و دادپەروەران لەم وڵاتانەدا ئەنجام دەدرا (لەم کاتەدا سەربازەکان بۆ نێجریا و غەنا بنکەکانیان گەڕانەوە) بەڵام ئەم هەڵبژاردنانە، هیچ کاتێك پابەند بوونیان بە کردەوەی دیموکراسی نیشان نادەن چونکە بەردەوامی هەڵبژاردن زۆر دەگمەن بوو، تا ساڵی ١٩٩٠ ژمارەی وڵاتانی خاوەن سیستەمی فرە پارتی لە ٩ وڵات بۆ ٤٥ وڵات بەرز بووە، چەندین وڵاتیش ئەم جۆرە دیموکراسییەیان (فرە پارتی) تەنیا لە سەر لاپەڕەدا تاقییان کردەوە بەڵام لە هەندێ وڵاتدا هەڵبژاردن سوودمەند بوو. چرکەساتە مێژووییەکانی وەك خۆبەدەستەوەدانی کێنت کایوندا، سەرۆك کۆماری زامبیا لەهەمبەر داواکارییەکانی گەل پاش ٢٧ ساڵ (حکومەتداری) یاخود سەرکەوتنی نلسون ماندلا لە یەکەمین هەڵبژاردنی



نانەژادگەرایی لە ئەفریقیای باشووردا نیشاندەری ئەوەیە کە دیموکراسی فرە پارتی جێ پێی کردووەتەوە، ئەگەرچی لەم کیشوەرە ناسەقامگیرەدا، ئەم پرسە رووبەڕووی هەندێ مەترسیش دەبێتەوە بەم پێیەش سوودمەندە ئەگەر بابەتی دیموکراسی بخەینە سەر دوایین بەش لەم پەرتووکەدا.

## دیموکراسی:

پێناسەی باوی دیموکراسی بریتییە لە ((حکومەتی گەل)) و بیرۆکەیەکی سەروەری گشتییە، کە تاکەکان بەشداری لە حکومەتی کۆمەڵگاکەیان دەکەن. لە پێناسەیەکی وردتردا (دیموکراسی) واتە، گشت کۆمەڵگا بە رێسامەندانە لە بڕیاردەرکردندا بەشدارن. هەر هاوڵاتییەك یەك دەنگی هەیە و دەنگی هەر هاوڵاتییەکیش کێش و گرنگی یەکسانی (لەگەڵ دەنگی کەسێکیتردا) هەیە. دەوڵەت شارەکانی یۆنانی کۆن نموونەی دیموکراسی راستەوخۆن ئەگەرچی ئەو دیموکراسییەی کە ئەمڕۆکە لە رۆژئاوا بەکاردێت جیاوازی بەرچاوی لەگەڵ دیموکراسی یۆناندا هەیە: ئەم جۆرە دیموکراسییە دەرەنجامی نوێگەرایییەکانی سەدەی بیستەمە و بە دیموکراسی نوێنەرایەتی ناو دەبردرێت.

دامەزراوەکانی دەوڵەتی مۆدێرن ئالۆزییەکی زۆریان هەیە تا (بتوانرێت) راستەوخۆ لەلایەن گەلەوە بەڕێوە ببردرێن. هاووڵاتیان سەرقاڵی ژیانی خۆیانن و ناتوانن لە وردەکارییەکانی دەوڵەتدا بەشداربن، بەم جۆرەش هاوڵاتیان بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان، نوێنەرایەتی (وکالە) بە سیاسەتمەداران دەدەن بە هەر حاڵ لە هەر شێوازێك لە دیموکراسی، دەبێ دەسەڵاتداران وەڵامدەرەوەی ئەو کەسانە بن کە فەرمانڕەواییان لێ دەکەن و سەبارەت بە دیموکراسی نوێنەرایەتیش ئەم بابەتە لە رێگەی هەڵبژاردنی رێسامەندەوە بەدەست دێت. هەر هاوڵاتییەك پێویستە هەلی یەکسانی بۆ دەنگدان بە نوێنەرەکەی کە باشترین پشتیوانی بەرژەوەندییەکانیەتی هەبێ، زیاد لەمەش پێویستە یاساگەلێك دابڕێژرێ و رکابەری ئازاد لەنێوان هاوڵاتیاندا بوونی هەبێت تا بۆ دەنگدان بە کەسە دەستنیشانکراوەکەیان ئازاد بن. ئازادی رادەربڕین و کۆبوونەوە و پێکهێنانی دەستە خاوەن گرنگی زۆرن و پرەنسیپەکانی وەك میدیای ئازاد، مافی کارکردن و دەنگدانی نهێنی، ژیارین. بە بوونی ئەم گەرەنتییانە، هاوڵاتیان بە کۆمەڵیی دەتوانن نوێنەرەکانیان بە ویستی خۆیان هەڵبژێرن، تەنانەت گرنگترین شت ئەوەیە کە، هەل بۆ لە کار لابردنی کاربەدەستە نالێهاتووەکان فەراهەم دەکات. بیرۆکەی

ئابراهام لیکۆلن واته ((حکومەتی خەڵك له ڕێگەی خەڵکەوه و بۆ خەڵك)) له ڕێگەی دیموکراسی نوێنەرایەتییەوه بەدی دێت.

له ڕۆژئاوادا ڕکابەری فره پارتی میکانیزمی پەسەندکراو بۆ جێبەجێکردنی ئەم جۆره دیموکراسییەیە، پارتەکان جەخت لەسەر جۆراوجۆری ڕوانگەکان و بەرژەوەندییەکان دەکەنەوه و هەڵبژاردن به جێگرەوەی دیاری کردنی سیاسەتی گشتی دەزانن که ئەگەر کاربەدەستە سیاسییەکانی پارتی دەسەڵاتدار له خزمەت بەرژەوەندییەکانی گەلدا نەبن و دەبێ گەل بتوانێ دەنگ بۆ لەسەرکار لابردنیان و جێگرکردنی پارتێکی بەرهەڵستکاری بدەن. له ڕووی مێژووییەوه هەڵبژاردنی فره پارتی، بوو به هۆی سەرهەڵدانی ڕژێمە نوێنەرەکان و حکومەتە وەڵامدەرەکان جەختکردنەوه لەسەر ڕکابەری فره پارتی، وەك باشترین شێوازی نوێنەرایەتی کردنی ئایدیال له سەر ئاستی جیهانەوه پەسەند کراوه. بۆ نموونه مارکسیزم دەڵێت که به بێ دادپەروەری دیموکراسی ڕاستەقینه مومکین نییه. به بوونی مافی سیاسی یەکسان و یەکسانی له دیموکراسییه بۆرژوازی یاخود لیبراڵ کاندا، دەکرێ بەهەمان ڕێژه وێنای مافی ئابووری یەکسان بکەین. له ڕاستیدا وێنای مارکسیزم سەبارەت به دەست پێگەیشتنی کۆمەڵەکان به ڕکابەری فره پارتی تەنیا دروستکردنی ئاگاییەکی (هۆشیاری) درووییه که هاوڵاتیان نائاگایانه پشتگیری له ستراکتۆرگەلی سیاسی دەکەن که تەنیا دەبنه هۆی بەردەوام بوونی هەژموونی باڵا دەستی بۆرژوازی و چەوساندنەوەی ئابووریی لیبراڵی دیموکراسی له سێ دەیەی یەکەمی دوای سەربەخۆیی له ئەفریقیادا پێشوازییەکی چەندانی لێ نەکرا. هەروەك له بەشی شەشەمدا ئاماژه پێکرا سەرکرده سیاسییەکان لەم کیشوەرەدا وەك فاکتەرێکی وێرانکەر دەیانڕوانیه ڕکابەریی فره لایەنی. ئایدیالی ئەم سەرکردانه یەکپارچەیی میکانیزمەکانی دەوڵەت بوو، پرسی ئەوەی که سیاسەتەکانی فره پارتی تەنیا له خزمەت بەردەوام بوونی سیاسەتی ڕەگەزی دایه (نەژادی) بوو به هۆی ئەوەی که دەوڵەتەکان ئەرکە سەرەتاییەکان سەبارەت بنیاتنانەوەی دەوڵەت و گەشەی ئابووری جێبەجێ نەکەن، له ئەنجامدا دەوڵەتی تاك پارتی بوو به شێوەی باوی سیاسی لەم وڵاتانەدا.

هەندێ له پارته دەسەڵاتدارەکان وەك پارتی تانو (TANU) و پارتی کانۆ (KANU) له سەردەمی کنیاتا له کێنیادا تا ڕادەیەك پەیوەندی نێوان دەسەڵاتدار و هاوڵاتیان سەرکردایەتی کرد. ئەگەرچی دیالۆگی زاڵ ئەوه بوو که پێویسته پارتەکانی ئەفریقیا مەودای نێوان پاشایەتی ستەمکار و گەل کەم بکەنەوه. له نەبوونی بەرهەڵستکارانی یاساییدا (به پێی یاسا) سیستەمه



سیاسییەکان وەها پشتیان لەم کیشوەره کرد که لەلایەن نوخبەکانی دەسەڵاتدارەوه به خراپی کەڵك (لەم کیشوەره) وەرگیرا. هیچ یەك له سەرکردەکانی ئەفریقیا ناتوانن بانگهێشت بکەن که حکومەتەکەیان دیکتاتۆرییەکی گەشەسەندووه که تیایدا بەرژەوەندییه ئابوورییەکانی دەسەڵاتداران وەك ئەڵتەرناتیڤێك له هەمبەر چاوپۆشی له مافه سیاسییەکان دابین کراوه. گەشەی ئابووریی بابەتێکی ماددیگەرایانەیە، بەم پێیەش له ناوەڕاستی هەشتاکاندا تەنانەت نایرێرەش جەختی لەوه دەکردەوه که سیستەمی تاك پارتی بوو به هۆی شکست هێنانی ئەفریقیا و ئەو بەڕاستگۆیانه بڕوای به دیموکراسی هەبوو. نایرێره به پارتەکەی ڕاگەیاند که کەشی سیاسی تانزانیا بۆ ڕکابەریی فره پارتی ئاماده بکات. لەم ڕێگەیەدا تانزانیاییەکان تەنیا نەبوون دوای ساڵی ١٩٩٠ گشت کیشوەری ئەفریقیا گیرودەی چاکسازیی سیاسی بووه. تاڕادەیەك گشت نموونەکان (نموونه چاکسازییەکان) هاوشێوەی یەکتر بوون. سەرەتا خۆپێشاندانی پەرت و بڵاو له دەوروبەری شارەکاندا ڕوویدا که تیایدا ئامانجی نارەزامەندەکان، نارەزایی دەربڕین لەهەمبەر هەموارکردنی ستراکتۆری بوو. ئەم بابەتەش دواتر، وەك بابەتێکی سەقامگیر (بەردەوام) و پێکەوه بەستراو کۆکرایەوه (تدوین) که له داواکاری تەواو ئابوورییانه بەرەو چاکسازیی گشتگیری سیاسی گۆڕدرا. زۆر پێشتر (له چاکسازی کردن) بابەتی دیموکراسی فره پارتی له پێوەرێکی بەرفراواندا له داواکارییەکانی خۆ پێشاندەرەکان بوو.

له ئەنجامدا نوخبەی دەسەڵاتدار به ناچارانه ملکەچی ئەم گوشاره سیاسییانه بووه و گۆڕانکارییه بنەڕەتییەکان به مەبەستی دەرفەت ڕەخساندن (مۆڵەتدان) به گرووپه بەرهەڵستکارەکان به فەرمی ناسێنرا و بوو به هۆی کرانەوەی دەرگاکان بۆ داواکاریگەلی سیاسی زۆرتر. حکومەتەکانیش بەخێرایی بەرنامەگەلێکیان بۆ کردنەوەی ڕکابەرێتی پۆلۆراسیتی داڕێشت بۆ نموونه له زۆربەی وڵاتانی فرانکوفونی ئەفریقیادا، کۆنفرانسی بەرفراوان لەپێناو هێنانەدی ریفراندۆمی جەماوەری گرێدرا. تا ساڵی ١٩٩٥، زۆربەی وڵاتانی ئەم کیشوەره ڕووبەڕووی داواکاریی دیموکراسی فره پارتی و ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئازاد و دادپەروەرانه بوونەوه.

بێگومان لەم هەلومەرجه مێژووییەدا گۆڕانکاری سەرسوڕهێنەر له ئەفریقیادا ڕوودرا. ئەفریقییەکان له خێرایی ئەنجامدانی قۆناغەکانی ئەم دیموکراتیزاسیۆنه شکستیان هێنا و ئەو شتەی که ڕوویدا پێویستی بەڕوونکردنەوه هەیه. ئەو شتەی که لەم باسەدا تیشکی دەخەینه سەر سێ پرسی سەرەکی پەیوەست بەم دەروازه سیاسییه نوێیەیە: یەکەم ئەزموونی ئەو شتەی

که بوو بە هۆی گوزار بەرەو دیموکراسی فرە پارتی، باسی لێدەکرێت، دواتر شێوازی ئەنجامدانی گۆڕانکارییە پۆلۆرالیزمە سیاسییەکان وەك فاکتەرێکی بەهێز لە هاوبەندی سیاسی ئەم کیشوەرەدا روون دەکرێتەوە و لە ئەنجامگیریشیدا، کاریگەی ئەم دەرەنجامانە بە سەر پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا وێنا دەکرێت.

## روونکردنەوەی پێویست بۆ دیموکراسی فرە لایەنی:

بە واتایەکی سادە دەکرێ مەیلی ئەفریقیا بۆ دیموکراسی فرە لایەن لە دەیەی نۆیەمدا، بە کۆکردنەوەی گشت ئەکتەرەکان (گیرودەکردنی پارتەکان) روون بکرێتەوە. نوخبەی دەوڵەت لە رووی ئایدیۆلۆژیکییەوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ خۆیان بە شێوازێك لە شێوازەکانی دەوڵەتی دەسەلاتخواز پابەند دەزانی، هەنوکە روانگەیان بەرەو پۆلۆرالیزم گۆڕیوە، کۆمەڵگای مەدەنیش ململانێیەکانی بەرەو ئامانجەکی هاوچەشن (پۆلۆرالیزم) بردوی دا و ئەم کارەش لە سەردەمێکدا روویدا کە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی پشتگیری لەم جۆرە ئاراستەگەلی سیاسی دەکرد. ئەگەرچی وەها دێتە بەرچاو کە رێککەوتنی نێوان دەوڵەت، کۆمەڵگای مەدەنی و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان لە ئاراستەی بەرفراوان کردنی بەرژەوەندییەکانیان، چەند ساڵ لەمەوبەر روویدابێت. بەڵام بۆچی هەنوکە هەر سێ دامەزراوە دیموکراسی فرەپارتییان وەك رێگە چارەی هاوبەش دەزانی؟ چ گۆڕانکارییەك روویداوە؟ لە رێگەی چوار چەمکەوە: نەبوونی دەسەلاتی دەوڵەت، ژینگەی سیاسی نێودەوڵەتی نوێ، بووژانەوەی کۆمەڵگای مەدەنی و دواتریش رێڕەو، دەتوانین پێکهاتنی ئەم کۆدەنگییە روون بکەینەوە.

### نەبوونی دەسەلاتی دەوڵەت:

لە نەوەدەکاندا ژینگەی سیاسی ئەفریقیا ئامادەی گۆڕانکاریی بوو. لە باسی پێشوودا گرفتگەلەکانی بەردەم دامەزراوە دەوڵەتییەکان روونکرایەوە. فاکتەرگەلی وەك بێ بەش بوون لە سەرچاوەکان بە هۆی قەیرانی کەڵەکە بوون و قەیرانی نەبوونی مەشروعییەت بە هۆی قەیرانی حوکمڕانی لەم دەیەیەدا دەسەلاتی دەوڵەت لە دۆخی هەرەس هێناندا بوو و فۆرمولە کۆنەکان کە تیایدا تێکەڵەیەك لە هاوکاریی و بەکارهێنانی گوشار بە شارەزایانە ئەنجام دەدرا، ئیتر بۆ ماوەیەکی درێژ کارامە نەبوون. لەم پرۆسەیەدا رەگەزەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بە سوودی سەرکردایەتی (کۆمەڵگای مەدەنی) بوون و لە هەندێ پرسیشدا بوو بە هۆی توندوتیژی نواندنی



راستەقینەی گرووپە شۆڕشگێرییەکان دژی نوخبەی دەسەلاتدار بۆ هەندێ لە وڵاتانی ئەفریقیا ئەگەری شکست هێنانی دەوڵەتی دەسەلاتخواز ئەگەرێکی زۆر بەهێز بوو.

هەندێ لە نوخبەی دەسەلاتدار باشترین رێگە چارە بۆ قەیرانی دەوڵەت، پشتگوێ خستنی ئەم قەیرانەیان دەزانن، ئەم وڵات و دەوڵەتانەی کە بە باشی پابەند بوونەکانیان جێبەجێ نەدەکرد زۆرتر نزیکی رووخاندن دەبوونەوە، ئەم سیاسەتانە رێگەیەك بوو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی میلتاریستی (لیبریا و زەئیر) بە پێچەوانەشەوە هەندێ لە سەرکردەکان هێماکانی ئاگادارکردنەوەیان رەچاوکرد و هەوڵیاندا تا لەهەمبەر مەترسییەکان رژێمەکانیان بپارێزن. گەمەکان بە کۆتا هاتبوون، ئەم حکومەتانە رووبەڕووی نارەزامەندی دژە حکومەت بوونەوە. تەنیا شتێك کە رژێمە سەرۆکایەتی- پاشاییەکان دەیانتوانی ئەنجام بدەن ئەوە بوو کە دەبوایە بە فریودەران، هەڵخەڵەتاندن و ئۆتۆماتیکانە، دیسپلێن بەرقەراربکەن. ئەمە لە کاتێك دا بوو کە لە ساڵانی پێشتر دا هێزی حکوومەت بۆ سەرکوتکردنی یاخیبوان و نارەزامەندانی سەرکەوتوو تەرخان دەکرا، بەڵام هەنوکە بەپێچەوانەوە دەوڵەتەکان بەرپەرچدانەوەی کەمتریان هەبوو و هێزی دەوڵەتەکان بۆ بەکارهێنانی گوشار و سەرکوتکردن کەم ببووە. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە توانایە فرە رەهەندەکانی دەوڵەت بە کەمبوونەوەی سەرچاوەکان لەناو چوو و ستراتیژییەکانی پێشووی مانەوەی دەوڵەت تا ئەو رادەیە نەبوون کە بتوانن گەرەنتی مانەوەی رژێم بکەن و هێنانەدی زنجیرە تاکتیکی جیاواز کە دەکرا کاریگەربن، بەپێویست دەزانرا. بۆیە هێنانەدی دیموکراسی فرە پارتی لە ئەفریقیا، دەکرا وەك بەرپەرچدانەوەی قەیرانی دەسەلات هەژمار بکرێت. نوخبەکانی دەوڵەت رووخاندنی سیستەمی تاك پارتی بە تاکە ستراتیژییان دەزانی. لە ئەنجامدا چ پادژەهرێك (دژە ژەهر) بۆ قەیرانی دەسەلات باشترە لە مەشروعییەت بەدەست هێنانەوەی مەشروعییەتی دەوڵەت لەرێگەی هەڵبژاردنی فرە لایەنییەوە.

ئەمەش بەو مانایە نابێت کە رژێمە سەرۆکایەتی- پاشاییەکانی بەرقەرار لەناکاو بەرەو پۆلۆرالیزم وەرچەرخان، بەڵکو ئەمە سازشێکی لەناچاری بوو کە ملکەچی بوونەوە و هەڵومەرجێکیش بوو کە سەرکردەکان ملکەچی خەرجییە قەرەبوونەکراوکانی هەڵقولاو لە ئەنجام نەدانی ئەم چاکسازییانە لەپێناو بەرژەوەندی کورتخایەنەکانیاندا دەبوایە بەدەستیان هێنابا، پەسندکرد. لەڕاستیدا، هەندێ لە پارتە دەسەلاتدارەکان وای بۆدەچوون کە دەتوانن ئاراستەی ئەم چاکسارییانە بگۆڕن و بەبێ سنووردارێن لە دەسەلاتدا بمێننەوە. بۆنموونە کاتێك کە کاربەدەستانی پارتی نیشتیمانی بڕیاریاندا لەگەڵ کۆنگرەی گەلی ئەفریقیای، باشوور دانووسان

بکەن. تەنیا ژمارەیەکی کەم لە ئەندامانی پارتی گەل ئەم پرسە کە دیموکراسی لە چەند ساڵی داهاتوودا دادەمەزرێت لە خەیاڵیاندا وێنا کرد. هەر بەم شێوەیە سەرۆك کۆماری زۆربەی وڵاتانی فرانکۆفۆن، کۆنفرانسگەلێکیان سەبارەت بە داڕشتنی یاسای بنەڕەتی گرێدا. زۆربەی ئەم سەرکردانە وەها هزریان دەکردەوە کە دەتوانن دەستکاری ئەم پرۆسەیە بکەن و یاسا بەرەو بەرژەوەنییە تایبەتەکانیان ئاڕاستە بکەن و ژمارەیەکی کەم چاوەڕوان بوون کە چاکسازییەکانی داهاتوو لەڕێگەی ئەم کۆمەڵە سیاسییانەوە بێتەدی.

تاڕادەیەك، نوخبەکانی سیاسی بە لەدەستدانی ستراتیژی ژیاری (حیوی) (دەستیان بە ئەنجامدانی) ریسك کرد. هەروەك دواتر دەبینین هەندێ لە کاربەدەستان هەوڵیان دەدا تا لە دەسەڵاتدا بمێننەوە. تەنانەت ئەگەر هەڵبژاردنی ئازاد و دادپەروەرانەش ئەنجامدەدرا، جێی گومان نییە کە ئەم نوخبانە بۆ بەدەست هێنانی مەشروعییەت و راسپاردنی ڕێژەییانەی ستراکتۆرە دەسەڵاتخوازەکانی گونجاو لەگەڵ دوکتۆرینی گۆڕین لە ئەفریقیادا، بەرەو دیموکراسی فرە پارتی لە دەیەی نۆیەمدا، هەوڵیاندەدا.

### پانتای بگۆڕ (متغیر)ی سیاسەتی نێودەوڵەتی:

سەرکردەکان نەتەنیا ڕووبەڕووی گوشاری ناوەخۆیی بۆ چاکسازی کردن بوونەوە، بەڵکو هەنوکە تووشی گوشاری نێودەوڵەتیش کە خوازیاری گۆڕین بەرەو پۆلۆرالیزمی سیاسین، بوونەتەوە. نوخبەکانی دەوڵەت لەپێناو مانەوەی رژێمەکانیان (تەنانەت کاتێك کە مەشروعییەتی نێودەوڵەتییان کەم بوو) لە ساڵانی پێشوودا پشتبەستراو بە پشتیوانی دەرەکی بوون، بەڵام لە دەیەی نۆیەمدا ئەم سەرچاوەی پشتیوانیەیە زۆر کەم بووەوە. یەکێك لە گۆڕانکارییە گرنگەکان ئەوە بوو کە بە کۆتا هاتنی شەڕی سارد، یارمەتی دامەزراوە داراییەکانی نێودەوڵەتی و حکوومەتە دەرەکییەکان بۆ کۆمەك بەخشین بە ئەفریقیا کەمی کردەوە و جۆری یارمەتییەکانیش گۆڕدرا.

هەر وەك لە بەشی هەشتەمدا ئاماژە پێکرا، بەڕێوەبەران و سەرۆك دەوڵەتان، پێشتر وڵاتیان بەپێی پەیڕەوی کردنی ئایدۆلۆژیکی و ئەولەوییەتە ستراتیژیکییەکان دابەش کردبوو. وڵاتە یەکگرتووەکان، هاوپەیمانانی لەئەفریقیادا لە ژێر ناوی ((سەرماییەگوزاری لە دژی هێرشکردن و دەستتێوەردانی کۆمۆنیزم)) پشتگیرییان لێ دەکرد، (زئیر، کێنیا، مەغریب)، لەکاتێکدا کە یەکێتی سۆڤیەت هاوکاری وڵاتانی سۆسیالیستی وەك ئەسۆپیا و ئەنگۆلای دەکردن بە چەق



بەستنی  ئەم وڵاتانە لەسەر شەڕی سارد، نە واشنگتۆن و نە مۆسکۆ، نیگەرانی ئەم پرسە نەبوون کە ئەم وڵاتانە لە ئاستێکی بەرزدا خاوەن سیستەمی ستەمکاری کارکردی لاواز، هەمبەر بە (پرسی) مافی مرۆڤن.

ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت دەلالەت و مانای زۆر و جۆراوجۆری بۆ نوخبەکانی دەوڵەتی لە ئەفریقیادا بەدواوە بوو، نووسینی وەك براتۆن و ڤان دیوالی لەسەر دیواری  بەرلیندا نووسرابوون. لایەنگرانی یەکێتی سۆڤیەت هەنوکە (دوای شەڕی سارد) هیچ جۆر پشتیوانییەکیان نەبوو تابۆی بگەڕێنەوە، بەڵام هاوپەیمانانی وڵاتە یەکگرتووەکان پشتیوانی کەمی بێ مەرجیان وەردەگرێت، چونکە بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی واشنگتۆن لەم کیشوەرەدا، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر کەم ببووە. سەرۆك کۆماری گابۆن، عومەر بۆنگۆ ئەم گۆڕینەی لە شیعری ((داری نارگیل لە جوڵانەوەی دایە)) دەربڕیوە.

هەڵبەت ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان کە مەیلی یارمەتیدانی ئەفریقیایان هەبوو تەنیا بە مەرجی گرنگ و پێکەوە گرێدراو یارمەتییان پێشکەش دەکرد. بۆنموونە سەبارەت بە ئابوور وەرگری یارمەتی دەبوایا چاکسازییەکانی هەمووارکردنی ستراکتۆری ئەنجام بدات ئەم چاکسازییە ڕێگەخۆشکەر و ڕێکخەری بزاڤەکانی لایەنگری دیموکراسی بوو. هەروەها بارودۆخی سیاسیش پاشکۆی ئەم یارمەتییان بوون. هاوکارییەکان لە کاتێکدا بەردەوامی دەبێت کە وڵاتی وەرگر پابەندی رەچاوکردنی مافی مرۆڤ بەردەوامی دان بە چاکسازیی دیموکراتیك بێت. بۆ نموونە یارمەتی نێودەوڵەتی بە کێنیا لە ساڵی ١٩٩١دا، کاتێك کە سەرۆك کۆمار دانیل ئاراپ مویی لە گواستنەوە و گۆڕینی وڵات بەرەو پۆلۆرالیزم ڕێگری کرد، ئەم یارمەتییە هەڵواسراو مایەوە. هەروەها هاستینگ باندا لە مالاوی لە ساڵی **١٩٩٣**دا کەوتە ژێر گوشاری یارمەتیدەرانی نێودەوڵەتییەوە. سەرۆك کۆماری، ئەفریقیای ناوەڕاست بە سەرکردەکانی ئەم کیشوەرەی ڕاگەیاند ((پێویستە ئێمە ئەم ڕاستییە پەسەند بکەین کە ئەو کەسانەی بۆ گەشەپێدان پارە بە ئێمە دەدەن، لە بەرامبەردا لە ئێمەیان دەوێت  کە بارودۆخ بۆ پارتە سیاسییەکان فەراهەم بکەین)) ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە بەڕێوەبەرانی دەوڵەت هێشتا بەیارمەتییەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی پشتبەستراو بوون و لە ئەنجامدا ڕۆژئاوا ئەو شتەی کە دەیویست بەدەستی هێنا.

### کۆمەڵگای مەدەنی لە دۆخی گەشەکردندا:

زۆرترین گوشارەکان بۆ چاکسازی دیموکراتیك لەلایەن کۆمەڵگای مەدەنی ئەفریقیاوە بوو، کەنیسە، یەکێتی بازرگانی، ئەنجوومەنە نەتەوەییەکان، رێکخراوی ژنان، سەندیکا، یەکێتی جووتیاران، گرووپی کۆمەڵایەتی، پارتە سیاسییەکان. گشتیان رۆڵی سەرەکییان لە خەبات دژی سیستەمی کۆلۆنیالدا هەبوو. ئەم رێکخراوە وابەستەیانە (متبعیە) بەشداریی بەرچاویان لە دووەمین قۆناغی ئازادی لە کۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکاندا هەبوو. کاتێك کە بە هۆی بوونی دەسەڵاتی دەوڵەت، کەشی سیاسی هاتە ئاراوە، هێزە بەرهەڵستکارەکان چانسی خۆیان بۆ خەبات دژی نوخبەکانی دەوڵەت، بە تاقی کردەوە. هەست و بڕوایەك بوونی هەبوو ئەویش ئەوە بوو کە هەنوکە هەرشتێك مومکینە روخساری دەوڵەت بە هەست پێکراویی لەرزۆك و ئیمپراتور، بە بێ پاسەوان و پشتیوان بوو.

پرۆسەی گوزار بەرەو هەمووارکردنی ستراکتۆریی بە سەختی ئەنجامدرا. هەزاران کەس لە شارنشینانی ئەفریقیا رژانە سەر شەقامەکان، شۆڕشگەلی وەك ((شۆڕشی نان)) یەکێك لە خەسڵەتەکانی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال بوو، ئەم شۆڕشانە کورت ماوە بوون و بەرەبەرە لەلایەن گرووپە گوشارەکانی دەوڵەتەوە لە ناو بردران و جۆرە هەمووارکردنێکی ناوبژیوانانە لە پانتای گشتیدا بەدیهات. ئەگەرچی لەم کاتەدا دەوڵەت توانایی کەمی بۆ سەرکوتکردن بە سەر خۆپێشاندەرانی هەبوو، لە ئەنجامدا نارەزامەندەکان بەهێزتر بوون. ئەم گردبوونەوەیە ناوەرۆکی سیاسی بەخۆوە گرت، بۆ نموونە خۆپێشاندەرانی زەئیر بە راشکاوانە دروشمی ((مۆبۆتۆی دار))، یان دەووتەوە.

لەم بارودۆخەدا رێکخراوە رێنماییکەرەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لە رێگەی رێکخستنەوەی ئەم نارەزاییە گشتییانەوە پێك هێنران (دامەزران). گرووپە نوێیەکان بۆ خەباتی دیموکراسی فرە پارتی سەریان هەڵدا (لە کاتێکدا کە پێشتر ئەنجوومەنەکان لەلایەن دەوڵەتەوە هەڵدەبژێردران) و دەستیان کرد بە لادان و جیاکردنەوەی نوخبەکان. سیاسەتمەدارەکان هەستیان بە رێڕەوی گۆڕانکارییە سیاسییەکانیان کرد و چوونە ناو ئەم ململانێیەدا، ئەوانەی کە دوورخرابوونەوە (تبعید) هەوڵیاندا بگەڕێنەوە بۆ وڵات و ئەوانیتریش دەستیان بە چالاکی کردەوە و هەوڵیاندا بۆ جیابوونەوە لە پارتی دەسەڵاتدار و چوونە ناو پارتەکانی تازە سەرهەڵداو.

هەروەك لە بەشی چوارەمدا روونکرایەوە کەنیسەکانیش هێزێکی کاریگەر بوون لە خەبات دژی ستەمکاری و بایکوت کردن و دژی مەشروعییەتی (دەوڵەت) وەستان. ئەمەش لە



کاتێکدا بوو کە خودی دەوڵەت رێکخراوە ئایینییەکانی لەپێناو یەکپارچە راگرتنی گەل، بەهێز دەکردن بۆیەش لەوانەیە پێشنوێژەکان (پیاوانی ئایینی) لە خودی دەوڵەتیش مەشروعییەتیان زۆرتر بێ بۆ ئەوەی کە دەوڵەت بخەنە ژێر وەڵامدانەوە و ژێر وردبینەوە. بۆ نموونە قەشەی دزموند تۆتۆ کە لەگەڵ پارتە بەرهەڵستکارەکانی رەش (پێست) لە ئەفریقیای باشووردا بە یاغی هەژماردەکرا سەلماندی کە یەکێك لە کاریگەرترین لایەنگرانی خەبات (دژی) رژێمی ئاپارتایدچ لە ناوەوە و چ لە دەرەوەی وڵاتدایە، لە مارسی **١٩٩٢**دا قەشەی گەورە جیمز چیونا و قەشەکانیتری کاسولێك لە مالاوی، کە هیچ کەسێك بوێری رەخنەگرتنی لە رژێمی باندای بۆ دەیان ساڵ نەبوو، ئەم کارەی (دزموند تۆتۆ)یان ئەنجامدا دەستەی ئایینی تایبەت بە باندا (کەنیسەی سکوتلەند) لە کۆنفرانسە ئایینییەکەیدا رایگەیاند کە ((بۆ ئەم مرۆڤەی تەنیا کە لە زینداندا دیلە، دوعا بکەن)). دوای ئەم وتارە گرووپە ئایینییەکانیتر کۆمەڵگای مەدەنی مالاوی داواکارییەکانیان بۆ دیموکراسی فرە پارتی، بەهێزکرد یەکێتییە بازرگانییەکان رۆڵی سەرەکییان لە گوزار بەرەو هەڵبژاردنی پۆپۆلیزمیدا هەبوو. بۆ نموونە لە نێجیر گەورەترین فدراسیۆنی کاری ئەم وڵاتە (یەکێتی سەندیکاکانی گواستنەوەی نێجیر) گوشاری زۆریان خستە سەر نوخبەکانی دەسەڵاتدار بۆ سپاردنی حکومەت و چاکسازی دیموکراتیك. پێشتر ئەم دامەزراوەیە لەلایەن دەوڵەتەوە کونترۆڵ دەکرا ئەگەرچی تا کۆتایی هەشتاکان، یەکێتی سەندیکاکانی گواستنەوە نێجر سەنتەری جوڵانەوەی بەرهەڵستکاران بوو و مانگرتنە جۆراوجۆرەکان بۆ پشتیوانی کردن لە نارازییەکان (سەرکردایەتی دەکرد) لە هەر شوێنێکی وڵاتدا ئەم کردە سەرکەوتووە بوو بە هۆی وەستانی ئابووری فەرمی وڵات و دواجار هەڵبژاردنی فرە پارتی لە ساڵی **١٩٩٣**دا روویدا.

زامبیاش دەتوانێ نموونەیەکی باش بۆ چالاکی یەکێتی بازرگانی وەك پشتیوانێك بۆ دیموکراسی پۆپۆلیزمی بێت، فردریك چیلوبا وەك سەرۆکی کۆنگرەی یەکێتی بازرگانی بۆ ماوەیەکی درێژ بارگرانییەك (مزاحم) بوو بۆ دەوڵەتی تاك پارتی کنس کایندا. دەوڵەت لە هەل و بارودۆخی جۆراوجۆردا هەوڵیدا پارتی کۆنگرەی بە لای خۆیەوە راکێش بکات، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، کاتێك کە لێبوردەیی پارتی کایندا بە کۆتا هات چیلوبا بۆ ماوەیەکی کورت زیندانی کرا، بە رزگاربوونی لە زیندان، گۆڕانکارییەکی رووکەشانە روویدا، ئەو وەرگرتنی هەر جۆرە پۆستێکی لە کومیتەی ناوەندی پارتدا رەتکردەوە، بەمجۆرەش کاتێك کە لە ساڵی **١٩٩٠**دا هەلێك رەخسا، ئەو بەرەنگاری دەسەڵاتی قورغ کراو بووەوە. پارتی کونگرە سەلماندی

که پێگەیەکی ڕێکخراو و جەماوەری و ئایدیال بۆ بزاڤی دیموکراسی فرە پارتییە لە ئەنجامدا بزاڤی دیموکراسی فرە پارتی. پارتی کایندای لە هەڵبژاردنەکاندا شکستدا و چیلوبا، بوو بە سەرۆك کۆماری زامبیا.

گرووپەکانی کەنیسەیی و یەکێتییە بازرگانییەکان لەگەڵ بزاڤەکانیتر بەتایبەتیش بزاڤگەلی مافی مرۆڤ، خوێندکاران، پسپوران و کۆمەڵگای پزیشکی و زانکۆیی ڕێگەیان بۆ کۆمەڵگایەکی مەدەنی زیندووکراو فەراهەم کرد، لە ڕێگەی ئەم سەرکردە نارازییەوە، جەماوەر داوای دیموکراسی فرەپارتییان کرد و سەلمێنرا کە ئەمە داواکارییەکی سیاسییە کە بەڕێوەبەرانی لاوازی حکومەت توانایی بەرگری لە بەرامبەری ئەم (داواکارییان) نییە.

**ڕێڕەو:**

لە توێژینەوەی گۆڕینی دیموکراتیکی لە ئەفریقیادا پێویستە ڕێڕەویش ڕەچاو بکرێت. سەرکردەکانی ئەفریقیا چ سەرکردەکانی دەوڵەت و چ سەرکردەکانی دامەزراوەگەلی کۆمەڵگای مەدەنی نەتەنیا ئاگاداری ڕووداوەکانی ئەوروپای ڕۆژهەلات نەبوون بەڵکو ئاگایان لە ڕووداوە ناوخۆییەکانی ئەفریقیاش نەبوو. بۆ نموونە ئازاد بوونی نلسون ماندلا لە بەندیخانە لە ساڵی ١٩٨٩ و هەرەسهێنانی ئاپارتاید نیشانی هەموانیدا کە تەنانەت بەهێزترین نوخبەکانی دەوڵەت لە هەمبەر گوشارەکانی هەڵقوڵاو لە خوارەوەی (کۆمەڵگا) لەرزۆکن، بە ڕووخانی دەوڵەتی تاك پارتی وەك بەردەکانی دۆمینە ئەم ڕێگایە بۆ زۆربەی وڵاتان شتێکی حەتمی بوو. ئەمە کارێکی بوێرانە یاخود گەوجانەیە کە سەرکردایەتی هەوڵ بدات ئەم ئاراستە مێژووییە لە ناو ببات. دواجار سەرکردەکان بەڵێنیاندا ڕێڕەوی دیموکراتیزاسیوون، پەسەند بکەن.

**لەمپەرەکانی هاوبەندی دیموکراتیك:**

تا ساڵی ١٩٩٩، زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا هەڵوێستی پشتگیریی لە پۆلۆرالیزمی سیاسییان بە دامەزراوەیی (سەقامگیر) کرد. لە وەڵامدانەوەی ئەم هەڵوێستە زۆرتر لە ١٥٠ هەڵبژاردنی فرە پارتی لە دوایین دەیەی سەدەی بیستەمدا ئەنجامدران، بە بەراورد لەگەڵ کەمتر لە ٧٠ هەڵبژاردنی رکابەرێتی کە لە ماوەی سێ دەیەی (پێشتر لە دوایین دەیە) ئەنجامدران. (بڕوانە پاشکۆکان). هەندێ لەم هەڵبژاردنانە بە کەموکوڕی و ساختەکارییەوە ئەنجامدران، بەڵام لە هەندێ هەڵبژاردنیتردا ڕەنگدانەوەیەکی گونجاو و عەقڵانەیی لە داواکارییەکانی دەنگدەرانی،

خستەڕوو. لەڕاستیدا، جێی گومان نییە کە سیاسەتەکانی ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال بە خاڵێکی زەمەنی رەخنەگرانە گەیشتووە.

ئەگەرچی ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکان تەنیا پێش مەرجی دیموکراسی نەبووە بەڵام سیستەمێکی دیموکراسی کاملبوو پێویستی بە یاسای نوێ بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی سیاسی هەیە کە پێویستە لە هەڵبژاردنەکاندا بەردەوام بوونی هەبێت و لە راستیدا کاربەدەستانی دەوڵەت لە خولی داهاتوودا ناچارن بە بەدەستهێنانی دەنگی زۆرتر بە بەراورد لەگەڵ ئەوانیتر (رکابەری)، واتە بەپێی یاسای بنەڕەتی. هەروەها بەردەوام بوونی وەڵامدانەوە و نوێنەرایەتی کردن زۆر گرنگتر لە کانیزمە ساکارەکانی ئەنجامدانی هەڵبژاردن بوو. ئەمەش واتە، مەترسی شەپۆلی پۆپۆلیزم ئەوەیە کە دەتوانێت بەرپەرچدانەوەیەکی رێزپەرانە بۆ زنجیرە بارودۆخێکی سیاسی تایبەت بێت ئەمەش دەکرێ بەو هۆیەوە بێت کە وەك هەڵبژاردنی فرە پارتی لە سەردەمی سەربەخۆیدا ببێتە هۆی گەڕانەوەی سوپا بۆ سەربازگەکان. هەڵبژاردنی دەیەی نویەم رووداوگەلی تایبەت بوون، سەرلەنوێ مەشروعییەتی بەم دەوڵەتە بەخشی ئەمەش لە وتەی کریستوم کلافهامدا بەکارهاتووە: ((یەك پیاو، یەك دەنگ و تەنیا یەك جار)) ریچارد سند بروك ئەم روانگەیەی بەم شێوەیە راگەیاند ((بارودۆخی توندوتیژاوی ئەفریقیا هەڵومەرجی گۆڕان و گوزار بەرەو دیموکراسی، بە رادەی مەرجەگەلی جەخت کردنەوە لەسەر دیموکراسی سنووردار ناکات)).

سەرەڕای گۆڕانکارییە لاوازەکانی دیموکراتیکی لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیال. هەڵبژاردنگەلی فرە پارتی زۆر لە کۆتای سەدەی بیستەمدا ئەنجامدران و گۆشە نیگایەکیان لە ئومێد دروست کرد. لە هەلومەرجی رووخانی رژێمی سەرۆکایەتی ستەمکاریدا. کە لە چەندین بابەتدا دەوڵەتەکان لە لێواری رووخاندابوون، رکابەرێتی فرە پارتی (پۆلۆرالیزمی) دەکرا رێگەیەك بێت بۆ پێشکەوتنی حکومەتی جێگرەوە. ئەگەرچی هاوبەندی بەهیچ جۆرە ئامرازێك گەرەنتی ناکرێت. پێویستە ئەفریقیا بۆ دروست کردنی داهاتوویەکی سیاسی سەرکەوتوو بەسەر چەند لەمپەری گەورەدا زاڵ بێت:

**پێویستی بوون بە ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێز و متمانەپێکراو:**

ئاشکرایە کە دیموکراسییە فرەپارتییەکان پێویستیان بە پارتگەلی جۆراوجۆر هەیە. ئەگەر دەنگدەران لە سیاسەت و سەرکردایەتی دەوڵەت نارازی بن هێزێکی سیاسی جێگیرەوە بوونی دەبێت تا دەنگدەران بتوانن بۆ لەسەر کارلابردنی پارتی دەسەڵاتدار دەنگ بە گرووپی



بەرهەڵستکار بدەن. ئەگەرچی دیاریکردنی ئۆپۆزسیۆنێکی ناسراو (معتبر) گشت کاتێك بە باش هەژمار ناکرێت. بۆ نموونە هەڵبژاردنە گشتییەکانی زیمبابوا لە ساڵی ١٩٩٥دا بەڕادەیەکی زۆر دوور لە ترس و ساختەکاری بوو. لیزا لکسۆن دەڵێت: ((بەداخەوە رێڕەوی سەرەتایی بەکارهێنراوە لە دەنگداندا، رووبەڕووی نەبوونی ئەلتەرناتیڤیك یاخود هێزێك کە بتوانێت بە هەر ئامرازێك. بەرەنگاری پارتی دەسەڵاتدار ببێتەوە بووەوە)). رژێمی رابرت موگابە. رژێمێکی نا جەماوەری بوو لە ئەنجامی ئەم هەڵبژاردنەدا و بەپێی دیموکراسی رێسامەند مۆگابە لە دەسەڵاتدا مایەوە و پارتی زانوی پ- ئێف (PF – ZAN) رووبەڕووی بەرهەڵستکاری جیددی نەبووە و ئەم پرسەش لە هەڵبژاردنە گشتییەکانی ساڵانی ١٩٨٥ و ١٩٩٠دا دووبارە بووە، بۆ مۆگابە زۆر ئاسان بوو کە داواکاریی بوون بە سەرکردەی دیموکراسی فرە پارتی بکات ئەمەش لە کاتێکدایە کە هیچ رێگەیەك بۆ پێکهێنانی رێکخراوێکی بەرهەڵستکار بوونی نەبێت. ئەگەرچی گرووپێکی بەرهەڵستکار لە کوتاییەکانی دەیەی ١٩٩٠دا سەری هەڵدا و ئەم گرووپە نوێنەری بزاڤی کرێکاری بوو، بەڵام موگابە بە بەکارهێنانی هێزی سەرکوتکردن و گەرەنتی کردنی سەرکەوتنی پارتی زانو – پی ئێف ئیعتباری دیموکراتیکی خۆی لەناوبرد. لە شوێنەکانیتری ئەفریقیا پێچەوانەی ئەم بابەتە واتە بوونی پارتی جۆراوجۆر بووە. بەهۆی دروستکردنی گرفتگەلێك، چاکسازی سیاسی لەلایەن سەدان و هەزاران پارتی مۆبیلیزە کراو لە سەرتاسەری کیشوەری ئەفریقیادا سەرکردایەتی دەکرا. بۆ نموونە کاتێك کە چاد بەرەو ئاراستەی رکابەرێتی فرە لایەنی هەنگاوی نا، زۆرتر لە ٦٠ بزاڤ لە سیستەمی حکومەتی ئەم وڵاتەدا تۆمارکران. ئەگەرچی ناتوانرێ دیموکراسی تەنیا (لە رێگەی) چەندایەتی رکابەرێتی بپێوڕێت، چونکە چونیەتی ئەم پارتانەش گرنگە. گرنگتر لەمانەش پێویستە گشت ئەم پارتانە بتوانن سەرکردایەتییەك پێشکەش بە دەنگدەرانی سیاسەتەکانی جێگرەوە، بکەن.

جان وایزمن زۆرێك لەو رێکخراوانەی کە لەم دواییەدا دامەزراون وەك ((پارتە بێ سوودەکان)) وەسف دەکات. ئەوان زۆرتر ئامرازێکن بەدەست سەرکردەکانیانەوەن تاکو وەك کەڵکە بوونێکی ئایدیۆلۆژی یاخود داواکارییەکی سیاسی بن. زۆربەی ئەم پارتانە لە ئەندامی کەم و سەرکردەیەکی کاریزماتیك و هەندێ لە پەیڕەوانی پێکهاتووە. تەنانەت پارتە گەورەکانیش بە لایەنگری زۆرترەوە لە دەوری ((مرۆڤێکی گەورە)) کۆ دەبوونەوە. لە ئەنجامیشدا رکابەرێتی هەڵبژاردن دەگۆڕدرێت بۆ رکابەرێتی نێوان کەسایەتییەکان لەبری رکابەرێتی بیرۆکەکان. وایزمەن ئاماژە بۆ نەبوونی سیاسەتگەلی چەق گرتوو لە سەر پرسێکی

دیارکراودا دەکات ئەو لەو بڕوایەدایە کە بۆچوونی بەرهەڵستکارەکان بە گشتی پشت بەستراوە بە لایەنگری کردن لە دیموکراسی فرە پارتی، بەرگری لە مافی مرۆڤ، رەخنەگرتن لە حکوومەتی گەندەڵ و پێ داگرتن لە سەر هەندێ رێباز بۆ سیاسەتی ئابووریيە. هیچ کام لەم رەگەزانە بێ سوود یاخود بێ بەها نین. بەڵام ئەم رەگەزانە زۆر بەسەختی تێکەڵ بە پلانێکی بایەخداری ئایدیۆلۆژیکی بۆ بنیاتنانەوەی کۆمەڵگا دەبنەوە.

وردبوونەوە بە سەر سیاسەتگەلی کەسیی (شخصی) بوو بە هۆی دوو بەرەکی نانەوە لەنێوان بزاڤە بەرهەڵستکارەکانی ئەفریقیادا، ئەم پرەسەش روونی دەکاتەوە کە بۆچی هەندێ لە سەرکردەکان و کاربەدەستانی سیاسی و پارتەکانیان ئاڕاستەیان بەرەو ژیانی سیاسییانەی فرە پارتی گۆڕی (بڕوانەپاشکۆکان). کاتێك کە هێزە لایەنگرەکانی دیموکراسی پێکەوەگرێدراو بمێننەوە، رکابەرێتی سەرکەوتوانە دژی رژێمگەلی سەرۆکایەتی — پاشایی پەرە دەستێنن. بۆ نموونە یەکێتی دیموکراسی فرە پارتی لە زامبیا کایوندایان، شکستدا، یەکێتی دیموکراتیکی دارایی بە لە دەسەڵات لابردنی ترائۆرە یارمەتییان کرد و یەکێتی دیموکراتیك لە مالاوی، باندای رووخاند.

پارتە بەرهەڵستکارە پەرت بووەکان بە ئاسانی لە ناو بردران چونکە رکابەرێتی ئەم گرووپانە زۆرتر لە دژی یەکتر بوون نەك لە دژی کاربەدەستانی سیاسی، کەناری عاج نموونەیەکی باشە. لەم وڵاتەدا پاش چاکسازی کردن لە یاسای بنەڕەتیدا ٢٦ پارت ناونووسکران و لەم ژمارەیەش پالێوراوی ١٧ پارت هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٠دا شکستیان هێنا و تەنیا پارتی بەرەی ئازادیخوازی گەل توانی بوینگی و کاربەدەستە سیاسییەکانی پارتەکەی لە (چوارچێوەی) مکانیزمێکی هەڵبژاردنی کارامە بخاتە ژێر گوشارەوە، ئەم پارتە توانی لە رێگەی مامۆستایەکی زانکۆوە، لورانت ئێگبا گبو، بە رێژەیەکی کەم لەلایەنی چینی خوێندەواری شارنشین پەسەند کراو بێت، بەڵام دواجار بیونگی سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

سیاسەتمەدارانی کێنیاش لە بەرهەڵستکارە پەرتبووەکان، ئازاریان دەبینی لە زۆربەی ناوچەکانی وڵاتدا مویی، کەسێکی نەویستراو (منصور) بوو سەرەڕای ئەم دۆخەش لە دوو هەڵبژاردن کە لە نەوەدەکان ئەنجامدران، لە کاتێکدا کە تەنیا ٤٠٪ی دەنگەکانی بەدەست هێنا بوو، سەرکەوتنی بەدەست هێنا. هاوبەندی و هاوکاری لەنێوان پارتەکاندا بە بڕاوی دەتوانی سەرۆك کۆماری ستەمکار (مویی) شکست بدات و ژیانێکی نوێ بە سیاسەتی کێنیا ببەخشێت. بەڵام ئەم پرسەش تا ساڵی ٢٠٠٣ رووی نەدا و دوای خانەنشین بوونی مویی لەم



ساڵەدا، هاوپەیمانی بەرهەڵستکاران دواجار توانی قوڕغکردنی چل ساڵانەی پارتی کانو (kanu) بشکێنێت. ئەم کورتە ئەزموونانە لە پارتە بەرهەڵستکارەکان بەڵگەیە بۆئەوەی کە هاوبەندی دیموکراسی فرە پارتی لە ئەفریقیادا رێگەیەکی دوور و درێژ و دژواری لەبەردەمدایە. تا ئەو کاتەی کە دەنگدەران نەتوانن هەڵبژاردنێکی راستەقینە لەنێوان بەرنامە سیاسییە رکابەرەکاندا هەڵنەبژێرن و تەنیا پەیڕەوانی سەرکردەی گرووپە سیاسییەکان بن. دیموکراسی راستەقینە ئامانجەکی بەدی نەهاتووە.

پێویستی بەکۆمەڵگایەکی مەدەنی بەهێز: دووەمین پێش مەرج بوو هاوبەندی دیموکراتیك، کۆمەڵگایەکی مەدەنی بەهێزە. چالاکیگەلی بەشداریکردنی ساغلەم دەتوانن وەك هێزێکی بەرهەڵستکاری سەربەخۆ لەهەمبەر تاکە جەمسەر بوونی لە پرۆسەی سیاسیدا کار بکەن. لە دیموکراسی فرەپارتیدا پێویستە کە کۆمەڵگای مەدەنی چ لە هاوکاری کردن و چ لە بەرەنگار بوونەوەی دەوڵەتدا ئامادە بوونی هەبێت. ئەم یارمەتییانەش گەرەنتی کەرەن کە بەرژەوەندییە گشتییەکان هەمیشە گرنگترین بابەتن و پێویستە دەوڵەتان رێز لە یاسا دیموکراتیکەکان بگرن.

لە رابردوودا، کۆمەڵگا مەدەنییەکانی ئەفریقیا، ئیمپریالیزمیان شکستدا و بەرەنگاری دەوڵەتە هێرشبەرەکانی پۆست کۆڵۆنیال بوونەوە. پرس ئەوەیە کە ئایا هەنوکە ژیانی کۆمەڵایەتی لەم کیشوەرەدا تا ئەو ئاستە بەهێزە کە پارێزگاری لە دیموکراسی نوێ بکات؟

ئەم پارێزگاری کردنە پێویستی بە گەشەکردنی چینە ناوەڕاستەکانی هەیە ((دواجار ئێوە ناتوانن بە بێ بۆرژوازی ببنە خاوەن دیموکراسی بۆرژوازی یان لیبڕاڵ)) ئەو چینی ناوەڕاستە کە سامان، کات و خوێندەواری بۆ رێکخستنی گرووپگەلێك کە کاریگەری لە دەوڵەت دەکەن دەستدایە.

پسپۆران دەتوانن بەرەنگار بوونەوەیەکی رۆشنبیرانە بۆ پارتی دەسەڵاتدار دروست بکەن، کەنیسە، مزگەوت و گرووپەکانی مافی مرۆڤ دەتوانن بەرەنگارییەکی (تحدی) رەوشتی دروست بکەن. ئەنجوومەنی ژنان دەتوانن پرسە رەگەزییەکان وەك بەشێك لە گرنگترین بابەتەکان گەڵاڵە بکەن، میدیا سەربەخۆکان دەتوانن لە رێگەی بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان بەرەنگاری دەوڵەت ببنەوە. ئەم کارەش پێویستە (ئەنجام بدرێت) چونکە بەبێ چالاکی رێکخراوە سەربەخۆکان، مەترسییەکی گەورەیە کە دەوڵەت بەهێزتر ببێتەوە و هێز بەخراپی بەکار بێنێت. هەروەك لە بەشی پێنجەمدا باسکرا و وڵاتانی کەم لەم کیشوەرەدا خاوەنی چینی ناوەڕاستی سەربەخۆن. خودی دەوڵەت لە پێکهاتنی چین، چاودێر بووە. لەم رووەوە مومکینە هەڵبژاردنی فرە پارتی و

لەبری هێنانەدی پرۆسەیەکی سیاسی گرێیەکی نوێ بخاتە ناو گرووپی نوخبەی دەوڵەتەوە، هەڵبەت هیچ جۆرە گەرەنتییەك نییە کە سەرکردەکانی پێشووی کۆمەڵگای مەدەنی بە ئاراستەی هێنانەدی بەرژەوەندی گشتی کار بکەن. لەوانەیە ئەوان وەك نوخبەکانی دەوڵەت زۆرتر هەوڵ بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان یاخود بەرژەوەندی دەستەی دامەزرێنەرەکانی بدات. گومان لە لێهاتوویی زۆربەی ئەو کەسانەی کە لەپێناو پۆلۆرالیزم تێدەکوشن، نییە، بەلام دەکرێ پابەند بوونی هەندێ لەم کەسانە بۆ دیموکراسی فرە پارتی تەنیا ئامرازێك بێت بۆ مانەوەیان (سەربازە کۆنەکان) لە دەسەلاتدا و، یاخود دەوڵەتێکی نوێ بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان نە بۆ بەرژەوەندی گشتی دابمەزرێنن، لە ئەنجامدا لەوانەیە بڕوابە پۆلۆرالیزم بە بایەخێکی کەمەوە سەیر بکرێت. تەنیا کۆمەڵگایەکی مەدەنی سەربەخۆ لە دەوڵەت دەتوانێ نوخبە دەسەلاتدارەکان کونترۆڵ بکات.

فردریك چلوبا پاڵەوانی گواستنەوەی زامبیا بۆ دیموکراسی فرە پارتی، لەساڵی ١٩٩١دا، تەنیا سەرۆك کۆماری سەردەمی نوێ نییە کە لە کاتی بەجێهێشتنی دەسەلات رووبەڕووی تۆمەتی بەرتیل و گەندەڵی بووەوە.

رەگەزی سەرەکی ئەوەیە کە ئایا ئەم نوخبە سیاسییە نوێیە زۆرتر لە سەربازە کۆنەکان پابەندی ئامانجی دیموکراسی و حکوومەتی نوێنەرایەتین. جێی گومان نییە زۆرێك لە سەرکردەکان رێز لە دیموکراسی فرە پارتی دەگرن بەلام ئەم ئەگەرەش هەیە کە زۆرێك لە دیموکراسییە فرەپارتییەکان رووکەشن، راستی ئەوەیە کە ئەو کەسانەی دەسەلاتیان بەدەستەوەیە بڕوایان بە پۆلۆرالیزم کەم بووەتەوە.

## پێویستی بوون بە ئابوورێکی بەهێز:

مانەوەی دیموکراسی فرە پارتی پشتبەستراو بە چاودێرکردنی حکومەت لە ئابوور و خۆشگوزەرانی کۆمەلایەتی هاولاتیان دایە. ئەگەر پارتی دەسەلاتدار لە هێنانەدی ئەو شتەی کە دەنگدەران چاوەڕوانی بوونە شکست بهێنێت، دەنگدەران دەنگ بۆ لادانی ئەم پارتە لە دەسەلات دەدەن. بەمجۆرەش حکومەتە وەلامدەرەکان ناچارن کە رێژەیەك لە داواکاری دەنگدەران وەك (هێنانەدی) ژینگەیەکی ئابووری ساغلەم، چاودێری تەندروستی، پەروەردە، خزمەتگوزاریی کۆمەلایەتی و ژێرخانی گواستنەوە و گەیاندن، بهێنەدی بۆ ئەوەی کە تاك بتوانن بەرەو پێشەوە بڕوات. ئەمانەش تەنیا رێژەیەکی کەمی خزمەتگوزارییە سەرەکییەکانن



کە هاولاتیان چاوەڕوانی دەکەن، ئەم داواکارییانەش بەو هۆیەیە کە لە ئەوروپای رۆژئاوا دیموکراسی فرە پارتی لە پاڵ دەوڵەتی خۆشگوزەرانەوە گەشەی کردووە. لە ئەفریقیادا سەرچاوەکان کەمن بۆیەش ئەگەری ئەوە هەیە کە حکومەتێکی تازە بە دەسەلات گەیشتوو بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانی هاولاتیان رووبەڕووی کێشەگەلی زۆر ببێتەوە بۆ دابین کردنی. ئەگەرچی لەوانەیە ئەم حکومەتە دیموکراتیکانە خاوەنی ئامرازێك بۆ پێشکەش کردنی خزمەتگوزارییە سیاسییەکان نەبن، کە سیستەمە دیموکراتیکەکان خوازیاری (ئەم ئامرازانە)ن. نەبوون لە ئەنجامیشدا گرفتەکانی خزمەتگوزارییە ئابوورییەکان دەتوانێ ببێتە هۆی نەمانی مەشروعییەت و تەنانەت شکستهێنانی خودی پۆلۆرالیزم بۆ نموونە لە رژێمی نازی ئەلمانیا، هاولاتیان داواکار بوون کە بە هاوکاری یەکتر دیموکراسی لیبڕاڵ هاوتەریب لەگەڵ خواستەکانی سۆسیالیزمی نەتەوەیی بێنەدی وەها دێتە بەرچاو کە سۆسیالیزمی نەتەوەیی جۆرە یاسایەکی شیاوتر بێت ئەگەرچی دامەزراوە ئابووری و سیاسییەکانی بەرقەرار لە ئەلمانیادا هۆی نائومێدی گەل بوون — بەپێی ئەم نموونە مێژووییە، سەرکردە سیاسییەکان پێویستە گشت کاتێك ئەم ئامۆژگارییەی گیتونگا رەچاو بکەن کە ((دیموکراسی بەسکی پڕ و هزری ئارام دێتە دی)). لە ئەفریقیادا کارکردی ئابووری پێشکەوتوو دەتوانێ ئەم دیموکراسییە گەرەنتی بکات.

## پێویستی بە لێك جیاکردنەوەی دەوڵەت و پارتی دەسەلاتدار:

دیموکراسی فرە لایەنی پێویستی بە دەوڵەتێکی بێلایەن هەیە کە دامەزراوەکانی ((یەك ئاست لە هێزی مانوردان))یان هەبێت و تیایدا پارتە سیاسییەکان بتوانن رکابەرێتی یەکتر بکەن. پارتێك بە سەرکەوتن لە هەڵبژاردنەکاندا ئەم مافەی هەیە کە لە رێگەی ئەم دامەزراوانەوە فەرمانڕەوایی بەرژەوەندییە نیشتمانییەکان بکات. ئەگەرچی سەرکردەکانی سیاسی نابێ دەسەلات و بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت بە ئاشکرا بۆ بەهێزکردنی پارتەکەیان بەکار بهێنن. ئەمەش دەرفەت و بالادەستییەکی نادادپەروەرانە لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا بۆ ئەم پارتە دەرەخسێنێ. بەم پێیەش هاوبەش و هاوبەندی دیموکراتیکی لە ئەفریقیادا پێویستی بەژینگەیەکی سیاسی نوێی هەیە کە تیایدا جیاوازییەکی بەرچاو لەنێوان دامەزراوەکانی دەوڵەت و پارتە دەسەلاتدارەکاندا بوونی هەبێت.

ئەم جیاوازییە بەرچاوەش لە زۆرێك لە ولاتانی ئەفریقیادا سەری هەڵداوە ئەگەرچی هەنوکە پارتە جۆراوجۆرەکان مولەتی رکابەرێتی کردنیان هەیە و هێزە بەرهەڵستکارەکانیش لە

(دۆخێکی) تاڕادەیەك باشتردان بەڵام لە زۆرێك لەم ژینگە نوێیانەدا، لەوانەیە دەنگدەران بە نائاگایانە و بەهەڵە ببنە هۆی کامڵ نەبوونی پرۆسەی گەشەکردنی بەرهەڵستکارە سیاسییەکان. بۆ نموونە سنوورەکانی ناوەندی هەڵبژاردن بە دروستی دابەش نەکرێن، تەعرەفەکانی دەنگدان بە کۆتا بێت و پارتەکانیتر نەتوانن دەنگ بەدەست بێنن (بە هۆی داخستنی دەرگای ناوەندەکانی هەڵبژاردن) و بەمجۆرش سەرکەوتن بەدەست نەیێنێت، یاخود کۆمیسیۆنی هەڵبژاردنەکانی دەوڵەت ئەنجامەکی ساختە رابگەینێت.

زامبیا نموونەیەکە بۆ نیشاندانی ئەوەی کە چۆن یاساکانی هەڵبژاردن لەلایەن پارتی دەسەڵاتدارەوە بە زیرەکی دەستکاری کرا. پارتی یەکێتی دیموکراسی فرە پارتی چیلوبا، پارتی کایندای لە ساڵی ١٩٩١ شکست دا و ئەمەش یەکێك لە هێماکانی سەرەتای گۆڕین و گواستنەوە (بەرەو) رژێمی دیموکراتیك لە ئەفریقیادا بوو. هەروەها پارتی کایندا، وەك هێزێکی سیاسی، بە تەواوی شکستی نەهێنا. ئەم پارتە وەك بەرهەڵستکاری وەفادار (بە دەوڵەت) پێگەکەی لە پەرلەماندا بەدەست هێناوە و بە سەرکەوتوانە پشتگیری دەنگدەرانی بەدەست هێنا بە هۆی ترس لە دووبارە سەرهەڵدانەوە و هاتنە سەرکاری پارتی کایندا، لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٦دا چیلوبا لە ریگەی بەکارهێنانی هێزی دەوڵەتەوە هەوڵی شکستدانی کایندای دا (لەبری سەرکەوتن لە هەڵبژاردنێکی ئازاددا). زۆرینەی پارتی یەکێتی دیموکراسی فرە پارتی لە پەرلەماندا هەوڵیاندا بۆ چاکسازی کردن لە یاسای بنەڕەتی بۆ رێگەگرتن لە هاتنە سەر دەسەڵاتی یەکەمین وەچە لە سەرکردەکانی (تازە پێگەیشتوو) و بەشداری نەکردنیان لە رکابەرێتی سەرۆك کۆماریدا گشت کەسێك لەم بابەتە ئاگادار بوو کە دایك و باوکی کایندا لە مالاوی لە دایك بوونە، بە دەرکردنی کایندا لە گۆڕەپانی رکابەرێتیدا، چیلوبا دووەمین خولی سەرۆکایەتی بە سەرکەوتوانە بەدەست گرت.

پارتە دەسەڵاتدارەکان نەتەنیا هێزی دەوڵەتیان بۆ زیادکردنی چانسیان لە هەڵبژاردنی دووبارەدا بەکار هێنا، بەڵکو بەرژەوەندییە گشتییەکانیش لەم ئاراستەیەدا بەکار هێنران. بۆ نموونە بە دەست گەیشتن بە سامانی نەتەوەیی پارتە دەسەڵاتدارەکان دەتوانن چانسەکەیان بۆ رکابەرێتی هەڵبژاردن زیاد بکەنەوە گرووپە سیاسییە بەرهەڵستکارەکان کە رووبەڕووی کەمی سەرچاوەی داراین، ناتوانن لەگەڵ ئەو پارتانەی کە لە بەرژەوەندی گشتی و بودجەی نەتەوەیی سوود وەردەگرن، رکابەرێتی بکەن. بۆ نموونە سەرۆك کۆماری کێنیا لە رکابەرێتی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٧دا تەواو پێگەکەی بەکار هێنا. پێش ئەنجامدانی هەڵبژاردن خەرجییەکانی دەوڵەت



گەیشتە سەرووی ١٠٠ ملیۆن دۆلار و پارەی لە ناو کاری دەوڵەت بۆ ٣٥٪ بەرز بووە و ئەو دەنگدانەی کە بۆ سەرکەوتن لە هەڵبژاردندا پێویست بوو بە دەستی هێنا.

سەرچاوەکانیتری دەوڵەتی کە بەکارهێنراون، میدیای دەوڵەتی و هێزەکانی گوشارن. زۆربەی رۆژنامە و تەلەفزیون و رادیۆکانی دەوڵەتی لەم کیشوەرەدا هەواڵ و رەوانگەگەلێك کە لایەنگری لە دەوڵەت دەکات لەراپۆرتەکانیاندا بلاودەکەنەوە. بۆنموونە لە توێژینەوەیەکدا لە ساڵی ١٩٩٦ لە هەڵبژاردنەکانی گامبیا، دیارکرا کە سەرۆك کۆمار یەحیا جامە، ٨٣٪ کاتی تەرخانکراو بۆ رکابەرێتی هەڵبژاردن لەرێگەی رادیۆ و تەلەفزیۆندا بۆخۆی تەرخانکردبوو لەبەرامبەریشدا پارتە بەرهەڵستکارەکان هەڵی زۆر کەمیان لەم رکابەرێتییە نایەکسانەدا هەبوو. لە زیمبابواش رابرت مۆگابی سەرەتا چاوپێکەوتنی لەگەڵ کۆمەڵێك رۆژنامەنووسی نێودەوڵەتی ئەنجامدا، بەڵام کاتێك هەواڵە بلاوکراوەکان لەلایەن ئەم رۆژنامەوانانەوە هەڕەشەی لە حکومەتەکەی کرد. چالاکی ئەم رۆژنامەوانانە قەدەغەکرا، بەتایبەتیش کاتێك کە حکومەت لە لێواری رووخان نزیك دەبووەوە. بۆیەش جێی گومان نییە کە جامە و موگابی هەر وەك چیلوبا و مویی لە هەڵبژاردنی فرە پارتی کە دوای ئەم رووداوانە، ئەنجامدران سەرکەوتن بەدەست بێنن.

بەپێچەوانەوە بۆ گرووپە بەرهەڵستکارەکان زۆر سەختە بتوانن روانگە و سیاسەتەکانیان لەرێگەی ئەم میدیایانەوە دەربڕن. دامەزراوەگەلی زۆر لێکردن و سەرکوتیش بەدەستی پارتی دەسەڵاتداران. سوپا و پۆلیس بۆ لەناوبردنی گرووپەکانی دژی دەوڵەت و چۆك دانان بە سەرکردە بەرهەڵستکارەکان سوودمەندن. ئەم ئامرازە باڵادەستییەکی تایبەتی لەرکابەرێتی هەڵبژاردندا هەیە. بۆنموونە لە گینەی بیسائۆ لە ناوەندێکی دەنگداندا بە دەنگدەران وترابوو هەرکەسێك بیهەوێت دەنگ بە پالێوراوێکی بەرهەڵستکار بدات دەتوانێت دەنگی بخاتە ئەو سندووقەوە کە لە پشت بینایەکە دانراوە و سەربازێکیش رێگەی بە دەنگدەران نیشان دەدا.

گشت ئەم نموونانەی سەرەوە نیشانەی چۆنیەتی بەکارهێنانی دامەزراوە دەوڵەتییەکانن بۆ دەستکاری کردن لە هەڵبژاردندا. ئەگەرچی زۆربەی هەڵبژاردنەکانی دەیەی نۆیەم بە هەڵبژاردنێکی ئازاد و دادپەروەرانە راگەیەنرا، بەڵام هەنوکەش ئەم راستییە لە ئارادایە کە کاربەدەستە فەرمانڕەواکانی دەوڵەت و دامەزراوەکانی پارتی دەسەڵاتدار جیاوازییەکی زۆرتریان لەهەمبەر رکابەرەکانیدا هەیە. تا ئەو دەمەی جیاکەرەیەکی ئاشکرا لەنێوان دەوڵەت و پارتی دەسەڵاتداردا بوونی هەبێت گۆڕەپانی گەرمەیەکی یەکسان و دیموکراسی وێنا ناکرێت. ئەمەش

له گشت ئەزموونگەلی فرەپارتیدا رەنگی داوەتــەوە و تــا ئــەو کاتــەی کــە ژمارەیــەکی زۆری سەرکردە و کاربەدەستە سیاسییەکان لەگــەڵ بۆچــوونی ســەرۆك کۆمــاری کۆنگــۆی برازاویــل، پاسکاڵ لیسۆیۆبا، هاودەنگ بن ئەم ( نابەرابەرییە) بوونی دەبێت ئەو دەڵێــت: ((هەڵبــژاردنێك ئەنجام نەدەن کە تیایدا ئەنجام (بە لایەنی بەرامبەر) دەسپێرن)).

### ڕزگاربوون لە موبیلیزە کردنی نەژادیی:

پێنجەمین گرفتی بەهێز کە هاوبەنــدی دیموکراتیــك پێویــستە بەســەریدا زاڵ بێــت گرفتــی بەردەوامی هاوبەندی نەژادییە ئەم راستییەش هەڵقوڵاوی ئەو پرسەیە کــە ســنووری ســەپێنراو لەلایەن ئیمپریالیزمەوە، گرووپگەلی نەژادی جۆراوجــۆری لــە وڵاتێکــدا کــۆ کردۆتــەوە، بــەڵام دیموکراسی فرە پارتی ئیمکانی مۆبیلیزەکردنی بەرفراوانی گرووپە نەژادییەکانی فەراهــەم کــرد. زیاد لەمەش هەروەك کلۆد ئاکی دەڵێت: ((دیموکراسی لیبراڵ جەخت لە تاکگەرایی دەکاتــەوە و بە پێویستی دەزانێت بەڵام لە ئەفریقیادا تاکگــەرایی زۆر دگمەنــە)). مامەڵــەکردنی ئــەفریقیا بەپێی بناغەی ستراتیژییەکییە. لەم رووەوە ئەم ئەگەرە بوونی هەیە کــە بڕیارگــەلی نــەژادیی- ناوچەیی لە دانوسانی پارتە ساســییەکانی ئــەفریقیادا رەنــگ بداتــەوە. رکابەرێتییــەکانی ئــەم دواییە و تەنگەژەی نــەژادی لــە کۆنگــۆی برازاویــل، کێنیــا، مــالاوی و زامیــا... بەشــوناس نیشاندەری ئەم بابەتەیە. مەترسییەکانی هــەڵقوڵاو لــە رکابــەرێتی پــشتبەسترا و بەشوناســی ناوچەیی. نەژادی ئەوەیە کە سەرکەوتنی گرووپێك لەوانەیە ببێتە هۆی شکستهێنانی تــەواویی گرووپێکیتر و فەرمانڕەوایی کردنی ((خێڵەك)) بەسەرئەوانیتردا. لەم چەشنە هەڵومەرجــەدا بــۆ گرووپە نەژادییە دۆڕاوەکان سەختە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان پەسەند بکەن. هەڵبەت ئەگەر بێــت و گرووپە نەژادییەکان هەست بکەن کە بەرژەوەندییەکانیان لەرێگــەی سیــستەمی نەتــەوەیی و لەلایەن خێڵەکانیانەوە بەدەست نایێت، لەوانەیە چوونەدەرەوە (لەهەڵبژاردنەکانــدا) بــەخێرایی ئەنجام بدرێت و ئەنجامی ئەم کارەش ئەندام نەبوون لە دەوڵەتدایە. هەروەك لە دیموکراســییە بــێ ئەزموونەکانی یۆگسلاڤیا، چکسلواکی و سۆڤیەتی پێشوو (ئەم کارە) روویدا.

بەڵام تا هەنوکە پارچە پارچە بوون و لێك دابڕان داواکارییــەکی جــەماوەری لــە ئــەفریقیادا نەبووە، زۆربەی ئەفریقییەکان خۆیان پابەندی پرۆژەی نەتەوە دروست کردن و پەیڕەوی کردن لــە ستراکتۆری بەمیرات ماوی دەوڵەت- نەتەوە دەزانن. لەڕاستیدا دەکــرێ ئــەم نەژادگەراییــە بــە



هاوکــاریکردنێکی پۆزەتیڤانــە و رەفتــارێکی دیموکراتیــك کــە پێــشنیاری کەڵەکــە بــوونی داخوازییەکان دەکات، بە کۆتا بێت.

دواجار پۆلۆرالیزم بە دەوری رکابەری کردن بەسەر بەرژەوەندییەکاندا دەخولێتەوە و ئەمەش رێگەچارەیەکی ئاشتیخوازانەی چارەسەرکردنی ململانێیەکانە. تا ئەو کاتەی گــشت رێــساکانی گەمەکردن پەیڕەوی بکرێت دیموکراسیش بەردەوام دەبێت. ئەنجامگیری هاروی گلیکمەن لێــرەدا ســوودمەندە: ((ئاراســتەکانی دیمــوکراتیزەکردن هەلگــەلێك بــۆ تەشــەنەکردنی نەژادگــەرایی و ململانێ کردن فەراهەم دەکات، بەڵام لە لایەکیتریــشەوە هەلگــەلێك بــۆ کــونترۆڵ کردنــی ئــەم ململانێیە لە رێگەی میکانیزمە بەدامەزراوەیی بووەکان فەراهەم دەکات.

### هەڕەشەی سوپا:

لە پاڵ پێویست بوون بە بەرهەڵستکارە بەهێزەکان، کۆمەڵگای مەدەنی، ئابوور، پێویــستی بە جیاکردنەوەی دامەزراوەگەلی دەوڵەت لە پارتی دەســەڵاتدار و بــەڕێوەبردنی ســەرکەوتوانەی ململانێی نەژادی، رەفتاری سوپاییەکان لە قۆناغی هاوپەیوەندی و هاوبەندی دیموکراتیدا رەخنە هەڵگر دەبێت، لە بەشی هەفتەمدا روونکرایەوە کە چۆن پێــشتر دامــەزراوە ســەرکوتکارەکان و گوشار لە دەستیان لە سیاسەتەکانی ئەفریقیادا کرد و چەندین جار سوپاییەکان، سیاســەتمەدارە سیڤیلەکانی سەرکوت دەکرد. بە هــەرحاڵ بــۆ ئــەوەی کــە دیموکراســی ســەرکەوێت، یونیفــۆرم پۆشەکان (سەربازەکان) ناچارن رۆڵی ناسیاسییانە لە ئەستۆ بگــرن و ملکەچــی گــۆڕینی رژێــم بەرەو ئاراستەی دیموکراسی ببنەوە.

خاڵی کۆتایی بۆ دەستتێوەرنەدانی سوپا لــە سیاســەتەکانی ئــەفریقیادا بــوونی نییــە. لــە نەوەدەکاندا چەندین نموونە هەن کــە هێزەکــانی ئاســایش (أمــن) ئــەنجامی هەڵبــژاردنیان رەت کردووەتــەوە و لــەبری ئەمەشــدا دەوڵەتەکــەی خۆیــان گومــاردووە. بــەمجۆرەش کاربەدەســتانی ئاسایشیی دەڵەتی خۆیان لە بری دەوڵەتی دیموکراتیك و هەڵبــژێردراو دایانمەزرانــد (ئەلجــەزایر، نیجریا، بروندی، کۆنگۆی بیسائۆ کۆماری ئــەفریقیای ناوەڕاســت). تەنانــەت کاتێــك کــە لــەم وڵاتانەدا رکابەرێتی فرە پارتی پەسەندکرا، زنجیرە تاکتیکی درك پێکــراو لــە ئــارادا بــوون کــە بەپێی ئەم تاکتیکە دەبوایا پالێوراوەکان لەلایەن سوپاوە دانی پێبنێت. لە پرســی نیجــردا، بــۆ گەڕانەوە بە رکابەرێتی فرە پارتی لە ساڵی ١٩٩٧دا دەبینین کە ژەنەراڵ ئۆبا سانجۆ وەك سەرۆك کۆمار هەڵدەبژێردرێت، پێشتر لە ساڵانی ١٩٧٦ تا ١٩٧٩ ژەنــەراڵ ئۆبــا ســانجۆ بــەڕێوەبردنی

حکومەتی سەربازیی لە ئەستۆدا بوو. ئایا ئەم گەڕانەوەیە بۆ حکومەتی مەدەنی لەلایەن سوپاوە پشتگیری لێکرا، یاخود گەل پشتگیری لە پالێوراوەکانی سوپای کرد؟ سەرکەوتنی چەند پالێوراوێکی سوپا (بۆ) سەرۆك کۆماری لە هەڵبژاردنەکانی نۆیەم لە ئەلجەزایردا ئەم گریمانەیە بەهێز دەکات وە ئەم بابەتەش، لە بابەتی توێژینەوەدا بەوردەکاری زۆرترەوە روونکراوەتەوە.

جێی خۆیەتی توێژینەوەیەك بکەین کە بۆچی گامبیا لە دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم رووبەرووی کودەتا بووە؟ کارێك کە بە هۆیەوە سیستەمی دیموکراسی فرە پارتی دوای ٢٩ ساڵ لە بەین برا. ئەم چەشنە رووداوانە ئاماژەن بۆ ئەوەی کە چەندین وەچە درێژە دەخایەنێت تا هاوپەیوەندی لە ئەفریقیادا کامل ببێتەوە.

## کولتووری سیاسی:

گشت ئەم بابەتانەی سەرەوە دەتوانێ بە ئاراستەی هێنانەدی بیرۆکەی کولتووری سیاسی وێنا بکرێت. کولتووری سیاسی بریتییە لە بۆچوونگەلی سیاسی هاوبەش، روانگە و بڕواگەلێك کە کۆمەڵگایەك دەخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە سروشتییە، کە گشت مرۆڤەکان خاوەنی بیرۆکە و مەیلگەلی تایبەت بە خۆیانن، بەڵام زۆربەی کۆمەڵگا سەقامگیرەکان خاوەن پرەنسیپگەلی سیاسی گشتی (کلی) و هاوبەشن. بۆ نموونە بۆچوونگەلی لیبڕاڵ دیموکراسی لە گشت کۆمەڵگای بەریتانیا و ولایەتە یەکگرتووەکاندا دەستڕۆیی و دزەی کردووە و تاکەکان چ ئەوانەی سیاسەتمەدارن و چ ئەوانەی پسپۆر نین پشتگیری لە رێساکانی گەمەی سیاسی دەکەن، بەم پێیەش دیموکراسی وەك شێوازێك بۆ چارەسەرکردنی ململانێیەکان لە گشت دامەزراوەکانی دەوڵەت (وەك پەرلەمان و کابینەی حکومەت) و کۆمەڵگای مەدەنی (ژوورە گەورەکانی (بازرگانی)، کۆنفرانسییەکان، یەکێتییە بازرگانییەکان و کۆبوونەوەی کلوپەکاندا) رێز و بەهای خۆی هەیە. ئەگەر ولاتانی ئەفریقیا خوازیاری بەرقەراری و بەردەوام بوونی ژیانی دیموکراسی فرەپارتین، ناچار دەبن کولتووری سیاسی دووبارە بکەنەوە (موممارەسەی بکەن). بە گشتی کەسانێك دەتوانن چاودێری سەرکردە سیاسییەکان بکەن کە پێشەنگی بەرگری کردن لە کولتووری سیاسی کۆمەڵگاکەیان بن. ئەگەرچی باس لەم بابەتە دەکرێت کە ژمارەیەك لە نوخبەکانی سیاسی لە ئەفریقیادا چ فەرمانبەران و چ بەرهەڵستکاران لە دیموکراسی فرە پارتی، وەك ئامرازێك دەکەن. بەواتایەکیتر ئەمانە پشتگیری لە پۆلۆرالیزمی سیاسی دەکەن. چونکە دیموکراسی شێوازێك بۆ پاراستن و بەدەست هێنانی دەسەڵاتە، نەك لە بەر ئەوەی کە ئەوان لە



رووی زاتییەوە بڕوایان بە بەها رەوشتییەکەی دیموکراسی هەبێت. سیاسەتمەدارانی زەئیر (وەك تشیسکیدی (Tshiskedi) و نگوزا کارل ئی بۆند ( Bond - Nguz a) نموونەگەلی باشن بۆ ئەم پرسە. هەردوو کەس بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندییەکانی قۆناغی رکابەرێتی فرە پارتی، سیاسییان دامەزراند هەردووشیان دواتر بۆ هاوکاریکردنی شۆڕشگێڕانی لورنت کابیلا دژی مۆبۆتۆ سێسێکو ئامادە بوونیان دەربڕی، ئەگەرچی ئەوان پێشتر لە خزمەت مۆبۆتۆدا بوون، ئەم جۆرە سیاسەتە بگۆڕانە (متغیر) یاخود سیاسەتگەلی بۆ خۆ سەرمایەگوزاری کردن، ناتوانێ جێی متمانە و گەرەنتی کەری دیموکراسی بێت.

رابرت فاتون دەڵێت، کاتێك کە گاردی کۆن ((دایناسۆرەکان)) لە ناکاوەوە بۆیان دەردەکەوێت کە دیموکراتگەلی باشن، رزگار بوونی ولات لە رژێمی ستەمکاری سوودمەند دەبێت، بەڵام داهاتووی ولات وەك کۆمەڵگایەکی دیموکراتیك دەکەوێتە مەترسییەوە. ئەم جوڵەیە (حرکە) لە یاسا کەسییەکان (شخصی) و رژێمە باوکسالارەکانی نوێ هەڵدەقوڵێت لە روانگەی سیاسەتمەدارانەوە، کۆمەڵەکان دەتوانن ببن بە سەرچاوەیەکی ئاشکرای پاراستنی بیرۆکەی نوێنەرایەتی کردن و وەڵامدانەوە. چەندین بەڵگە هەن بۆ ئەوەی کە کولتووری سیاسی فرە پارتی لە کۆمەڵەکانی ئەفریقیایدا قوول و رەگ داکوتاوە. بۆ نموونە لە بوتسوانا لە سەردەمی سەربەخۆییەوە لە ساڵی ١٩٩٦دا رکابەرێتی فرە پارتی لەم ولاتەدا بوونی هەبووە ئەگەرچی لە ریفراندومێك کە لە هەشتاکاندا ئەنجامدرا تەنیا ٤٧٪ی دەنگدەران دیموکراسی فرە پارتییان بە پێویست دەزانی. ئەم لێکۆڵینەوەیە نیشان دەدات کە لەنێوان ئەو کەسانەی کە خوێندەوارییان لە خوارووی ئامادەییە، زۆرینەیەکی بەرچاو بەو بیرۆکەیە کە پێویستە زۆرینە رۆڵی (گرنگیان) لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتدا و ئامانجەکەی هەیانبێت بوونی نییە. زۆرینەی گەلی بوتسوانا لە نوخبە سیاسییەکان کە ئەرکەکانیان بە باشی جێبەجێ دەکرد رەزامەند بوون و تەنیا کەمینەیەك لەگەڵ داواکاری بەشداریکردن لە پرۆسەی سیاسیدا هەبوو، ئەگەر ئەم پرسەش لە بوتسوان راست بێت کەواتە پەسەندکراوە کە وەها بۆی بڕوین کە جیاوازی زۆری لەگەڵ ولاتانیتری هەبێت و ئەم دادوەرییەش بۆ زاڵ بوون بە سەر حکومەتی ستەمکاردا کاریگەری ئەوتۆی نابێت. پۆلۆرالیزم پێویستی بە کولتووری سیاسی هەیە. رژێمە دیموکراتیکەکان بە لەسەر خۆییەوە سەرکەوتن بەدەست دێنن یاخود تووشی شکست دەبنەوە، یەکێك لە هێماکانی (مؤشرات) کولتووری دیموکراتیك (ئەگەرچی لاواز) ئەوەیە کە پارتە جۆراوجۆرەکان ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی فرە پارتی پەسەند بکەن و ئارەزوومەندی بەشداریکردن

لەگەڵ پارتی سەرکەوتوویان هەبێت سەرەڕای فاکتەرەکانی لە سەرخۆ بوون و ئارامی لە شکستی هێنان لە هەڵبژاردنەکاندا. لەلایەکیترەوە فاکتەرگەلێك هەن کە رەچاو نەکراون. بۆ نموونە لە ئەنگۆلا، هەڵبژاردنی فرە لایەنی دوای ١٧ ساڵ شەڕی ناوخۆ لە ساڵی ١٩٩٢دا ئەنجامدرا و پارتی ئێم پلا، پارتی یونیتای لە هەڵبژاردنێکی ئازاد و رکابەرێتیدا شکست دا. ئەگەرچی بەرپەرچدانەوەی یونیتا وەك پارتێکی بەرهەڵستکاری وەفادار نەبوو و ئەم پارتە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و دژایەتیکردنی پارتی ئێم پلا، چالاکیگەلی شۆڕشگێڕانە و یاغیگەرانەی ئەنجامدا. لە زۆرێك لە ناوچەکاندا پارتە شکست خواردووەکان بوونیان هەبوو کە شکست هێنانیان لە چوونە ناو پەرلەماندا، پەسەند نەدەکرد. کاتێك کە یەکەمین بەرپەرچدانەوەی پارتی شکست خواردوو بایکوت کردن و چالاکی گێڕانی چەکدارانە بێت، هاوپەیوەندی و هاوبەندی دیموکراتیك رێگەیەکی نەپێوراو و سەختە.

## گۆڕینی رژێم:

ساموئیل هانتینگتون دەڵێت کە هەڵبژاردنی ئازاد و یەکسان کاتێك ئەنجام دەدرێت کە لە دوو لایەنی حکومەتدا گۆڕانکاریگەلێك ئەنجام درابێت. پێش ئەوەی کە دەوڵەت، بە دەوڵەتێکی دیموکراتیك بناسرێت. هانتینگتون دەڵێت کە تەنیا بەڵگەی باش کار کردنی پولۆرالیزمی راستەقینە ئەوەیە کە نیشان بدات کە هەم کاربەدەستە سیاسییەکان و هەمیش بەرهەڵستکاران پابەندی رێساکانی گەمەکردنن و شکستی (خۆیان) پەسەند بکەن، هەڵبەت ئەگەر ئەمەش لە داواکارییەکانی گەل بێت. لە ئەفریقیادا موریس و بینن و ماداگاسکار ئیمتیازی پێویست بۆ هێما (مۆشر)کانی دوو لایەنەی وەرچەرخان و گۆڕانکاری پێشکەش کراو لەلایەن هانتینگتونەوە، بەدەستیان نەهێناوە.

نابێ ئەم راستییە لەبیر بکەین کە ئەم کیشوەرە لە نەوەدەکاندا هەنگاوی باشی بۆ ئاڕاستەی دیموکراسی فرەپارتی، ناوە و ئەم بابەتەش هەم لە قەوارەی هەڵبژاردنە فرەپارتییەکاندا و هەمیش لە بارودۆخگەلێك کە تیایدا گۆڕینی رژێم بە ئاشتیخوازانە ئەنجامدراوە دەبینرێت. (١٤٦ هەڵبژاردنی فرەپارتی لەیەك دەیەدا لەهەمبەر ١٣ گۆڕینی زۆردارێکی حکومەت. بڕوانە پاشکۆکان).

زۆربەی ئەم هەڵبژاردنانە ئازاد و پەسەندکراو بوون و تەنانەت لەهەندێ بارودۆخدا کە کاربەدەستە سیاسییەکان بەتوندی دەسەڵاتیان بەدەست گرتبوو، دەسەڵاتیان لەدەست دا و ئەم



بابەتەش هەڵقوڵای پشتگیری گشتگیرانەیە تا ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی سادە و ئەم بابەتە وڵاتانی ئەفریقیای لە بارودۆخێکی جیاواز لە گۆڕانکاری دیموکراتیکانە جێگرکردووە (بڕوانە خشتەی ٢-١١). هەندێ لە وڵاتان هیچ کاتێك دەستیان بە پڕۆسەی چاکسازی نەکرد (ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە کاربەدەستە سیاسییەکان توانای بەرەنگاربوونەوەی گوشارەکانی ئازادسازییان هەبوو). هەندێ لە وڵاتانیتر بە کەموکوڕییەوە ئەم کارەیان (چاکسازی) ئەنجام دا (بەدەست گرتنی دەسەڵات و بەکارهێنانی ستەمکاری و فاکتەرگەلی وەك دەستتێوەردانی دەرەکی یاخود رووخانی دەوڵەت) لەهەندێ دەوڵەتیشدا ئاماژەگەلی پۆزەتیڤانە لە کولتوورێکی دیموکراتیك نمایش کرا. پێویستە ئاماژە بکرێت کە هیچ یەك لەم کۆمەڵە دەوڵەتانە لە مەترسی هەرەسهێنان و رووخان بە دوور نین. لەم ساڵانەی دواییدا سپاردنی دەسەڵاتەکانی رژێمی دیموکراتیکی سەرکەوتوو بە جۆرەکانیتری رژێمەکان بە ئاسانی ئەنجامدەدرێت لە زۆرێك لە وڵاتاندا گەڕانەوە بۆ دواوە و دابونەریتی کۆن شتێکی بڕاوەیە.

بەڵام هیچ یەك لە وڵات و دەوڵەتانی ئەم کیشوەرە توانای پێشکەوتنی زۆرتریان نییە، تەنانەت ئەوانەش کە بەتەواوی شکستیان هێناوە (هیچ رێگەیەکیان نییە) مەگەر ئەنجامدانی پڕۆسەی دووبارە بنیاتنانەوە و ئەنجامدانی هەڵبژاردنی فرەپارتی نەبێت، لەئەنجامدا سەرەڕای قۆناغێك لە گۆڕانکاری، هەنوکەش داهاتووی سیاسی ئەم کیشوەرە لە تارمایی دایە.

## دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی:

هەم دەوڵەت و هەمیش کۆمەڵگای مەدەنی لە هەنگاونان بەرەو دیموکراسی فرە پارتی سوودمەند بوونە. بۆ نموونە هەروەك لە بەشی پێشوو ئاماژە پێکرا، زۆربەی حکومەتەکانی ئەفریقیا رووبەڕووی قەیرانی گەڵەکە بوون و مەشروعییەت بوونەوە و مەشروعییەتەکەیان بەخێرایی کەم بووە، دەوڵەتەکان گۆڕدراون و هەندێکیان بە چاو نوقاندنێك رووخان. لەم رووەوە گوزار بەرەو یاسای بنەرەتی فرە پارتییانە لە ساڵی ١٩٨٩وە وەك ستراتیژییەك بۆ بەردەوام بوونی دەوڵەت پەیڕەویی کرا و رژێمگەلی سەرۆکایەتی، پاشایەتی تاڕادەیەك لە دوای چاکسازی کردنی دیموکراتیکانە مەشروعییەتێکی نادیار (صنمنی) یان بەدەستهێنا و ئەمەش دوایین ئومێدیان بوو بۆ بەدەستهێنانەوەی مەشروعییەتی دەوڵەت و بەمجۆرەش رادەیەك لە دەسەڵاتیان بۆ خۆ و بۆ هاوڵاتییەکانیان پاراست. قەرەبووی بەکارهێنانی ستراتیژی بەردەوام بوونی ژیان (ژیانی دەوڵەت)، ئازاد بوونی سیستەمە سیاسییەکانی ئەفریقیا بوو، کەش و پانتای سیاسی

کە پێشتر نائازادانە بوو و لەلایەن نوخبەکانی دەوڵەتەوە سنووردار کرابوو، دواجار بۆ لیبڕاڵییەت گۆڕدرا. هەنوکە کۆمەڵگای مەدەنی بە راشکاوی و لە ئاستێکی بەرزدا دەیتوانی بەرەنگاری پارتی دەسەڵاتدار ببێتەوە بۆ بەردەوام بوونی ژیانی (سیاسی) کاربەدەستە سیاسییەکان، سەرەتا دەبوایا کاربەدەستان لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتن بەدەست بهێنن و دواتر بەرەنگاری بەرهەڵستکارانی ناو پەرلەماندا ببنەوە. هەڵبەت هەندێ لە گاردی کۆن لەم کارەدا شکستیان هێنا، چونکە توانایی دەستکاری کردن و ساختەکاری، دەست گەیشتن بە سەرچاوەکان و فەراهەم کردنی پشتیوانی گشتی بۆ بەردەوامیدان بە ژیان و لە ئەنجامدا گۆڕینی سیستەمیان نەبوو، ئەگەرچی پارتەکانیتر ئەم پرسەیان بۆ پانتایەکی نوێ گۆڕی. هەرچەند لەوانەیە کە سیاسەتمەدارەکان توانایی بەرجەستەکردنی دەسەڵاتەکەیان هەبێت بەڵام ئەوان ئاگادارن کە هەنوکە پێویستە کردارگەلی نوێ بە دەنگدەران نیشان بدەن. هەم دیموکراسی و هەمیش دەوڵەت دەتوانێ لە رێگەی ئەم هێمایانەوە (مۆشرات) بە هێز بکرێت. کۆمەڵگای مەدەنی یا خۆد بەلانیکەم بەشێك لە کۆمەڵگای مەدەنی لە رێڕەوی گوزار بەرەو رکابەرێتی فرە پارتی بەهێز دەبێت. کەنیسەکان، یەکێتیە بازرگانییەکان، گرووپەکانی مافی مرۆڤ، گرووپە پسپۆرەکان، گشتیان متمانە پێکردن و ئەزموون، بە هۆی رێزگرتن لە بەشداریی لە پرۆسەی سیاسیدا، بەدەست دێنن. بەمجۆرەش ئەم گریمانەیە بەهێز دەبێت کە کۆمەڵگای مەدەنی دەتوانێ پۆلۆرالیزمی سیاسی رزگار بکات.

ئەگەرچی چونیەتی ئەو شتەی کە کولتووری سیاسی پێشکەشی بە کۆمەڵگای مەدەنی کردووە جێی پرسیارە: ئایا سەرکردەکانی ئەم دامەزراوە کۆمەڵایەتییانە پابەندی سەردەمی نوێ پۆلۆرالیزم دەبنەوە و تا چ ئاستێك کۆمەڵگای وەرزێری و دەرەبەگایەتی لە ئەفریقیادا گۆڕدراوە؟ ئایا ئەم شێوەیە لە چاکسازیی سیاسی شتێکی بەم کۆمەڵانەی پێشنیار کردووە یاخود تەنیا هەلێکە بۆ دەنگدان؟

زیاد لەمەش ئەم ئەگەرە بوونی هەبوو کە دیموکراسی فرە پارتی تەنیا لە خزمەتی تەشەنەکردنی چینی سیاسی لەم کیشوەرەدا بووبێت (بە ئاڵوگۆڕ بوونی نوخبەکان کە هەنوکە لە بەرزترین ئاستی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیدان) دەوڵەت لە ژێر ئەم چەشنە بارودۆخەدا پێویستە نوێنەر و وەڵامدەرەوەی ئەم بەشە بەرفراوانەی کۆمەڵگا بێت. پەیوەندی نێوان کاربەدەستانی دەوڵەت و گەل لاواز دەمایەوە تەنیا دەکرێت دیموکراسییەك هاوهەنگاو لەگەڵ ئابوورێکی گەشەسەندو سیستەمێکی سیاسی لێهاتوو، دەتوانرێ دابمەزرێت (دەرباز بوون لەم



قەیرانە) بەم جۆرەیە کە دیموکراسی سەرکەوتووە بە هۆی زیاد بوونی داواکاری گەل بۆ پشکدار بوون لە کاروباری بەرقەراردا، بە بوون دێت ئەگەر ئامانجی ئەم دیموکراسییانە تەنیا هەوڵدان بۆ ((دوایین هەناسەکان)) بێت. لەپێناو پاراستنی دەوڵەتی لە دۆخی رووخاندا سەرکەوتنێکی کەم دەستەبەر دەکرێت.

بێگومان ژینگەی سیاسی ئەفریقیا لە دەیەی نویەمەوە بەرەبەرە پێشکەوتنی بە خۆوە بینیوە و ئەم ئەگەرەش لە ئارادایە کە بە بەردەوام بوونی ئەم بارودۆخە ئەم کیشوەرە سوودگەلی زۆر بەدەست بهێنێت، بەڵام خۆشبینی بۆ داهاتووی سیاسی ساوێلکەیانەیە. چونکە ئەم بابەتە (پێشکەوتن) پشتبەستراو بە هەندێ داواکاری و ئاواتە (هاتنەدی هەڵ و مەرجگەلێك) کە لە سەرەوەدا باسکران. بە پشتگوێ خستنی ئەم فاکتەرانە زۆر سەختە هاوپەیوەندی دیموکراسی فرە پارتی لە سەرتاسەری ئەم کیشوەرەدا بە بێ هیچ ئامرازێکی گەرەنتی کەر بەدی بهێنرێت.

**خشتەی ژمارە ١-١١: هەڵسەنگاندنی سیستەمە سیاسییەکانی ئەفریقیا لە ساڵانی نێوان ١٩٨٨ و ١٩٩٩دا:**

**سیستەمی سیاسی ئەفریقیا: ١٩٨٨**

| ناوی سیستەمی سیاسی | ناوی وڵات |
| --- | --- |
| سیستەمی تاك پارتی: ٢٩ وڵات | ئەلجەزایر، ئەنگۆلا، بڕوندی، کامیرون، گەروی سەوز، کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست، کۆمۆر، کۆنگۆی برازاویل، کەناری عاج، جیبوتی، گینەی ئۆستوایی، ئەسوپیا، گابۆن، گینەی بیسائۆ، کێنیا، ماداگاسکار، مالاوی، مالی، موزامبیك، رواندا، سائۆمەو پرنسیب، سیشل، سیرالیۆن، سومالی، تانزانیا، تۆگۆ، زەئیر، زامبیا. |
| ئۆلیگارشی سەربازی: ١٠ وڵات | بۆرکینا فاسۆ، چاد، غەنا، گینە، لسۆتۆ، لیبیا، موریتانی، نێجر، نێجریا، ئۆگاندا. |
| یاسای بنەڕەتی فرە پارتی: ٩ وڵات | بۆتسوانا، میسر، گامبیا، لیبریا، موریس، سەنیگال. سوودان، تونس، زامبیا |

| | |
|---|---|
| پاشایەتی: دوو وڵات | مەغریب، سوازیلند |
| ئۆلیگارشی سەربازی: دوو وڵات | ئەفریقیای باشوور، نامبیا |

**سیستەمی سیاسی ئەفریقیا: ١٩٩٩**

| ناوی سیستەمی سیاسی | ناوی وڵات |
|---|---|
| یاسای بنەڕەتی فرە پارتی: ٤٥ وڵات | ئەلجەزایر، ئەنگولا، بنین، بوتسوانا، بۆرکینا فاسو، کامیرون، گەروی سەوز، کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست، چاد، کۆمۆر، کۆنگۆی برازاویل، کەناری عاج، جیبوتی، میسر، گینەی ئۆستوایی، ئەسوپیا، گابون گامبیا، غەنا، گینە، گینەی بیسائۆ، کێنیا، لسۆتۆ، لیبریا، ماداگا سکار، مالاوی، مالی، موریتانیا، موریس، موزامبیك، نامبیا، نێجر، نێجیریا، رواندا، سائۆمەو پرنسیپ، سەنیگال، سیشل، سیرالیۆن، ئەفریقیای باشوور، سوودان، تانزانیا، تۆکۆ، تونس، زامبیا، زیمبابو. |
| ئۆلیگارشی سەربازی: دوو وڵات | مەغریب، سوازیلند |
| نەبوونی حکومەتی ناوەندی: | سومالی |
| حکومەتی بێ پارت: یەك وڵات | ئۆگاندا |
| سیستەمی تاك پارتی: یەك وڵات | ئەریتره |



**ڕەوتی گۆڕانکارییەکان لە ئەفریقیادا ٩٩- ١٩٩٠**

| ڕێگری لە گۆڕانکاری | وەستاندنی گۆڕانەکان | گۆڕانکاری کەم و کوڕ | گۆڕانکاری دیموکراتیکانە |
|---|---|---|---|
| لیبریا | ئەلجەزایر | بۆرکینافاسۆ | بنین |
| سوودان | ئەنگولا | کامیرون | گەروی سەوز |
| | بروندی | کۆمور | کۆماری ئەفریقیای (ناوەڕاست) |
| | چاد | کەناری عاج | کونگۆی برازاویل |
| | ئەسوپیا | جیبوتی | گینەی بیسائۆ |
| | گینە | گینەی ئۆستوایی | سوتۆ |
| | رواندا | گابون | ماداگاسکار |
| | سیرالیۆن | غەنا | مالاوی |
| | سومالی | کێنیا | مالی |
| | تانزانیا | موریتانی | موزامبیك |
| | ئۆگاندا | نێجریا | نامبیا |
| | زەئیر | سوازیلند | نێجر |
| | | تۆگۆ | سائۆتومەو پرنسیپ |
| | | | سیشل |
| | | | ئەفریقیای باشوور |
| | | | زامبیا |

**خشتەی ٢- ١١: پوختەی بەش: لەمپەرەکانی هاوپەیوەندی دیموکراتیکانە لە ئەفریقیادا**

| | |
|---|---|
| نەبوونی ئۆپۆزیسیۆنی یاسایی. | * هێزەکانی جێگرەوە و بەرنامەی سیاسی دیارکراو لەلایەن هەڵبژێرەکانەوە دیار دەکرێت.<br>* پارتی بەرهەڵستکاری یەکگر پێویستە (بوونی هەبێت) نەك پارتی بێ بەرنامە و بە پشتگیرییەکی سنووردار. |
| کۆمەڵگای مەدەنی لاواز | * کۆمەڵگای مەدەنی وەك رکابەرێك هەمبەر هەژموونی دەوڵەت دەوەستێتەوە.<br>* کۆمەڵگای مەدەنی هاوکاری دەوڵەت ناکات و بە هەبوونی سەربەخۆیی بەردەوام، کونترۆڵی دەسەڵاتی دەوڵەت دەکات.<br>* چینی ناوەڕاستی بەهێزی ئەفریقیا پێویستی بە بەردەوام بوونی چالاکی کۆمەڵگای مەدەنی هەیە. |
| ئابووری لاواز | * بەرهەمهێنانی ئابوورییانە بۆ دابین کردنی پێداویستی و خزمەتگوزارییە گشتییەکانی دەنگدەران، بۆ دەوڵەت پێویستە.<br>* کەمی سەرچاوە، دەنگدەران (کۆمەڵەکان) بۆ پچڕاندنی پروسە دیموکراتیکەکان رەزامەند دەکات. |
| هیچ جیاکردنەوەیەك لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا نییە | * پارتی دەسەڵاتدار گەرەنتی هەڵبژاردنی ئازاد و دادپەروەرانە دەکات و دەستکاری پرۆسەی هەڵبژاردن ناکات.<br>* یاساکان تەنیا لە خزمەت بەرژەوەندییەکانی پارتی دەسەڵاتداردا نین.<br>* گشت پارتەکان بە یەکسانی، دەستیان بە ئامرازەکانی راگەیاندن دەگات.<br>* هێزەکانی ئاسایشی (أمن) دەوڵەت دیموکراسی بەهێز دەکەن و تواناییەکانیان بۆ سەرکوتکردنی بەرهەڵستکاران بەکار نایێنن. |



| | |
|---|---|
| پتانسێیلی ململانێ بە هێزەکانی نەژادی کونترۆڵ نەکراو | * رکابەرێتی نەژادییانە، سەرلەنوێ بە هۆی رکابەرێتی. ئازادی دیموکراتیکانەوە گەشە دەکەن.<br>* پێویست بوون بە رکابەرێتی نەژادییانە لە رێگەی پرۆسە دیموکراتیکەکانەوە گەرەنتی دەکرێت. |
| توانایی بۆ دەستتێوەردانی سەربازییانە | * لەوانەیە سوپاییەکان هەر کاتێك کە بن بەستی سیاسی لەنێوان پارتەکاندا بوونی هەبوو، دەستتێوەردان (لەکاروبارەکاندا) بکەن. |
| کولتووری سیاسی دیموکراتیکی لاواز | * رێزگرتن لە دیموکراسی لەنێوان نوخبەی دەسەڵاتدارەوە بوونی هەیە و هیچ دەرفەتێك بە چالاکی پۆلۆرالیزمی لە دەرەوەی دەسەڵاتدا نادرێت<br>* بەرهەڵستکاران رێز لە دیموکراسی دەگرن و ئەگەر پارتی دەسەڵاتدار لە گەیشتن بە دەسەڵات شکست بهێنێت، پرۆسەی دیموکراسی، شکست نایێنێت.<br>* رێزگرتن لە دیموکراسی بۆ کۆمەڵگای مەدەنی. پێویستە، (واجب) بەڵام هیچ پێویست نییە کە دەوڵەتێك کە ئەم پرۆسەیەی قەدەغەکردووە (پرۆسەی دیموکراسی) رێزی لێ بگرێت.<br>*فێرکردن و ئەزموونی دیموکراسی بۆ ئەم کیشوەرە بۆ گەرەنتی کردن و بەردەوام بوونی دەسەڵاتداران پێویستە. |
| نەگۆڕینی رژێم | * نەریتی گۆڕانکاری سیاسی سنووردارە لە ئەفریقیای دوای کۆلۆنیالدا.<br>* بوونی بەڵگەگەلێك لە سەر گۆڕانکاری یاسایی و بەردەوام بۆ رێز گرتن لە پرۆسەی دیموکراتیك. |

## بابەتی توێژینەوە: گەڕان بە دوای دیموکراسی لە ئەلجەزایردا:

زۆربەی دانیشتوانی ئەلجەزایر لە هێڵێکی باریکی ئەم وڵاتە کە لە کەنارەی دەریای ناوڕاستەوە جێگر بووە نیشتەجێن. لە باشووری ئەم دەشتە بە پیتە زنجیرە چیاکانی ئەتڵەس دێن و دوای ئەم ناوچەیەش، دەشتی بەرفراوانی بیاوانی گەورە دەست پێدەکات. لە رووی مێژووییەوە خۆجێییەکانی بەربەر، ئیمپراتۆری فینیقی، کارتاژ و رۆمەکان لەم وڵاتەدا ژیاون و تێکەڵیان لەگەڵ یەکتردا هەبووە. ئەگەرچی ئەم ناوچەیەی گۆی زەوی لە سەدەی حەفتەمی زایینییەوە هاتنی بەرەبەکانی بەخۆوە بینیوە و دەسترۆیی فەرەنسا لەم وڵاتەدا زۆر درەنگ دەستی پێکرد و هێزەکانی فەرەنسا لە ساڵی ١٨٣٠دا بەشێك لەم وڵاتەیان داگیرکرد و تا ساڵی ١٩٠٢ کۆلۆنیالی فەرەنسا بەسەر ئەم وڵاتەدا کاملبوو و حکومەتی کۆلۆنیالی فەرەنسا ٦٠ ساڵی خایاند و لە ساڵی ١٩٦٢دا ئەلجەزایر سەربەخۆیی وەرگرت.

سەربەخۆیی ئەم وڵاتە بەپێی پرۆسەیەکی ئاشتیخوازانەوە ئەنجام نەدرا. فەرەنسا زۆر بە خراپی کۆلۆنیالی بەسەر ئەم وڵاتەدا سەپاندبوو و مەیلی چوونە دەرەوەی نەبوو. هەڵبەت پاریس ئەم وڵاتەی بە بەشێکی جیانەکراو لە فەرەنسا هەژمار دەکرد و هەر بۆیەش ئەم وڵاتە خراپترین و توندوتیژاویترین، شەڕ لەپێناو ئازادیی بەخۆوە بینی و لە شەڕێکی سەختدا لەنێوان بەرەی رزگارکەری نەتەوەیی و کاربەدەستانی کۆلۆنیالی نزیکەی یەك ملیۆن کەس (یەك کەس لە هەر دە کەس لە دانیشتوانی ئەلجەزایر) بوونە قوربانی.

کاتێك کە فەرەنسا ناچار بوو سەربەخۆیی ببەخشی، بەخشینی سەربەخۆیی بەم وڵاتە بە خێرایی ئەنجامدرا. فەرەنسا کە بینی ناتوانێ ئەم گەلە شکست بدات، ریفراندومێکی بۆ ئەلجەزایر رێك خست و گەل بە زۆرینەی دەنگ، دەنگیان بۆ سەربەخۆییدا. دوای دوو رۆژ فەرەنسا سەربەخۆیی فەرمی بەم وڵاتەی بەخشی و لە رکابەرێتی نێوان گرووپەکاندا، بەرەی رزگارکەری نەتەوەیی (ئەحمەد بن بلا) وەك یەکەمین سەرۆك کۆمار هەڵبژێردرا. هەڵبژاردنی نیشتیمانی کە بە بەراوورد لەگەڵ ریفراندۆم خەڵکێکی زۆر تێدا بەشدار بوون مەشروعییەتی بە دەوڵەت و دەسەڵاتە لێ تاشراوەکانی بەخشی.

حکومەتی (بن بلا) رەنگدانەوەی ئەو رێگە (خیارات) هەڵبژێردراوانە بوو کە لەلایەن زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیاوە، پاش سەربەخۆیی پەیڕەوی کرابوو. لە رووی یاسای بنەڕەتییەوە (بن بلا) باڵاترین پۆستی جێبەجێ کردن بوو و بەرەی رزگاریکەری نەتەوەییش تاکە پارتی سیاسی وڵات بوو و سەرچاوەکانیتری بەرهەڵستکاری یان بە سیستەماتیکانە لەناو بردران یاخود لە



دەوڵەتدا توانەوە. چونکە سۆسیالیزم ئایدۆلۆژیای سەرەکی دەوڵەت بوو. بۆیە دەوڵەت لە سەنتەری پلان داڕێشتنی ئابووری دابوو.

چارەنووسی ئەلجەزایر، وەك چارەنووسی وەڵاتانیتر بوو، بن بلا لە رێگەی کۆدەتای سەربازییەوە لە ساڵی ١٩٦٥، لەلایەن هواری بومدین، لە سەرکار لابردرا و بومدین بوو بە سەرۆکی ئەنجوومەنی شۆڕش و رایگەیاند کە هەوڵ دەدات سۆسیالیزمی راستەقینە لە وڵاتدا جێبەجێ بکات، چونکە پلانە جێبەجێکراوەکانی بن بلا بەپێی بەرژەوەندی تایبەتییەکەی (بن بلا) بوونە. حکومەتی نوێش زۆربەی دامەزراوە دەسەڵاتخوازەکانی رژێمی پێشووی بەکارهێنا، سوپا، حیزب و دامەزراوە دەوڵەتییەکان کران بە تاك جەمسەری و لە خزمەت حکومەتدا بوون و هیچ جۆرە هەوڵدانێك بۆ پاراستنی بەرژەوەندی گشتی لەرێگەی هەڵبژاردنی دیموکراتیك و رکابەرێتی ئەنجام نەدرا. دوای مردنی بومدین لە ساڵی ١٩٧٨دا سەرهەنگ شازلی بن جەدیر بوو بە سەرۆك کۆماری ئەم وڵاتە.

بە درێژایی دە ساڵ حکومەتی بن جەدیر بەسەر دەوڵەتدا، پارت و سوپاییەکان زۆر سەرقاڵ بوون (سەرقاڵی سەرکوتکردنەوە بوون) و بەرهەڵستکاران هەڕەشەیان لە دەسەڵاتی دەوڵەت دەکرد و مەشروعییەتی شازلی زۆرکەم بوو و رێژە و چۆنیەتی خۆپیشاندانەکان بەربەرە لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا گۆڕدرا و لە ساڵی ١٩٨٨دا کونترۆڵکردنی ئەم خۆپیشاندانانە زۆر سەخت بوو و ستراتیژی سەرکوتکردن کاریگەری نەمابوو. بۆ نموونە لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٨٨دا ناڕەزایەتی بەوپەڕی گەیشت و نزیك ٥٠٠ کەس لە ئەنجامی ئەم شۆڕشانە و سەرکوتکردنیان لەلایەن سوپاییەکانەوە کوژران و قەیرانی کەڵەکە بوون و حکومەتداری وڵاتی خستە لێواری تەقینەوەدا و دواتر وردە وردە ناڕەزایەتی دەربڕینەکان بەرجەستە بوونەوە. گەنجە بێکارەکان (کە هەندێ کات خوێندکارانیش لەگەڵیاندا هاوڕێ دەبوون) زۆرجار بۆ ناڕەزایی دەربڕین دەرژانە سەرشەقامەکان، تا لەم رێگەیەوە ناتوانایی حکومەت و نەبوونی مەشروعییەت نیشان بدەن. گەل هەوڵی رزگاربوون لەم بارودۆخەی دەدا و شکست هێنانی ئابوورییانەی ئەلجەزایر، ئەم بەشەی دانیشتوانی شاری، ناڕەزای کردبوو. ئەوان هەوڵیان دەدا تا ئەم ناڕەزایەتیە بەرەو رکابەرێتی دیموکراسی فرەپارتی ئاراستە بکەن. پێشەنگی ئەم گرووپە رێکخراوانە، گرووپە ئیسلامییەکان بوون (ئەو گرووپانەی کە هەوڵیان دەدا دامەزراوەکانی دەوڵەتی ئەلجزایر رەچاوی سوننەتی ئیسلامی بکەن). گرووپە ئیسلامییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی هەندێ پێشنیاریان خستەڕوو کە بەرەی رزگارکەری نەتەوەیی توانای جێبەجێ کردنیان نەبوو. عزەدین لایاچی لەو

بروایەدایە کە: ((لەو کاتەوە کە نارەزاییەتی سیاسی، شۆڕشەکان و نالێهاتوویی بوونە هۆی ئازاردانی خەلك، تۆڕە ئیسلامییەکان دەستیان بە گەشەکردن کرد و تەنانەت بوون بە جێگرەوەی چالاکییەکانی دەوڵەت و هەندێ جاریش وەپێش دەوڵەت کەوتنەوە. بۆنموونە لە ساڵی ١٩٨٩دا کاتێك کە لە رۆژئاوای ئەلجەزایر لە (تی پازا)دا بۆمەلەرزە روویدا، گرووپە ئیسلامییەکان، بازاڕی ئیسلامییان دامەزراند (جێگەیەك کە رێڕەوی دابەشکردن یاساییانە و نرخەکان ئەرزانتر لە نرخی دەوڵەت بوون). هەروەها ئەوانە دادگای گشتی و بازگەی سەربازییان لە سنوورەکاندا دامەزراند و تەنانەت لە هەندێ شوێن کە پۆلیسی نەبوو، یاساکانی هاتووچۆیان جێبەجێ دەکرد)). هەرکە یەکێتییە بازرگانییەکانی لایەنگری دیموکراسی لە زامبیا رێك خران، یاخود کەنیسەکانی مەسیحی هەر ئەم کارەیان لە مالاوی ئەنجامدا، نەیارانی دەوڵەت لە جەزایریش پەرەیان بە تۆڕە ئیسلامییەکاندا.

بەڵام بۆچی خۆپیشاندانی سەر شەقامەکان لە ساڵی ١٩٨٨دا بەو خێراییەوە تەشەنەی کرد و بۆچی گرووپە رێك نەخراوەکان و پێکهاتوو لە گەنجان بۆ بەرەنگار بوونەوەی دەوڵەت لە ئاستێکی بەرفراواندا گەشەیان کرد؟ دەکرێ دووبارە وەڵامی ئەم پرسیارانە لە قەیرانی کەڵەکە بوون و حکومەتداری بدرێتەوە.

لە رووی ئابوورییەوە دەوڵەتی تاك پارتی بومەدین تا رادەیەك سەرکەوتوو بوو. پلانی دەوڵەت بۆ بەپیشەسازیی بوون لە رێگەی داهاتەکانی نەوت و گازەوە بەهێزکران و ئەلجەزایر لە ساڵانی ١٩٦٧ گەشەی ئابووری ٨/٦ بە خۆوە بینی. بەرز بوونەوەی ئاستی بەرهەمهێنان، بوو بە هۆی رەخساندنی هەلی کار لە سەرتاسەری وڵاتدا و دواتریش خزمەتگوزاری خۆشگوزەرانی وەك تەندروستی و پەروەردە دابین کران. بۆ نموونە ئەلجەزایر لە پلانەکانی تەرخانکردنی بودجە بۆ پەروەردەی خۆڕایی، چاودێری تەندروستی خۆڕایی، سوبسید بۆ کالا خۆراکییەکان (پارە تەرخانکرا). پلانی گەشەکردنی بومەدین ئەگەرچی بۆ درێژ ماوە دارێژرابوو، بەڵام بوو بە هۆی هێنانەدی بۆرۆکراسی هالئاوسراو، دابەزینی (ئاستی) کشتوکاڵی، کەمی کالا خۆراکییەکان و

هەڵاوسانێکی لەرادەبەدەر. لەمەش بودجەی دەوڵەت پشت بەستراو بە داهاتەکانی نەوت و گاز بوو (فرۆشتنی بەرهەمەکانی هایدروکاربون ٩٧٪ داهاتی دەرەکی ئەم وڵاتەی بۆ خۆی تەرخانکرد بوو). راستییەکە ئەوەیە کە سەرۆك کۆماری هەوڵیدەدا تا ئابوور لە هەشتاکاندا بە هۆی پلانەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی بەتایبەتی (خصوصی) بکات، بەڵام هیچ کاتێك ئەم وڵاتە راسپاردەکانی بانکی جیهانی و سندووقی نێودەوڵەتی دراوی پەسەند نەکرد. شازلی



هەوڵیدا، تێچوونەکان و رێژەی خزمەتگوزارییەکانی کەرتی گشتی کەم بکاتەوە و لە هەمان کاتیشدا نرخەکەیان بەرز بکاتەوە. هەروەها ئەو لە خزمەتگوزاری خۆشگوزەرانی، سوبسید و نرخی کالای بەرهەم هێنراوی جووتیارانی کەم کردەوە.

تێچوونە کۆمەڵایەتییەکانی هەموارکردنی ستراکتۆریی لە رادەبەدەر زۆر بوو و بێکاری پەرەی سەند. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە وڵات خاوەنی هێزی گەنج بوو کە زۆربەیان بێکار بوون. قەرزە دەرەکییەکان ئەلجەزایری بە ئاستێکی مەترسیدار گەیاندبوو. بارودۆخی ئابووری بە هۆی دابەزینی نرخی نەوت لە ساڵی ١٩٨٦دا خراپتر بووە. رێك نەکەوتنی ئەندامانی ئۆپێك لە سەر پشتکی (بەرهەمهێنانی) ئەندامان (لە نەوت)، نرخی یەك بەرمیل نەوتی لە ٣٢ دۆلار بۆ ٨ دۆلار دابەزاند و گرنگترین سەرچاوەی داهاتی ئەلجەزایر رووبەڕووی مەترسی بوویەوە و ئەم رەوتەش بارودۆخی ئابووری بەرەو خراپتر بوون برد و ئەنجامیشی ئەوە بوو کە دەوڵەت نەیتوانی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ خۆشگوزەرانی و گەشەکردن بۆ خەڵك دابین بکات.

دژوارییە بارودۆخی ئابووری هەڵقوڵاو لە قەیرانی کەڵەکە بوون و حکومەتداری زەقتر بووە و توری بەرفراوانی لایەنگران بە هۆی کەمبوونی سەرچاوەکان، کەم بوونەوە. گەلی ئەلجەزایر بەراوردی نێوان بارودۆخی نوخبەکانی دەوڵەتی دەکردەوە لە روانگەی گەلەوە نەتەنیا بەرێوەبەران نالێهاتوو بوون بەڵکو ئەوان ناتوانا لە بەرێوەبردنی ئابوور، گەندەڵ، نالێهاتوو بۆ بەرێوەبردنی پۆستە گشتییەکانی دەوڵەت بوون. هەندێ لە ئەلجەزایرییەکان هەنوکە گەنجتر لەوەن کە شەڕە گەورەکانی لەپێناو سەربەخۆیی کە سەرکردەکانی بەرەی رزگاریکردن و ئازادیبخەش، شەڕیان بۆ دەکرد وەبیریان بێتەوە. لە ئەنجامدا مەشروعییەتی دەوڵەت کەم بووە و لە ژێر ئەم هەلومەرجەدا گەلی ئەلجەزایر ئامادە بوون بچنە سەر شەقامەکان و داوای حکومەت بکەن.

شۆڕشی شارەکان و رووداوەکانی ئۆکتوبەری ١٩٨٨ شازلی، رازی کرد کە سەرلەنوێ مەشروعییەتی دەوڵەت زیندوو بکاتەوە. ماریتن ستوان ئاماژە دەکات کە ((بۆ یەکەم جار دەوڵەت نەتەنیا لە سەرکوتکردنی بەرهەڵستکاران شکستی هێنا، بەڵکو بەرهەڵستکاران بوون بە جێگری دەوڵەت)). گرووپە بەرهەڵستکارەکان — خوێندکارە یەکێتییە بازرگانییەکان، گرووپە ئیسلامی و کۆمۆنیستییەکان — بوونە هۆی جوڵاندنی نارازییەکان و داواکاری بۆ چاکسازی سیاسی بەردەوام سەریهەڵدا و دام و دەزگای دەوڵەت کە لەلایەن هەندێ نوخبە و سوپاییەکانەوە بە ناوی گەل بە خراپی بەکار دەهێنران، متمانەیان لە دەستدا و نارەزایی

دەربڕینەکان بوونە هۆی ئەوەی کە دوای ٩ مانگ دامەزراوە کاتییەکان پێك بهێنرێن و کۆتایی بە دەسەڵاتی دامەزراوەکانی دەوڵەتی هێنا کە لە ماوەی دوو دەیەدا دامەزرا بوون.

لە یەکەمین هەنگاودا شازلی گۆڕانکاری لە یاسای بنەڕەتیدا کرد. کە تیایدا مۆڵەت بە پاڵێوراوی سەربەخۆ دەدا (بێ ئەندام بوون لە پارتێکدا)، خۆی لەهەمبەر ئەندامانی بەرەی (رزگاریکەر) لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا بپاڵێورێت. وەك زۆرێك لە وڵاتانی ئەفریقیا. گوشارەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بوو بە هۆی ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٨٩دا شازلی رکابەرێتی فرە پارتی بە فەرمی راگەێنێت و سوپاش بە فەرمی رایگەیاند کە لە گۆرەپانی سیاسەتدا دەچێتە دەرەوە و روخسەت دەدات کە بەرەی رزگارکردن و ئازادی بەخش وەك پارتێکی سڤیل بەرێوە ببردرێت. حکومەتی تاك پارتی بە کۆتا هات و سەردەمی پۆلۆرالیزمی سیاسی دەستی پێکرد.

پرۆسەی دیموکراسی لە ئەلجەزایردا بە دوو قۆناغ دەرباز بوو، سەرەتا دەبوایا هەڵبژاردنی خۆجێیی لە جوەنی ١٩٩٠دا ئەنجام بدرێت و لە قۆناغی دووەمیشدا هەڵبژاردنی نەتەوەیی پەرلەمان ئەنجام بدرێت، هەڵبژاردنی نەتەوەییش دەبوایا لە دوو قۆناغدا ئەنجام درابا لە دیسەمبری ١٩٩١ و خانوڤێەکی ١٩٩٢. نزیکەی ٦٠ پارت کە لەلایەن کاربەدەستانی دەوڵەتەوە دامەزرا بوون لەنێوان ساڵانی ١٩٨٩ و ١٩٩١ پێکهێنران کە زۆربەیان خاوەنی رێکخستنێکی بچووك بوون و لە یەك سەرۆك و چەند لایەنگرێك پێکدەهات، گرنگ ئەوە بوو کە ئەم پرسە دەبووە هۆی بەرفراوان بوونی بەشداریی نیشتمانی. گرنگترین پارتە بەشدار بووەکانی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩١ بریتی بوون لە:

١. بەرەی رزگاری ئازادی بەخش کە هەولێ دەدا دەسەڵات لە رێگەی رکابەرێتی لە ژینگەیەکی نوێی پۆلۆرالیستیدا، بپارێزێت.

٢. بەرەی هێزە سۆسیالیستییەکان (FFS) کە پارتێکی سۆسیال دیموکرات بوو.

٣. بەرەی رزگارکردنی ئیسلامی (FIS) کە بەپێی چوارچێوەی ئیسلامییانە لایەنگرەکانی مۆبیلیزە دەکرد.

هەڵبژاردنە خۆجێییەکانی جوەنی ١٩٩٠ بێ ئیعتبار بوون و نارزامەندی لە نوخبەی دەسەڵاتداری سەلماند، چونکە زۆربەی ئەو کەسانەی کە سەرکەوتنیان بەدەست هێنابوو لە بالێ بەرهەڵستکارەکانی نوێ بوون (بەرەی رزگارکری ئازادی بەخش ٣٢٪ دەنگەکانی بەدەست هێنا). لە قۆناغی دووەمدا پارتی دەسەڵاتدار لە بەرەی رزگارکردنی ئیسلامی (٥٥٪



دەنگەکان) شکستی هێنا و بەرەی هێزە سۆسیالیستییەکانیش چونکە هەلی نایەکسان بە لایانەکانیتر درابوو هەڵبژاردنەکانی بایکوت کرد.

لەم روانگەیەوە بەرەی رزگارکردنی ئیسلامی، کاتێك کە پارتی دەسەڵاتدار هەولێ دا لە رێگەی گۆڕینی یاساکانی هەڵبژاردن بارودۆخێکی ئایدیال (مطلوب) بۆ پارتەکەی برەخسێنێ، (بەرەی ئیسلامی) وەك دەوڵەتێکی ئامادە بۆ خزمەتکردن هەڵسوکەوتی کرد. ئەم بەرەیە خۆپێشاندانێکی بەرفراوان لە دژی حکومەت و راگەیاندنی مانگرتنی گشتی رێك خست. دەوڵەت بەراگەیاندنی بارودۆخی نائاسایی و دەستگیر کردنی ژمارەیەك لە ئەندامانی بەرەی رزگارکردنی ئیسلامی بەرپەرچی ئەم بارودۆخەی دایەوە و ئەم قەیران و بارودرخەش بوو بە هۆی هەڵبژاردنی گشتی (نەتەوەیی) لە دیسەمبری ١٩٩١دا و بەبڕوای رێگری کرد لە جێگرتنەوەی سیاسەتی پۆلۆرالیزمی لەم وڵاتەدا. کاتێك کە یەکەمین قۆناغی هەڵبژاردنی گشتی دەستی پێکرد بەرەی رزگارکردنی ئیسلامی هەر وەك ساڵی ١٩٩٠، سەرکەوتووی ئەم گۆڕەپانە بوو و ئەم پارتە ٤٧٪ و پارتی هێزە سۆسیالیستەکان ٧٪ی دەنگەکانی بەدەستهێنا و بەرەی رزگارکردنی ئیسلامی لە لێواری یەکەمین سەرکەوتن و بوون بە سیستەمێکی حکومەتی ئیسلامی لە هەڵبژاردنەکی دیموکراتیکانەدا نزیك بووە. دوای ئەمە سوپا دەستی (لە کاروبارەکاندا) وەردا و لە یەکەمین کردەوەدا، هەڵبژاردنەکانی رەتیکردەوە و گوشاری خستە سەر شازلی تا پەرلەمان هەڵوەشێنێتەوە و دواتر خۆدی (شازلی)یان ناچار بەدەست لە کار کێشانەوە کرد. ترس لە ئیسلامگەراکان، ئەو شتەی کە مومکین بوو لە سەردەمی حکومەتی بەرەی رزگارکردنی ئیسلامی روو بدات و بووە هۆی ڤیتۆ کردن رەوتی دیموکراتیك لە ئەلجەزایر لەلایەن سوپاوە و لەبری ئەمەشدا سوپا، ئەنجوومەنی کاتی حکومەت بە ناوی کومیتەی باڵای دەوڵەت پێکهێنا کە جێی دامەزراوە فەرمییە لە ناو چووەکانی گرتەوە و سوپا لەم رێگەیەوە فەرمانڕەوایی ئەلجەزایری کرد.

لە روانگەیەکەوە، کودەتای سەربازی دەتوانی کاریگەری کەمتری لەوەی کە لە هەڵبژاردنەکاندا روویدا، بەسەر رووداوەکانی هەبێت. دوای ئەمە سوپا بوو بە هێزی باڵا دەستی لە گۆڕەپانی سیاسی ئەلجەزایردا. بۆمدین لە ساڵی ١٩٦٥دا راستەوخۆ بە دەسەڵات گەیشت و بە تێکەڵییەك لە حکومەتی سەربازیی / جەماوەری بۆ ماوەی ١٣ ساڵ فەرمانڕەوایی ئەم وڵاتەی کرد. هەروەها سوپا سەرلەنوێ، لە ناو خۆیدا لە ساڵی ١٩٧٨دا بومدینی هەڵبژاردەوە و بڕیاری سوپا بۆ دەستتێوەردان لە دەسەڵات هەڵوەشاندنەوەی خولی دووەمی هەڵبژاردن لە

ژانویەی ١٩٩٢دا یەکێك لە گرنگترین هەلەکان بوو کە سوپاییەکان لە ڕێگەیەوە چوونە ناو پرۆسەی سیاسیدا.

یەکێك لە گرنگترین چالاکییەکانی کۆمیتەی باڵای دەوڵەت، ڕاگەیاندنی باری نائاسایی لە وڵاتدا بوو. لەم بارودۆخەدا چالاکی بەرەی ڕزگارکردنی ئیسلامی قەدەغەکرا و نووسینگەکانی داخران و هەندێ لە سەرکردە و لایەنگرانی دەستگیرکران و ئەنجوومەنی خۆجێیی کە لە هەڵبژاردنە خۆجێییەکانی جوەنی ١٩٩٠دا، بەرەی ڕزگاری کردنی ئیسلامی سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو هەڵوەشێنرایەوە و دامەزراوە دەوڵەتییەکان لەبریدا دامەزران. ڕاپۆرتەکان نیشانیاندا کە هێرش و ئەشکەنجەدانی لایەنگرانی هێزە ئیسلامییەکان (لەلایەن) هێزەکانی ئاسایشەوە پەرەی سەند.

هەندێ لەلایەنگرانی بەرەی ڕزگارکردنی ئیسلامی خەباتی چەکدارییان هەڵبژارد و سوپای ئازادی بەخشی ئیسلامی بە سەرکردایەتی بەرەی ڕزگارکردنی ئیسلامی هێرشیان کردە سەر بینا و کادیرە دەوڵەتییەکان و پێ لەسەر ئەم پرسە دادەگرن کە تا ئەو کاتەی کە بەرەی ڕزگارکردنی ئیسلامی، پرۆسەی سیاسی لە ئەستۆ نەگرێت ئەم پرۆسەیە (خەباتی چەکداری) بەردەوامی دەبێت. گرووپە چەکدارە ئیسلامییەکان، ڕادیکال بوون و لە ئامانجەکانیاندا ڕەچاوی پرسە تایبەتییەکانی دەکرد و ئامانجیان ڕووخاندنی دەوڵەتی سیکۆلار و جێگیرکردنی حکومەتێکی ئیسلامی بوو. لەنێوان گرووپە چەکدارە ئیسلامییەکاندا ژمارەیەك ئەفغانی کە پێشتر بە خۆبەخشانە هاوکاری موجاهدین لە ئەفغانستانیان دەکرد، بوونیان هەبوو. کوشتن، چاندنی مین لە ئۆتۆمبیل، کۆمەڵکوژی، هێرشی نهێنی و لەناکاو و شەڕی چەکداری لە ڕووداوە ڕۆژانەییەکانی ئەلجەزایر بوون، نزیکەی ١٠٠،٠٠٠ کەس لە دووەمین شەڕی ناوخۆیی تا جولانی ١٩٩٧ بوونە قوربانی و ئەم توندوتیژییەش تا سەرەتای هەزارەی (سێیەم) درێژەی کێشا.

لە ڕوانگەی سیاسییەوە، سوپا بۆی دەرکەوت کە کاتی ئەوە هاتووە لە هەر ڕێگەیەك بێت لە چەند ساتی داهاتوودا دووبارە مەشروعییەتی دەوڵەت بەدەست بهێننەوە. کۆمیتەی باڵای دەوڵەت هەوڵی دا تا لەگەڵ سیاسەتمەدارە سیکۆلارەکان و هێزە میانڕەوە ئیسلامییەکان پەیوەندی زۆرتر دروست بکەن و بەرەبەرە ژمارەیەك پارتە بچووکەکان لە کۆنفرانسێکدا حکومەتی گوازراوەیان پەسەندکرد و بەرەی ڕزگاریکردنی ئازادی بەخش. هەوڵی دەدا بەبێ بەشداری و هاوکاریکردنی بەرەی ڕزگاریکردنی ئیسلامی و پارتی سۆسیال دیموکرات دانوسان لەگەڵ پارتەکانیتردا بکات. بۆ نموونە سەرکردایەتی پارتی سۆسیال دیموکرات ئەم کۆنفرانسەی



بە نادیموکراتیك وەسف کرد و بۆ دەوڵەتی بە پێویستی نەدەزانی. ((ڕژێم هەوڵ دەدات تا لەڕێگەی ئەم کۆنفڕانسەوە ئیمتیاز و باڵادەستی خۆی لە دەسەڵاتدا بپارێزێت)). ئەم پرسە کۆمیتەی باڵای دەوڵەتی ناچارکردن تا یەك لایەنە سەرۆك کۆمار هەڵبژێرێت و ئەمین زرواڵ بۆ ماوەی ٣ ساڵ بە سەرۆکی دەوڵەتی گواستنەوە (گوازراوە) گوماردرا.

سەرۆك کۆمار زرواڵ بۆ ستراتیژی بەدەست هێنانەوەی دووبارەی مەشروعییەت، هەڵبژێردرا و پلانەکەی سێ قۆناغی لەخۆ گرتبوو: ١. ئەنجامدانی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری و پتەوکردنی پۆست و پێگەی. ٢. ئەنجامدانی ریفراندوم بۆ پەسندکردنی یاسای بنەڕەتی (کە تیایدا بە رکابەرێتی فرە پارتی بەپێی پێوەرگەلی نا ئایینی. مۆڵەتی چالاکی گێڕان دەدرا). ٣. ئەنجامدانی هەڵبژاردنی فرە پارتی پەرلەمان. زرواڵ یەکەم قۆناغ لەم سێ قۆناغەی لە نوڤەمبری ١٩٩٥ جێبەجێکرد و توانی لە هەمبەر پارتی بەرهەڵستکاری ئیسلامی میانڕەو بە سەرۆکایەتی ماهفود ناهناح ٦١٪ بەدەست بهێنێت و پێگەی وەك سەرۆك حکومەت قایمتر بکات، (سەرەڕای بایکوت کردنی (هەڵبژاردنەکان لەلایەن) بەرەی ڕزگارکردنی ئیسلامییەوە، بەرەی ڕزگارکردنی ئازادی بەخش، پارتی سۆسیاڵ دیموکرات و سەرپێچی کردنی فراوان لە هەڵبژاردنەکاندا). دوای ئەمەش، یاسای بنەڕەتی داڕێژرا و خرایە ریفراندۆمەوە. دواتر لە جوەنی ١٩٩٧ پارتی ڕزگارکردنی ئازادی بەخش و پارتی سۆسیاڵ دیموکرات ڕێککەوتن کە بەشداری لە هەڵبژاردنەکانی فرە پارتیدا بکەن.

ئەم هەڵبژاردنە (یاسا داڕێژی پەرلەمان) گەورەترین سەرکەوتنی زرواڵ و لایەنگرانی بوو ئەوان لە هەڵبژاردنەکاندا، یەکێتییەکی نوێ بە ناوی (یەکێتی نەتەوەیی)یان پێکهێنا و ئەم یەکێتیە ٣٣٪ی دەنگەکان لە هەمبەر ١٤٪ دەنگ بۆ بەرەی ڕزگارکردنی ئازادی بەخش، ٥٪ پارتی سۆسیال دیموکراتی بەدەستهێنا و زۆرترین دەنگ بۆ بزاڤە ئیسلامییەکان ١٤٪ بوو کە بزاڤی سۆسیالیستی بەدەستیهێنا بوو و ئەمەش بە پێچەوانەی دەنگەکانی بزاڤی ڕزگارکردنی ئیسلامی بوو کە لە ساڵی ١٩٩١دا، ٦٥٪ی دەنگەکانی بەدەستهێنابوو. گردبوونەوەی دیموکراتیکی نەتەوەیی بوو بە پارتی لایەنگری زرواڵ و لە سەرچاوە بێ ژمارەکانی دەوڵەت وەك میدیاکان سوودمەند کرا. ئەم هەڵبژاردنە تاڕادەیەك بە ئازادانە ئەنجامدرا (ئەگەرچی بەرەی ڕزگارکردنی ئیسلامی ئەم هەڵبژاردنانەی بایکوت (تحریم) کردبوو) و وەها دەهاتە بەرچاو کە زرواڵ و لایەنگرانی لە سوپادا توانیبوویان هەلومەرجی نیمچە دیموکراسییانە کە خوازیاری

بەدیهێنانی بوون، وەدی بێنن و ئەم دیموکراسییەش تاڕادەیەك بۆ مەشروعییەتی دەوڵەت بەس بوو بەڵام نە بەو رادەیە بوو کە بتوانی پرۆسە سیاسییەکان کونترۆڵ بکات.

سەرەڕای مەیلی دەوڵەت بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی فرە پارتی (جیا لە بەرەی رزگارکردنی ئیسلامی) نابێ هەوڵ دان بۆ دووبارە زیندووکردنەوەی پۆلۆرالیزم لە کۆتای نەوەدەکاندا بە هاوبەندی لیبراڵ دیموکراسی لێك بدرێتەوە، بەڵکو بە پراکتیکی سوپا مافی ڤیتۆی دژی پرۆسەی سیاسی بەکارهێنا. بۆ نمونە لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری ساڵی ١٩٩٩ دا، گشت هێماکانی دەستتێوەردانی سوپا لە هەڵبژاردنەکاندا بەرچاو بوو، عەبدولعەزیز بوتەفلیقە لەم هەڵبژاردنانەدا کە رکابەرێنی شەش پالێوراو بەرهەڵستکاری دەکرد و هەڵبژاردنیان بایکۆت کرد، سەرکەوتنی بەدەستهێنا. ئەوان بە کۆمەڵی یەك رۆژ پێش هەڵبژاردنەکان بۆ نارەزایی دەربرین دژی سەرپێچی کردن لە هەڵبژاردندا (لەلایەن بوتەفلیقەوە) لە رکابەرێتی پاشەکشەیان کرد، چونکە لەو بڕوایەدا بوون کە سوپا دەست لە هەڵبژاردنەکاندا وەردەدات. هەندێکیتر لە پالێوراوەکان بۆ نارەزایی دەربرین دژی دەسەڵاتخوازی لە هەڵبژاردندا پاشەکشەیان کردبوو. هاوڵاتییەکی ئەلجەزایری لەو بڕوایەدا بوو کە ((گشت سیاسەتمەداران بەشێکن لە سیستەمی گەندەڵی (ئەلجەزایر) وێنا بکەن کە ئەگەربێتو یەکێك لەوان لە رێگەی سوپاوە هەڵبژێردرێت ئایا سەبارەت بە ساختەکاری (لە هەڵبژاردنەکاندا) نارەزایی دەردەبڕێ؟ بە هیچ شێوەیەك)). دیموکراسی فرە پارتی تا ئەو کاتەی کە گەلی ئەلجەزایر نەتوانن بە بێ دەستتێوەردانی سوپا و بە ئازادانە پالێوراوەکانیان لە لیستە سنووردار نەکراوەی پالێوراوە سیاسییەکاندا هەڵبژێرن، ناتوانرێت (دیموکراسی) لەم وڵاتەدا گشتگیر و بەدامەزراوەیی (سەقامگیر) بکرێت.

**ئەلجەزایر:**

| | |
|---|---|
| رووبەر | ٧٤١،٣٨١،٢ کیلۆمەتری چوارگوشە |
| دانیشتوان | ١،٣١ ملیۆن کەس |
| ساڵی سەربەخۆیی | ١٩٦٢ |
| گرنگترین شارەکان | ئەلجەزیرە (پایتەخت) ئوران، کنستانتین، بانت |
| نەژاد | عەرەب، بەربەر، ئەورووپی |
| زمان | عەرەبی، زاراوە بەربەرییەکان، فەرەنسی فەرەنسا |



| | |
|---|---|
| دانیشتوانی شار | ٣،٥٩٪ |
| ناوەندی ژیان | ٥،٦٩ ساڵ |
| رێژەی خوێندەواری | ٢،٦٠٪ |
| رێژەی مردن | ١،٤٠ مردن لە هەر ١٠٠٠ لەدایکبوو |
| هەناردەکان | نەوت، گاز |
| ئایین | ئیسلام |
| دراو | دیناری ئەلجەزایر |
| ساڵانەی بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی | ١٧٩٠ دۆلار |

## زاراوە سەرەکییەکان:

**بە دامەزراوەیی بوونی (سەقامگیری) دیموکراسی:** باوەڕهێنان بەوەی کە دیموکراسی دوای یەکەمین خولی هەڵبژاردنەکانی فرە پارتی (لەلایەن گشت هێزەکانەوە) پەسەند کراوە و وڵات خاوەن کولتووری سیاسی ئایدیال و کۆمەڵگای مەدەنی بەهێز و ئابووری گەشەسەندو بێت.

دیموکراسی: شێوەیەکی حوکم کردن کە پشتبەستراو بە سەروەری گەلە.

**پێوەرەکانی هەڵگەڕانەوەی دوو لایەنە:** روانگەیەك کە تیایدا تا سەردەمی هەڵبژاردنەکان پرۆسەی دیموکراتیك بوونی نەبووە و دوای هەڵبژاردن رژێمە دوو لایەنەکان بە دادپەروەرانە و ئاشتیخوازانە لە پلە و پۆستەکاندا دوور دەخرێتەوە. (هانگتینگتون) .

**دەنگی سوپاییەکان:** قۆناغێك کە سوپا بۆ رێگەگرتن لە پرۆسەی سیاسی کودەتا ئەنجام دەدات.

**کولتووری سیاسی:** ئایدیا سیاسییەکان، رێبازەکان، و بۆچوونە هاوبەشەکان کە کارتیکەری لە کۆمەڵگا بکات.

**بووژانەوەی دووبارەی کۆمەڵگا مەدەنییەکان:** مەرجەعێك بۆ زیندووکردنەوەی ژیانی دەستەجەمعی لە ئەفریقیا لە دەیەی هەشتەم و نۆیەمدا کە لە رێگەوە رێکخراوگەلێك کە هاوکاریکردنی دەوڵەتیان پچڕاند بوو، سەرلەنوێ دەست بە چالاکییەکانیان دەکەنەوە و چالاکی ئابووری بەرەو پانتای دەرەوە لە کونترۆڵی دەوڵەت ئاراستە دەکرێت.

**سەرلەنوێ بەدەستهێنانەوەی مەشرۆعییەت:** هەوڵدانی دەوڵەت بۆ دامەزراندنی پەیوەندی نوێ لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنیدا لە بارودۆخی قەیرانی کەڵەکە بوون و حکومەتداری.

**پارتە بێ سوودەکان:** پارتێکی سیاسی کە زۆرتر وەك ئامرازێك بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی سەرکردەکەی کار دەکات لەبری ئەوەی کە بە ڕاستەقینە هەوڵ بۆ دابین کردنی داواکارییەکانی کۆمەڵگا بدات. (جی وایزمەن).

## پرسیارەکان:

١. بۆچی لە دەیەی نۆیەمدا، شایەتی ڕێژەیەکی زۆری ڕکابەریتی هەڵبژاردن لە ئەفریقیادا بووین؟

٢. ئایا دەکرێ دیموکراسی فرە پارتی لە ئەفریقیادا بە دامەزراوەیی بکرێت؟

٣. ئایا کولتووری سیاسی ئەفریقیا لەگەڵ دیموکراسیدا هاوگونجانی هەیە؟

٤. تا چ ئاستێك دیموکراسی فرە پارتی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی گۆڕی؟

٥. ئایا پرۆسەی دیموکراتیزەکردن لە نەوەدەکاندا بووە هۆی هێنانەدی مەشروعییەتی دەوڵەت لە ئەفریقیادا؟

## بۆ خوێندنی زۆرتر:

ئەوانەی کە هۆگری بەدەستهێنانی زانیاری لە سەر دیموکراسی فرە پارتی لە ئەفریقیا لە دەیەی نۆیەمدان با پەرتووکی جان وایزمەن (١٩٩٦) بخوێننەوە. میخاییل براتوان و نیکۆلاس ڤەن دێوال خاوەن پەرتووکێکی سوودمەند لەم بارەیەدان. پاتریك مولیستی و جان هۆلم پەرتووکێکی سوودمەندیان سەبارەت بە بۆتسوانا کە لە ساڵی ١٩٦٦دا سیستەمی دیموکراسی پەیڕەو دەکرد نووسیویانە.

هەروەك لەم پەرتووکەدا ئاماژە پێکرا پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لەلایەن زانایانی زانستە ڕامیارییەکاندا لایەنگری زۆری هەیە و دەکرێ بابەتگەلی زۆر لەم بارەیەوە بدۆزرێتەوە، ئەمە ڕێبازێکە کە یارمەتیمان دەدات ڕووداوە سەرەکییەکانی سیاسی لە ژینگەی سیاسی و مێژووییەکەی و پێگە سەرەکییەکەیدا، خوێندنەوەی بۆ بکەین. ڕووداوە سیاسییەکان بە لێك جیایی ماناگەلی فراوان لەخۆدەگرن و ڕوونکردنەوەی ئەنجامە سیاسییەکان ئاسان دەکات. هەڵبەت بۆ ئەفریقیاناسەکان ئەم تەکنیکە بایەخدارە چونکە چەمکێکی لە پێشتر دیارکراوی (زۆر گرنگ) بەسەر کۆمەڵێك ڕووداوگەلی ناوازەدا دەسەپێنێت کە لە گشت



بابەتە سیاسییەکانی ئەم کیشوەرەدا بوونی هەیە، ئەفریقیا لە گشت قۆناغەکانی دوای کۆلۆنیال ڕووبەڕووی دژواری پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بوونەوە. بەڵگەنەویستە کە هەردووکیان پێویستیان بە یەکتر هەیە. بەڵام پابەندییان بۆ یەکتر زۆر کەم بوو و ئەمەش سەبارەت بە دەوڵەتگەلێکەوە ڕاستە کە هەولی کونترۆڵ کردنی کۆمەڵگای مەدەنییان داوە، بەڵام هێزی پێویستیان بۆ بەدیهێنانی ئاواتەکانیان نەبووە و هەڵومەرجگەلێك لە ئارادا نەبووە کە بتوانن خۆیان لە ڕژێمە تالانچییەکان ڕزگار بکەن. بەمجۆرەش هاوسەنگی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە هەڵبەز و دابەزیندا بووە و ئەمەش نیشاندەری ئەوەیە کە ژمارەیەك لە ئەفریقییەکان سوودیان لەم بن بەستە سیاسییە وەرگرتووە. ئەم کیشوەرە تەواو لەگەڵ سیستەمی ئەورووپا و ئەمریکا جیاوازی هەیە و دامەزراوە سیاسییەکانی کە لە دوای کۆلۆنیال بنیاتنراون، بە تەواوی لە گەشەی ئابووری، خۆشگوزەرانی و ئازادییە سیاسییەکاندا، شکستیان هێناوە. تا ڕادەیەك ئەفریقییەکان بەراوردی نێوان دۆخی تەندروستی و خۆشگوزەرانی خۆیان و ڕۆژئاوا دەکەن. بە هەڵکەوت نییە کە وڵاتە خۆشگوزەرانەکان خاوەنی پەیوەندی پۆزەتیڤی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنین. لە سەرەتای سەردەمی دوای کۆلۆنیال، کۆمەڵگا مەدەنییەکانی ئەفریقیا لە بارودۆخێکی باشدا بوون. هەڵبەت بە بەراورد لەگەڵ دەوڵەت، پێگەی کۆمەڵگای مەدەنی مەترسییەکی زۆرتری لە سەر بوو. بۆ نموونە پەیوەندییە نەژادییەکان لە بەهێزترین جومگە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم کیشوەرە بوو. ئەم پرسە لە سەردەمی کۆلۆنیالدا زۆرتر بوو و، بوو بە کەناڵێکی بەهێزی مۆبیلیزەکردنی سیاسی لە ساڵاکانی دوای کۆلۆنیالدا. بە کورتی ئەوە کۆمەڵگای مەدەنی بوو کە دەوڵەتی کۆلۆنیالی لە بەین برد. چالاکیگەلی هەماهەنگ لەگەڵ گرووپگەلی نەتەوەیی — نەژادی، یەکێتییە بازرگانییەکان، کۆمەڵگاگەلی پسپۆرەکان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان، لەگەڵ یەکتردا هاوکارییان کرد تا بزاڤە کۆمەڵایەتییە بەهێزەکان پێك بهێنرێن. دژە کۆلۆنیالی چالاکییەکی کۆمەڵی بوو لەنێوان ئەفریقییەکاندا و لەپێناو ڕووخاندنی کۆلۆنیالی ئەورووپادا بنیاتنرابوو کە نزیکەی ٧٠ ساڵ فەرمانڕەوایی ئەم کیشوەرەی دەکرد.

لە سەردەمی کۆلۆنیالدا، وڵاتانی ئەفریقیا زۆر لاواز بوون. ئاشکرایە کە میراتی کۆلۆنیال ئەم وڵاتانەی بە سنووری دەستکرد — سنوورگەلێك بە هێلی ڕاست — دامەزراندبوو کە زۆرتر ڕەنگدەرەوەی بەرژەوەندی ئەورووپییەکان بوو لەبری بەرژەوەندی ئەفریقییەکان. ئەم سنوورانە کۆمەڵگا سوننەتییەکانی لەنێوان نەتەوە جۆراوجۆرەکاندا دابەش دەکرد، لە کاتێکدا کە

نەتەوەكانیتر سەرقاڵی كێشە ناوخۆییەكان بوون. بە بڕوای هیچ جۆرە چالاكییەك پێش قۆناغی حكومەتی ئیمپریالیستی بۆ دروستكردنی چەمكێكی هاوبەش لەنێوان خەڵكدا ئەنجام نەدرابوو. بەمجۆرەش دوای سەربەخۆیی كاتی ئەوە هاتبوو كە دەوڵەتی نوێ، ئایدیایەك لەنێوان ئەم ناوچەدەستكردانە دروست بكات. هەروەها حكومەتە خۆجێییەكان ناچار بوون بەخێرایی ئابوور گەشە پێی بدەن سیاسەتەكانی كۆلۆنیالی هۆكاری گەشە نەكردن بوون و ئەمەش بارودۆخێكی نایاسایی بۆ زیاد كردنی قەبارەی بەرهەمهێنانی ئەم وڵاتانەی هێنایە ئاراوە. بۆ ئەم كارەش دەبوایا سەرمایەگوزارییەكان زیادی كردبا و هەروەهاش دەبوایا ئابوورگەلی جۆراوجۆری مودێرن دابمەزرێن. بە بێ سەركەوتنی ئابووری، دەوڵەتانی ئەفریقیا توانایی بەڕێوەبردنی سەرچاوەكانی پێویست بوو بەرفراوان كردنی خۆشگوزەرانی كۆمەڵایەتی كە كۆمەڵگای مەدەنی خوازیاری بۆ نەیانبوو. هەڵبەت ڕەگەزی مەشروعییەتی سیاسی، دەوڵەتانی ناچار بە بەكارهێنانی دروست لە خزمەتگوزارییە گشتییەكان بۆ درێژەدانی بە حكومەتەكانیانی كرد.

تا هەنوكەش بەڕێوەبەرانی سیاسی ئەفریقیا، نە هاوگونجاوی قەوارەی دەوڵەت بوونە و نە ئامرازە بەدامەزراوەیی كراوەكانیان بنیاتنا تا (بتوانن) ئەم كارە ئەنجام بدەن. ئەمەش بووە بە هۆی خولقاندنی كێشەگەلێك بۆ دەوڵەتان بە چوونە دەرەوەی هێزە كۆلۆنیاڵكارەكان ئەم ئەگەرە بوونی هەبوو كە دەسەڵاتداران بۆ جێگرەكانیان یاسای بنەڕەتی دیموكراتیك دابرێژن، بەڵام ئەم كارە بە خێرایی ئەنجامدرا و دامەزراوە پۆلۆرالیزمەكان بە سەر ستراكتۆرە سیاسییە لاوازەكان بنیاتنران. حكومەتی كۆلۆنیالی ئەوروپا نزیكەی حەفت تا هەشت دەیە دەسەڵاتگەرایی بۆرۆكراتیكیان گرتبووەبەر و هیچ جۆرە كولتوورێكی سیاسی دیموكراتیك گەشەی نەكردبوو و هیچ جۆرە نەریتێكی دامەزراو لە سەر پۆلۆرالیزمی سیاسی بەبوون نەهاتبوو و مكانیزمەكانی دەسەڵاتی بەجێماو (لە كۆلۆنیال) بە یەك رادە بۆ سەركردە نوێیەكانی دەوڵەت و ئەندامانی كۆمەڵگای مەدەنی سازگار بوو.

بەم پێیەش جێی سەرسوڕمان نییە كە وڵاتانی ئەفریقیا یەكسەرە دوای سەربەخۆیی، دیموكراسی لیبراڵیان قەدەغەكرد، چونكە ڕووبەڕووی كۆمەڵێكی گەشە نەسەندو لە ڕووی ئابوورییەوە و كۆمەڵگاگەلی لێكترازاو ستراكتۆرگەلی حكومەتكردنی لاواز و متمانە نەكراو، بوونەوە سەركردە سیاسییەكانی ئەم كیشوەرە ناچار بوون تا لە ڕێگەی دامەزراوەگەلی چەق گرتوو حكومەت بكەن. هەروەك پێشتر ئاماژە پێكرا، ئەم پرسە دەوڵەتانی یارمەتیكرد تا



یەكگرتوویی لەنێوان خەڵكدا دروست بكەن و ستراتیژییەكانی گەشەی ئابوور بگرنەبەر و لە ئەنجامدا ئەفریقیا چووە ناو سەردەمی دەوڵەتی تاك پارتییەوە.

لەم سەردەمەدا پۆلۆرالیزمی سیاسی لە بەین چوو و نوێنەرایەتی فەرمی بە هۆی ستراكتۆرە تاك پارتییەكانەوە هەڵوەشێنرایەوە و دامەزراوەكانی كۆمەڵگای مەدەنیش یان ناچار بە هاوكاریكردن بوون یاخود سەركوت و قەدەغە كران. حكومەتە خۆجێییەكان بۆ دامەزراوەی خۆجێیی كە بڕیارەكانی ناوەندیان جێبەجێ دەكرد گۆڕدران و چالاكی ئابووری كەرتی تایبەتیش لە ناو بردرا و لەبری ئەمەشدا چالاكی (كەرتی) گشتی جێی گرتەوە و پۆلۆرالیزم و ڕۆڵی دادوەری حكومەت لە ڕێگەی دەسەڵاتی جێبەجێ كردنەوە لە بەین بردرا. زیاد لەمەش، تەنانەت پارتیش لە وڵاتانی تاك پارتی زۆر لاواز بووە و دامەزراوەی ناوەندی جێبەجێكردن وەك تاكە دەسەڵات بەسەر چالاكی فەرمی وڵاتەكەیاندا فەرمانڕەوایی دەكرد كە لە ترۆپكی ئەم سیستەمە چەق گرتووە ((خودی سەرۆك – پاشا)) دەهات كە لە حكومەتی تاكەكەسی (شخصی) سوودی فراوانی بەدەست دێنا.

ئەم كاربەدەستانە ترسێكی كەمیان لە ڕووبەڕوو بوونەوەی سیاسەتی فەرمی سەركردایەتییەكەیان هەبوو و هیچ میكیانیزمێكی یاسایی كە مەترسییان بخاتە سەر لە ئارادا نەبوو. زیاد لەمەش كۆمەڵگای مەدەنی لە پرۆسەی سیاسی دوور كەوتبووە هەروەها ركابەرێتی سیاسی لە ئەفریقیای دوای كۆلۆنیالدا لە (چوارچێوەی) نوخبەی دەوڵەتیدا سنووردار ببووە لەم ژینگەیەدا، سیاسەتە گرووپییەكانی باڵە جۆراوجۆرەكانی ((بۆرژاوازی بۆرۆكراتیك)) كە بۆ دامەزراوەیی كردنی (دەسەڵاتی نوخبە) یاخود فراوان كردنی توانایی مانوردان دامەزرابوو، باڵا دەست بوو و زۆرتریش سوپاییەكانی بوون كە لەم ململانێیە درێژخایەنەدا سوودی فراوانیان بەدەستهێنا و سەرچاوەی توندوتیژییان بۆ ئەنجامدانی كودەتا بەكارهێنا و لە هەڵە ڕەخساوەكاندا سوپا دەستی بەسەر دەوڵەتدا گرت. لەم چەشنە بارودۆخەدا كۆمەڵگای مەدەنی تا ڕادەیەكی زۆر لە پانتای سیاسی فەرمیدا دوور كەوتەوە و پەراوێز خرا و ناچار بە پەسەندكردنی سەركردایەتی گشت گرووپەكان بووە و بە تایبەتیش نوخبەی دەوڵەتی كە حكومەتی بەدەستەوە بوو. دەستتێوەردان و ساختەكاری شارەزایانەی سوپا، ئەو توانایییەیان پێ بەخشی كە لە هێلكاری ململانێی نوخبەكاندا سەركەوتن بەدەست بێنێت. زیاد لەمەش ئەوان توانییان لە ركابەرێتی ناوخۆیی بۆ پێشكەوتنیان سوود وەرگرن و سەرۆك كۆمارەكانیش دڵنیا بوون كە چالاكڤانانی سیاسیش بۆ دوورخستنەوەیان (لە گۆڕەپانی سیاسی) سەرقاڵن بەم

جۆرەش هەوڵی نەهێشتنی هەرەشەکانیاندا. لە ئەنجامیشدا سەرکردایەتی سیاسی لە ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیالدا سەقامگیرکرا، بۆ نموونە ((سوپەرمانێکی)) وەك مۆبۆتۆ، قەزافی، کانیدا، مویی و هۆیفیت بونیگی زۆربەیان بوون بە ئەکتەری نەگۆڕی گۆڕەپانی سیاسی لەم کیشوەرەدا.

زۆربەی ئەم سەرکردانە ناچار بوون بەرەنگاری دژیەك بوونە سەرەکییەکانی دەوڵەتانی ئەفریقیا ببنەوە، رژێمەکانی دوای کۆلۆنیال لەم کیشوەرەدا سەرەڕای رێژەیەکی بەرفراوانی چالاکییە فەرمییە تاکجەمسەری لەم وڵاتانەدا، لیڤیاسانێکی (ئاماژەیە بە ئەژدیهای هوبز) بێ توانا بوون. ئەم دەوڵەتانە بۆ بلاوکردنەوە و جێبەجێکردنی دەسەڵاتەکەیان، بەسەر گشت ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان خاوەنی دەسەڵاتی پێویست نەبوون. هەروەها دەوڵەتەکانیش زۆر گەورە (بێ سنوور) ببوون و رۆڵی جۆراوجۆریان لە کۆمەڵگادا ئەنجام دەدا و بەم پێیەش رێژەیەکی بەرفراوانی سەرچاوەکان کۆمەڵگای مەدەنی (لە ناو دەوڵەتدا) تەواوە و (ئەم دەوڵەتانە) تووشی هەڵئاوسان بوونەوە. ئەوان دەسەڵاتی پێویستیان بۆ بەڕێوەبردنی سەرچاوەکان نەبوو تا بەم جۆرە پارێزگاری لە مەشروعییەتەکەیان بکەن. بە کورتی دەوڵەتانی ئەفریقیا خاوەنی گشت ئابووری فەرمی و رۆڵە سیاسییەکانی کۆمەڵگا بوون و کۆمەڵگای مەدەنییان لە پتانسیێلێکی بەردەوام لەپێناو پاراستنی پێگەی هەژمونێکی (کۆمەڵگای مەدەنی) بێبەشیانکرد. بەڵام دەسەڵاتی بەرفراوانی ئەم دەوڵەتانە بە هۆی کەمی رێژەی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری خۆشگوزەرانی و نوێنەرایەتییە فەرمییەکان تا رادەیەکی شکستیان هێنا.

ئەگەرچی نوخبەکانی دەوڵەت بە کۆمەڵگای مەدەنی پێشنیاری بەڕێوەبردنی هەندێ کاروباریان پێشنیارکرد، بەڵام نەیانتوانی تەنیا لە رێگەی هێزی سەرکوتکردنەوە درێژە بە ژیانی (دەوڵەت) بدەن و چونکە ناوەندگەرایی ئیعتباری یاسایی — عەقڵانی دەوڵەتی خستبوو ژێر پرسیارەوە. دەوڵەت ناچار بە زیندووکردنەوەی سەرچاوەکانیتری مەشروعییەت بوو. بەم پێیەش تۆڕەکانی دەرەبەگایەتی کە پردی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بوون لە قۆناغی دوای کۆڵۆنیالدا بنیاتنران. ئەم زنجیرە وەفادارییە بە پاشا — سەرۆك کۆمار روخسەتی دەدا کە مەشروعییەت لە خەڵك بەدەست بێنن و لە بری ئەمەشدا خزمەتگوزاری و کاڵاکان بەسەر خەڵکدا دابەش بکەن. سەرۆك کۆمار پاش ئەفسەرەکان رەچاوی سەرۆك رەعیەتەکانی دەکرد و ئەم تۆڕەش لە گوندەکاندا زۆرتر بوو و بەمجۆرەش (ئاڵوگۆڕی نایەکسان) لە نێوانی فەرمانڕەوا و هاوڵاتیاندا پەیوەندی دروست دەبوو و تاڕادەیەك ئەم پەیوەندییە مەشروعییەتی دووبارەی بەرهەم دێنایەوە.



نوخبەکانی دەوڵەت بۆ پاراستنی پێگەیان نەیاندەتوانی تەنیا پشت بەستراو بە تۆڕگەلی ناوخۆیی بن، چونکە خاوەنی سەرچاوەی ناوخۆیی بۆ راگرتنی ئەم تۆڕە بەهێزەی وەفادارەکان نەبوون. بەم پێیەش پەیوەندی نێودەوڵەتی لە ئەفریقیای دوای کۆڵۆنیالدا رۆڵی گرنگی هەبوو. چەمکی سەروەری نێودەوڵەتی گەرەنتی کەری ئەوە بوو کە نوخبەکانی دەوڵەت لە رێگەی ژینگەی دەرەکییەوە دەستیان بە سەرچاوەکان دەگەیشت و کاربەدەستانی دەوڵەت بە ناوی گەڵەوە دەیانتوانی سەرمایەی پێویست لە بازرگانی کردن و یارمەتییە دەرەکییەکان بەدەست بێنن. لە سەردەمی شەڕی سارددا — کاتێك کە هێزە دەرەکییەکان نیگەرانی مافی مرۆڤ و سیستەمی دەرەبەگایەتی لە ئەفریقیادا نەبوون — سەرچاوە دەرەکییەکان شتێکی ژیاریی بۆ نوخبەی دەسەڵاتداری ئەفریقیا بوون. بەمجۆرەش نوخبەکان زۆرتر هەوڵیان دەدا تا پشتگیری لە سەرچاوەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و زلهێزەکان بکەن لە بری ئەوەی کە رەچاوی داواکاری گەلەکەیان بکەن.

بە کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، یارمەتییە نێودەوڵەتییەکان بە بێ قەرەبوو کردنەوە پچڕان و لە سەردەمی سیستەمی نوێی جیهانی و قۆناغی پلانی هەموارکردنی ستراکتۆریی یارمەتیدەرەکان کۆمەکیان بۆ سەرمایەگوزاری کردن لە ئامانجەگەلی تایبەتدا تەرخان کرد و مەرجگەلی سەخت بۆ خەرجکردنی ئەم کۆمەکانە سەپێنران و لە هەمان کاتدا کێشەکانی ئابووری ناوخۆ تا رادەیەك کەم بوونەوە و کەم و کوڕییەکانی هەڵقولاو لە بڕینی یارمەتییەکانی سەردەمی شەڕی سارد، لەم رێگەیەوە قەرەبوو کران. بەڵام لە بری ئەمەشدا تۆڕی وەفادارەکان کە لە یارمەتییەکان بێ بەشکران لە ناو چوون و ئەفریقیا رووبەڕووی وەرچەرخانێکی سیاسی بووە و مەشروعییەتی دەوڵەت لە دۆخی نەماندا بوو. دەوڵەتەکان توانییان لە رێگەی میکانیزمە یاساییەکانەوە تا ئەو رادەیەی کە بۆیانکرا مەشروعییەتی سیستەمی سیاسییان زیندووکردەوە و لە زۆر بابەتدا دامەزراوەکانی سەرکوتکردنی دەوڵەت هێزی پێویستیان بۆ ئەنجامدانی کودەتایەکی سەربازییان هەبوو. بەڵام لە زۆر بابەتیشدا دەسەڵاتی دەوڵەت کەم بووە و رەگەزەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بە راستەوخۆ و بە (بەکارهێنانی) توندوتیژی رووبەڕووی دەسەڵاتی دەوڵەت ببنەوە ئەمەش زۆرتر لە رێگەی بزاڤە شۆڕشگێڕییەکانەوە بوو. لە زۆر بابەتیشدا بنبەستی سیاسی دەبینرا. ئەگەرچی دەوڵەتەکان زۆر لاواز ببوون و ئامرازی پێویستیان بۆ کونترۆڵ کردنی گەل و وڵاتیان نەبوو، بەڵام هێشتا کۆمەڵگای مەدەنی ئەو هێزەی نەبوو کە بتوانێت نوخبەی دەسەڵاتدار بڕووخێنێت؟ لەم چەشنە هەڵ و مەرجەدا لە ئەفریقیا،

دەسەڵاتی دەوڵەت رووبەڕووی بەرەنگاری ناوخۆیی بۆیەوە و ئەمەش لێك جیا بوونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لێکەوتەوە. ئەفریقییەکان بە چوونە دەرەوە لە بازاڕی فەرمی و کارکردن لە بازاڕی رەشدا بەرەبەرە دەسەڵاتدارانیان خستە ژێر گوشارەوە و ئەمەش لە هەندێ وڵاتدا بوو بە هۆی گۆڕینی حکومەتەکان (بە هۆی کەمی خزمەتگوزاری گشتی) لە هەندێ وڵاتیتریشدا شەڕکەرانی دەوڵەتی سەریان هەڵدا (ئەو وڵاتانەی کە هیچ مەشروعییەتیان نەمابوو) لە هەندێ وڵاتیشدا دەوڵەت رووخا. زۆربەی رژێمەکان هەوڵیان دەدا تا وڵاتەکەیان لەم چارەنووسە (رووخان) رزگار بکەن. بەڕێوەبەرەکانی دەوڵەتی لە ئەفریقیادا لە نەوەدەکان هەوڵیاندا تا لە رێگەی هەڵبژاردنی فرە پارتییەوە دووبارە مەشروعییەت بە دەوڵەت بدەن. سەرکردەکان هەوڵیاندا ریسکی لە دەست دەرچوونی کونترۆڵی دەسەڵات لە رێگەی پرۆسەی دیموکراتیزەکردنەوە تاقی بکەنەوە و لە ئەنجامیشدا لە دەسەڵات دوور خرانەوە، چونکە ئەم هەوڵدانە تەنیا هەوڵدانێك بوو بۆ پاراستنی داهاتووی سیاسییەکەیان. بەم پێیەش لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا شەپۆلێکی ملەوەر لە هەڵبژاردنی فرە پارتی لەم کیشوەرەدا ئەنجامدرا و ژمارەیەك لەم ((سوپەرمانانە)) لەم گۆڕەپانەدا نەمان و ژمارەیەکیتر رزگار بوون (چ لە رێگەی ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ساغلەمیانە و چ لە رێگەی دەستکاری کردن لە هەڵبژاردنەکاندا).
ئەگەرچی ئەم دەستکەوتانە لەگەڵ ئەو شتەی کە چاوەڕوانی بوون جیاوازییەکی لە رادەبەدەری هەبوو، بەڵام لە هەندێ بابەتدا رەنگدەرەوەی داواکارییەکانی گەل بوو و بەمجۆرەش ئەم هەڵبژاردنانە رێگەیەکی دووردرێژ بۆ دووبارە بەدەستهێنانەوەی مەشروعییەت لە ئەفریقیادا بوو و کۆمەڵگای مەدەنیش بۆ پرۆسەی سیاسی گەڕایەوە بەڵام دەبێ چاوەڕوان بین کە ئایا ئەم رووداوانە دەستێکی بە دامەزراوەیی کردنی دیموکراسییەکی درێژماوەیە یاخود نا؟ هەنوکەش لەمپەرگەلی زۆر بۆ زاڵ بوون لە بەردەمدا هەن.

ئایا راستە کە بڵێین ئەفریقییەکان خۆیان لە حکومەتە بێ سوودەکان رزگار کردووە؟ ئایا حکومەتە تالانچییەکان کە لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالدا باڵا دەست بوون هەنوکە لە ناو چوونە، یاخود لەبری جێگیری کۆلۆنیالکاران رۆڵ دەگێڕن؟

هەڵبەت دەتوانین بڵێین کە ئەم بابەتانە نیشانەی ئەوەن کە ئەم کیشوەرە لە دەروازەی وەرچەرخانێکی گەورەدایە. ئەو دەوڵەتانە کە لە دوای گۆڕانکارییەکانی دەیەی نۆیەمدا بنیاتنران، بە بڕوای ریشەی دەسەڵاتەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ (سەردەمی) رابردوو، بەڵام حکومەتە بەرقەرارەکان (هەنوکە) تاڕادەیەك وەڵامدەرەوەی گەلن. بەڵام ئەم حکومەتانە لە



دامەزراندنی دامەزراوە یاسایی — عەقڵانییەکان رووبەڕووی گرفتگەلێکن. هەروەها دووبارە دەرفەت بە کۆمەڵگای مەدەنی درا تا لە پرۆسەی سیاسیدا زۆرتر بەشداری بکات و ئەم پرسەش نەتەنیا دەبێتە هۆی پەیوەندی بەرفراوان نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بەڵکو موژدەی هێنانەدی داهاتوویەکی پرشنگداری سیاسی لەم کیشوەرەدا دەبەخشێت.

ئەگەرچی حکومەتی کۆلۆنیالی ئەم کیشوەرەی چەوساندووەتەوە بەڵام حکومەتەکان هەوڵی لەناوبردنی میراتی کۆلۆنیال دەدەن. سیاسەتی گشتی ناشیاو، حکومەتی تاکەکەسی، تەرخان نەکردنی سەرچاوە گشتییەکان (بۆ بەرژەوەندی گشتی) و دەوڵەتی ناوەندگەرا بووە هۆی درزتیکەوتنێکی قووڵ لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی و گەشەی ئابوورێکی نابەرهەمهێنەر. لە ئەنجامدا هەندێ لە ئەفریقییەکان لە قۆناغی دوای کۆلۆنیال رووبەڕووی هەژارییەکی لە رادەبەدەر بوونەوە و نوێنەرێکی فەرمییان کە بتوانێ داکۆکی لە مافەکانیان بکات نەیانبوو. تا دەیەی هەشتەم رەزامەندی و خواستەکانی هەڵقوڵاو لە سەربەخۆیی زۆر کەم ببوونەوە، بەڵام پێویستە بووترێ کە هەر شکستهێنانێك سەرەتایەك بۆ شکستێکیتر لە داهاتوودا نییە. مومکینە هەڵبژاردنی دەیەی نۆیەم بووبێتە هۆی رەزامەندکردنی ئەفریقییەکان تا بتوانن سیستەمگەلی سیاسی نوێ و بەرهەمهێنەر دابمەزرێنن. بە جێبەجێکردنی ئەم چاکسازییە سیاسییانە هیوادارین کە گشت دانیشتوانی ئەم کیشوەرە لە سوودەکانی لە هەزارەی سێیەم دا سوودمەند بن. ئەگەرچی هەندێ راستی دژواریش بوونیان هەیە ئەویش ئەوەیە کە دیموکراسی نوێ ناتوانێ بە تابلۆیەکی سپی (بێ کارتێکراوی لە رابردوو) دەست پێ بکات. سەرکردەکان ناچارن گشت ئەو هیوایانەی کە بە هۆی رووداوەکانی سەدەی بیستەم پشتگوێ خرابوون، فەراهەم بکەن.

# پاشکۆ

## پاشکۆی ژمارە ١:

هەڵبژاردنی دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن لە ئەفریقیا لە سەردەمی سەربەخۆییەوە تا ساڵی ١٩٩٩

| ناوی ولات | هەڵبژاردنی فرە پارتی، دەسەڵاتی یاسادانان / جێبەجێکردن | دەنگدان بە پارتی دەسەڵاتدار | دەنگدان بە گرووپی بەرهەڵستکار | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ئەلجەزایر | ١٩٩١ یاسادانان<br>١٩٩٥ جێبەجێکردن<br>١٩٩٧ یاسادانان<br>١٩٩٩ جێبەجێکردن | <br>×<br>×<br>× | | سیستەمی تاك پارتی ساڵی ١٩٨٩، هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩١ لەلایەن سوپاوە هەڵوەشێنرایەوە سیستەمی تاك پارتی لاواز بە دەسەڵاتدارێتی سەربازییەکان لە ساڵی ١٩٩٥ تا ١٩٩٧ و هەڵبژاردن لە ساڵی ١٩٩٩ دا. |
| ئەنگولا | ١٩٩٢ یاسادانان<br>١٩٩٢ جێبەجێکردن | ×<br>× | | تا ساڵی ١٩٩٢ سیستەمی تاك پارتی. گەڕانەوەی بەرهەڵستکاران بۆ شەڕی ناوخۆیی پاش سەرنەکەوتن لە |



| | | | | |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| | | | | هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٢ |
| بنین | ١٩٩١ یاسادانان<br>١٩٩١ جێبەجێکردن<br>١٩٩٥ یاسادانان<br>١٩٩٦ جێبەجێکردن<br>١٩٩٩ یاسادانان | | ×<br>×<br>×<br>×<br>× | پۆلۆرالیزم لە دوای سەربەخۆیی بۆ سیستەمی تاك پارتی و حکومەتی سەربازی گۆڕدرا و تا ساڵی ١٩٩٠ی خایاند. سەرۆك کۆمار (پارتی دەسەڵاتدار) لە هەڵبژاردنی فرە پارتیدا دەسەڵاتی بە بەرهەڵستکاران سپارد. |
| بۆتسوانا | ١٩٦٩ یاسادانان<br>١٩٧٤ یاسادانان<br>١٩٧٩ یاسادانان<br>١٩٨٤ یاسادانان<br>١٩٨٩ یاسادانان<br>١٩٩٤ یاسادانان<br>١٩٩٩ یاسادانان | ×<br>×<br>×<br>×<br>×<br>×<br>× | | پارتی دیموکراتێکی بۆتسوانا لە سەردەمی سەربەخۆییەوە دەسەڵاتی بەدەستەوە بووە و سەرپەرشت (قیم) بوونێکی لە ڕێگەی هەڵبژاردنی فرە پارتییەوە بەدەست هێناوە. |
| بۆرکینلفا سۆ | ١٩٧٠<br>١٩٧٨<br>١٩٧٨<br>١٩٩١ | ×<br>×<br>×<br>× | | پۆلۆرالیزم لە سەردەمی سەربەخۆییەوە بۆ سیستەمی تاك پارتی |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | ١٩٩٢<br>١٩٩٧<br>١٩٩٨ | ×<br>×<br>× | | و حکومەتی سەربازی گۆڕدرا و تا ساڵی ١٩٨٩ی درێژە هێنا. هەڵبژاردنەکانی ساڵانی ١٩٧٠ و ١٩٧٨ ئەم ڕێڕەوەی لە بەین برد سوپا بۆ سەربازگەکان گەڕانەوە. هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩١ لەلایەن بەرهەڵستکارە نایاساییەکانەوە بایکوت کرا. |
| بروندی | ١٩٦٥ یاسادانان<br>١٩٩٣ یاسادانان<br>١٩٩٣ جێبەجێکردن | × | <br>×<br>× | حکومەتی فرە پارتی تا ساڵی ١٩٦٦. حکومەتی سەربازی لە ساڵی ١٩٦٦ەوە تا ساڵی ١٩٩٢ کودەتای سەربازی لە ساڵی ١٩٩٦. بە فەرمی ناساندنی پارتە سیاسییەکان، بەلام هیچ هەڵبژاردنێکی فرە پارتی دوای کودەتا ئەنجام نەدرا. |
| کامیرون | ١٩٦٤ یاسادانان<br>١٩٩٢ یاسادانان | ×<br>× | | سیستەمی فرە پارتی تا ساڵی ١٩٦٦. |



| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | ١٩٩٢ جێبەجێکردن<br>١٩٩٧ یاسادانان<br>١٩٩٧ جێبەجێکردن | ×<br>×<br>× | | سیستەمی تاك پارتی لە ١٩٦٦ تا ١٩٩٢. پارتی دەسەڵاتدار لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ بەسەر دەسەڵاتدا مایەوە بەلام دەستکاری و بایکۆت کردنی هەڵبژاردنەکان کرا. |
| گەروی سەوز | ١٩٩١<br>١٩٩١<br>١٩٩٥<br>١٩٩٥ | <br><br>×<br>× | ×<br>× | سیستەمی تاك پارتی تا ساڵی ١٩٩١. بەرهەڵستکاران لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩١دا سەرکەوتن و لە هەڵبژاردنەکانیتر دا بەشێوازی سەرپەرشت (قیومت) سەرکەوتن. |
| کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست | ١٩٨١ جێبەجێکردن<br>١٩٩٣ یاسادانان<br>١٩٩٣ جێبەجێکردن<br>١٩٩٨ یاسادانان<br>١٩٩٨ جێبەجێکردن | <br><br><br>×<br>× | <br>×<br>× | دەوڵەتی تاك پارتی / حکومەتی سەربازی تا ساڵی ١٩٨١. ئەزموونێکی کورتخایەن لە هەڵبژاردنی فرە پارتی لە ساڵی ١٩٨١دا. کودەتای سەربازی و گەڕانەوە بۆ سیستەمی تاك پارتی |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | لە ساڵی ١٩٨١ تا ١٩٩٣. بەرهەڵستكاران لە ساڵی ١٩٩٣دا سەركەوتن و لە هەڵبژاردنەكانی داهاتوودا بوون بە سەرپەرشت (قیم) (لەگەڵ نائارامی ناوخۆیی). |
| چاد | ١٩٩٦ جێبەجێكردن<br>١٩٩٧ یاسادانان | ×<br>× | | پۆلۆرالیزم لە سەردەمی سەربەخۆییەوە گۆڕدرا بۆ سیستەمی تاك پارتی و تا ساڵی ١٩٩٦ درێژەی كێشا. پارتی دەسەڵاتدار لە دەسەڵاتدا مایەوە و لە هەڵبژاردنی فرە پارتی ساڵی ١٩٩٦یش سەركەوتنی بەدەست هێنا. |
| كۆمۆر | ١٩٩٠<br>١٩٩٢<br>١٩٩٣<br>١٩٩٦<br>١٩٩٦ | ×<br>×<br>× | <br><br><br>×<br>× | پۆلۆرالیزمی سەربەخۆیی گۆڕدرا بۆ سیستەمی تاك پارتی / سەربازی و تا ساڵی ١٩٩٠ خایاندی، |



| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | پارتی دەسەڵاتدار لە هەڵبژاردنەكاندا كە لەلایەن هێزە بەرهەڵستكارەكانەوە بایكۆت كرابوو لە دەسەڵاتدا مایەوە. لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٦ دوای دەستتێوەردانی سوپا، هێزی بەرهەڵستكار سەركوت كرد (پارتەكانیش بایكۆتی هەڵبژاردنەكانی كرد). |
| كۆماری كونگۆی برازاویل | ١٩٩٢ یاسادانان<br>١٩٩٢ جێبەجێكردن<br>١٩٩٣ یاسادانان | ×<br>× | <br><br>× | پۆلۆرالیزمی سەردەمی سەربەخۆیی بۆ حكومەتی تاك پارتی / سەربازی گۆڕدرا و تا ساڵی ١٩٩٢ خایاندی. بەرهەڵستكاران لە یەكەمین هەڵبژاردنی فرە پارتی سەركەوتن، بەڵام ناسەقامگیری هەڵقوڵاو لە ركابەریتی نێوان باڵەكان بووە هۆی شەڕزەیی و كودەتای سەربازی لە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | ســــــــالّی ١٩٩٧دا رووبیدا. |
| کۆماری دیموکراتیکی کونگۆ (کینشازا ) | ١٩٦٥ جێبەجێکردن | | | ١٩٦٠ تا ١٩٦٤ شەری ناوخۆیی هەڵبژاردنەکانی ناتەواو لە ساڵی ١٩٦٥. کودەتای سەربازی لە ساڵی ١٩٦٥ و دواتر حکومەتی سەربازی. |
| کەناری عاج | ١٩٩٠ یاسادانان<br>١٩٩٠ جێبەجێکردن<br>١٩٩٥ یاسادانان<br>١٩٩٥ جێبەجێکردن | ×<br>×<br>×<br>× | | حکومەتی تاك پارتی تا ساڵی ١٩٩٠. پارتی دەسەڵاتدار لە هەڵبژاردنی فرە پارتیدا سەرکەوت بەڵام بە هۆی کودەتای ساڵی ١٩٩٩ لە کار لادرا. |
| جیبوتی | ١٩٩٢ یاسادانان<br>١٩٩٣ جێبەجێکردن<br>١٩٩٧ یاسادانان<br>١٩٩٩ جێبەجێکردن | ×<br>×<br>×<br>× | | سیستەمی تاك پارتی تا ساڵی ١٩٩٢. ئەگەرچی هەڵبژاردنی فرە پارتی هەڵوەشێنرایەوە بەڵام پارتی دەسەڵاتدار، لە دەسەڵاتدا مایەوە. |
| میسر | ١٩٥٠ یاسادانان<br>١٩٧٦ یاسادانان | × | | بەشداریکردن لە دەسەڵاتدا لە ساڵی |



| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | ١٩٧٩ یاسادانان<br>١٩٨٤ یاسادانان<br>١٩٨٧ یاسادانان<br>١٩٩٠ یاسادانان<br>١٩٩٥ یاسادانان | ×<br>×<br>×<br>×<br>× | | ١٩٢٢ تا ١٩٥٥ لەنێوان حکومەتی پاشایەتی، نەتەوەگەراکان و حکومەتی بریتانیا. لە ساڵی ١٩٥٠ هەڵبژاردنی فرە پارتی ئەنجامدرا. ١٩٥٢ تا ١٩٧٦ حکومەتی تاك پارتی / سەربازی لە ساڵی ١٩٧٦ ە وە تێکەڵێك لە هەڵبژاردنی نیمچە فرە پارتی سەرەڕای توندوتیژی سیاسی و بایکۆت کردنی پارتەکان پارتی دەسەڵاتدار، لە دەسەڵاتدا مایەوە. |
| گینەی ئۆستوا | ١٩٩٣ یاسادانان<br>١٩٩٦ جێبەجێکردن<br>١٩٩٩ یاسادانان | ×<br>×<br>× | | پۆلۆرالیزم دوای سەربەخۆیی گۆڕدرا بۆ حکومەتی تاك پارتی / سەربازی و تا ساڵی ١٩٩٣ خایاند. لە ساڵی ١٩٩٣یەوە سیستەمی فرە پارتی بوونی هەبووە و |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | هەڵبژاردنیش بە ناياسابييانه ئەنجامدراون کە ئەمەش بەردەوامی پارتی دەسەڵاتداری لە دەسەڵاتدا لێ کەوتەوە. |
| ئەریتریا | | | | لە دامەزراندنی ئەریتریا تا ساڵی ١٩٩٣ هیچ هەڵبژاردنێك چ یاسادانان چ جێبەجێکردن ئەنجام نەدراوە. |
| ئەسیوپیا | ١٩٩٥ یاسادانان | × | | حکومەتی پاشایەتی تا ساڵی ١٩٧٤. سیستەمی تاك پارتی لە ساڵی ١٩٧٤ تا ١٩٩١. دابەشکردنی ڕێژەییانەی یەکێتی EPRDF لە ساڵی ١٩٩١ کە لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٥ ئەم یەکێتییە لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتی یاساداناندا سەرکەوت. |



| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| گامبیا | ١٩٩٦ یاسادانان | × | | پارتی پێشکەوتنخوازی گەل لە ساڵی ١٩٦٦ تا ١٩٩٤ بە هۆی سیستەمی فرە پارتییەوە لە دەسەڵاتدا مایەوە. لە ساڵی ١٩٩٤ یاسای بنەڕەتی گامبیا بە هۆی کودەتای سەربازییەوە خرایە ژێر پێ و سوپا لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٦دا درێژەی بە حکومەتەکەی دا. |
| | ١٩٧٢ یاسادانان | × | | |
| | ١٩٧٧ یاسادانان | × | | |
| | ١٩٨٢ یاسادانان | × | | |
| | ١٩٨٢ جێبەجێکردن | × | | |
| | ١٩٨٧ یاسادانان | × | | |
| | ١٩٨٧ جێبەجێکردن | × | | |
| | ١٩٩٢ یاسادانان | × | | |
| | ١٩٩٢ جێبەجێکردن | × | | |
| | ١٩٩٦ یاسادانان | × | | |
| | ١٩٩٦ جێبەجێکردن | × | | |
| گابون | ١٩٩٠ یاسادانان | × | | پۆلۆرالیزمی سیاسی دوای سەربەخۆیی گۆڕدرا بۆ حکومەتی تاك پارتی / سەربازی و تا ساڵی ١٩٩٠ خایاندی. لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٠دا پارتی دەسەڵاتدار، لە دەسەڵاتدا مایەوە. |
| | ١٩٩٣ جێبەجێکردن | × | | |
| | ١٩٩٦ یاسادانان | × | | |
| | ١٩٩٨ جێبەجێکردن | | | |
| لسۆتۆ | ١٩٩٣ یاسادانان | | × | پارتی دەسەڵاتدار ئەنجامی |
| | ١٩٩٨ یاسادانان | | × | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٠ی پەسەند نەکرد.<br>حکومەتی پاشایەتی تا ساڵی ١٩٨٦.<br>حکومەتی سەربازی لە ساڵی ١٩٨٦ تا ١٩٩٣.<br>بەرهەڵستکاران لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٣ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٨ گرووپی جیابووە لە پارتی دەسەڵاتدار سەرکەوتنی<br><br>بەدەست هێنا. |
| ليبريا | ١٩٨٥ ياسادانان<br>١٩٨٥ جێبەجێکردن<br>١٩٩٧ ياسادانان<br>١٩٩٧ جێبەجێکردن | ×<br>× | <br><br>×<br>× | لە ساڵی ١٨٧٠ تا ١٩٨٠ پارتیتر و ویگ ( TRUE UHIG) لە ڕێگەی سەرپەرشتی کردنی هەڵبژاردنەکان، حوکمرانی وڵاتی کرد.<br>حکومەتی سەربازی |



| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | ٨٥ — ١٩٨٠، کاربەدەستانی پارتی دەسەڵاتدار لە هەڵبژاردنێکی فرە پارتیدا لە ساڵی ١٩٨٥ سەرکەوتن و تا ساڵی ١٩٨٩ (سەردەمی دەست پێکردنی شەڕی ناوخۆیی) بەسەر وڵاتدا فەرمانڕەوایيان کرد. لە ساڵی ١٩٩٧دا هەڵبژاردنی فرە پارتی لە ئەنجامی ڕێککەوتنی ئاشتی ئەنجامدرا. |
| ليبيا | | | | پاشایەتی باڵادەست و سیستەمی فرە پارتی لاواز تا ساڵی ١٩٦٩.<br>حکومەتی سەربازی / سەرۆکایەتی لە ساڵی ١٩٦١ەوە. |
| غەنا | ١٩٦٩ ياسادانان<br>١٩٧٩ ياسادانان<br>١٩٧٩ جێبەجێکردن<br>١٩٩٢ ياسادانان<br>١٩٩٢ جێبەجێکردن | <br><br><br>×<br>× | | پۆلۆرالیزم لە سەردەمی سەربەخۆییەوە تا ساڵی ١٩٩٢ گۆڕدرا بۆ سیستەمی تاک |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | ١٩٩٦ یاسادانان<br>١٩٩٦ جێبەجێکردن | ×<br>× | | پارتی / سەربازی (بە ڕێزپەڕکردنی ساڵی ١٩٦٩ و ١٩٧٩ کە هەڵبژاردنی فرە پارتی ئەنجامدرا و سوپا بۆ سەربازگەکان گەڕایەوە. پارتی دەسەڵاتدار لە هەڵبژاردنی فرە پارتی ساڵی ١٩٩٢ سەرکەوت و دەسەڵاتی کونترۆڵ کرد. |
| گینە | ١٩٩٣ جێبەجێکردن<br>١٩٩٥ یاسادانان<br>١٩٩٨ جێبەجێکردن | ×<br>×<br>× | | سیستەمی تاك پارتی تا ساڵی ١٩٩١ پارتی دەسەڵاتدار لە هەڵبژاردنی فرە پارتی ساڵی ١٩٩٣ سەرکەوتنی بەدەست هێنا و دەسەڵاتی گرتە دەست. |
| گینەی بیسائۆ | ١٩٩٤ یاسادانان<br>١٩٩٤ جێبەجێکردن<br>١٩٩٩ یاسادانان<br>١٩٩٩ جێبەجێکردن | ×<br>× | <br><br>×<br>× | سیستەمی تاك پارتی تا ساڵی ١٩٩١. پارتی دەسەڵاتدار لە هەڵبژاردنی فرە پارتی ساڵی ١٩٩٤ سەرکەوت، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٩ |



| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | دەسەڵاتی لە دەست دەرچوو. |
| کێنیا | ١٩٦٣ یاسادانان<br>١٩٦٦ یاسادانان<br>١٩٩٢ یاسادانان<br>١٩٩٢ جێبەجێکردن<br>١٩٩٧ یاسادانان<br>١٩٩٧ جێبەجێکردن | ×<br>×<br>×<br>×<br>×<br>×<br>× | | سیستەمی تاك پارتی تا ساڵی ١٩٦٩. سیستەمی تاك پارتی لە ساڵی ١٩٦٩ تا ١٩٩٢. پارتی دەسەڵاتدار لە هەڵبژاردنی فرە پارتی ساڵی ١٩٩٢ سەرکەوتنی بەدەست هێنا. |
| ماداگاسکار | ١٩٦٠ یاسادانان<br>١٩٦٥ یاسادانان<br>١٩٧٠ یاسادانان<br>١٩٧٧ یاسادانان<br>١٩٨٢ جێبەجێکردن<br>١٩٨٣ یاسادانان<br>١٩٨٩ یاسادانان<br>١٩٨٩ جێبەجێکردن<br>١٩٩٣ یاسادانان<br>١٩٩٣ جێبەجێکردن<br>١٩٩٦ جێبەجێکردن<br>١٩٩٨ یاسادانان | <br>×<br>×<br>×<br>×<br>×<br>×<br>× | <br><br><br><br><br><br><br><br>×<br>×<br>×<br>× | هەڵبژاردنی نیمچە رکابەریێتی تا ساڵی ١٩٩٣. لەم هەڵبژاردنەدا پارتی دەسەڵاتدار بە ساختەکارییەوە بە دەسەڵات گەیشت. گرووپی بەرهەڵستکاران ساڵی ١٩٩٣ لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماریدا بە دەسەڵات گەیشت بەڵام لە هەڵبژاردنی داهاتوو سەرۆك کۆماری پێشوو |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | (دیدیر رۆتسیراکا) لە هەڵبژاردنە ئازاد و دادپەروەرانەی ساڵی ١٩٩٦ شکستی هێنا. پارتی رۆتسیراکا لە هەڵبژاردنی یاسادانان ساڵی ١٩٩٨یش سەرکەوتنی بەدەست هێنا. |
| مالاوی | ١٩٩٤ یاسادانان<br>١٩٩٤ جێبەجێکردن<br>١٩٩٩ یاسادانان<br>١٩٩٩ جێبەجێکردن | <br><br>×<br>× | ×<br>× | پۆلۆرالیزم لە سەردەمی سەربەخۆییەوە تا ساڵی ١٩٩٣ گۆڕدرا بۆ سیستەمی تاک پارتی. بەرهەڵستکاران لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٤ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و لە هەڵبژاردنەکانی دواتریشدا سەرکەوتن. |
| مالی | ١٩٩٢<br>١٩٩٢<br>١٩٩٧<br>١٩٩٧ | <br><br>×<br>× | ×<br>× | پۆلۆرالیزم لە سەردەمی سەربەخۆییەوە تا ساڵی ١٩٩٢ گۆڕدرا بۆ سیستەمی تاک پارتی / سەربازی. |



| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | بەرهەڵستکاران لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ سەرکەوتن و لە هەڵبژاردنەکانی دواتریشدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا ئەگەرچی لە ساڵی ١٩٩٧دا هەڵبژاردنی دەسەڵاتی یاسادانان لەلایەن پارتەکانەوە بایکۆت کرا. |
| موریتانیا | ١٩٩٢ یاسادانان<br>١٩٩٢ جێبەجێکردن<br>١٩٩٦ یاسادانان<br>١٩٩٧ یاسادانان | ×<br>×<br>×<br>× | | سیستەمی تاک پارتی تا ساڵی ١٩٩١. پارتی دەسەڵاتدار لە هەڵبژاردنی فرە پارتیدا حوکمرانی گرتە دەستەوە. |
| موریس | ١٩٧٦ یاسادانان<br>١٩٨٢ یاسادانا<br>١٩٨٣ یاسادانان<br>١٩٨٧ یاسادانان<br>١٩٩١ یاسادانان<br>١٩٩٥ یاسادانان | <br><br>×<br>×<br>×<br>× | ×<br>× | هەڵبژاردنی فرە پارتی لە سەردەمی سەربەخۆییەوە (وەستانی هەڵبژاردنەکان بە هۆی بارودۆخی نائاساییەوە ١٩٧١-٧٦) چەندین وەرچەرخان لە حکومەتدا بەدرێژایی |

